

# بیرەوەریی رۆژگارانی بەسەرچوو

## بیرەوەری و بەڵگەنامەکانی یووسف ئیفتیخاری

1299-1326هەتاوی (1930-1947ز)



کاوەی بەیات ، مەجید تەفرەشی

# بیرەوەریی ڕۆژگارانی بەسەرچوو

**بیرەوەری و بەڵگەنامەکانی یووسف ئیفتیخاری**

**١٢٩٩ – ١٣٢٦ هەتاوی (١٩٣٠ – ١٩٤٧ ز)**


**کۆکردنەوەی**

**کاوەی بەیات، مەجید تەفرەشی**

**وەرگێڕانی**

**عەلی مەولود – لوقمان یوسفی**



حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران

xanecontact@yahoo.com

- ناوی کتێب: بیرەوەری ڕۆژگارانی بەسەرچوو
- کۆکردنەوەی: کاوەی بەیات، مەجید تەفرەشی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: عەلی مەولود – لوقمان یوسفی
- بابەت: بیرەوەری
- پیتچنین: کامەران محەممەد ئەحمەد
- هەڵەبڕی: مەسعود بابایی
- دیزاینی ناوەڕۆک: زانا کەمال
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٥٠٠
- زنجیرە: ٣٩٧
- چاپخانە: ڕوون
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی پۆلێن: ٩٢٣/٢- ک ٢٣٩
- ژمارەی سپاردن: (١١٦٠) ساڵی (٢٠١٣) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێ دراوە

# پێرست

# پێشگوتار

ناوی یووسف ئیفتیخاری، لە هەورازو نشێوەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێران و بەتایبەت لە مەسەلەکانی پەیوەندیدار بەرێکخراوی کرێکاری، لە نێوان ساڵەکانی ١٣٠٧ — ١٣٢٧ی هەتاوی (١٩٢٨-١٩٤٨ ز)، ناوێکی ناسراوە، بەڵام ئەوەی لەبەردەستدایە لەهەندێك زانیاری پەرشوبڵاو واوەترنین، ئەوەی کە: ئەو لە ساڵی ١٣٠٨ یەکێك لە رابەرانی مانگرتنی کرێکارانی پیشەسازی نەوت بووە، ١٢ ساڵ لەگرتوخانەکانی رەزاشادا ماوەتەوە، بیروڕای ناتەبا لەگەڵ زۆربەی زیندانییە چەپ و کۆمۆنیستەکانی ئەو سەردەمە هەبووە و لە ساڵەکانی دوای شەهریوەری ١٣٢٠یش (خەرمانانی ١٩٤١ز) چالاکی پیشەیی و سیاسی کردووە.

ئەوەی کە لە نوسین و بیرەوەرییەکانی پێوەندیدار بەو سەردەمە و هێماگەلی پەرەوازە بە یووسفی ئیفتیخاری دەکرێت، زۆرتر باسی ناتەباییی ئەوە لەگەڵ بەریان(گرایش)ە سیاسییە باوەکانی ئەو کاتە، رکابەر و بەرهەڵستکارە سەرەکییەکان ئەگەر بەناچاری باسی ئەویان کردووە، جگە لەخراپەکاری و دووبەرەکایەتی رۆڵێکی دیکەیان بۆ ئەژمار نەکردووە.[1] ئەوانیش "رکابەرو نەیارە سەرەکییەکانی" لەبەرئەوەی هیچ مەبەستیان نەبووە چاو بەکارەکانی رابردووی

[1]. چهل سال در سنگر مبارزه، تهران، انتشارات حزب توده ایران ١٣٦٠ (١٩٨١ز)، لاپەرە ١٢٦

خۆیاندا بگێڕنەوەو هێشتاش بەجۆرێك گیرۆدەی "دەرفەتی گەورەی لەدەستچوو" بوون و هەن، ئەگەرچی بەناچاری و نابەدڵ دەربارەی یووسفی ئیفتیخاری و چالاکییەکانی دواون[2]، وەلێ سرووشتییە هەوڵی زۆریان نەداوە بۆ رۆشنتربوونەوەی چۆنایەتی و چەندایەتیی باوەڕ و چالاکییەکانی ئەو. ئەوەی لەهەر خاڵێکی دیکە زیاتر لەبارەی یووسفی ئیفتیخاری و "نووسینی مێژووی" چالاکییەکانی ئەو بەرچاودەکەوێت ئەوەیە کە ٢٠ ساڵ ئامادەیی و چالاکی ئەو لەمەیدانی کێشمەکێشە سیاسی و پیشەییەکانی کرێکارانی ئێراندا، دروستبوونی رەوتێکی" تۆکمەی سیاسی"ی بەتایبەتمەندیی خۆیەوە شێخ و دەروێشایەتیی... لێنەکەوتەوە و رەنگە بتوانین بڵێین ئەم "کەمتەرخەمییەی" رۆژگار لە ڕوویەکەوە بەقازانجی بووبێت، لەبەرئەوەی کێشمەکێشەکانی ئەو دەمە خاوبوونەوەو پێوانە سیاسییەکانی ئەو رۆژانە تارادەیەك کاڵ بوونەوە. بۆ ناسینی ئەو بەشە لەمێژووی هاوچەرخی ئێران، ناچار نین ژەنگ و تەمومژەکانی ئەفسانەسازییە باوەکان دەربارەی کەسایەتییە مێژووییەکانی وڵاتەکەمان (ئێران) پاك بکەینەوە و لەوەش ناترسین کە خستنەڕوو و باسکردنی ئەم بابەتە بمانگەیەنێت بە ئەفسانە سازییەکی نوێ. سەربوردەی یووسف ئیفتیخاری

---

2. بۆ نمونە بگەڕێرەوە بۆ د. ئەنوەر خامەیی، پەنجا کەس و سێ کەس، تاران ، دەزگای چاپەمەنی هەفتە لاپەڕە ١٥٠، ١٧٣ و ١٧٩ - ١٨٨، بیرەوەریە سیاسییەکانی خەلیل مەلەکی، د. محمد عەلی کاتوزیان پێشەکی بۆ نوسیوە، تاران، کۆمپانیای پشکداری بلاوکردنەوە، ج٢، ١٣٦٨لاپەڕە ٢٨٠ -٢٨٥ ئیرەج ئەسکەندەری بیرەوەری سیاسی بە هەوڵی عەلی دەباشی، تاران، چاپەمەنی عیلمی ١٣٦٨ (١٩٨٩ز) لاپەڕە ٢٠٧ـ ٢١٠.

بەسەرهاتێکی نەناسراوە لەسەردەمانێکی ڕابردوودا کە ناسین و باسکردنی ئەو لەپاڵ ناسین و باسکردنی زۆر مەسەلەو چالاکی دیکەی هاوشێوەی نەناسراو، لەڕووی تێگەیشتن و ناسینی وەرچەرخانەکانی مێژووی هاوچەخی ئێران هەرپێویستە.

ئەوەی لەم گشتکۆ(مجموعە)یە دا دەخرێتەڕوو سێ جۆرە، بیرەوەرییەکان، نوسینەکان و بەلگەنامەکان، ***"بیرەوەرییەکان"*** بەرهەمی ئەو وتووێژانەن کە لە پاییز و زستانی ١٣٦٨ لەگەڵ یووسف ئیفتیخاری ئەنجامدراون و دوای نووسینەوەیان لەبەر کاسێت و ڕێکخستن و پاکنووسکردنیان ئامادەی بڵاوکردنەوە کراون و ***"نووسینەکان"*** زنجیرە وتارێکن یووسف ئیفتیخاری لە ئۆردیبەهێشتی ١٣٣٠تا تیری ١٣٣١ ( گولانی ١٩٥١ تا پوشپەڕی ١٩٥٢ ز) لەژێرناوی "**کورتەمێژووی بزووتنەوەی کرێکاری لەئێران**" لەرۆژنامەی "ئیرادەی ئازەربایجان" ژمارە ١٦ی ساڵی سێهەم ١٩ گولانی ساڵی ١٣٣٠( ١٩٥١ ) ـ ژمارە ٦٩ ساڵی چوارەم ٢١ پوشپەڕی ١٣٣١(١٩٥٢) بڵاویکردوونەتەوە. لەم وتارانەدا پاش باسکردنی پێشینەی مێژوویی چالاکییە کرێکارییەکانی ئێران دوای کودەتای ١٢٩٩، (١٩٢٠ ز) چووەتە سەر بابەتی سەرەکیی دامەزراندنی سەندیکای کرێکاری لە خوزستان ١٣٠٧ (١٩٢٨ز)، لە مەڕ شێوەی ڕێکخستن و خواستەکانی کرێکاران و مانگرتنی ١٣٠٨ ( ١٩٢٩ ز)، زانیاریی وردو تەواو خراوەتەڕوو، پاشان چۆنیەتی نوێکردنەوەی چالاکییە کرێکارییەکانی دوای شەهریوەری ١٣٢٠(خەرمانانی ١٩٤١ ز)، کراوەتە جێی باس و چۆنێتی دامەزراندن و هەڵسوڕانی" یەکێتی کرێکاران و جوتیاران" تا ساڵی ١٣٢٢ (١٩٤٣ز) شرۆڤەکراوە. ئەگەرچی

لەم وتارانەدا هەوڵدراوە زیاتر لایەنی گشتیی مێژووی گۆڕانکارییە کرێکارییەکان لەئێران لەبەرچاوبگیرێت و هەتا لەتوانادا هەبووە خۆپارێزی کراوە لە نیشاندانی رۆڵی یووسفی ئیفتیخاری. لەگەڵ ئەوەشدا پایەی سەرەکیی نوسینەکان بەناچاری لەسەر ئەزمون و بیرەوەرییەکانی ئەو دارێژراوە. ئەم بەشە لەگەڵ بەشی "بیرەوەرییەکان"ی ئەو دوو جیاوازی گەورەی هەیە: یەکەم لەبەشی " بیرەوەرییەکان" بەسەرهاتی یووسفی ئیفتیخاری لەدەورانی لاوییەوە دەستپێدەکات و قۆناغەکانی وەك فێرکار لە زانکۆی **کۆمۆنیستی کرێکاری رۆژهەڵات** (KUTTV) و شێوەی گەڕانەوەی ئەو بۆ ئێران لەخۆدەگرێت، کە لەبەشی "نوسینەکان"دا وەشێراوە. بیرەوەرییەکانی ئەو لە رۆژانی زیندان و هەروەها رەوتی چالاکییەکانی" سەندیکای کرێکاران و جوتیاران" لەدوای ساڵی ١٣٢٢ ( ١٩٤٣ ز) (کە بەهۆی پچڕانی وتارەکانی ئیفتیخاری لەدوای پوشپەڕی ١٣٣١ / ١٩٥٢ز) بەناتەواوی مایەوە، یەکێکی تر لە باسەکانە کە لە نووسینەکاندا لەبەرچاو نەگیراوە. بەواتایەکی دی " بیرەوەرییەکان" لەڕووی لایەنەکانی سەردەمانی چالاکیی سیاسی ئەو تەواوترن لەوەی لەنوسینەکاندا هەیە، بەڵام لەوڕووەوە کە رێکەوتی نووسینی ئەو وتارانە و کاتی تۆمارکردن و کۆکردنەوەی بیرەوەرییەکانی ئەو نزیك بە ٤٠ ساڵ نێوانیانە، هەروەك دەبینرێت یووسفی ئیفتیخاری زۆرێك لە وردەکارییەکانی لەبیر نەماوە، هەر ئەوەندە بیرەوەری بەجێماوە، ئەوانیش لەچاونەوەی ئەو سەردەمە گرنگی زۆر بە نەنوسین نەدراوە بە دانسقە و گرنگن.

بەشی بەڵگەنامەکان بە راپۆرتەکانی کاربەدەستە ئینگلیزەکانی کۆمپانیای نەوت، لەمەڕ مانگرتنی ١٣٠٨(١٩٣٩ز) (بەڵگەنامەکانی ١ هەتا ٥) دەستپێدەکات.[3] ئەگەرچی لەم بەڵگەنامانەدا لەرووی چۆنیەتی کاردانەوەی بەرپرسانی کۆمپانیای نەوت و کاربەدەستانی حکومەتی ئێران لەمەڕ ئەو رووداوە زانیاریی بەسود بەرچاودەکەوێت، بەڵام هەندێك لەهەڵسەنگاندنی ئەو بەرێزانە، بەراورد بەوەی یووسفی ئیفتخاری دەیگێڕێتەوە، زیادەڕۆیی زۆری تێدایە، بەتایبەت بەڵگەی ژمارە ٤ و پێداگریی کاربەدەستانی ئینگلیز لەسەر رۆڵی ئەکتیڤی دەوڵەتی سۆڤیەت لەم روداوەدا. ئەوەی کە دەوڵەتی سۆڤیەت تاچەند لەم رەوەندەدا ڕاستەوخۆ دەستی هەبووە یان ئیمکانی دەستوەردانی هەبووە، بابەتێکە ساغکردنەوەی پێویستی بە بەڵگەنامەی زۆرتر هەیە.

لەم چەند بەڵگەنامەیە بترازێ، بەڵگەنامەی دیکەی ئەم بەشە تایبەتە بەگۆڕانکاریەکانی دوای خەرمانانی ١٣٢٠ ( ١٩٤١ ز). بەشێك لەم بەڵگەنامانە لەمەڕ دەقی وتارەکانی خەلیل ئینقلابئازەر لەتەورێز (بەڵگەنامەکانی ٦ و ٧و ٨) سەروتاری ڕۆژنامەی گیتی (بەڵگەنامەی ٩)، وتارەکانی یووسفی ئیفتخاری (بەڵگەنامەکانی ١٠و ١٨) و بەیاننامەکانی سەندیکا (بەڵگەنامەی ١٥) و بەتایبەت دەقی دوو پەیڕەوی ناوخۆی

---

[3] - ئەم بەڵگەنامانە لەگەڵ بەڵگەنامە دەرەکیەکانی دیکە کەلەم بەشەدا ناویان براوە ، لە کۆمەڵێك بەڵگە و سەنەدی بەنرخ وەرگێراون و کراون بەفارسی، کە خەسرەوی شاکری لەژێر ئەو ناوەی خوارەوەدا کۆی کردوەتەوەو لەچاپیداون.

The comdition of The Worakin slass in Iran, cd .c. Chagueri( Florence ) 1978

پەکێتی کرێکاران و جوتیاران (بەڵگەنامەکانی ٤٢ و ٤٣) وەك نموونەی مەبەست و ڕێبازی ئەم بزووتنەوەیە جێگای بایەخە. ئەوەی کە لەم بەڵگەنامانەدا هاتووە، لە ڕوانگەی روونکردنەوەی پێگەی ڕاستەقینەی ئەم جووڵانەوەیە لەنێو کارکرد و ئاپۆرەی دەستە و کۆمەڵە سیاسییەکانی دیکەدا، زۆرگرنگترن لەچاو گێڕانەوەی بیرەوەری تاکەکەسی و ڕاپۆرتی سەرچاوەکانی دەستی دوو لەم بارەیەوە.

بەشێکی دیکە لەم بەڵگەنامانە وەك بەڵگەنامەکانی ١٤و ١٩و ٢٢و ٢٣و ٣١ پەیوەندیدارن بە گەلاڵەی مەسەلە پیشەییەکان لەگەڵ بەپرسانی دەوڵەتی و بەشێکی دیکەیشیان وەك بەڵگەکانی ١١ و ١٣ و ١٦و ٢١ و ٢٥ و ٢٩ و ٣٠ و ٣٣ و ٣٤ و ٣٥، نوسینگەلێکن لەچوارچێوەی لابردنی بڕیاری راگرتنی ڕۆژنامەی گیتی و سکاڵا لەهەڵسوکەوتی نایاسایی و دژایەتی گروپە نەیارەکان هاتوونە ئاراوە. لەم بەڵگانامانەدا ڕێگری کاربەدەستانی سۆڤیەت و گرووپەکانی سەر بەوان لەبەردەم چالاکیی ئازادانەی ڕێکخراوەکەی یووسفی ئیفتخاری دا بەئاشکرا بەرچاودەکەوێت. بەشێکی دیکە لەم بەڵگەنامانە کە دەتوانرێ پێی بوترێ گێڕانەوەی (سەرچاوەی دەستی دوو)، پێکهاتووە لە زنجیرە ڕاپۆرتێکی کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران (بەڵگەکانی ١٢ و ١٧ و ٢٠ و ٢٦ و ٢٧ و ٢٨) و ڕاپۆرتی کاربەدەستانی ئینگلیزی (بەڵگەکانی ٣٦ و ٣٧) و ڕاپۆرتی ڕێکخراوی لایەنگری روسەکان (بەڵگەی ٣٩) لەمەڕ چالاکییانە. جێگای سەرنجە کە هەریەك لەم سەرچاوانە سەرەڕای جیاوازیی دیدگا و بەرژەوەندییەکانیان، بەڵام هەرسێکیان لە بەدگومانی و رەشبینی بەرامبەر بەم بزووتنەوەیە هاوڕان.

ئێستا جێی خۆیەتی لەبارەی دوو قۆناغی دیاریکراوی ژیان و چالاکییەکانی یووسفی ئیفتخاری، واتە ڕۆژانی خوێندنی لەمۆسکۆ و مانگرتنی ۱۳۰۸ و گرتوخانە، وە سەردەمی **چالاکییە کرێکارییەکانی** ۱۳۲۰ ـ ۱۳۲۵ چەند شتێك وەبیر بێنینەوە.

بیرەوەرییەکانی یووسفی ئیفتخاری لەسەردەمی منداڵییەوە لەئەردەبیل دەست پێدەکات. ئەم سەردەمە کە هاوکاتە لەگەڵ داگیرکردنی نازربایجان لەلایەن هێزەکانی رووسیەی تیزاری و چالاکی سیاسی و شۆڕشگێڕانەی چەند برایەکی، کاریگەریی درێژ خایەن لەسەر یووسفی ئیفتخاری دادەنێت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەو لەسالانی پڕ کێشمەکێشی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و قۆناغەکانی دوای شۆڕشی ۱۹۱۷ی روسیە لە قەفقاز نیشتەجێ بووە، بەلام لەبیرەوەرییەکانیدا وێنایەکی دیارکراوی لەم گۆڕانکاریانە نیشان نەداوە. وادیارە زۆرتر خەریکی خوێندن و راهێنان بووە تا شوێنکەوتنی گۆڕان و وەرچەرخانە سیاسییەکانی سەردەم. لەڕاستیدا بەشی سەرەکی بیرەوەریەکانی ئەو لەو کاتەوە دەستپێدەکات کە بۆ درێژەدان بەخوێندن چوو بۆ مۆسکۆ و بۆ زانکۆی **کۆمۆنیستی کرێکارانی ڕۆژهەلات** (KUTTV). لەم بەشەدا وێڕای زانیاری لەبارەی شێوەی وانەبێژی و بابەتەکانی تایبەت بەو زانکۆیە، چەند نوسینێکی سەرنجڕاکێشیش هەیە لەهەمبەر گوزەرانی خوێندکارە ئێرانییەکانی ئیکە و جیاوازی بیروبۆچوونی دەستە کۆمۆنیستیە ئێرانییەکانی رووسیا.

یووسفی ئیفتخاری بەهۆی دژوەستانەوەی "**سیاسەتی پشتیوانی**

له رەزاخان" کە سەردەمێك سیاسەتی رژێمی سۆڤیەتی پێکدەهێنا، وەك پێشرەوێك رەوانەکرا بۆ تاجیکستان، بەڵام پاش ماوەیەك بەهۆی گۆڕانی بیرکردنەوەی ڕووسەکان لەبەرامبەر ڕژێمی نوێی ئێران، ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ و پاش ماوەیەك بۆ چالاکی گەڕایەوە بۆ ئێران. یووسفی ئیفتخاری لەساڵی ١٣٠٧ ( ١٩٢٨ ز) دەڕوات بۆ خوزستان کە لەو سەردەمەدا بەهۆی پیشەسازیی نەوتەوە بەگرنگترین ناوەندی پیشەسازیی وڵات هەژماردەکرا. لەکۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا پیشەسازیی نەوتی باشورو بەتایبەت دامەزراندنی ئەم پیشەسازییە لە ئابادان بەخێراییەکی بەرچاو رووی لە گەشەکردن کرد.[4] بەڵام ئاستی هەڵکشان و گەشەی ژیان و گوزەرانی کرێکاران چ لەڕووی هۆکارەکانی خۆشبژێوی و تەندروستی و چ لەڕووی ئاستی کرێ بەهیچ شێوەیەك هاوتای ئەو پێشکەوتن و گەشەکردنە نەبوو. لە ٩ی دیسەمبەری ١٩٢٠ واتە ١٧ ئازەری ١٣٠٠، نزیکەی ٢٠٠٠ کرێکاری هندی پاڵاوگەی ئابادان مانیانگرت و داوای زیادکردنی

---

[4] – ژمارە کارمەندو کرێکار کە ئێرانییەکانی دامەزراوە نەوتییەکانی ئابادان لەساڵەکانی ١٩١٩ / ١٢٩٨ و ١٩٢٢ / ١٣٠٢ و ١٩٢٧ / ١٣٠٦ کە لەم خشتەیەی ژێرەوەدا دیاریکراوە ، دەرخەری گەشەی خێرای پیشەسازیی نەوتە لەم قۆناغەدا .

| کۆ | ئەرمەنی | ئەورووپایی | هیندی | ئێرانی | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٣٧٩ | ٢٨ | ٣٦ | ٢٤٩٩ | ٨٠٦ | ١٩١٩ |
| ١٠٥٨٩ | ٣٧٩ | ٢٢٠ | ٢٦٥٤ | ٧٣٣٦ | ١٩٢٢ |
| ١٤٠٣٢ | ١٢٧٣ | ٥٢٧ | ٤٠٦٢ | ١٠١٧١ | ١٩٢٧ |

وەرگیراوە لە Ferier, r.w.,the Histarg of British petroleum compang ( Cambridge , 1982 ) vol . I , p . 659

فەریر مێژوونوسی فەرمی کۆمپانیای نەوت، کە بۆ تۆمارکردنی لێکۆڵینەوەکانی خۆی ئەرشیفی بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای لەبەردەستدابووە، مانگرتنی ١٣٠٨ی وەك "شۆڕشێکی بچووك" دەستکردی سۆڤیەتییەکان ناوی بردووەو ڕوونکردنەوەی زیاتری نەداوە.

هەقدەستەکانیان کرد. رۆژی دواتر کرێکارانی ئێرانی و عەرەب پالاوگەکەش بە پەیرەوی لەوان دەستیاندایە مانگرتن و داواکاری هاوشێوەیان خستەڕوو. لەگەڵ ئەوەی رەزامەندی لەسەر ئەو داواکارییانە درا، بەلام چەندین کێشەی دیکەی وەك شوێنی نیشتەجێبوون و مافی خانەنشینی و پێداویستیی تەندروستیی کرێکاران لەجێی خۆیان مابوونەوە و هیچ هەوڵێك بۆ چارەسەرکردنیان نەدرا. ماوەیەك دوای ئەوە لەمانگی ئاياری ١٩٢٢ / ئوردیبهشتی ١٣٠١ جارێکی دیکە کرێکارانی هیندی دەستیان لەکار کێشایەوەو خوازیاری رێژەی زێدەباری ١٠٠٪ی هەقدەستەکانیان بوون. ئەمجارەیان هیچ رێکەوتنێك نەکرا. هێزی سەربازی ئینگلیزەکان دەستبەکاربوون و زۆرێك لەرابەرانی مانگرتنەکەیان دەستگیرکرد. نزیکەی ٢٠٠٠ کرێکاری هیندیش لەسەر کار دەرکران و بەکۆمەڵ ناردیاننەوە بۆ هیندستان[5].

وەك ئەوەی لەبەشەکانی دواتری بیرەوەری و نوسینەکانی یووسفی ئیفتخاری دەبینرێت، کاتێك ئەوو هاورێکانی دەستیاندایە کاری رێکخستنی کرێکارانی خوزستان، باری ژیانی کرێکاران هەروا نالەبارو رەنگە خراپتریش بووبێت، یەکێك لەو خالانەی لەم باسەدا شایانی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی زیاترە، ئەو دانوستانانەن کە گوایە بۆ پێداچوونەوەی گرێبەستی دارسی لەنێوان دەوڵەتی ئێران و کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز و ئێران لەئارادابووەو هەم لەبەشی

5- Elwell – su tton , l.p., Persian oil : Astudg in power politics ( Lond on 1955 ) , pp. 168 – 169 , Ferrier.,p . 439

بیرەوەری و هەم لەبەشی نوسینەکاندا "درێژکردنەوەی گرێبەست" و دژایەتی ڕێکخراوی کرێکاری لەگەڵ ئەو گرێبەستە، وەك یەکێك لەهۆکارەکانی مانگرتن قسەی لەسەرکراوە. گومان لەوە نییە کە هۆی سەرەکی مانگرتنی ١٣٠٨، (١٩٢٩ ز) نارەزایەتی بووە دژی شێوەی نالەباری کارو ژیان لە پیشەسازیی نەوتی خوزستان. لەم نێوەشدا " هۆکاری سیاسی" پێشهاتەکە وا خۆی دەردەخات کە ڕۆڵی بەشێك لەئەندامانی ڕێکخراوی کرێکاری کۆمینترێن و هاوکاتبوونی مانگرتنەکە بێت لەگەڵ ڕۆژی یەکی ئایار. بەڵام پێوەندیی ئەم بابەتە بە دیالۆگی نێوان دەوڵەتی ئێران و کاربەدەستانی کۆمپانیای نەوتەوە پێویستیی بەهەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی زیاترە.

بەشێکی دیکەی بیرەوەرییەکان، تایبەتە بە ساڵەکانی زیندان، کە بەشی زۆری لە بەندیخانەی کۆشکی تاران بووەو لەبەرئەوەی یووسف لەیەکەمین "میوانانی" ئەم ڕێکخراوە بووە بیرەوەرییەکانی ئەو ڕوداوو کەسایەتییانە لەخۆدەگرێت کە لە بیرەوەری دیکەی گرتوخانەکانی سەردەمی ڕەزاشادا، لەبەرچاونەگیراون.

دوای ڕووداوەکەی خەرمانانی ١٣٢٠ ( ١٩٤١ ز) تەواوی بەندکراوەکان و دوورخراوە سیاسییەکانی ئێران ئازادکران و یووسفی ئیفتخاریش کە لە گرتوخانەی بەندەرعەباس بوو، ماوەیەك دوای ئازادبوونی خۆی گەیاندە تاران. لەو کاتەدا حیزبی توودە یەکەمین کۆبونەوەکانی لەهەمبەر ڕاگەیاندنی خۆی بەڕێوەدەبرد. ڕەزا ڕوستا لەلایەن حیزبەوە ڕاسپێردرا تا ئیفتخاری بانگهێشت بکات بۆ ئەندامبون لە کۆمیتەی ناوەندیی حزب، یووسف لەلایەکەوە

بارودۆخەکەی بەگونجاو نەدەزانی بۆ پێکهێنانی حیزبی سیاسی لەئێراندا و لەلایەکی دیکەشەوە دامەزرێنەرانی حیزبی توودەی بە شیاو نەدەزانی بۆ ئەو کارە. لە ڕوانگەی ئەوەوە سلێمان میرزا ئەسکەندەری بەهیچ شێوەیەك لێهاتوو نەبوو بۆ ڕێبەرایەتیی حیزبی چینی کرێکار چونکە نە توانا و دەرکی ئەوکارەی هەبوو و نە رابردوویەکی پرشنگداریشی لەبزووتنەوەکەدا هەبوو، کەسانێکی وەك **ئارداشس ئاوانسیان، عەدولسەمەد میرزا کام بەخش و رەزا روستایش** بەهۆی وابەستەیی توندیان بەدامودەزگا ئەمنیەکانی سۆڤیەتەوە نەیاندەتوانی نوێنەری راستەقینەی خەڵکی ئێران بن. لەبەرئەوە ناکۆکی نێوان ئیفتخاری و دامەزرێنەرانی حیزبی توودە لەدەرەوەی بەندیخانەش بەردەوام بوو. یووسف بڕوای وابوو کە حیزبی ئێرانی نابێت بەفەرمانی هێزەکانی سۆڤیەت دابمەزرێت و لەبەرئەوەش بوو کە لەدەستپێکی ساڵی ١٣٢١ ( ١٩٤٢ ز) دەستیدایە دامەزراندنی "یەکێتی کرێکاران و جوتیارانی ئێران". بێجگە لەخۆی کەسانێکی دیکە کە لەنێو یەکێتیەکەدا هاریکاریی زۆریان هەبوو بریتین لە: **رەحیم هیمداد، خەلیل ئینقلاب، عیزەتوڵاعەتیقەچی، ئیبراهیم عەلیزادە، نادر ئەنساری، نادر کەلهوڕی و مەحمود نەوایی.**

سەندیکا سەرەتای هاوینی ١٣٢٢( ١٩٤٣ز ) ڕۆژنامەی گیتی دەرکرد کە ئورگانی فەرمی ڕێکخراوەکە بوو یووسف بەناوی خەلیل ئینقلاب خاوەن ئیمتیازەکەی وەرگرتبو.[6]

---

[6] - نوسرەتوڵلا جەهانشاهلوئەفشار، ئێمەو بێگانەکان ، بەشی یەکەم ( چاپی دەرەوەی وڵات )، ١٩٨٢ . لاپەرەکانی ١٦٦ – ١٦٧ . یەکەمین ژمارەی گیتی . لە ٢/٤/ ١٣٢٢

سەر وتارەکانی ڕۆژنامەی گیتیش سەرنجڕاکێش بوون. گیروگرفتە سیاسی و کرێکاریەکانی دەخستەڕوو و جگە لە یووسف و ڕێبەرانی دیکەی سەندیکا، هەندێك لەسەر وتارەکان نوسرەتولاجەهانشاهلو، عەلی نەقی حەکەمی و فەرەیدون مێنو دەیاننوسی[7].

سەردێری بەشێك لەسەروتارە گرنگەکانی گیتی بریتیبوون لە: ژمارە ١ ـ ڕۆژنامەی گیتی، ٢ ـ خەبات دەکەین، ٣ـ ئاخۆ هەڵبژاردن سەربەخۆ دەبێت؟، ٤ ـ چاوسوورکردنەوە لە چاپەمەنییەکان، ٥ ـ ئێمە چیمان دەوێت؟ ٦ ـ سەندیکای کرێکاران، ٨ ـ خەڵك دامەپلۆسێنن ٩ ـ هەڵبژاردنی خولی چواردەیەم، ١٠ ـ دەوڵەت و جوتیار.

لە ڕۆژنامەی گیتیدا زنجیرە وتارێکی ئیبراهیمی عەلیزادە لەژێر ناوی "باستیلی ئێران" و هەروەها چەندبەش لەکتێبی (دایك)ی ماکسیم گورکی لە وەرگێڕانی مەحمود ئەوایی و چەند وتارێکی موحیب عەلی بەناونیشانی "دووساڵ شەڕ لەیەکێتی سۆڤیەت"دا بڵاوکراونەتەوە. دواین ژمارەی گیتی کە بەرچاوکەوتبێ لە ١٣٢٢/١٠/٢٧ دا بڵاوکراوەتەوەو لەبڵاوبونەوەی ژمارەکانی دواتردا هیچ زانیارییەك لەبەردەستدانیە.

هەرچەندە سەندیکاکەی یووسفی ئیفتخاری یەکەمین ڕێکخراوی

---

پوشپەڕی ١٩٤٣ بلأوکرایەوە . خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەرەکەی خەلیل ئینقلاب بور لەتەنیشت لۆگۆی ڕۆژنامەکە نوسرابوو (( کرێکارانی ئێران یەککگرن ـ داهاتوو بۆ ئەو کەسانەیە کە لە هەموو شتێك زیاتر کار بۆ ڕەنجدەران دەکەن. ))

[7] ـ جەهانشاهلو، پێشتر ، بەرگی ١ لاپەڕە ١٦٦.

کرێکاری بوو کەلەدوای خەرمانانی ١٣٢٠ ( ١٩٤١ ز) لەتاران دامەزرا، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات و بە برشت و پشتیوانیی سۆڤیەت و هەروەها لەئاکامی هەڵبژاردنی خولی چواردەیەمی پەرلەمان و بەچوونی چەند کەس لەئەندامانی حیزبی توودە بۆ نێو ڕێکخراوی ناوبراو، سەندیکای کرێکارانی ئەو حیزبە توانی زۆربەی هاوڕێیانی ئیفتخاری بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. گرفتی گەورەی حیزبی توودە لەم ڕێگایەدا ڕاکێشانی یووسفی ئیفتخاری و ڕەحیم هیمداد بوو کە لەو کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو.

وەك دیارە لەهەمان قۆناغی سەرەتای کاردا لەنێوان خەلیل ئینقلابئازەر و ئەندامانی دیکەی سەندیکا هەندێك ناکۆکی دەرکەوت. خەلیل ئینقلاب هەر لەوکاتەدا کە کەسایەتیەکی شێلگیر دەردەکەوت ورەیەکی ناهاوسەنگیشی هەبوو. سەرەتا لەمەڕ هاوکاریی ئەو لەگەڵ حیزبی توودە لەرەزبەری ١٣٢٢ (١٩٤٣ ز) ڕاپۆرتێك دەبینین[8] پاش ماوەیەکیش لەسەر بڵاوبونەوەی بابەتێك لەڕۆژنامەی "ڕەعدی ئیمروز" کە پشتیوانیی خەلیل ئێنقلابی "سەرۆك"ی سەندیکای کرێکارانی لە سەید زیانەدین تەباتەبایی دەردەخست،[9] یووسف ئیفتخاری ناچاربوو بەناوی سەندیکای کرێکارانی ئێرانەوە، ڕوونکردنەوە بدات کە "کەسی یەکەمی" سەندیکاکە خۆیەتی نەك خەلیل ئینقلاب. سەرەڕای ئەوە لەبارەی "چاکەی حکومەتی سەید

---

[8] – بەڵگەی ژمارە ١٢ .

[9] – وادیارە ئەم نوسراوەیە لەژمارەی پێنکەوتی ٨ی خەزەڵوەری ١٣٢٢ ( ١٩٤٣ ) ی ڕەعدی ئیمروز بڵاوکراوەتەوە .

زیانەدین" یش رایگەیاند "سەندیکای کرێکاران کە لەسەر بنەمای خەباتی ئابوری دامەزراوە و پێکهاتووە، سەرباری ئەوەی خۆی دەپارێزێت لەدەستێوەردانی کاروباری سیاسیی تایبەت، بەرامبەر هەر حکومەتێکیش رەشبین دەبێت کە بۆ پتەوکردنی بنەماکانی چەوساندنەوە و گوشارخستنەسەر چینی کرێکار دابمەزرێت، جا ئەو حکومەتە لەژێر چاودێری سەید زیانەدیندا بێت یان لەژێر چاودێری قەوام ئەلسەلتەنە یان هەرکەسێکی دیکە".[10] لە وەها دۆخێکداپاش ماوەیەك کۆمەڵێك لەهاوکارەکانی ئیفتخاری ـــ لەوانە خەلیل ئینقلابئازەر ـ لە سەندیکای کرێکاران جیابوونەوەو لەگەڵ گروپی کرێکارانی حیزبی توودە، ئەنجومەنی یەکگرتوی کرێکاران و زەحمەتکێشانیان دامەزراند.

لە تاقمەکەی ئیفتخاری ئیبراهیم عەلیزادە، خەلیل ئینقلاب، عێزەتولاعەتیقەچی، کەریم مومتەحین، نادم ئەنساری، حەبیب جەلیل و ئەسەدوڵلا قودرەتی لەم هاوپەیمانیەدا بەشداربوون[11]. ئاشکرا و ڕوون بوو لەو رۆژگارەدا حیزبی توودە توانای قبولکردنی سەندیکایەکی کرێکاریی ڕاستەقینەی لە بەرامبەر خۆی نەبوو، بەتایبەتیش ئەوەی کە سەندیکاکەی ئیفتخاری ماکێکی کرێکاریتر و سەربەخۆتری لە رێکخراوی حیزبی توودە هەبوو. هەربۆیە لەبەر بێهیوایی لە هاوکاریی یووسفی و هاوڕێیانی و هەروەها لەژێر گوشاری ڕاستەوخۆی روسەکان بۆ یەکگرتنەوەو روونبوونەوەی چارەنووسی

---

[10] – ئەوبەهار ، ژمارەی ۷۸ ، ڕێکەوتی ۱۲ ی خەزەڵوەری ۱۳۲۲ ( ۱۹٤۳) .

[11] – بەڵگەی ژمارە ۲٤ .

سەندیکا کرێکارییە چەپەکان، بەشێوەی فەرمی و بەئاشکرا هەوڵدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی سەندیکای کرێکاران دەستپێکرد.

لەسەرەتای پاییزی ساڵی ١٣٢٣ ( ١٩٤٤ز ) یەکێتی کرێکاران لە تەورێز بەئاشکرا لەلایەن پیاوانی حیزبی توودە و بەڕێبەرایەتیی موحەممەد بێ ڕیا (سەرۆکی رێکخراوی کرێکاری حیزبی توودە لە تەورێز) داگیرو تالآنکرا[12].

ئەمجۆرە کارانە تەنیا لەوحاڵەتەی سەرەوەدا نەمانەوەو پێبەپێ ژمارەو بەتوندی ئەم کارانە زیادی دەکرد تا گەیشت بەو جێگەیەی لە ٢٠ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ ( ١٩٤٥ز ) ، یووسف ئیفتخاری بەرۆژی ڕوناك لەلایەن بەکرێگیراوانی حیزبی توودەوە لەتاران فرێندراو برا بۆ گرتوخانەی تایبەتی رەزا روستا.جێگای سەرنجە کەئەم گرتوخانەیە چەندقات لەگرتوخانەکانی رژێمی ڕەزاشا خراپتر بوو و چکۆلەترین توانای ژیانی بۆ گیراوان تێدا فەراهەم نەبوو. یووسف لەدوای ئەرمرایەنیی بەشێك لە ئەندامانی حیزب و کاربەدەستانی دەوڵەتی و لەژێر کاریگەریی دزەکردنی ئەم هەواڵە بۆ نێو ڕۆژنامەکان دوای چەند ڕۆژێك ئازاد کرا.

لەسەرەتای ڕەزبەری ١٣٢٤ ( ١٩٤٥ز ) یووسف ئیفتخاری وەك نوێنەری کرێکاران بانگهێشت کرا بۆ کۆنفرانسی کار لەپاریس. لەلایەن حیزبی توودەشەوە ئیرەج ئەسکەندەری ڕۆیشت بۆ فەرەنسا. ئەو لیژنەیەی کە ئیفتخاری لەگەڵیان ڕۆیشت بۆ پاریس، درەنگتر لە وادەی خۆی گەیشتنە کۆبوونەوەکانی کۆنفرانس، هەربەو هۆیەشەوە

[12] – بەڵگەکانی ژمارە ٢٩ و ٣٠ .

سەندیکای کرێکارانی حیزبی توودە لەوێ وەك نوێنەری ئێران ناسێندرا.[13]

تۆمەتی ترۆتسکیزم کە سەردەمی زیندان درابووە پاڵ یووسف و دوای ١٣٢٠(١٩٤١ز)یش درێژەی کێشا. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم هەنجەتە کاریگەرنەبوو تۆمەتی نوێی "سیخوڕی شارەوانی" یان دایە پاڵ، ئەم تۆمەتەش وەکو ترۆتسکی بوونەکەی زۆرتر لەلایەن ئارداشس ئاوانسیان و ڕەزا روستا هاتەئاراوە. بە وتەی جهانشاهلو "ڕەزا روستا کە بەردەستی فەرمیی باڵوێزخانەی سۆڤیەت بوو، لەبەرئەوەی پیاوێکی نەزانیش بوو سیخوڕ و بەکرێگیراوە جۆراوجۆرەکانی کۆمپانیای نەوت وەك ئەسکەندەری سەرابی و جاهد و کەسانی لەمجۆرەی نەدەناسی کە هەمیشە لەبەرچاوی بوون، بەڵام ناتۆرەی بەدناوی بۆ یووسفی ئیفتخارییەوە هەڵدەست، کە بەتواناترین پێشڕەوانی کرێکارانی ئێران بوو".[14]

قۆناغی دواتری چالاکییە کرێکارییەکانی یووسفی ئیفتخاری، لەکۆتایی قەیرانی ئازەربایجان و داڕمانی دەستەلاتی حیزبی توودە بوو. ئەو لەم قۆناغەدا هەوڵدەدات کەیەکێتیەکی نوێ لە خوزستان پێکبهێنێت بەڵام ئەم هەوڵەشی کەوتەبەر دژایەتی تاقمە توودەییەکان کە لە قۆناغەکانی دواییدا کاربەدەستانی دەوڵەت هیچ دەسەڵاتیان بەسەر بارەکە دا نەدەشکا و یووسفی ئیفتخاری لەدوای بیست ساڵ، وردە وردە لەمەیدانی چالاکی پیشەیی و سیاسی دوورکەوتەوە.

---

[13] – ئیرەج ئیسکەندەری ، پێشووتر . لاپەڕەکانی ٣٠٨ – ٣٠٧ و ٤٠١ – ٤٠٢ .
[14] – جەهانشاهلو ، پێشووتر ، لاپەڕەی ، ١٦٨ .

لەکۆتاییدا بەئەرکی خۆمانی دەزانین سوپاسگۆ بین لەپێشدا بۆ دڵسۆزییەکانی بەڕێز یووسفی ئیفتخاری و دواتر بۆ ڕێنوێنییەکانی بەڕێز دکتۆر مەهیار خەلیلی و هەروەها بۆ یارمەتی بەڕێز رەحیم زەهتاب فەرد کە ڕۆژانی تێکۆشانی ئازەربایجانی خستە بەردەستمان.

کاوە بەیات ـ مەجید تەفرەشی

جۆزەردانی ۱۳۷۰ ( ۱۹۹۱ ز)

# پاری یەکەم
# بیرەوەرییەکان

## بەشی یەکەم
## لەدایکبوونەوە تا دیلی

### سەردەمانی منداڵی لە ئەردەبیل

من لەئەردەبیل ساڵی ١٢٨١ی هەتاوی( ١٩٠٢ ز ) کاتێک لەدایکبووم بەشێك لە ئێران لەژێر دەستی رووسە تزارییەکاندا بوو و ئێستا تەمەنم ٨٨ ساڵە، تەمەنم یەك ساڵ بوو باوکم مرد. ئێمە حەوت برا بووین و من چکۆلەکەیان بووم. براگەورەکەم ناوی عزیز ئیفتخاری بوو کە لە سەردەمی پاشایەتیی رەزاشادا لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکەدا دوور خرانەوە بۆ رووسیە. لە رووسیە کە ستالین بەشێك ئێرانییەکانی کوشت، ئەویشی نارد بۆ گرتوخانەی تاشکەند لە ئۆزبەکستان و لەوێ مرد. عەزیز یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی حیزبی سۆسیالست لەئەردەبیل و ئێمەش لەژێر ڕێنمایی ئەودا بوین. براکانی دیکەم عەزیم، ڕەحیم، کەریم، غەفورو عیبادوڵای ئیفتخاری بوون. ئەوان لەگەڵ رووسیا هاتوچۆ و بازرگانیان هەبوو، لەناو براکانم جگە

لــە عزیــز، ڕەحیمــیش شۆڕشــگێڕبوو کــە ئــەویش بــۆ ڕووســیا دوورخرابــووەوەو بـۆ مـاوەی حـەوت سـاڵ لەگرتوخانـەکانی سـیبیریادا بـوو، کاتێـك ئـازادکرا، ڕووسـەکان دەیانویـست ئـەو لـەوێ بهێڵنـەوە. وتبوویـان بەرامبـەر تـۆ هەڵـەکراوە و بێهـۆ زینـدانکراوی. بـەلاّم ئـەو پێیــانی وت چــیتر لێــرە نامێنمــەوەو گەڕایــەوە بــۆ ئێــران. ئەمــە بـارودۆخی براکـانم بـوو، بـەهۆی ئـەوەی کـە لـە ڕووسـیا بازرگانیـان هەبوو، منـیش زۆرجـار هاتوچـۆی ئـەوێم ئـەکرد. بازرگـانیی براکـانم زۆرتـر لە ئازەربایجان، تورکستان وشوێنی دیکە بـوو. بـۆ ڕۆیـشتن بـۆ ڕووسیا پەساپۆرت پێویست نەبوو بەبێ کێشە لەسنور دەپەڕینەوە.

براکانم زۆرتر قاپوقاچاغ و کەلوپەلی کانزاییان بۆ ئێران هاوردە دەکرد. لەئێرانیشەوە برنـج و ئەوجۆرە شتانەیان دەبرد.

لــە ئــەردەبیل حیزبێکــی سۆسیالــست و حزبێکــی دیمــوکرات چــالاکییان دەکــرد. حیزبــی سۆسیالــست تاڕادەیــەك ســەربەخۆو پێوەندیدار بوو بەئێرانەوە بەلاّم لەگەڵ "اجتماعیون ـ گشتیون" و قەفقاز پێوەندیی هەبوو. پێوەندییـەك نـا کـە فـەرمانیان لێـوەربگرن. لەو زەمەنەدا فەرمانێك لەئارادا نـەبوو. جاروبـارە کەسـانێك لـەباکۆوە دەهاتن. من لەبیرمە دوو کەس لەقـەفقازەوە بـەناوی ئەکبـەر و غـەفار هاتن. دەیانوت دەمانـەوێ میـزا عـەلی ئەکبـەری موجتەهیـد بکوژین. میـزا عـەلی ئەکبـەری تێکۆشـەرێکی دەستڕۆشـتوو و نـەترس بـوو، بـرا گەورەکـەم عـەزیز نەیهێـشت و پێیـوتن ئێمـە دەمانـەوێت بـە وتـەو بەتیۆری کارەکانمان بکەین نەك بەتیرۆر، پەیوەندییان لەگـەڵ قـەفقاز هەرئەوەندەبوو. لەگەڵ دیمۆکراتەکانیش پەیوەندییان هەبوو.

لە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کە حاکمی ئەردەبیل سارمولسەلتەنە خەڵکی نەمەین بوو، من و براکانمیان لەبەر چالاکیی سۆسیالستی دەستگیرکرد و لە نارینقەڵا دەستبەسەریانکردین. چواردەوری قەڵاکە چاڵاوی گەورە بوو هاتوچۆ بەسەر پرددا دەکرا. گرتوخانەکە پانزە شانزە مەتر لەژێر زەوی بوو. بەشەکەی ئێمەش هەرلەوێ بوو شوێنێکی زۆر ناخۆش و تاریک و شێدار بوو، بیست و یەك کەسی تێدابوون. پێی هەموان زنجیر کرابوو و هەمووانیش بەیەك زنجیر بەسترابوونەوە، تەنانەت بۆچوونە ئاودەستی هەریەکێکیان دەبوو هەموو پێکەوە هەستن و بڕۆن. لەبەرئەوەی من تەمەنم کەمبوو کەلەپچە و کۆتیان نەکردبووم، ئەوانیش پێیان خۆش بوو چونکە یارمەتیم دەدان. دوای ئەوەی پاش حەوتویەك منیان ئازادکرد، دۆخەکەیان لێشێوا، هەرنەبێ من هاوکارێك بووم بۆیان. لەوێ ئێمەی پێنج برا گیرابووین. زۆربەی گیراوەکان بێتاوان بوون. دوو لەبراکانم هەستی شۆڕشگێرانە و رێکخراوەیان هەبوو سۆسیالیست بوون. بەڵام ئەودوانەکەی تر وانەبوون. یەکێك لەوان بەردەوام لە مزگەوت نوێژی دەکرد و کاتێك لێیاندەپرسی بۆ لە مزگەوت؟ دەیوت خێری زۆرترە.

میری شار خەڵکی نەمەین بوو نەمەینیەکانیش رێزێکی تایبەتیان لە باوکم دەگرت و زۆرجار کە لە نەمەینەوە دەهاتن، دەهاتنە دارایی ئێمە. کاتێك لە زیندان ئازادکرام، دایکم منی نارد بۆ لای میر کە بۆ ئازادکردنی براکانم کارێك بکات. رۆیشتم بۆ دادگا، بینیم لەگەڵ کۆمەڵێك سەرۆك خێڵ دانیشتوون و قوماردەکەن و

هەموویان مەی دەخۆنەوە و سەرخۆشن، میر منی دەناسی. پیاوێکی قەڵەو بوو کە زۆربەی کات بەئەسپ بە ناوشاردا هاتوچوی دەکرد و لەسەر ئەسپەکەیەوە سەلامی لە من دەکرد. دایکم هەواڵی دابوو کەتەواوی کوڕەکانم لە زیندانـدان. میر بەردەستەکەی بانگکرد. بەرێکەوت ئەویش ئەمەنی بوو ئێمەی دەناسی. میر پێیوت: ئێستا برۆ یەکێك لە براگانی ئازادبکە تا بۆ ئەوانی دی هەوڵدەدەین. هاتین و بەردەست وتی: وانابێت. وتم ئەی چۆن ئەبێت؟ وتی ئەم کارە خەرجی دەوێت. وتم. نا ئەوە میر فەرمانی کردووە. وتی نا بەوجۆرە نیە، گەڕاینەوە لای میر و وتم ئەم پیاوە پارەی دەوێ. بەردەستەکەی بانگکردو وتی برۆ. دواتر هاتین و بەردەست دیسان وتی میر گاڵتەی کرد، دەبێت پارەیەك بدەیت. دیسان گەڕاینەوە بۆلای میر و وتم ئەمە چی دەڵێت. ئەوی بانگکردو جنێوێکی پێداو دواجار ڕۆیشت یەکێك لەبراکانمی ئازادکرد.

دەزگای ئاسایش بەرامبەر ماڵمان بوو، گیراوەکانیان زۆر ئازار دەدا. من زۆربەی کات لە دارایی خۆمانەوە چەلاوم دەبرد بۆ گیراوەکان و یارمەتیم دەدان. چ سیاسی بوونایە یان نا. گیراوێك هەبوو بەناوی مەولازادە، ڕۆژێك چەلاوم بۆ برد، وتی کۆتەدارێکمان بۆ بێنە لەخواردن باشترە بابیخەینە ژێر زنجیرەکەوە. دواتریش گوریسم بۆ بردو هەڵهات، دواتر لە باکۆ بینیمەوە.

ماوەیەك پێش ئەم ڕووداوانە کاتێك هێشتا هێزەکانی سۆڤیەت لەئەردەبیل بوون، ڕەحیمی برام هەوڵیدا ژەنراڵ فدوروۆفی سەرکردەیان بکوژێت. گەڕەکێك هەبوو بەناوی قاجاریە کە

سەربازگەی ڕووسیەکان لەوێ بوو. شەو ڕەحیم ڕۆیشت بۆ بەردەرگاکەیان و دای لەدەرگا تا دەرگاکە بکاتەوەو بیکوژێت. پاسەوانەکەی فێدروف کە ناوی سلێمان و لە تاتارەکانی رووسیا بوو شیشەکی بەرکەوت بەڵام نەمرد. ئاژیریان لێداو بوو بەئاژاوە بەڵام ڕەحیم توانی دەربچێت. نەیانزانی کاری کێ بووە. کەسیشیان نەگرت. گومانیان لە ڕەحیم هەبوو بەڵام بەڵگەیەکیان نەبوو. جاروبار چەند ڕۆژێک دەستبەسەریان دەکرد. بەڵام لە بنەڕەتدا رووسەکان زۆر گوێیان بەوکارانە نەدەدا. ئەوان زیاتر سەروکاریان لەگەڵ عەشیرەتەکان بوو. لەبەرئەوەی ئەوان هەم چەکوچۆڵیان پێبوو هەم زۆریش بوون.

### قەفقاز

وابزانم لەکاتی شۆڕشی ١٩١٧ بوو کە ڕۆیشتم بۆ قەفقاز، هەڵبەت لە سۆڤیەت شۆڕش کرابوو بەڵام لە قەفقاز هێشتا دەنگوباسێک نەبوو. لەباکۆ چووم بۆ قوتابخانەی "یەکێتی ئێرانیەکان" و دواتریش چووم بۆ قوتابخانەیەک بەناوی "فیرقە" کە ئێرانی نەبوو. لەرووداوەکانی ئەو کاتەی قەفقاز تەنیا شەڕی تورک و ئەرمەنیم لەبیرە. هەندێک لە ئێرانیەکانیش کوژران. ئازەربایجانیەکان زیاتر بژیویان لەقەفقاز وەدەست دەهێنا. لەبەرئەوەی لەئێراندا کار نەبوو زۆرتر بۆ ئەوێ دەهاتن. پارەیەک کە لەوێ دەیانبردەوە لە ئێران سودی زۆری هەبوو بۆیان. مەرو ماڵاتیان پێدەکڕی یان شتومەکیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا و لەئێران دەیانفرۆشت. تەنانەت لەلادێکانی ئازەربایجان سەماوەری

گەورەی وەرشۆیی (فلزی) هەبوو کە بۆ ڕیزگرتن لە میوان چایان تێدالێدەنا.

من لە قەفقاز چالاکیی سیاسیم نەبوو. زۆرتر خەریکی خوێندن بووم. قوتابخانەی "فیرقە" دواناوەندی بوو بەزمانی تورکی وانەیان تێدا دەوتەوەو زمانی ڕووسیشی تێدا دەخوێندرا. لە باکۆ لە ئێرانییەکان تەنیا دکتۆر سەلامولا جاویدم دەناسی و زۆرجار دەچووم بۆ ماڵەکەی. ئەویش وانەی پزیشکیی دەخوێند و نێوانجی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و نێونەتەوەیی(ئەنترناسیونال) ی سێهەمیش بوو.

لەدوای شکستی ڕاپەڕینی گیلان براکانی ئاقایۆف کە لەو شۆڕشەدا بەشداربوون و کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بوون، لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئێرانیی دی هاتن بۆ باکۆ. لەو ئێرانیانە ئێحسانوڵلاخان لەهەموویان ناسراوتر بوو. دۆخی ئێرانییەکان باش نەبوو. لەگەڵ ئەوکەسانەش کە دوای شکست لە گیلانەوە هاتبوون، لە ڕووسیەش باش هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نەدەکردن. هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوان پەیوەندیی بە دیپلۆماسییەوە هەبوو. ئەگەر ڕووسەکان بیانویستایە لەگەڵ ئێران ڕێککەوتن بکەن و لێك نزیك ببنەوە، یانەکەی ئەوانیان دادەخست و بلاوەیان پێدەکردن و بێدەنگیان دەکردن. دواتر ئەگەر لەڕێککەوتنەکانیان سەرکەوتوو نەبوونایە دەستبەجێ یانەکانیان بۆ دەکردنەوەو دەیانوت ڕێگەی هیندستان لە ئێرانەوە تێپەڕدەبێت و ئەمجۆرە قسانە.

لەبیرمە کە ئیحسانوڵلاخان کوڕەکەی نارد بۆ خوێندن بۆ زانکۆی "KUTTV" لەمۆسکۆ کە ئێمەش لەوێ بووین. منیش هەوڵم دا

وەربگرن، بەلام کورەکەی ئیحسانوللاخان ئەقڵ و ئاوەزێکی باشی نەبوو بۆیە سەرکەوتوو نەبوو.

## مۆسکۆ و زانکۆی "KUTTV"

لە ساڵی ۱۹۲۳ چوومە زانکۆی KUTTV [1] لە مۆسکۆ. مەسەلەی چوونم بۆ ئەو زانکۆیە بەو شێوەیە بوو کە لەدوای چوونم بۆ مۆسکۆ ڕۆیشتم بۆ لای سوڵتانزادە. سوڵتانزادە سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و هاوڕێی رەحیمی برام بوو. لەدیتنی من خۆشحاڵ بوو. وادیاربوو لەگەڵ براکەم زۆر نێوانیان خۆش بوو. سوڵتانزادە منی بە زانکۆ ناساند. جگە لە لیژنەی زانستی و زانیاریی زانکۆ. لیژنەیەکی باڵایش هەبوو کە کاری لێکۆڵینەوە بوو لە کەسەکان، بزانن چ کارەن و بۆچی دێن بۆ ئەو زانکۆیە. لەبەرئەوەی بیانییەکان پارەیەکی زۆریان خەرجدەکرد تاکو سیخوڕ بنێرن بۆ ئەوێ و ماوەیەکیش سەرکەوتوو بوون و زۆر کاریان کردبوو لەڕێگای چینی و هیندوچینیەکان و

---

[1] – زانکۆی کۆمۆنیستی کرێکارانی ڕۆژهەلات (KUTTV)
Kammunistitcheski universitet Troujenika vostoka
ئەم دامەزراوەیە لە ئەپریلی ۱۹۲۱ بەفەرمانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی رووسیا بۆ فێرکاری کرێکارانی کۆمارەکانی ڕۆژهەلاتی سۆڤیەت دامەزرا. سەرەتا لەژێر چاودێری کۆمیساریای پەروەردەدا بوو بەلام لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا کەوتە ژێر چاودێری کۆمیساریای کاروباری نەتەوەکان. لەم دامەزراوەیەدا بەشگەلێك وەك کاروباری حیزبی و سیاسی، چالاکییە کرێکاری و سەندیکاییەکان، ئابوری و کارگێڕی و یاسا لەژێر دەستی کەسانێکی وەك لوناچارسکی، کراسین و پوکروسکی دەوترایەوە. بریدوکە یەکێك بوو لەپیاوەکانی ستالین و لە کۆمیساریای کاروباری نەتەوەکان کاری دەکرد بۆ ماوەیەك بەرپرسی زانکۆی KUTTV بوو. لەدوای ئەویش شۆمیانسکی بوو بە بەرپرسی ئەوێ. لە ساڵی ۱۹۲۳ دا خولی فێرکاری ئەوێ بوو بەسێ ساڵ. ئەرکی سەرەکی ئەم دامەزراوەیە بارهێنانی کادری پیشەیی کۆمۆنیست بوو بۆ چالاکی لە ولاتانی رۆژهەلات. (و)

کەسانی دیکەیانەوە کە ناردبوویانن بۆ زانکۆ. بەوهۆیەوە لیژنەی ناوبراو زۆر ورد دەبونەوە. منیان نارد بۆ لای کەسێك بەناوی کیتاکارۆفسکی کە وتاریشی لەبارەی ئێرانەوە لەژێر ناوی "ایران دوست"ی دەنووسی و لە جولەکەکانی رووسیا بوو، بەرپرسی لقی رۆژهەڵاتی نێونەتەوەیی سێهەم بوو. چوومە لای، پێیوتم بەیانی وەرەوە. لەژوورەکەی هاتمە دەرەوە بینیم نیکبین چاوەڕێیە بانگی بکەن و بچێتە ژورەوە. نیکبین منی بینی و ڕاچڵەکی. لەگەڵ ئەوەی زۆر ئاشنای یەکتر نەبووین بەڵام منی لە باکۆ دەناسی. وایدەزانی من لەگەڵ ئاقایۆفەکان کە سەردەمانێك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوون پەیوەندیم هەیە و لەوانەشە لەلایەن ئەوانەوە ناسێندرابێتم. نیکبین لەگەڵ ئەوان نێوانی خۆش نەبوو. گوایە لە ڕابردوودا لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستدا ڕکەبەری یەکدی بوون. ئاقایۆفەکان پێشینەیان لە نیکبین زۆرتر بوو. لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش کاریان کردبوو، بەڵام لەمکاتەدا لەگەڵیان نەمابوون، لە باکۆ بوون و شتی گرنگیان بەدەست بوو. نیکبین وایزانیبوو مادام ئەوانیش و منیش خەڵکی نەردەبیلین، پێوەندییەك لەنێوانماندا هەیە. لەکاتیکدا وانەبوو. بەکورتی نیکبین دەچێتە لای کیتاکارۆفسکی و پێیدەڵێت ئەم پیاوە لەلایەن ئاقایۆفەکانەوە هاتووە تا دووبەرەکی بنێتەوە. بۆ بەیانی چووم بۆلای کیتاکارۆفسکی، دیتم میهرەبانیی رۆژی پێشووی نەماوە. خۆی تەریك دەکاتەوە و دەڵێت ئێمە ناتوانین هەموو کەسێك وەربگرین و دەبێت کەسەکان بناسین. بەبێهیوایی هاتمەدەرەوە.

من لە مۆسکۆ لـە دارایـی لـەتیفزادە دەژیـام. لەوکاتـەدا لـەتیفزادە ئەنـدامی حیـزب بـوو، دەشـیخوێند. بـەڵام یەکـەمجار چـوومە مـاڵی برادەرێکی ڕەحیمی برام کە ناوی جیهانگیر بوو لـە قـەفقاز دادەنیـشت و مامۆستای زانکۆو پیـاوێکی زانـا بـوو.[٢] ڕوداوەکـەم بـۆ باسـکرد. وتـی بەیانی دەچم بۆلای کیتاکاروفسکی و ئـەم مەسـەلەیە ڕووندەکەمـەوە. بـەیانی دەچـێتە لای کیتاکاروفـسکی و پێیـدەڵێت: ئـەم بنەماڵەیـە لەکۆنەوە لەگەڵ تزار دژایەتیان هەبووەو شەڕیان کردووەو ئێستا ئێوە لەگەڵیان ئاوا هەڵسوکەوت دەکەن. گومانتـان نـەبێ. دواتـر بـەمنی وت بـچۆرەوە بـۆلای. چـووم و دیـتم زۆر سـنگفراوانە و هەڵـسوکەوتی لەگەڵمـدا باشـە. بـەکورتی چـووم تاقیکردنـەوەم ئـەنجام دا. تاقیکردنەوەکـە دووکـەس دەیـانکرد. پیرەژنێـك بـوو لـە تورکـەکانی عوسمـانی و کەسـێکی دیکـە کـە پرسـیاری سیاسـی دەکـرد و تـا ئـەو جێگـەی دەمزانـی وەڵامـم دەدایـەوە. لەکۆتاییـدا هەسـتمکرد زۆر بەقورسـی گرتوویانـە. پیرەژنەکـە کـە پێموایـە نـاوی حـەلیمۆف بـوو بـەتورکی پێمـوت ئەمـە تێگەیەنـە کـە لـە ئەردەبیلـەوە هـاتووم، لـە ئەردەبیلیش بارودۆخ هەروایە، لەزانکۆی عەلی ئەکبـەر موجتەهـدیش ئەو شتانەیان فێری ئێمە نـەکردووە. ئەمانـە چـی دەڵێن؟ سـەختیمان زۆر کێشاوە تا هاتوین بـۆ ئێـرە. ئـەویش ئـەوانی تێگەیانـد. لـە منیـان پرسـی چـەند زمـان دەزانـی؟ وتم زۆر. وتم زمـانی تاتـار دەزانم، تـۆ دەزانی؟ وتی نا. وتم ئەم تورکیە کە قسەی پێدەکەم دەیزانی؟ وتی نـا. وتم تۆرکمانی دەزانم، تورکی تەواوی شوێنەکانم هەڵدا. وتم: فارسـیش

[٢]- ناوی یەکەمی جیهانگیر بوو ناسناوەکەیم لەبیر نەماوە .

دەزانم. تۆ دەیزانی؟ وتی نا. وتم ئێستا بەڕاست من زۆرتـر دەزانم یـان تـۆ؟ دەسـتیکرد بـە پێکـەنین و بـوو بەکەشـێکی دۆسـتانە و وەرگـیرام. دوای ئـەوەی کـە وەرگـیرام، دەسـتمدایە دەرسـخوێندن و ڕەزامەنـدیش بووم. زۆرتر لەژێر ڕێنمایی سەندیکاکان واتە پرۆفینترندا[٢] بووم.

لە زانکۆی "KUTTV" زۆرتر بیرۆکەکانی مـارکس و ئـەنگلس و لیـنین دەخوێنـدران و دواتـریش پرسـەکانی خـەباتی سـەندیکایی و شۆڕشـە جیهانییـەکان. ڕێکخـستنیان فێـر دەکـردین. لـە مۆسـکۆ دوو مانگ لـە سـاڵدا لەکارگـەی بیرازتنـی فـارگۆنی ترامـوا کارم دەکـرد. لـە سـەندیکای کارگــەش چــالاکیم هــەبوو، چــۆنیەتی بــەڕێوەبردنی سـەندیکاکان و ئـەوجۆرە چـالاکیانە فێربـووم. حیزبـی کۆمۆنیـستی ئێــرانیش هەنــدێك کۆبونــەوەی هــەبوو. لەیادمــە لەیــەکێك لــەو کۆبونەوانەدا سوڵتانزادە قسەی بۆ دەکردین. لە یەکێك لـە ژوورەکـانی دەوروبــەر کۆمــەڵێك چـینی هاتنــەدەرەوەو کاتێــك زانییــان ئێمــە کۆبونـــەوەمان هەیـــە، هـــەموو بەهێواشـــی لەســـەر پەنجـــەی پـــێ چوونەدەرەوە تا دەنگی پێیـان لێمـان تێکنـەدەن. سـوڵتان وتـی ئەمانـە لەسـەرخۆ دەڕۆن و بـەخێرایی شـۆڕش دەکـەن! سـوڵتانزادە بـەزمانی ڕوسی وتاری دەدا. ئەگەر کەسانێك هەبوونایە تـازە هـاتبن و ڕوسـییان نەزانیبایـە نیکـبین یـان سـتارزادە یـان کەسـانی دیکـە بۆیانـدەکردن بەفارسـی. ئەگــەر هــەموومان ئێرانـی بوینایـە بەفارسـی دوانـدەریی دەکرد و قسەی دەکرد. سوڵتانزادە فارسـیی کـەم دەزانـی، تورکییەکـەی باشتربوو.

---

[٢] – پروفینترن . ڕێکخراوی جیهانیی کرێکاری سەربە کۆمینترن .

## کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسان و پرسی رەزاخان

لەم نێوەدا بابەتی رەزاخان هاتەئاراوە. ئەحمەد شا لەدەرەوەی وڵات بوو و بڕیاربوو رەزاخان دەوڵەتی کۆماری دابمەزرێنێ. روتشتین باڵوێزی سۆڤیەت و ئاخوندزادە کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو و موسەوی کە پەیوەندی بە سۆڤیەتوە هەبوو، دەیانوت ئیتر رەزاخان لەخۆمانە و گوایە تەنانەت داوایانلێکردبوو ببێت بە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست و رەزاخان وتبووی هێشتا زووە. چونکە ئێرانییەکان موسڵمانن و ئەگەر من ببمە ئەندام لەوانەیە پشتمان تێبکەن و ئێوە کاری خۆتان بکەن. لەم نێوەدا لەساڵی ١٩٢٤ لەمۆسکۆ کۆنگرەیەك گیرا کە رۆژهەڵاتناسانی یەکێتی سۆڤیەت و هەندێك لەئەندامانی دیاری نێونەتەوەیی سێهەم و حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت و خەڵکی ئێرانی جۆراوجۆر لە بازرگانی میللیەوە تا دەگاتە کۆمۆنیستەکان تیایدا بەشداربوون. لەکۆبونەوەیەکدا وترا رەزاخان پیاوێکی پێشکەوتنخوازەو دەیەوێت ئێران بەرەو پێشکەوتن بەرێت، ئازادیخوازە و دەیەوێت رژێمی شاهنشایی بگۆڕێت بەکۆماری. ئێمە لێکەڕاین ئەویش وەك موستەفا کەمال بەهێزبێت. زۆربەیان لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بوون، لەبەرئەوەی سۆڤیەتیەکان بۆچونەکانیان دادەڕشت. زۆربەی ئامادەبووانیش بەم بۆچوونە کە بۆچوونی سۆڤیەتەکان بوو رازیبوون. تەنها سێ کەس دژبەر بوون، یەکیان لادین برای نیمایوشیج و یەکێکی دیکە لەتیفزادە بوو کە پێشتر ناویمان هێنا و ئەوی دیکەشیان من بووم. بەڵام

هەرسێکمان گەنج بووین و من لەوانیش گەنجتر بووم. من لەزانکۆی KUTTV بووم و ئەوانیش لەزانکۆی ڕۆژهەڵاتناسی[4] دەیانخوێند. خوێندنی من تەواو بووبوو. دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ئێران بەڵام بەهۆی ئەم دژایەتیەوە پێیانوتم تۆ نابێت بگەڕێیەوە بۆ ئێران لەبەرئەوەی تۆ دژی ڕازەخانیت و ئێمە لەگەڵ ئەودا دۆست و هاودەنگین، ئێوە دەڕۆنەوە ئەم دۆستایەتیەی ئێمە دەشێوێت هەربۆیە نابێت بڕۆیتەوە. لێم پرسین بچین بۆ کوێ؟ وتیان بچن بۆ باکۆ. چوونی من بۆ باکۆ کارێکی باش نەبوو. لەبەرئەوەی لەوێ ئێرانیی زۆری لێبوو ئەگەر لەوێ چالاکیمان بکردایە نەماندەتوانی بچینەوە بۆ ئێران. بەڵام دڵبەستەیی تایبەتیم بۆ ئێران هەبوو تەواوی ئارەزووم ئەوەبوو بگەڕێمەوە و هەرکارێك لە توانامانادایە بۆخۆمان لەوێ بیکەین.

بڕیارم دا بڕۆم ستالین ببینم. لەو سەردەمەدا هێشتا دەکرا کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو وەربگریت. ڕۆیشتم و بەبێ کێشەیەکی ئەوتۆ کاتی چاوپێکەوتنەکەیان بۆ دیاریکردم و چوومە نوسینگەکەی. خۆمم پێناساند و پێیوتم تۆ زۆر گەنجی. لەڕاستی دا تەمەنم کەم بوو. هەموو ئەو شتانەم بۆ باسکرد کە من لە ئێرانەوە هاتووم بۆ خوێندن و تا لەسەر مارکس و لینین و کەسانی تر شت فێرببم و ئەگەر باش بێت بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم و لەوێ بەکاریان بێنم. ئێستا پێمدەڵێن

---

[4] – ئەم زانکۆیە دوو بەشی هەبوو . ئابوری ودپلۆماسی . ئەوانەی کە بەشی دپلۆماسییان تەواو دەکرد دەبون بە قۆنسوڵ و باڵوێز و ئەوانەی کە ئابوریيان تەواو دەکرد ، دەبوون بە هاوپەیوەستی ئابوری.

تۆ لەگەڵ ڕەزاخان دژایەتیت هەیە و نابێت بچێتەوە بۆ ئێران. ئەگەر دەوڵەتی سۆڤیەت پێی باش نیە من بڕۆمەوەو چونەوەی من زیانی هەیە بۆی ئەوە منیش ناڕۆمەوە، بەڵام شوێنێکیان بۆ من دیاریکردووە کە دواتر لەوێوە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئێران. ستالین خۆی خەڵکی قەفقاز بوو بارودۆخی ئەوێی دەزانی. پرسیاری لێکردم کوێیان پێوتویت؟ وتم باکۆ کە پڕە لەئێرانی و ئەگەر بچم بۆ ئەوێ هەموویان من دەناسن و ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئێران. زەردەخەنەیەکی کردو تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و تەلەفۆنی کرد بۆ ناوەندی یەکێتی گەنجان و پێیوتن فلانەکەس بۆ هەرکوێی یەکێتی سۆڤیەت دەیەوێت بینێرن.

لەو سەردەمەدا پرۆفینترن منی دابووە دەستی دەوڵەتی سۆڤیەت، لەبەرئەوەی خوێندنەکەم تەواو ببوو یان دەبوو بگەڕێمەوە بۆ ئێران، یان دەبوو لەدەستی پروفینترندا بم و یان لەسۆڤیەتدا بمێنمەوە. کاربەدەستانی پروفینترن لێیان پرسیم دەتەوێت بۆکوێ بڕۆیت؟ پێموتن تاجیکستان. ئەوێ زۆر دوور بوو ئێرانییشی لێ نەبوو. ئەوانیش رازیبوون.

## سەفەر بۆ تاجیکستان

من لەپێشدا چووم بۆ کۆماری ئۆزبەکستان. لەو سەردەمەدا هەرکۆمارێك لە کۆمارەکانی دیکە نوێنەرایەتیی هەبوو. لە ئوزبەکستان چووم بۆ لای نوێنەری تاجیکستان. نوێنەرەکەی تاجیکستان لە شاری سەمەرقەند ئەفخانییەك بوو بەناوی محەمەد.

تازە گەیشتبوومە ئەوێ و بەپانتۆڵ و قەمیسێکی سادە و تۆزاویەوە چووم بۆ نوسینگەکەی. سکرتێرەکەی کە ژنێکی ڕوس بوو پێموت دەمەوێت هاوڕێ محەمەد ببینم. پێیوتم ئێستا سەرقاڵە. کاری هەیە، دانیشە کتێبێکی پێدام و وتی بیخوێنەرەوە با سەرقاڵ بیت، خۆم بە خوێندنەوەی سەرقاڵ کرد، بووبە کاتژمێر ۱ی پاشنیوەڕۆ پێیوتم هەستە با بڕۆین. وتم بۆ کوێ؟ وتی کاری ئێمە تەواو بووە. پێموت من کارم بەهاوڕێ محەمەد بوو، بۆ پێت نەوت؟ وتی ئاخر ڕۆشت. بینیم بەهەندیان وەرنەگرتووە چ کارێکم هەیە یان نیمە، هەستام و چوومە میوانخانە. دواتر چووم خۆم شۆری و جلەکانم گۆڕی. ڕۆژی دواتر ڕۆیشتمەوە. ئەو ژنە منی نەناسییەوە. هەستا و بەناز و غەمزەوە وتی کاکە کارت بەکێیە؟ وتم بەهاوڕێ محەمەد. ڕۆیشت و دوای ماوەیەك گەڕایەوەو وتی فەرموو. وتم جلەکانم کاری خۆیان کرد! ئەو محەمەدە دەبوایە ئامادەکاریی سەفەرەکەمی بۆ تاجیکستان بکردایە.

یاخییەکانی یاسماچی ڕێگاکەیان گرتبوو. ئەوان زۆر دڕندەبوون و هەرکەسێکیان بگرتایە دەیانخەساند، سیستمەکەیان وابوو. محەمەد منی بە پۆلیسی سنور ناساند کە لەژێر چاودێریی ئەواندا بڕۆم بۆ تاجیکستان.چوومە سنوورو لەگەڵ ژمارەیەك سەرباز بە زیل چووم بۆ تاجیکستان، گەیشتمە دووشەمە کە دواتر ناوەکەیان گۆڕی بۆ ستالینئاوا. لە دووشەمە نە میوانخانەی لێبوو نە شوێنێك بۆ مانەوە. چایخانەیەکی لێبوو کە میوانەکان لێیدەمانەوە بەڵام زۆر پیس بوو.

لە ئێرانییەکانی ئەوێ سۆراخی مەهدی تەهماسبیم* کرد و چووم بۆ مالەکەی. ژوورەکەی ڕێکوپێك بوو، خزمەتیان کردم. ماوەیەك لەوێ بووم.

لەو ڕۆژانەدا یەکێك لە پلەدارەکانی سوپای ئێران بەناوی لەهاکخان لە خۆراسان ڕاپەڕیبوو و دوای شکستی ڕاپەڕینەکەیان، لەگەڵ هاوڕێکانی ڕایانکردبوو بۆ سۆڤیەت. ڕوسەکان ئەوانیان کرد بەدوو بەشەوە. بەشێك لەوانیان نارد بۆ مۆسکۆ کە لەهاکخانیشیان لەگەڵ بوو، بەشەکەی تریان بۆ تاجیکستان. لەتاجیکستان بووم کە محێدین داوایلێکردم کاریان بۆ پەیدابکەم. بەڕێکەوت پێویستمان بە کەسانێك بوو ئەلفبێ بلێنەوە تەنها ئەگەر دوو سێ پۆلیشیان خوێندبێت. تاجیکەکان لەو وەختەدا کەسیان نەبوو. من ئەوانم کرد بەدوو بەشەوە. ئەوانەی تا پۆلی شەشیان خوێندبوو بۆ وانە وتنەوە و نەخوێندەوارەکانیش کە زۆربەیان جوتیار بوون بۆ کشتوکاڵ دامنان. خودی لهاکخانم دواتر لە مۆسکۆ بینی.

ڕۆژێك چووم بۆ دیتنی یەکێك لەلایەنگرانی کە لە نەخۆشخانە کەوتبوو. زۆر پێیخۆش بوو، وابیریدەکردەوە لەوێش یەکێك سەرۆکە و یەکێك گەورەو یەکێك بچووك، وایدەزانی ئێمەش لە گەورەکانین و هاتوین بۆ سەردانی. دەستیکرد بەدەردی دڵ کردن و وتی: ئاخر بڵێ لەهاك خان تۆ شۆڕشت بۆچی بوو؟ لە کاتێکدا کە ژیانیشمان باش بوو. دەیوت یەك مەن تلیاکم هەبوو پێیانوتم بێتو تلیاکەکەت بگرن دەتکوژن منیش خستمە ناو بیری ئاو. ئەم هەموو زیانەم پێگەشتووە.

* - دواتر کامبخش لە قاوی دا و لەژێر ئەشکەنجەدا مرد.

ئەمانــە ناسـتی بیرتەسـك بـوون. لــەهاکخان سـەرۆکیان بـوو فەرمانێکی پێکردبوون. حیزب و ڕێکخراوەکەشیان نـاوی "پاداشیـست" بوو، "پاداشیست" بەمانای پاداشتکردن بـوو. کۆمـەڵێکی زۆر نـەبوون. نارەزایـەتیان هـەبوو، یـاخی بووبـوون. بەشـێکیان دەیانگێڕایـەوە پێکـدادانێکیان کـردووەو گەڕاونەتـە دواوە. وتیـان سـۆڤاتییەکان وەرتانـدەگرن. هـاتین و دیتمـان سوپای سوور لـەدوو ڕیـزدا وەسـتاوە. لەسـنور تێپـەڕبووین زۆر پێمانخۆشـبوو کـە ئەمانـە هـاتوون بـۆ پێشوازیمان، کاتێـك هـاتین ئـەوان ئێمـەیان گـەمارۆدا و وتیـان دەبێـت چەکەکانتان دابنێن، چەکیانکردین و ناردیانینـە نـاو خـاکی سۆڤیەت. پیاوەکانی لەهاکخان نـەقڵێکی تێگەیشتنێکی زۆریـان نـەبوو. لەوانەیـە خۆی بیرێکی هەبووبێت بەڵام پیاوەکانی نا.

کەسێکی دی لەوانـەی لـە تاجیکستان چـاوم پێیکـەوت **ابوالقاسم خـان لاهـوتی** بـوو. ئـەو لـە ئێـران پلـەداری جەندرمـە بـوو دوای ڕاپەڕینێکی سـەرنەکەوتوو هـەڵهات بـۆ سـۆڤیەت. شۆڕشـەکەی لاهـوتی ویـست وخواسـتی خـۆی بـوو هـەر بۆیـە لـە سـۆڤیەتش زۆر ڕێزیـان لێنـەدەگرت. ئەوکاتـەی هـاتم بـۆ تاجیکـستان وەك پێـشتر بـاسمکرد شوێنێکم نەبوو بۆ مانـەوەو دوای ماوەیـەك ژوورێکیـان پێـدام کـە هـی لاهوتی بـوو (لاهـوتی لەوکاتـەدا چـوو بـوو بـۆ سـەفەر) ئێرانییـەکانی تاجیکستان بەگشتی نێوانیان لەگـەڵی خـۆش نـەبوو. لاهـوتی پیـاوێکی تورەبوو کاتێکیش تورەدەبوو قسەی هەلـەق و بەلـەقی زۆری دەکـرد و کەسـانی دەوروبـەری دەڕەنجانـد. بـەکورتی لـەم سـەروبەندەدا لـە تاشکەندەوە بروسکەی دەناردو دەیوت خەریکم دێمەوەو ژوورەکەم بـۆ

چۆڵ بکەن. ئەو ئێرانیانەی لەگەڵی ناکۆك بوون ئەم مەسەلەیان باسدەکردو دەیانوت ئێستا زانیت ئێمە ڕاستدەکەین و بێهۆ دژایەتی ناکەین. بەکورتی من ئەو ژوورەم بۆ چۆڵکرد و هیچ شتێك ڕووینەدا. لەناو ئەوانەی لەگەڵی ناکۆك بوون دوو ئێرانی هەبوون بە ناوەکانی دەیلەمی و مەسیح. دەیلەمی لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی تاجیکستان کارێکی گرنگی هەبوو. لاهوتی لەو کاتەدا ژنی نەبوو. دواتر ژنێکی ڕوسی هێنا کە گوایە خوێندەواریش بوو. تا ئەوکاتە دۆخی باش نەبوو بەڵام دواتر کە زۆر بەستالیندا هەڵیدەگوت کاروکاری باش بوو. دەیانوت ژنەکەی لاهوتی لەئێران سیخوڕی سۆڤیەتیەکان بووە.

من بوومە ئاشنای لاهوتی. هەرکات هۆنراوەی بنوسیبایە یەکەمجار دەهات بۆماڵەکەم و بۆمی دەخوێندەوە. پێمدەوت کاك لاهوتی خۆت بیخوێنەوە، دەیگوت تا تۆ بیخوێنەوە. ئێرانییەکی تورکزمان هەبوو کە ناوی حسێن فارس بوو. زمانی دەیگرت و نەیدەتوانی باش قسەبکات بەڵام هەمیشە پێداگری دەکرد دەیوت بێنن من بیخوێنمەوە. لاهوتیش کە دەیزانی شیعرەکەی تێکدەدات دەیوت لێیگەڕێ خۆم دەیخوێنمەوە.

لەم سەروبەندەدا داوام لە تاجیکستان کرد کە بۆ درێژەدان بەخوێندنەکەم لەبواری یاسادا بمنێرن بۆ مۆسکۆ ئەوانیش ناردمیان.

لەو سەردەمەدا باروودۆخ گۆڕابوو. ڕەزاخان ژمارەیەکی زۆر لەکۆمۆنیستەکان و لایەنگرانی سۆڤیەتی لە ئێران لەناوبردبوو، لەگەڵ سۆڤیەتیەکانیش بەشەڕهاتبوو. شومیاتسکی کەلەو ساڵانەدا باڵوێزی

سۆڤیەت بوو لەئێران[٦] لەمکاتەدا ببووە سەرۆکی زانکۆی KUTTV کە من پێشتر لەوێ دەمخوێند. کاتێك لە زانکۆی یاسا دۆسیەی منیان لە زانکۆی KUTTV داواکردبوو، شومیاتسکی دەزانێت چومەتە مۆسکۆ و ڕاپۆرت دەدات کە من دژی ڕەزاشا بووم و بڕیاردەدەن کە بهێڵن بێمەوە. منیان بانگکرد بۆ سەندیکای جیهانی و پێیانوتم ئەگەر پێتخۆشە دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ئێران. منیش بەهۆی ئەوەی کە بنەماڵەکەم لە ئێران بوو پێمخۆش بوو بگەڕێمەوە. پێیانوتم پەساپۆرتی ساختەت بۆ دروستدەکەین. وتم: نامەوێت، چونکە هەمیشە هاتوچۆی ئێرانم کردووە و پەساپۆرتیشم پێنەبووە. پێیانوتم بۆ خەرجی ڕێگا پارەت پێبدەین. وتم نا، پارەشم پێویست نیە و من بۆ خۆم دەڕۆم (چونکە لە تاجیکستان کارم کردبوو بڕێك پارەم پێمابوو).

لە مۆسکۆوە هاتمە باکۆ. پێویستبوو ئەو پارەیەی کە پێمە بیگۆڕمەوە بەئالتون بۆئەوەی بتوانم لەئێراندا خەرجی بکەم. میر مەحمود ناوێك لە تێکۆشەرانی ئەردەبیل کە لەوێ بازرگانیی دەکرد. چوم بۆ لای و پێموت دەمەوێت بڕۆم بۆ ئێران. پارەیەکم پێیە دەمەوێت بیگۆڕمەوە. دوای ئەوەی کە پارەکەم پێنیشان دا، ڕۆیشت و کەمێك سەیری ئەملاولای کردو بڕێك سکەی زێڕی بۆ هێنام. یاسایەکیان دانابوو هەرکەسێك بازرگانی بەزێڕ و زیوەوە بکات بەتوندی سزایان دەدا. بەڵام میر مەحمود منی دەناسی. لە باکۆ لە

---

[٦] – ئەو لەماوەی ساڵەکانی ٢٥– ١٩٢٣ نوێنەری خاوەن بڕیاری تەواوی ڕوسیا بوو لەئێران

قوتابخانە دەخەوتم. لەبەرئەوەی هاوین بوو قوتابخانەکان داخرابوون. قوتابییەکی دیکەش لەوێ دەخەوت. شەو کە ویستم بخەوم ئاڵتونەکانم دەرهێنا و خستمە ژێر سەرم لەبەرئەوەی ون نەبێت. بەیانی هێشتا بولێڵە بوو لەدەرگایان دا و هاواریان دەکرد بیکەنەوە، بیکەنەوە. دەرگاکەم کردەوە. پێیانوتم گپۆ داواتدەکات. توومەزا ئەو قوتابییە شەو ڕۆشتبوو وتبوی کەسێك لەوێ خەوتووە ئاڵتونی پێیە. ڕۆیشتم و لێیان پرسیم ئەمانەت لەکوێ هێناوە؟ وتم لە دراوگۆڕێك وەرمگرتووە. لێیان پرسیم ناوی چیە؟ وتم: ئەگەر ئەو بیزانیایە کە ناوی دەبەم ئەوەی پێنەدەدام. وتیان شتی وانابێت لەبەرئەوەی یارمەتی کەسێکی شۆڕشگێڕی کردووە دەمانەوێت لەداهاتودا یارمەتی بکەین. وتم ئەو پێویستی بەیارمەتیی ئێوە نیە هەرئەوەندە بەسە. منیان بۆ ماوەیەك ڕاگرت و فشاریان بۆ هێنام، بەڵام دوایی کە زانیان هیچ سودی نیە بەریاندام. سواری پاپۆڕێك بووم کە بڕۆم بۆ ئاستارا.

ئاخوندزادە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش لەو پاپۆڕەدا بوو. لە منی پرسی: بەڕێز ئیفتخاری بۆ کوێ دەچی؟ ئەوان نەیاندەزانی من لەلایەن سەندیکای جیهانییەوە ڕاسپێردراوم. زانیم پیاوێکی پیرو زەحمەتکێشە نابێت لێی بشارمەوە، وتم دەچم بۆ ئێران. وتی: گپۆ ئاگادارە؟ وتم من هەقم بەسەر گپۆوە نیە. من لە ئێرانەوە هاتووم و دەگەڕێمەوە بۆ ئێران. پێیوتم دەبێت ئیزن وەربگریت. ئەگەر بێت و ئیزن وەرنەگری من زانیاریت لەسەر دەدەم با دەستبەسەرت بکەن. وتم گەورەترین ڕێکخراوی یەکێتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت ڕێگەیان پێداوم بڕۆم، ئێستا من بڕۆم بۆ لای

گیۆ؟ وتی: نا وانابێت. دەمزانی ئەگەر بێت و بڕوات ڕاپۆرتم لێبدا، دەستبەسەرم دەکەن و دەمبەن بۆ باکۆ لەوێش بەندیخانە و ژێرزەمین و زۆر مەینەتیی دیکە. هەربۆیە خۆم گەڕامەوە بۆ باکۆ پێمڕاگەیاندن کە دەمەوێ لە سنوور تێپەڕبم.

## گەڕانەوە بۆ ئێران

دیسان لە باکۆوە گەڕامەوە بۆ ئاستارا. بەهۆی ئەوەی باپیرەم ئاستارای ئاوەدانکردبۆوە، لەوێ دەستمان دەڕۆیشت. باپیرم گومرکی ئەوێی بەکرێ گرتبوو جێی متمانەی بەندەرگە بوو. هەربۆیە لەوێ ئاسیاوی زۆرمان هەبوو. داوامکرد ئەسپێکم بۆ ئامادە بکەن تا بەشەو بپەڕمەوە. خاوەنی ئەسپەکە وتی: ئەم ئەسپە ڕێگاکە شارەزایە و خۆی دەتبا. بەس ئاگات لێبێت سەرت لەدارەکان نەدات. بەو شێوەیە کە وتبووی ئەسپەکە منی لەسنوور پەڕاندەوەو لەوبەرەوە منیان وەرگرت. براکەم لە بەندەری پەهلەوی بوو، شەو لەوێ خەوتم و شەوی دواتر ڕۆیشتم بۆ ڕەشت.

براکەم ئاگاداری هاتنەوەی من نەبوو، وەلێ دەیزانی لە سۆڤیەتم و بۆی ئاسایی بوو. نەیدەزانی هاتنەوەی من هۆکاری سیاسیی هەیە. لە ڕەشت ئەرمەنیەکی لێبوو کە لە مۆسکۆ یارمەتیم دابوو بۆ ئەوەی ئەشتەرگەری بۆ بکەن، ئەو لە ڕەشت وێنەگر بوو. لەو سەردەمەدا بۆ ڕۆیشتن لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە پێویستیی بەمۆڵەتنامە بوو. ئەو ڕۆیشت بۆ ئاسایش و مۆڵەتنامەیەکی بۆ دەرهێنام کەپێی بڕۆم بۆ تاران. لە تاران چووم بۆ دارایی یەکێك لە هاوڕێیان بەناوی

عـەتائوڵلاّئارش کـە فیتـەر و شـۆفێرێکی بـاش بـوو. لـەو زەمەنـەدا چاوپێکەوتنم لەگەڵ هەژماری کرد. ئەو ئەندامی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبـی کۆمۆنیـستی ئێـران و قوتـابیی خـولی یەکـەمی زانکـۆی "KUTTV" بوو. حیسابی و بەشێك لە کۆمۆنیـستە ئێرانییـەکان بـۆ بەشداریکردن لەکۆنگرەی دووهەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران (کە بـە کـۆنگرەی ئرومیـە ناویـدەرکرد وادیـاربوو لـە ئۆکرانیـا بەسـترابوو) دەچوون بۆ سۆڤیەت و داوای لە من کرد تا دێتەوە لە ئێران بمێنمـەوە و وتـی تـاران چـۆڵە. لـە ماوەیـەدا مـن دوو مـانگ لـە تـاران مامـەوەو پێموابـوو لـە تـارانیش دەبێـت چـالاکی بکـەین. ئێمـە ڕێکخراوێکـی قوتابیانمان پێکهێنـا و ئـەم ڕێکخراوەیـە زوو پـەرەی سـەند. لەوکاتـەدا ئێران زانکۆی تێدانەبوو. بەس یەك قوتابخانەی بـالای پزیـشکی، یـەك قوتابخانەی بالای یاساو یەك قوتابخانەی بالای کشتوکاڵی لێبوو.

لـەو کاتـەدا چـەند مانگرتنێکمـان ڕێکخـست. قوتابییـەکان چـەند داواکاریـــەکییان هـــەبوو. داواکاریـــەکانیانم بـــاش بیرنـــەماوە. بـــەڵام سـەرکەوتوو بـوون. تـەدەیون وەزیـری ڕۆشـنبیری بـوو. بەشـێك لـەو قوتابیانە دواتریش پێوەندیی خۆیان هێشتەوە، لەوانە دکتۆر شـەفیعی کـە خـەڵکی گـیلان بـوو لەقوتابخانـەی سـۆڤیەت وانـەی دەوتـەوە و دەشیخوێند، دواتر بوو بەدکتۆرو لە ڕەشت عیـادەی دانـابوو. هـەروەها دکتۆر جەلال عەبدە، دکتـۆر پـاکپور کـەدواتر بـوو بـە دکتـۆری ددان. بەشـێك لـەوان دواتـر چـوون بـۆ زانکـۆو بـوون بـەدکتۆر و ئـەو ڕێـزو خۆشەویستیەی سەردەمانی یەکبون و یەکگرتوییان مـابوو.[٧] لەوکاتـەدا

---

[٧] - بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم مانگرتنەی خوێندکاران بگەڕێوە جەلال عەبدە ، چل

خوزستان گەورەترین ناوەندی پیشەسازیی وڵات بوو. بەڵام لە بەشەکانی دیکەش ناوەندی کرێکاری هەبوو. گەورەترین سەندیکای کرێکاریی ئێران لە بەندەر ئەنزەلی بوو کە ئاخوندزادە سەرپەرشتیی دەکرد. دواتر ئاخوندزادەیان لە ئێران هەڵداشت. گەشە و پێشکەوتنی ئەم سەندیکایە پێوەندیی بە سەودای بازرگانیی نێوان ئێران و سۆڤیەتەوە هەبوو. ئەگەر ئەم سەودا بازرگانییە گەشەی بکردایە، کرێکارەکان و ئەندامانی سەندیکا زۆر دەبوون و رێکخراوەکە بەهێز دەبوو، ئەگەریش بازرگانی نەبوایە رێکخراوەکە وردە وردە لاواز دەبوو. لە تارانیش سەندیکایەکمان هەبوو کە زۆرینەی ئەندامەکانی کرێکاری چاپخانەکان و پینەچی و هی تر بوون.

لەم قۆناغەدا لەتاران چالاکیی کرێکاریم نەبوو. بەس لەکاروباری خوێندکاریدا بەشداریم دەکرد. بەڵام لەوکەسانەی کەدەمناسین و دەمزانی لە بواری کرێکاریدا چالاکی دەکەن عەتائوڵلاخان ئارش و براکەی رەزا قولی کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیست بوو لە چاپخانە کاری دەکرد. براکەی رۆڵێکی گرنگتری هەبوو. یەکێکی دیکەیان کرێکاری پینەچی بوو بەناوی حەقیقەت کە دواتر بوو بە ئەندامی حیزبی توودە و ناوەکەی گۆڕی و کردی بە کەی مەرام. ئەم کرێکارانە لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران پەیوەندیان هەبوو. من لەگەڵ ئەوان چالاکیم نەدەکردو ئاشنایەتیشم لەگەڵیان نەبوو.

---

سالْ لە گۆڕەپانی دادوەری ، سیاسی و ڕامیاری ئێران و جیهاندا، بە هەوڵی مەجید تەفرەشی ، لاپەرەکانی ٦٥-٧٠.

## خوزستان

دواجار لەناوەڕاستی ساڵی ١٣٠٦ ( ١٩٢٧ ز) ڕۆیشتم بۆ خوزستان. ئەم کارە لە چەندلاوە قورسبوو، هیوای زۆرم بەسەرکەوتنی نەبوو. یەکەم: نە من، نە حیزبی کۆمۆنیست، نە سەندیکا و نە هاوڕێکانمان کەمترین زانیاریمان لەسەر بارودۆخی خوزستان نەبوو. تەنها دەیانوت هەر بەگەیشتنت بە خوزستان دەتگرن. دووەم شت ئەوەبوو کە هاتنی ئەرمەنی و تورکەکان بۆ خوزستان زۆر خۆی کێشەیەکی گەورە بوو، یەکسەر دەکەوتنە ژێر چاودێرییەوە. ئەمەش هۆکاری سیاسیی هەبوو، دەترسان مەترسیدا بن.

من ڕێگاکەم دوورکردەوەو لەڕێگای لورستانەوە نەڕۆیشتم. لەبەرئەوەی لورستان بەهۆی ڕاپەڕینەوە شلۆق بوو، ناچاربووم بەڕێگای ئەسفەهان و شیرازو بوشەهرەوە بە پاپۆڕ بڕۆم. چوونە ناو خوزستان ئەویش بەپاپۆڕ کارێکی زۆر دژوار بوو. ئەرمەنێك لە ئەسفەهانەوە لەگەڵمدابوو، پێکەوە لە ئۆتۆمبێلێکدا بووین، دوو منداڵیشی لەگەڵ بوون بۆ درێژەدان بەخوێندن دەیبردن بۆ هندستان. پیاوێکی پیر و زۆر لەسەرخۆ بوو. بۆ منداڵەکانیشی دلگران بوو نەوەك ژاندارمەکان تەماحیان تێبکەن. منداڵەکانیشی جوان بوون. متمانەی بە من کرد و خۆی و منداڵەکانی سپاردە من. گەیشتینە بەرازجان بەڵام بەهۆی باران بارینەوە حەوتویەك لەوێ ماینەوە. یەکەم شەو لەچایخانەیەکی نۆژەنکراوە ماینەوە. بەیانی دیتم ئەم پیرە پیاوە ناتوانێت لەجێگای خۆی هەستێت. چ بکەین و چ نەکەین.

هەواڵی فەرمانگەکانمان پرسی، وتیان تەلەگرافخانە نزیکە. چوم بۆ لای بەڕێوەبەرەکەی و نەخۆشییەکەی پیرە مێردەکەم بۆ باسکردو پێموت کە خەریکە دەمرێت. وتی ئێمە لێرە هەم ژوورمان هەیە و هەم سۆپا. خزمەتکاریشتان پێدەدەین و هیچ نیگەران مەبە و بڕۆ بیهێنە. پیاوە پیرەکەم برد بۆ ئەوێ و تاحەوتویەك لەبەرازجان ماینەوە.

دوای هەفتەیەك بەرەو بوشەهر بەڕێکەوتین. لەڕێگا واسموس سیخوڕی بەناوبانگی ئەڵمانیا زۆر یارمەتی داین. کاتێك کە ئوتومبێلەکان دەچەقین ئامێرێکی پێبوو دەهات و سەیارەکانی ڕادەکێشا.

پاش ماوەیەك گەیشتینە بوشەهر. پیرە مێردە ئەرمەنییەکە لە پاداشتی ئەو هاوکارییەی کردبووم یەك بوتڵ مەی پێدام و وتی ئەمە خۆم دروستمکردووە. من مەییم نەدەخواردەوە لەبەر جوانی شوشەکە و ڕەنگەکەی، هەڵمگرتوو خستمە نێو جانتاکەمەوە و لەیەکتر جودا بوینەوە.

دووسێ ڕۆژ لە بوشەهر بووین و دواتر بەپاپۆڕ بەرەو خورمشەهر کەوتمەڕێ. بینیم کۆمەڵێك بەهۆی گەرمای ژورەکانەوە هاتونەتە سەر عەرشەی پاپۆڕەکەو دانیشتوون و خەریکی مەی خواردنەوەن. یەکیان خولکی کردم و وتی: فەرموو. لێیان نزیك بوومەوەو وتم ڕێگەم بدەن خوانەکەتان ڕازاوەتر بکەم. هاتم و مەیەکەم پێدان. وەکئەوەی دنیام پێدابن. لێیان پرسیم کارت چیەو لەکوێ دەژیت؟ وتم لەڕاستیدا بێکارم لە قوم دەستفرۆش بووم پێیان

وتوم لە خوزستان کار هەیە و دەڕۆم بۆ ئەوێ بەڵکو کارێك بدۆزمەوە. یەکێکیان وتی: "بە باوباپیرم تۆ دامەزراویت" دەرکەوت ناوی **بەهەشتیە** و لە فەرمانگەی ڕێگاوبان کاردەکات. **بەهەشتی** وتی من بۆ خۆم داتدەمەزرێنم. هەرکەسێك پرسیاری لێکردیت بڵێ من فەرمانبەری دەوڵەتم. چیدی مەڵێ لە قومەوە هاتوم. من ئەوەم لە خودا دەویست و باشترین ڕێگە بوو بۆ من لەبەرئەوەی کە لەگەڵ کۆمەڵێك فەرمانبەری دەوڵەتدا بووم. پێکەوە هاتینە خوڕمشەهرو لە خوڕەمشەهر نە پشکنینیانین و نەپرسیاریشیان لێکردین. یەکێکیان کە فەرمانبەری داد بوو وتی من ناوم **جەزائیرییە** و ئەمەش **سەید عەباسخان** بەهەشتیە و پێکەوە چووین بۆ ئەهواز.

لە ئەهواز چووین بۆ میوانخانەی "ئیسلام"، بیستبووم یەکێك لەهاوڕێکانمان لەوێ لەوەزارەتی ڕۆشنبیری کاردەکات. بە سەید عەباس خانم وت من دەچم پیاسەیەك دەکەم. وتی: منیش دەچم چاوێکم بە **ئەلبورز** سەرۆکی ئاسایش بکەوێت. وادیاربوو لەگەڵ **ئەلبورز** برادەر بوون. منیش ڕۆیشتم و عەلی ناوینیم دۆزییەوە کە لە ڕۆشنبیری کاریدەکرد. پێیوتمماڵەکەی من لەژێر چاودێریدایە بەشێوازێك وەرە. وتم دێمەوە. بەس دوو سێ ڕۆژ دەمێنمەوە تا ئەمانە دەڕۆن. چومەوە بۆ ماڵەوە سەید عەباس خان پێیوتم هەستە بابڕۆین. وتم بۆ کوێ؟ بڕۆین داتبمەزرێنم. چوین بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاوبان. ئەندازیارێکی ڕووس دانیشتبوو گوایە ڕێگاکەی جۆلفا ئەو دروستی کردبوو. بەئەندازیارە ڕووسەکەی وت ئەم نووسینی فارسی زۆر جوانە پێویستمان پێیدەبێت. ئەویش وتی باشە بابێت دابمەزرێت. گەڕاینەوە

بـۆ ماڵــەوە بــەڵام هــەر ئــەو چــووە دەرەوە جانتاکــەم هــەڵگرت و نوسراوێکم بـۆ دانـا کەتێیـدا نوسـیبوم مـن گەڕامـەوە بـۆ ئازەربایجـان. بـەهۆی ئـەوەی لـەوێ یـەکێك لەخزمـەکانم مـردووەو چـیدی نـاتوانم بگەڕێمەوە.

چـووم بـۆ دارایـی نـاوینی وتـی دراوسـێیەکمان هەیـە بـارودۆخی خوزسـتان بـەجوانی دەزانـێ ئەگـەر ئیـزن بـدەی بـا بێـت و لەگـەڵت قسەبکات. ئەو لێرە مامۆستایە و وانە دەڵێتەوە. پێموت بابێت. بینیم گـەنجێکی زۆر ڕێکوپێکـە. ئینگیزەکـان ئازاریـان دابـوو، لـە ئابادانـەوە دووریانخستبۆوە بۆ ئەهواز. وتی ئێـوە پێویـستتان بـە چ یارمەتیەکـە؟ وتم لەپێشدا پێم بڵـێ ناوەنـدی کرێکاریی ئێـرە کوێیـە؟ وتـی ئابـادان. وتم دەتـوانی یارمــەتیم بـدەیت بێـدەنگ بـچم بـۆ ئـەوێ. وتـی مـن بەیەکێك لە برادەرەکانم دەڵێم لـەوێ ژوورێکت بـۆ بـە کـرێ بگرێـت. ئەو لەگەڵ خۆی دەتبـات و هـیچ کێـشەت نابێـت. هـەروای کـرد بـانگی برادەرەکەی کرد کە ناوی **هەژبەری** بوو هات بـۆ ئـەوێ. پێموابێـت لـە نوسـینگەی خانوبـەرە کاریـدەکرد. ژوورێکـی بـۆم بـەکرێ گـرت و مـن چووم بۆ ئابادان. ئیتر نۆرەی پەیداکردنی کار بوو.

## چۆن لەپاڵاوگە کارم پەیداکرد

پاڵاوگـەی ئابـادان لەپاڵاوگـەی بـاکۆ زۆر باشـترو ڕێکـوپێکتر بـوو. وەکو باکۆش نەوتی نەدەکردە ئاوی دەریاوەو بێزاری دروست نەدەکرد. ئینـگیزەکان لە ئابادان گەڕەکی تایبەت بەخۆیان هـەبوو، لـەوێ ڕێگـەی هـیچ کەسـێکیان نـەدەدا. تەنانـەت ئەگـەر یـەکێك لـەو ئینگلیزییانـە

لەگەڵ ژنێکی ئێرانی هاوسەرگیری بکردایە ئەویشیان لەوێ دەردەکرد. ناوی گەڕەکەکەیان بریم بوو. بەڕاستی لە ناوەڕاستی ئەو دورگەیەدا بەهەشتێکیان بۆ دروستکرابوو کەهەموو شتێکی تێدابوو. شوێنی مەلەوانگە، پاریگا و خانووی باشیان هەبوو، زۆریش ئاسودەبوون، کەس مافی چوونە ئەوێی نەبوو. گەڕەکێکی دیکە هەبوو بەناوی بواردە. ئەم گەڕەکە عەرەب نشین بوو، بەڵام ئینگلیزەکان دەیانویست ئەوێ لە عەرەبەکان بستێنن. دارایی عەرەبەکان زۆربەی لە حەسیرو قامیش دروستکرابوو، ئینگلیزەکان زۆرجار ئەوێیان ئاگرتێبەردابوو مۆڵەتی خانوو دروستکردن و نۆژەنکردنەوەیان نەدەدا. گەڕەکێکی دیکە هەبوو بەناوی ئەحمەداوا. کە بەناوی ئەحمەد ناوێکەوە کرابوو کە سەرۆکی شارەوانی و خەڵکی گیلان بوو. ئەو ئەحمەدە لەمانگرتنی کرێکاراندا ئینگلیزەکان کردبوویان بەژێر ئوتومبێلەوە. ئەحمەداوا پیسترین گەڕەك بوو کە لە هەموو تەمەنمدا بینیبوم، تەنانەت ئاودەستیشی لێنەبوو خەڵکەکە لە قەراخ ئاوەکە پێشاویان دەکرد. هەڵبەت ئابادان هەمووی پیس بوو. بەڵام چەند جۆگەیەکیان هەڵکەندبوو کە ئاوەڕۆکەی دەبرد بۆ ناو دەریا. ئەحمەداوا ئەوەشی نەبوو. زۆرجار نەخۆشییەکان لەوێوە سەریان هەڵدەدا. بارودۆخی کرێکاران زۆر نالەبار بوو. کرێکارێك کە خزمەتی زۆربوایە مووچەکەی لە مانگێکدا شەش تمەن بۆ نۆ تمەن، یانی رۆژی دوو ریاڵ بوو. کرێکارەکان بەچەرمەسەری ژیانیان دەبردەسەر. ئینگلیزەکان نەوتە خراپ و پیسەکەیان دەکردە چاڵێکەوە و هاوسەری کرێکارەکانیش دەچوون لەو نەوتەیان دەبردەوە بۆ پێویستی

ماڵەکانیان. نەوتەکە دەڕژا بەسەرو ملیاندا. جلوبەرگەکانیان شڕۆڵ بوو سەروسمتیان بەدەرەوە بوو ئینگلیزەکان لەگەڵ ژنەکانیان دەهاتن ڕەسمیان دەگرتن. ئەو کارانەی ئینگلیزەکان و بەدبەختی کرێکارانی ئێران ڕق و تووڕەیی زۆری لە دڵی کرێکارەکاندا دروستکردبوو. بەکورتی ئینگلیزەکان خۆیان زەمینەی ڕێکخستنی کرێکارانیان ڕەخساندبوو، ئیدی هیچ پێویستی بە هەڵخڕاندن نەدەکرد.

بەڵام من هێشتا دانەمەزرابووم. دەبوایە بچمە ناو کرێکارەکان و لەدەرەوەی ئەوان نەمدەتوانی چالاکی بکەم و دەستبەجێ پێیان دەزانیم، بۆیە بێنەملاولا دەبوایە دابمەزرێم. شێوازی دامەزراندن وابوو کە کرێکارە بێکارەکان دەچوون لە حەوشەکە کۆدەبوونەوەو ئینگیزەکان لەسەرەوە سەیریان دەکرد هەرکامێکیان بەرچاوتر بوایە ئەوانەیان هەڵدەبژارد. من بەهۆی ئەوەی باڵا کورت و لاواز بووم وەریاننەگرتم. دوو مانگ سەرگەردان بووم، پارەشم پێنەمابوو. دۆخیشم ڕووی لەخراپی بوو. ڕۆژێکیان کە لەبەردەرگای فەرمانگەی دامەزراندن دانیشتبووم لەگەڵ کرێکارەکان سێرسکانێمان دەکرد پیاوێکی باڵابەرزی ئینگلیزی لە "ئۆفیس" [٨] هاتەدەرەوە - بەرپرسی ئەوێ بوو - کەمێك سەیری کردین و بەفارسی شتێکی وت و چۆوە ژوورێ. سکرتێری ئەوێ مەحمود ناوێك بوو، هاتە دەرەوەو وتی میستەر کاری پێتە. من پێموابوو بەپێی ئەوەی باسدەکرا بمانگرن، چوومە ژوورەکەی و لێیپرسیم، تۆ کارت چیە؟ وتم دەستفرۆش بووم، ئێستا هاتوم بۆ ئێرە بۆ کارکردن، دەڵێن کار نیە و منیش دەمەوێ

---

[٨] - office فەرمانگە – نوسینگە

بگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم پارەم پێنەماوە، ئێرە سەرم لێشێواوە. لێی پرسیم خوێندەواریت هەیە؟ وتم نەخوێندەوارم بەڵام دەتوانم کەمێك بنوسم و بخوێنمەوە. وتی: بڕبەندکاری دەزانی؟ وتم لەلای کەسێك سێ چوار مانگێك ئەو کارەم کردووە. (بڕبەندکاریم دەزانی، بەهۆی ئەوەی پێشووتر لە کارخانەی چاککردنەوەی تراموا لە مۆسکۆ لە ساڵێکدا دوو مانگ کارمدەکرد) وتی: دەتنێرم بۆ شوێنێك بڕۆ کار بکە. وتم: سوپاست دەکەم. وتی: بڕۆ داواکارییەك بنوسە و بۆمی بێنە و ڕەزامەندی خۆمی لەسەر دەنوسم.

هاتم بۆ شار کۆمەڵێك عەریزەنوس دانیشتبوون بە تایبەت دەیاننوسی. بەیەکیانم وت عەریزەیەکم بۆ بنوسە. بۆی نوسیم کە من هاوسەرو منداڵم هەیە و بێکارم و کارم پێبدەن. بەڵام شێوازی عەریزەکەم پێناخۆش بوو. من خێزاندار نیم و پێویست ناکات لەئینگلیزەکان بپاڕێمەوە. وتم ئەمەم ناوێت. پێیوتم بەنێمەیان ڕاسپاردووە وابینوسین دەبێت زۆر چەوساوانە بێت. عەریزەکەم هەڵگرتوو بردم بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی کۆمپانیای نەوت. لەشوێنی پەنجەمۆرەکە ئەرمەنیەك دانیشتبوو، چەند پرسیارێکی لێکردم و وتی: بڕۆ نەختێك ئاوی خواردنم بۆ بێنە. لەو سەردەمەدا زۆر تامسار بووم بەبێزارییەوە چووم ئاوی بۆ بێنم. پەرداخەکە لەدەستم کەوت و شکا دەستیکرد بەجنێودان بەهەموو ئێرانییەکان. ویستم لێیدەم، بیرمکردەوە هەموو کارەکانم بەفیڕۆدەچێت. هەرچیەکی وت سەرمداخست. لەکۆتاییدا پەنجەمۆرەکە تەواوبوو.دواتر وتیان بچۆ بۆ نەخۆشخانەی ئینگلیزەکان. لەوێش

کارەکەم تەواوبوو ناردیانم بۆ شوێنێك کە پێیانـدەوت (ووٚرك شۆپ)[٩].
ئـەوێ بەرواڵـەت فێرگـە بـوو کاریـان فێـری منـاڵان دەکـرد، بـەڵام
لەڕاستیدا ناوەندێك بوو بۆئەوەی لەهەر بەشێك کرێکاریان بویستایە
دەهاتن و لـەوێ دەیـانبرد. کـە کارەکـەیان تـەواودەبوون دەهاتنـەوە بـۆ
ئەوشـوێنە. بڕبەنـدکاری و ئـەو جـۆرە کارانەشـیان فێردەکـردن.
جاروبارە منیشیان دەنارد بەملاولادا، بۆ من زۆر بـاش بـوو. دەمتـوانی
لەنێو پاڵاوگەدا بگەڕێم. وردە وردە لێکۆڵینەوەم کردو ئەو کرێکارانەی
لەگـەڵ خەزعـەل شـەڕیان کردبـوو ناسـیمن و زەمینـەی سـەرەتایی
چالاکیمان فەراهەمکرد.

## پێکهێنـانی سـەندیکای کرێکـاری لـەنێو کرێکـارانی پیـشەسازیی نەوتدا

پـێش هـاتنی مـن بـۆ ئابـادان هەنـدێ شـت هـەبوو ئینگلیزەکـان
لەگـەڵی کـۆك نـەبوون. یـەکێك لەوانـە کۆمـەڵێك پارسـیی فارسـیزمان
هەڵدەستن بـۆ کـاری کـشتوکاڵی لەهندسـتانەوە دێـن بـۆ ئابـادان. لـەوێ
بەکشتوکاڵەوە خـەریك دەبـن و بـەهۆی زەوی بـەپیت و نـاوی بـاش و
شـــارەزایی خۆیانـــەوە، بەرهـــەمیان زۆر باشـــدەبێت. ئینگلیـزەکـــان
دەیانزانی ئەگەر ئەم کارە برەو پەیدابکات لەسەر مووچەی کرێکاران
توشـی گرفـت دەبـن. بۆیـە کاتێـك بەرهەمەکـەیان پێـدەگات، شـەوێك
تەواوی بەرهەم و کەرەستەکانیان دەستوتێنن. پارسیەکانی هندستان
لـە مەبەسـتەکە تێدەگـەن و کەلوپـەلیان کۆدەکەنـەوەو دەڕۆن. بـەڵام

---

٩- work shop – کارگە

بزووتنەوەکـە کرێکـاری نــەبوو، هــیچ قــسەیەکیش لــەئارادا نــەبوو لەســەرنەوەی کرێکـاری بێـت و یــەکبن و پێکــەوە خــەبات بکــەن ، هیندییــەکان بـۆ خۆیــان ســەندیکایان هــەبوو بــەڵام ئێرانییــەکان نــەیانبوو. ئێرانییــەکان قینیــان لــە هیندییــەکان بـوو، چونکە زیـاتر کوێخاییان بەسەردا دەکردن.

ئێستا دەبوو هاوڕێ پەیدابکەم. سەرەتا هـاوڕێم لـەنێو کەسـانێکدا دۆزییەوە کە هەستی نەتەوایـەتیان هـەبوو لەگـەڵ شێخ خەزعـەل لـە ململانێدا. یەکەم کەسێك کـە دۆزیمـەوە، شـەعبان کاوە بـوو. شـەعبان کاوە یەکێك بوو لەو کەسانەی تایبەتمەند بوو بە بەرزکردنەوەی باری قورس بە دەزگاکەی، دەزکایەك بوو پێیادەوت "ریگ" [10]. شەعبان کاوە کەسـێکی پـاك بـوو. لەگـەڵ ئـەوەی خوێندەواریـشی نــەبوو زیــر و بەئەزمون بوو. سەرەرای ئەوە خـەڵکی ئابادانیـشی بـاش دەناسی. کـەم کـەم هاتوچـووی دارایـیم دەکـرد [11]. وردەوردە بـووین بـەهاورێی نزیـك. دوای ماوەیـەك بـۆم باسـکرد کـە مـن کێم و بەتـەمای چیم. زۆر پێـی خۆش بوو. وتی وەرە سەردانمان بکە. دووەم کەس کە کاوە باسـیکرد و منیش بەدوایدا گەڕام و دۆزیمەوە حەسەن عـەلی سابتی بـوو. سێهەم کەس کە دۆزیمەوە دارتاشێك بوو بـەناوی وەفـایی. دواتـر بـۆ خوێنـدن وەفاییم نارد بۆ مۆسکۆ [12].

بەرەبەرە لەنێو کرێکاران جێی خۆمـان کـردەوەو رێکخراوەکـەمان

---

[10] - rig - ئامێری بەرز کردنەوە .

[11] - کوڕێکی هەبوو کەدواتر بوو بە سەرهەنگ ئێستا لە ئێران نیە و خۆیشی مردووە.

[12] - رۆژێك لەبەندیخانە بوو ئەویشیان هێنا بۆ ئەوێ . ئێستا مردووە.

پەرەپێدا. کارەکە بەخێرایی دەچووەپێش. ئێستا کێشە ئەوەبوو کە چۆن لەناو خوزستان هاتوچۆ بکەم. لەبەرئەوەی ئینگلیزەکان هەموو شوێنێکیان تەلبەندکردبوو کەس بۆی نەبوو هاتوچۆ بکات. میوانخانەشی لێنەبوو. دەیانپرسی بۆ کوێ دەچیت و بۆچی هاتویت و کارت بەکێیە و لەکوێ دادەنیشیت؟ هەر بەو هۆیە چوون بۆ شارەکان دژواربوو. منیش تورکزمان بووم. هاورێکان شتەکانیان ئامادەکرد، بەنیاز بووم بچم بۆ ئاغاجاری، ئاغاجاریش تەلبەند بوو، بەر دەرگاکەشی پاسەوانی لێبوو. لە هیچ شیوێنیکەوە بوارنەبوو بچیتە ژوورەوە، ئەملاولاشی کێو بوو. راوێژم بەهاورێکانم کرد چیبکەم و چۆن بچمە ژوورەوە. وتیان ئەمانە متمانەیان بەهیندیەکان زۆرترە تا ئێمە و هیندیەکان لێرە پینەچییەتیان هەیە. ئێمە چوار جووت پێڵاوت بۆ وەردەگرین و بیبە و بەو بیانوەوە بچۆ ژورەوە. هەڵبەت هاورێکانیشیان پێناساندبووم کە لەگەڵیان دانیشم و قسەبکەم.

چوومە بەر دەرگای ئاغاجاری وتم کارم بە کێیە. بینیم پیاوێکی هیندیی بەتەمەنی زۆر میهرەبان هات و لەباوەشی گرتم و ماچیکردم و جانتاکانی لێوەرگرتم. پێموت نابێت تۆ هەڵی بگریت بۆ خۆم هەڵیدەگرم. یەکیان ئەو هەڵیگرت و یەکیان من، چووین بۆ ماڵەکەی. ئێستا رێزگرتنی ئەو پیرە پیاوە بۆتە مایەی دواکەوتنی کارەکانم، بۆ هەرکوێ دەڕۆم لەگەڵم دێت بۆ ئەوەی شوێنەکانم پێ نیشانبدات. لەکۆتاییدا پێموت کە تۆ لەگەڵم دێیت و دەچیت تەریق دەبمەوە. من ئەم چەند رۆژەی لێرەم دەمەوێت ئەو کێوو شاخانە بگەڕێم و ئەگەر تۆم لەگەڵ نەبیت باشتر دەتوانم بچم، چونکە من گەنجم. قبوڵیکرد.

هاورێیانم دۆزینەوەو رێکخراوێکمان پێکهێنا. دواتر لەرێگەی کرێکارەکانەوە رێکخراوەکەمان لە هەموو شوێنەکان گەشەی کرد و فراوانبووەوە، پێویستیی بەکادر بوو. کارەکان دەبوایە سەرپەرشتی بکرێن و کێشەکە ئەوە بوو هەموو شتێك لەخوزستان قەدەغەبوو. ئێرانییەکان بۆیان نەبوو یانە و هەرەوەزگە و ئەو شتانەیان هەبێت کە لایەنی کۆمەڵایەتیی هەیە.

من چووم بۆ دیتنی وەزیری رۆشنبیریی ئابادان و پێموت دەمانەوێت یاریگامان هەبێت، ئێمەش ئێرانین. گەنجێکی زۆر باش بوو رێگەی پێداین و ئێمە یەکەم یاریگامان دامەزراند. ئینگلیزەکان کردیان بەهەرا. بەڵام خەڵك، ژن و پیاو گەورەو بچوك هاتن بۆ سەیری یاریگاکە و زۆر پێیانخۆش بوو کە ئێرانییەکانیش یاریگایان هەیە، ئینگلیزەکان هەرزوو چواردەوریان گرت و خستیانە ژێر چاودێری. دوو مانگ گێرەوکێشەمان بوو. یاریگاکە بەس چالاکیی وەرزشیی تێدادەکرا بەڵام بۆ راکێشانی خەڵك زۆر باش بوو هەموو شار روویان لەوێ دەکرد. دوای دوو مانگ یاریگاکە لەلایەن پارێزگارەوە داخرا و چیدی نەکرایەوە.

بۆ رێکخراو کادر پێویستبوو، لەبەرئەوە قوتابخانەیەکی شەوانەی نهێنیمان دامەزراندو من لەمەڕ سەندیکاکان وانەم بەو کەسانە دەوتەوە کە جێی متمانە بوون. کەسێکیان پێناساندبووم کەخەڵکی ئاستارا و ناوی میرئەیوب شەکیبا بوو. وەك شتێ دواتر لە ورمێ (ناوەندی پارێزگای ئازەربایجانی رۆژئاوا .. و. ك) بەتۆمەتی هاوکاری لەگەڵ پیشەوەری کوژرا. پێموت ئێوە لێرەدا ناتوانن هیچ کارێك بکەن

چونکە پێتاندەزانن. لەڕۆشنبیرییەوە هاتبوو لەوێ وانەی دەوتەوە. بە شەکیبام وت ئێوە وەرن و بەنهێنی تەنها وانەی فارسی بڵێنەوە. چەند کادرێکمان پەروەردە کردبوو بەڵام ئەوە بەس نەبوو. لەم نێوەدا ساڵێك دوای هاتنی من لەلایەن سەندیکای جیهانییەوە ڕەحیم هیمداد نێردرا بۆ هاوکاریم کە قوتابیی زانکۆی KUTTV بوو لەمۆسکۆوە یەکترمان دەناسی، لەچەند کەناڵەوە پێوەندیمان لەگەڵ سەندیکای جیهانی هەبوو. ئێمە نامەکانمان دەدا بەعەلی ناوینی. ئەویش لە تاران دەیدا بەسەندیکا، ئەوانیش دەیاننارد. لەم ڕێگەیەوە ئێمە پەیوەندیمان هەبوو. بەشێك لەهاوڕێیانمان لەوانە حسێن شەرقی و ئارش و رەزا قولی ی برای لە تاران بوون. رەزا قولی لەگەڵ ئەوەدا کۆمۆنیست بوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو بەڵام سەندیکالیست بوو. کارەکەی زۆرتر کاروباری کرێکاری بوو. سەروکاری لەگەڵ سەندیکای کرێکاران هەبوو.

لە خوزستان ڕێکخراوەکەمان زۆر باش کەوتبووە سەرپێی خۆی، کاتێك ڕەحیم هیمداد هات من یەکەم ڕۆژ دامەزراند. بەڵام لەرووی مادییەوە بارودۆخمان زۆر خراپ بوو. من مانگانەم هەشت تمەن بوو کە دواتر بوو بە دە تمەن. ڕەحیمیش مانگی هەشت تمەنی وەردەگرت سەرجەم مووچەکەمان هەژدە تمەن بوو. من خەرجی ماڵەوەم دابووە دەست ئەو چونکە شارەزا نەبووم. خانوویەکی سەربەخۆمان گرتبوو بەچوار تمەن. دەماوە چواردە تمەن. بەو چواردە تمەنە دەبوایە ئێمە دوو کەس پێی بژین. لەبیرمە تەنانەت یەك ڕۆژیش لەدەرەوە نانمان نەدەخوارد چونکە نەماندەتوانی. بەڵام ڕۆژانی هەینی دەچووین بۆ

نەخلّستان لەوێ کەسێکی کرماشانی چاپخانەی هەبوو. دەیانوت خواردنی خۆشی هەیە. پیاوێکی میهرەبان بوو. ڕۆژێکیان پێش ڕەحیم گەشتمە ئەوێ، وتم چایەکم بۆ بێنە. کاتێك ڕەحیم هات وتم من چایەکی زیادم خواردووە وتی ئێمە نیمانە و من نایدەم. وتم تۆ بیدە لەشتێکی تر لە خۆم دەگرمەوە، ئەوەندە دەستکورت بووین و هەرئەوەش وایکرد سەرکەوتوو بین، لەبەرئەوەی وایاندەزانی کەسێك ژیانی بەمجۆرە بێت ناتوانێ سیاسی بێت. لەرۆژی یەکەمەوە تا ئەوڕۆژەی گیرایین ئینگلیزەکان سەرنجیان نەچووە سەرمان، ڕێکخراوەکە زۆر پەرەی سەند و ئێمە دەمانتوانی زۆر کاری گەورە ئەنجامبدەین.

## مانگرتن

لەوسەردەمەدا وتووێژێك دەربارەی نەوت دەستیپێکردبوو. دەبوایە ئینگلیزەکان پاش سی ساڵ دامەزراوە نەوتیەکان جێبێڵن و رادەستی ئێرانی بکەن و کاریان بەسەر هیچەوە نەبێت. بەلاّم ئەوان دەیانویست ئەو ماوەیە درێژبکەنەوە، یەکێك لەنەخشەکانیان لەدامەزراندنی حکومەتی رەزاشا ئەوەبوو کە ئەو رێککەوتنە لە ٣٠ ساڵەوە بکەن بە ٦٠ساڵ. ئێمە لەو سەردەمەدا لایەنگرمان زۆر بوو، تەنانەت لەنێو نەتەوەییەکانیشدا لایەنگرمان هەبوو ئەوانیش خۆشیان دەویستین. بڕیار بوو ئەو رۆژەی کە ئەو گرێبەستە دەچێت بۆ پەرلەمان بەکرێکارەکان بڵێین مانبگرن. هەربۆیە پێمانوتن وردەوردە خۆیان ئامادەکەن. ڕۆژێك دوو کرێکار بەشەرهاتن. یەکێك

لـەوان دەچـێت بەسـکرتێر دەڵێـت ئـەم کەسـە داوای لێکـردووم ببمـە ئەندامی سەندیکا. ئەویش خەبەردەدات و دەچن و ماڵەکەی دەگـەڕێن و مەرامنامەیـەکی دەسـتنووس دەدۆزنـەوە. ئینگلیزەکـان پـەلاماری ئەوانە دەدەن کە لە دامەزراندنی یانەکە بەشداربوون. دێن ئەنـدامانی یانەکـە دەگـرن و ئێمەشـیان گـرت. بـەڵام بەرلـەوەی ئێمـە بگـرن، دەستپێشخەریی خۆمـان کردبـوو. لەوانـە ژمارەیـەك لـەو کرێکارانـەی ئینگلیزەکـان لـە کـار دەریـانکردبوون لـە ئاسـایش دامانمەزرانـدبوون. بەشێك لە پۆلیسەکان لە ئابادان و ئەھوازو شوێنانی دی لـە ھاوڕێیـانی خۆمان بوون. ئەوان ھاوکات لەگەڵ ئەوەی پاسەوان و پۆلیس بوون لـە کۆبوونەوەکانی ئێمـەدا بەشـداریاندەکرد. ئەنـدامانی یانەکـەیان گـرت. روکنەدین موختاری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیی خوزسـتان بـوو. لـە ئەھوازەوە بۆ لێکۆڵینەوە ھاتبوو بۆ ئەوێ.

پـێش ئـەوەی ئێمـە بگـرن گێچەڵێکی سـەیر ھاتـە پـێش. کاتێـك بیستم ھاوڕێیانمان گیراون کاسبکارێك کـە نوسـینەکانی نێـوان ئێمـە و تارانی دەھێنا و دەبرد پێموت: ئەم مەسەلەیە لای کەس باس نەکات و ھەر نامەیەك ھاتووە بیدڕێنێت و بـەویش بڵـی ئەگـەر نامەیـەك ھـات بیدڕێنە. کە چوومە لای نامەیـەك تـازە ھـاتبوو کونجکۆڵی وایلێکـردم بیخوێنمەوە. سـەر دووکانەکـەی چایخانەیەکی لێبـوو. چومە ئـەوێ و خوێندمـەوە. دیـتم نامەکـە ھـی حـسین شـەرقی ە "قوتـابیی خـولی یەکـەمی KUTTV " و نوسـیویەتی ھـاتوم بـۆ تـاران و بـا نامـە لەنێوانمانـدا ھـەبێت و ئەمـەش ناونیـشانەکەمە. ئەگـەر ئـەو نامەیـە بەردەسـت بکەوتایـە ھاوڕێیـانی تـاران غـافلگیر دەبـوون و ھـەموویان

دەگیران. لە خوێندنەوەی نامەکەبوومەوە بینیم رەزای لێکۆڵەر کە هەموو دەیانناسی، خەریکە دێتە سەرەوە. بەهێواشی نامەکەم خستە گیرفانمەوە. پێیوتم لەخوارەوە کاریان پێتە. لەدڵی خۆمدا وتم کە چوومە خوارەوە نامەکە دەدڕێنم و دەیخەمە جۆگەیەکەوە و هەڵدێم. دواتر خۆم دەچم بۆ ئاسایش و پێیاندەڵێم چیتان دەوێت؟ بەلام چووم بینیم بەرپرسی سیاسیی ئاسایش لەگەڵ دوو پاسەوان لەوێ وەستاون و ئەم نامەیەش لەگیرفانی مندایە. چووین بۆ ئاسایش، بەرپرسی ئاسایش پیاوێکی لووتبەرز بوو بەناوی سولەیمانخان. وتی بیبەن. من لەگەڵ دوو پاسەوان و لێکۆڵەرێك و بەرپرسێکی ئاسایش بەرێکەوتین. لەرێگا لێی پرسیم ماڵتان لەکوێیە؟ وتم کارت بەدارایی ئێمە چیە؟ پێیانوابوو ماڵمان نزیکی یانەکەیە. لەوکاتەدا هەلێك هەلکەوت نامەکە لەگیرفانمدا بدڕێنم بەلام نەمتوانی دەریبێنم. وتی پێمانخۆشە لە ماڵەکەتان چایەك بخۆینەوە. وتم یەکەمجار واتان بوتایە، دارایی ئێمە لەڕۆژهەلاتە و ئێرە ڕۆژئاوایە. بەرپرسی ئاسایش برێك قسەی بە ڕەزای لێکۆڵەر وت کە ئێوە چۆن تا ئێستا نەتانزانیوە ئەمانە لەکوێ دەژین؟ گەیشتینە ماڵەوە. وتی لەدەرگا مەدە دەگاکەم بەکلیك کردەوەو چوینە ژوورەوە.

پێشتر وتبوم هەرچی نوسین و بەلگە هەیە بیسوتێنن. دیتم شەعبان کاوە و رەحیم هەموو شتێکیان سوتاندبوو. ئیستاش خەریك بوون ئاویان پێدادەکرد. وتی ئەمانە خەریکی چین، وتم هیچ ئەو کاغەزانەی کە شتیان پێوە دەپێچینەوە زۆر بوون ئێمەش تەنەکەی خۆڵمان نیە هەربۆیەش دەیانسوتێنین، بەس ئامێرێکی چاپکردن

مـــابوو بـــەجوانی نـــەتوابووەوە کـــە ئێمـــە پێـــشتر نوســـینەکانمان پێراکێشابوو کاتێك گرێبەستەکەی جان کیدمەن دەچێت بۆ پەرلـەمان ئێمە مانگرتن رێکبخـەین. لەوکاتـەدا کـە خـەریکی ئـەو قسانە بـووین دوان لـــەکرێکارەکانیش هاتنـــە ژوورەوە، بـــوین بـــەپێنج کـــەس. بەرپرسەکە وتی تـەواوی شـتە سـوتاوەکان کۆبکەنـەوەو بیبـەن. دواتـر نێـو ماڵەکـەیان پـشکنی و کۆمـەڵێك وێنـە کـە هـەمانبوو هـەڵیگرتن، ماڵەکەی ئێمەش هەمووی حەسیر بوو ئەرزەکەشی جگە لەخۆڵ هیچی لێنـــەبوو، وتـــی: ســـەیرکە ئێمـــە هیـــچمان هەڵنـــەگرتووە، ئـــەوەی هـەڵمانگرتووە خـۆت ببینـە و دەرگاکـە داخـە، مـن چـووم هەنـدێك پارچـــەی نامەکـــەم فرێدایـــە ســـەر زەوی بـــەڵام هێـــشتا هەنـــدێکی لەگیرفانمـــدا بـــوو. دواتـــر هاتینـــە دەرەوە. دیـــتم ســـەرۆکی ئاســـایش بەئوتومبیل گەیشت. وتم: من بەم شێوەیە نـاڕۆم. بەرپرسـی ئاسایش وتـی ئـا تـۆ سـواری ئوتومبێلەکـە بـەو ئـەوانیش لەگـەڵ پۆلیـسەکان دەڕۆن. دانیـشتم و پۆلیـسەکان لـە نـەزانیی خۆیـان منیـان نەخـستە ناوەڕاست خستیانمە لای دەرگاکە، کەڵکم لەوە وەرگرت و ئوتومبیلەکـە کە خێـرا دەڕۆیـشت وردە وردە پارچـەکانی دیکـەی نامەکـەم دا بـەدەم باوە. دیتم هیچ لە گیرفانمدا نەماوە. تـا ئەوکاتـە زۆر دەترسـام. دواتـر دەستمکرد بەتانەلێدانی پۆلیـسەکان، پێمـوتن ئینگلیزەکـان فـەرمانیان پێکـردون ئێمـە بگـرن. شـەرم ناکـەن. ئـەم کاغـەزە سـوتاوانە دەبێـت ئینگلیزەکان بزانن چیە، لەوانەیە دژی ئەوان بێت. ئێوە شـەرم ناکـەن یانەکەتان داخست ئێستاش هـاتون ئەنـدامانی یانەکـە دەگـرن کـە دژی ئینگلیزن. لەلایەن نامەکەوە هیچ ترسم نەمابوو.

گەیشتینە ئاسایش. زیندانەکە سێ ژووری هەبوو دوانیان گشتی بوون، گوایە ئەویتریان دانابوو بۆ کەسایەتییە بەرێزەکان. قەرەوێڵە و سەرچەف پاکی تێدابوو، دەرگاکەم داخست. هەوا زۆر گەرم بوو، ١٣ی گولان بوو، خەریك بوو دەخنکاین. نیوەشەو پاسەوانێك هاتوو وتی بەڕێز بفەرموون کاریان پێتە. ئەمانە نیوەشەو گیراوەکانیان بانگدەکرد بۆئەوەی بترسن و دان بەتاوانەکەدا بنێن. کە لەزیندانەکە دەهاتمەدەرێ دیتم لەحەوشەی ئاسایش کۆمەڵێك لەهاوڕێیانی ئێمەیان هێناوەو لەسەر زەوی دانیشتون و پێکەوە قسەدەکەن. منیان برد بۆلای موختاری، موختاری پرسیاری دەکردو بەرپرسی سیاسی دەینوسی. دەرکەوت نووسینی باش نیە. موختاری وتی ئەمە بگۆڕن ئەفسەرێکی دی هات و لێکۆڵینەوە بەردەوام بوو. لێی پرسیم لەکوێوە هاتوی و هەرئەوشتانەم وت کە پێشتر وتبووم لە قومەوە هاتووم و لەمجۆرە قسانە. لێی پرسیم ئەم کاغەزانە چین کە لەماڵی ئێوە هێناویانە؟ وتم کاغەزی بێکەڵکن. ئێمە بەردەوام ئەم کاغەزانە دەستوتێنین. جیهازی چاپەکەی پیشاندام و وتی ئەمە دەچێت بەگیرفانی کەسدا؟ وتم بۆچی (یەکێك لەوان ناوی نایب حسن خان بوو گیرفانیشی گەورە بوو) وتم: ئەی بۆنا، گیرفانی نایب حسن خان. وتی نایب حسن خان بانگ بکەن. بانگیانکردو بەرێکەوت بەقەدەر گیرفانی ئەو بوو. وتی ئەمە لە دارایی ئێوە هاتۆتە دەرەوە، ئەمە چیە. وتم ئەمە بەزۆری لە کارگە دارتاشیەکان بەکاردێت و لە دارایی ئێمە بەیانهێناوە. خۆ من دز نیم کەلوپەلی کۆمپانیا بەرمەوە بۆ ماڵەکەم. ئەمە لەدارایی من نەبووە. بەدڵنیایی هی دارتاشەکانە. لەوانەیە لەوێ

هێنابێتیــان. زۆر لــەو پرســیارانەی لێکــردم و منیــان بــردەوە بــۆ ژوورەکەی خۆم. بەڵام من پێم خۆشبوو لێکۆڵینەوەکە درێژە بکێشێت، لەبەرئــەوەی ژووری لێکۆڵینــەوە پانکــەی لێبــوو، فێنــك بــوو، بــەڵام ژوورەکــەی مــن زۆر گــەرم بــوو خــەریك بــوو دەخنکــام. گەڕامــەوە و خــــەوتم. پاســــەوانێك دەرگاکــــەی کــــردەوەو هاتــــە ژووریٚ. بینــــیم لــەهاوڕێیانی خۆمانــە. وتــی مــن لەگــەڵ هاوڕێیــان پەیوەنــدیم هەیــە. ئــەوان چــاوەڕێن مۆڵــەت بــدەی بــۆ مــانگرتن. وتم دەتــوانی زوو پێیــان بگەیت؟ وتی ئوتومبێلم پێیە، پێیاندەگەم. بیرمکــردەوە ئەگــەر شــتێك نەکــەین گرێبەســتی دارســی درێــژ دەکرێتــەوە و ئێمــە دەدۆڕێــین، وتم بڕیاری مانگرتن بدەن.

بڕیاری مانگرتن دەرچوو. لەم نێوەدا لێکۆڵینەوەکانی روکنەلدین موختاری بەردەوام بوو. دەیانپرسی تەمەنت چەندە؟ ناوی خێزانیتــان چیە؟ لە کویٚ و کویٚ بوویت؟ کەسانێك کە ســەردانیان دەکــردن شــتیان بەدەستەوە بوو یا  نا؟ رەحیم و کاوە لــەدارایی تــۆ چیان دەکــرد، ئــەو کاغەزانە چی بوون کە ئاویان پێدا دەکردو ئــەو چاپکراوانە چــین کــە گرتوومانە و لە کوێتان هێنــاون و لــەم قــسانە. هەڵبــەت وەڵامــەکانیش ئەوە بوون کە وتم رەحیم هیمداد پورزامە و پێکەوە لەوماڵەدا دەژیــن و ئەوە ماڵی ئەویشە. ئەو کاغەزانەش  کاغەزی بێکەڵکی میوەفرۆش و کاسبکارەکانە دەماندەنیٚ و لەوێش بەرمیلی خــۆڵی شــارەوانی لیٚ نیــە، ئێمــــەش دەیانــــسوتێنین. قونــــاغی یەکــــەمی لێکۆڵینــــەوەکان لــــەم چوارچــێوەیەدا بــوو. کرێکــارانی حەوشــەش دەیانبیــست و ئاگــاداری دۆخەکە بوون، چونکە هەوا گەرم بوو پەنجەرەکان کرابوونەوە.

پۆلیسەکان هەموو شوێنەکانی لەشفرۆشی گەڕابوون تا بزانن من چووم بۆ ئەو شوێنانە، لەناوشارو لە کرێکارەکان پرسیاریان کردبوو تا بزانن من جگە لەو دە تمەن مووچەیە پارەی دیکەم خەرجکردوە یان نا؟ بەڵام هیچیان دەست نەکەوت، بەڕاستیش هیچ نەبوو. هەربۆیە دڵنیابوون کە ئەوەی کرێکارەکان کردوویانە خۆکردە. ئەوانەی لەباکوورو ئازەربایجانەوە هاتبوون، نەختێك هەستیار بوون بەڵام لە لێکۆڵینەوەکاندا گوشاری زۆریان نەدەهێنا، بەس خەویان لە ڕەحیم هیمداد زڕاندبوو، ویستیان کەلەپچە بکەنە دەستی منیش، من دەستمکرد بەگاڵتە پێکردنیان، چونکە پێشتر لە بەندیخانەی نارین قەڵای ئەردەبیل زیندانی کرابووم و ئەم زیندانە بۆ من وەك کەسانێك ترسناك و ترسێنەر نەبوو کە یەکەمجاربوو بگیرێن. بەرامبەریان وەستابووم تەنانەت بە ڕەقی پێمدەوتن بۆچی بوون بە داردەستی ئینگلیزەکان؟ دەیانوت: ئێمەش وەك ئێوە وڵاتەکەمان خۆشدەوێت. بەڵام کاری ئێمە ئەوەیە هێمنی سەقامگیر بکەین و لەمجۆرە قسانە. دواتر هەواڵیان هێنا کە بەیانی دەیانەوێت بمانبەن بۆ ئەهواز. لە گرتوخانەی ئابادان بووین و فەرمانی مانگرتنیشمان دابوو مسۆگەر دەبوایە بکرێت. لەبەرئەوەی ئەگەر لەمانگرتن دوابکەوتنایە سوجان کیدمەن پەیماننامەکەی واژوو دەکرد و بەدەستی پڕ دەگەڕایەوە. ئێمە دەمانویست ئەو پەیماننامەیە پەکبخەین. جگە لەئێمەش کەسی دیکە نەبوو. لەبەرئەوەی دیکتاتۆریەتی ڕەزاشا هەموو ئازادیخوازانی سەرکوت کردبوو. زۆرێك لە پیاوان لە هەوڵی ئەوەدابوون بەدامودەزگاکانی شاهنشاوە پەیوەست بن. دووبارە وەکالەت و وەزارەت

و نـەوجۆرە شـتانە وەربگرنـەوە. هەربۆیـە بیریـان لـەوە نـەدەکردەوە لەهیچ شوێنێکی ئێران هیچ نارەزایەتیەك هەبێت و نەشبوو.

لەناوەنـــدیش ســـەندیکاو یەکییـــەتیمان هـــەبوو بـــەلام یەکیەتییەکەمان زۆر لاواز بوو، جگە لە لاوازی گەنـدەڵیش تـەنیبووی. گەندەڵی بریتیبوو لەوەی کە ڕاپۆرتی ناڕاستیان بە سەندیکای جیهانی دابوو، بەسەندیکای جیهانییـان وتبـوو حـەفتا هـەزار ئەنـدامیان هەیـە لەکاتێکـدا وانـــەبوو. ژمارەیـــەك پینەچـــییان هـــەبوو (کـــەکرێکاری پیـشەسازیش نـەبوون) و نزیکـەی سـەد کەسـێکیش لـە کۆڵبـەرەکانی ئەنزلی. هەر بۆیە نە لەهاوڕێیانی ئێمە کەس دەیتوانی کارێك بکات و نەکەسانی تریش. دواتر خێڵی قەشقایی نەختێك دەنگە دەنگیان کـرد، ئەویش لەدوای مانگرتنەکە بوو، لەبەر ئەوە بەهەر نرخێکە دەبوایـە ئەم مانگرتنـە ئـەنجام بـدرێت. بڕیـاری مـانگرتن درابـوو بـەلام ئـەوان ئاگادار نەبوون کە فەرمانی مانگرتنمـان داوەو هـەواڵیان بـۆ هێنـام کـە بەیانی کۆمەڵێك دەبـەن بـۆ ئـەهواز. بـەیانی زوو هێـشتا دنیـا ڕوونـاك نــەبیبۆوە هاتنــەلام ، وتیــان وەرەدەرەوە چــوومە دەرەوە، ســەیرمکرد ئوتومبێـل ئامادەیـە. وتیـان دەچـین بـۆ ماڵەکـەی خـۆت. جلـەکانت و هەرشـتێکی دی کـە پێویـستە هـەڵیانبگرە. لـە ماڵـەوە هەنـدێك جلـم هەلگرت. سەیرم کـرد هـیچ بەلگەیـەك جێ نـەماوە. لـەو بابەتەشـەوە ئەرخەیان بووم. کاتێك کە گەڕاینەوە بـۆ ئاسـایش دەنگەدەنگێکی زۆر دەهـات. تێگەیـشتم کرێکارەکـان مانیـانگرتووە. ئێمـە نزیکـی بنکەکـە بوینــەوە ئــەوانیش هــەر نزیــك دەبونــەوە بۆئــەوەی کــە چــوار دەوری ئاسایش بگرن. ئێمـە گەیـشتین و کرێکارانیش گەیـشتن و چواردەوری

ئاسایشیان گرت. زۆری پێنەچوو گەمیە جەنگییەکانی ئینگلیزەکان هاتن. هەرچی هێزی سەربازی لە خوزستان و هەرچی پۆلیسی چەکدار هەبوو هێنابوویان بۆ ئابادان. لەپێشدا چواردەوری ئابادانیان گرت و لەدوای ئەوە پەلاماری کرێکارەکانیان دا. لەو قۆناغەدا داواکاریی کرێکاران ئەوە بوو کە هاوڕێکانمان ئازاد بکەن و گوێ بۆ قسەکانمان بگرن. موختاری هات و بەڵێنی شەرەفی پێدان کە ئێوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانی خۆتان بەیانیش ئەمانە ئازاد بکەین. ئەمانە خۆ گوناحیان نەکردووە، مانیانگرتووەو دەڵێن چیدی کار ناکەین، خۆ خەتابار نین.

کرێکاران گەڕانەوە ماڵەکانیان. بەیانی نەیانهێشت لە ماڵ بێنە دەرەوە. گرتن دەستیپێکرد. نزیکەی سێ سەد کەسیان لەژن و پیاو دەستگیرکرد. لەدەرەوە کەسانی دیکەش هاتنە ڕیزی مانگرتوان. ژنانی کرێکارانیش هەموو لەمانگرتندا بەشدارییان کرد. هەروەها خەڵکی خۆرەمشەهر، نەتەوەییەکانی خورەمشەهر هاتن بۆ ئابادان و لەمانگرتنەکەدا بەشدارییان کرد، مانگرتنەکە لەڕاستیدا تەنها هی کرێکاران نەمایەوە، گشتگیر بوو. لەلایەن کرێکارانەوە دەستی پێکرد و خەڵك پەیوەستبوون بە کرێکارانەوە. ئەوانیان گرت. نزیکەی سێسەد کەس لەگەڵ ئێمە بوون، لە ئەهوازیش چەند کەسێکیان گرت، چەند ژنێکیش ئازاد بوون. هیچ بەندیخانەیەك نەبوو. هەموومانیان برد بۆ تەلاریك کە هی ئاسایش بوو، لەوێ لێکۆڵینەوەیان دەکرد. من و ڕەحیمیان لەکرێکارەکان جیا کردبۆوە. لە ئابادان لەهەر کەسێك دەبووە گومان یەکسەر دەیانگرت. لەم جووڵانەوەیە دەترسان. بۆ

خۆپاراستن باری نائاساییان راگەیاندبوو. دەترسان دیسان دەستپێبکاتەوە. بەڵام سوجان کیدمەن بەپەلە ڕۆیشتەوە و نەیانتوانی پەیماننامەکە واژوو بکەن و ماوەی نەوتەکە درێژ نەکرایەوە. مەبەستی ئەوان درێژکردنەوەی گرێبەستە نەوتیەکە بوو کە سەرکەوتوو نەبوون. یەکێك لە مەستەکانی مانگرتنەکەی ئێمەش ئەوەبوو ئەو پەیماننامەیە پەکخەین و نەهێڵین سەربگرێ. ئەمە یەکەمجار بوو لە ئێرانی سەردەمی پەهلەویدا بەجووڵانەوەیەکی سەرتاسەری گرێبەستێك هەڵبوەشێتەوە.

لێرەدا جێی خۆیەتی لەسەر رۆڵی ژنان لەم خەباتەدا قسە بکەین. ئێمە کاتێك دەستماندایە ڕێکخستن، هەر کرێکارێکمان رێکدەخست وردە وردە دەچووینە ناو بنەماڵەکەشی و هەرکەسێکمان رێکدەخست هاوسەر و کچەکەشی لەگەڵ بوو. بەمپێیە ئەنداممان لە هەردارایيك هەبوایە ئەندامانی دیکەی خێزانەکەیشی وەك ئەندام وابوون، پیاوان شانەی رێکخراویان هەبوو بەڵام ژنان نەیانبوو، دەترساین پێیان بزانن. بەو بنکە بنەماڵەییانە ڕازیبووین مەگەر ناچاربووینایە کارێك بە ژنان بسپێرین. کاتێك لە ئاسایش زیندانی بووم، موختاری ئەو شەوانەی کاری نەبوایە بانگی دەکردم و قسەی لەگەڵ دەکردم. شەوێکیان پێیوتم بەڕێز ئەردەبیلی[١٢] پێم سەیر نیە کە یووسف ئەردەبیلی کارێکی نەدۆزیوەتەوەو هاتوە بۆ ئابادان بە

---

[١٢] – لەبەر ئەوە تائەم دواییانە لەبەندیخانە هاتمە دەرەوە کەس نەیدەزانی نازناوی من ئیفتخارییە . لە ئابادان ناسنامەم بەئەردەبیلی وەرگرتبوو. ئەو ناسنامەی ئیفتخاری لەیٰ مەنزەلی وەرم گرتبوو سوتاندم تا بەردەست نەکەوێت و بنەماڵەکەم ئازار نەدەن.

مانگی هەشت تمەن کار دەکات، بەڵام لە ئێراندا کە هێشتا رووبەندی بەسەرەوەیە ئێوە چۆن توانیتان ئەو ڕێکخراوە پێکبێنن. من لەوە سەرم سوڕماوە کە تۆ چۆن چوویتە نێو ئەوان و پێیان نەوتوویت تۆ بێگانەی. نەیانوتووە ئەمە کێیە و لەکوێوە هاتووە؟

ئێمە لەنێو کرێکاران و بنەماڵەکانیان جێی خۆمان دەکردەوە. لەناویانـدا کەسانی زۆر وشیار هەبوو کە لەبنەڕەتدا کاری ڕێکخراوەییان دەزانی. خۆیان بەرەوپیرمان دەهاتن. دەیانزانی کە سودی هاوسەرەکانیان لەوەدایە کە لەم سەندیکایەدا بن و ئەم سەندیکایەیان بوێ. یەکێك لەوانە ژنێك بوو بەناوی زەهرا کە ئەگەر بەهەڵەنەچووبم هاوسەری سادق یان موسەدیق ناوێك بوو. ژنێك بوو کە لەبیر ناچێتەوە، خەڵکی لوڕستان و بەڕاستی ژنێکی شۆڕشگێڕبوو. زەهرا دەچوو سەردانی بنکە و بنەماڵەکانی دەکرد لەبەرئەوەی بنکەی جیاوازی ژنانەمان نەبوو، فەرمانەکانی لە ئێمە وەردەگرت و بەوانی ڕادەگەیاند. هەروەك پێشتر باسمکرد قوتابخانەیەکی نهێنیی سیاسیمان هەبوو کەهەر لەوێدا ئەو کەسانەی کەخوێندەوارییان نەبوو فێری خوێندەواریمان دەکردن و منیش برێك زانیاریی سیاسی و سەندیکاییم فێردەکردن. بەو هۆیەوە ژمارەیەکمان وەك کادرو نیوەکادر پێگەیاندبوو، کە یەکێك لەوانە زەهرا بوو.

زەهرا یەکێك لەژنانی شۆڕشگێڕی لوڕستان بوو کاتی مانگرتنەکە یەکەم کەس کە لەبەردەم کۆمپانیای نەوت قسەی بۆ کرێکاران کردو وتی فەرمانی مانگرتن دەرچووە ئەو بوو. گوایە ئەو قسەیەی کە وتبووی کاتێك ژن خەبات دەکات، پیاو ناتوانێت خەبات نەکات

کاریگەری زۆری دانابوو. کاتێك کە ئێمەیان گرت و هێنایانین بۆ ئەهواز، زەهراش هات. هەڵبەت ئەو نەگیرابوو. زەهرا هات و ڕۆیشت بۆ لای موختاری وتی دەمەوێت یووسف ببینم. موختاری وتی یووسف چی تۆیە؟ وتی برامە. روکنەدین موختاری پێیوتبوو تۆ لۆڕو ئەو تورك چۆن دەبیتە خوشکی ئەو؟ وتی ئێمە لەو لۆر تورکانەین کە خوشك و برای یەکین. من هەردەبێ خۆم چاوم بە یووسف بکەوێت. هات، پۆلیسیش لەتەکمان وەستا. زەهرا پێی وت بچۆ دواوە من لەگەڵ براکەم قسەدەکەم. وابەتوندی فەرمانی کرد پاسەوانەکە بەقسەیکردو دوورکەوتەوە. وتی لەدەرەوە دەیانەوێت پارەمان بۆ بنێرن من ڕازی نەبووم. وتم ئێمە هێشتا زێڕمان ماوە دەیفرۆشین و دەیدەین بەهاوڕێیان لە بەندیخانە خەرجی بکەن. من زۆرم پێخۆش بوو گرتم و دەستیم ماچکرد وتم کارێکی باشت کردووە، گرنگ ئەوەیە هیچ لەکەس وەرنەگرین و قەرزاری کەس نەبین. خۆمان پارەمان هەیە. بە برسێتی دەمێنینەوە و خواست و پێویستیشمان نیە. هەربۆیە زەهرا چ لەباری بیرو باوەڕو چ لەباری رەوشتییەوە ژنێك بوو کە دەتوانی بەمانای وشە پێی بڵێی قارەمان. گەورەترین کێشە ئەوەبوو کە لە ئێراندا زۆربەی ژنان نەخوێندەوار بوون و نەیاندەخوێند.

دواتر بیستمەوە کەدوای مانگرتنەکە ڕۆژنامەی **حبل المتين** چاپی کەلکەتە داکۆکیی باشی لەکرێکاران کردووەو هێرشی کردۆتە سەر دەوڵەت. ڕۆژنامەکانی میسریش بەباشی بەرگرییان کردبوو تەنانەت نوسیبویان کە ئێمە دەبێت خەباتی دژی ئیستیعمار لە ئێرانییەکان و کرێکارە ئێرانییەکانەوە فێربین. بیستمەوە کە یەکێك لەهاوڕێیانی

ئێمە چووبوو بۆ مۆسکۆو لە کۆنگرەی سەندیکای کرێکارانی جیهان هێرشی زۆریان کردبوە سەر کرێکارانی ئینگلیز کە ئێوە بۆچی لەوکاتەدا کە گەمیی جەنگی دەوڵەتی ئینگلیز هێرشی کردۆتەسەر کرێکارانی ئێران دژی ئەوەستاون و پشتیوانیتان لە کرێکارانی ئێران نەکردووە. ئەوە بۆ ئێمە مایەی دڵخۆشی بوو. لاهوتیش پارچە هۆنراوەیەکی بە ناوی "بۆ هاوڕێی زیندانیم" بۆ پشتیوانی ئێمە نووسیبوو[١٦]. هەڵبەت ئەم پشتیوانییانە باش بوون کاریگەری لەسەر ورەی گیراوەکان هەبوو. هەواڵی ڕۆژنامەکانیشمان پێ دەگەیشت.

بەکورتی دوای ئەوەی ئێمەیان هێنا بۆ ئەهواز کرێکاران داخوازی دیکەیان خستەڕوو. داخوازیەکانی ئێمە زۆر بوون: پەیماننامەکە درێژنەکرێتەوەو ئینگلیزەکان دەبێت ئێران جێبێڵن چونکە ستەمکارن، سەرباری ئەوەی سەروەتمان دەبەن ستەمکاریشن. ستەمکاریش دەبێت لەئێران بچێتە دەرەوە، ئەمە لایەنی درێژماوەی

---

[14] مەبەست ئەم پارچە هۆنراوەیەی خوارەوەیە کە لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٩ لە تاشکەند نوسراوە

چە ننگ و عار کسی را ز بند و زنجیر است      که در مبارزه صنف فعله چون شیر است

از ان زمان که شنیدم به جرم رنجبری      به کنج محبش شه، دوستم زمینگیر است

به شب نشینی زیندانیان برم حسرت      که نقل مجلسشان دانەهای زنجیر است

بگو به توده ئیران که ترك شکوه کند      جواب قلم فقگ ابیده شمشیر است

به چد جور و ستم ، اتحاد و تشکیلات      برای صنف ستمکش یگانه تدبیر است

ببین جسان شکم خواجه، سیر از آن نانی است      که رنجبر پی تحصیل ان ز جان سیر است

ستم نکر که ز محصول خویش نان خوردن      برای فعلەایران بزرگ تقصیر است

اسارت زن و بیداد شاه غفلت خلق      حکایتی است که بیرون ز حد و تدبیر است

به جنگ قلم جوان است روح لاهوتی      سفید مو شده اما گمان مبر پیر است

(دیوان ابو القاسم لاهوتی ، به کوشش احمد بشیری، چاپ اول ١٣٥٨ ش، تهران امیر کبیر ص ص ٦-٩٥).

سیاسـی بـوو. کورتماوەکەیـشی ئـەوەبوو دەرکردنـی کرێکـاران و فـایلی ڕەش نەمێنێ، هیچ هۆیەك نەبوو کە کەسێك بە یەکجاری دەربکرێـت. زۆتر ئـەو کەسـانەیان دەردەکـرد کـە برینـدار بووبـوون و ئـیتر توانـای کارکردنیـــان نـــەدەما و بیمـــەش نـــەکرابوون. ئێمـــە داوامـــانکردبوو دەرکردنـی یـەکجارەکی رابگیرێـت، ئەشـکەنجەدانی کرێکـار نـەمێنێت، کرێکارانیـان ئەشـکەنجە دەدا. فـەرمانیان پێـدەکردن بـڕۆ سەربکێـشە بەدیواردا. ئەو چارە ڕەشە ئەگەر نەیکردایە بۆ هەتا هەتایە لەسەرکار دەردەکرا. کرێکارەکان خانوویان نەبوو لە قـەراخ چـەمەکە دەخـەوتن. ئەوان داراییـان نـەدەدا بـەکرێکارەکان. ژنـەکانیان برسـێتییان دەکێـشا. زۆربەیان بـەزۆری لەشـیان بـەدەرەوە بـوو. دۆخێکـی زۆر نـاخۆش بـوو مـن لەشـوێنی دیکـە نەمـدیبوو. تەنانـەت لەتاجیکـستانیش کـە زۆر دواکەوتوو بوو. لەوێش وەهـا نـەبوو. جێگایـەکی سامناك بـوو. نـازانم ئینگلیزەکان لای خۆیان چۆن بیریان دەکـردەوە. مەگـەر ئەمانـە مـرۆڤ نـــەبوون. دەمانویـــست مووچـــەی کرێکـــاران زیادبکرێـــت و ســـەندیکا لەلایـەن کۆمپانیـاوە بەفـەرمی بناسـرێت، داوەری لـەنێوان هـەردوولا بکرێـت، دانوسـتان بکرێـت، کـەس سـتەمی لێنـەکرێت، لـەوجۆرە داواکاریانەمان هەبوو.

دوای دوو سێ ڕۆژ لێکۆڵینەوەکان وەستان. عەبدولأخان بـەهرامی بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی داد هات بۆ ئەهواز. بەهرامی خۆی بەمن ناساندو وتی من بەرپرسی ئاسایشی خوالێخۆشبوو خیابانی بووم، خۆم ئـازادیخوازم و خـاوەن شـکۆیش بڕوایـەکی زۆری بـەئازادی هەیـە. مـنی نـاردوە بـۆلای تـۆ کـەپێتبلێم خـاوەن شـکۆ فەرمویانـــە ســـەرەتای

فەرمانڕەواییمە، نامەوێت هیچ دەنگێك بەرزبێتەوە. بابێن و واز لەم جوڵانەوەیە بێنن هەر کارو پیشەیەکی دەوێت لەتاران پێیدەدەم و چیدی نەچێتەوە بۆ ئەوێ و ئەگەر ئەو پێشنیارە قبوڵ نەکەن بۆ هەمیشە دەیانخەمە زیندان تا کۆتایی ژیان. ئیستا خۆت دەزانی. وتم کە نەخێر. مەسەلە مەسەلەی من نیە و ئێمە دژی دەوڵەتیش هیچ کارێکمان نەکردووە. دژی شا ڕانەپەڕیوین، مانگرتنەکەی ئێمە هیچ قسەیەك لەسەر شا ناکات، کەخاوەن شکۆ سەرەتای سەرۆکایەتی بێت یان بەڕاستی ئازادیخواز بێت. باسی ئەو شتانە نیە، باسەکە لەسەر ئێرانیش نیە. ئێمەین و ئینگلیزەکان. ئێوە خۆتان دادوەرێکی باشن و دەتوانن داوەری بکەن، هاتوون سامانی ئێمە دەخۆن و خۆشمان نەشکەنجە دەدەن و سوکایەتیمان پێدەکەن. کاتێك دەڵێین بەڕێز بەم خارەساتە کارناکەین ئێوە دێن و دەمانگرن و ئەشکەنجەمان دەدەن، خەوی رەحیمتان تاراند و منیشتان هێنا کەلەپچەم بکەن. دواتر چوون و وتتان ئەمە بەئەشکەنجە پێدەکەنێت، روکنەالدین موختاری وتی لەخۆڕایی ئازاری مەدەن، ئەگەر شتێکیش بزانێت لاساری دەکات و نایڵێت. دواتر هاتن و وتیان سەرۆك دەڵێ با بڕوات پشوو بدات، عەبدوڵلاخان بەهرامی پێیوتم تۆ یان لەبەندیخانە دەمریت یان وەرەوە کارو کاسپی هەرچیەکت دەوێت پێتدەدەم، بڕۆ تاران و چیدی ئەمجۆرە کارانە مەکە. وتم نا. ئەم مەسەلەی کۆمپانیای نەوت دەبێت باسی لێوەبکرێت و گوێ لەداخوازییەکانی ئێمە بگرن. ئەگەر ڕەوایە جێبەجێی بکەن. دواتر ئەگەر وتتان لە ئەهواز مەمێنە نامێنم ئەگەر وتتان لە خوزستان مەمێنە نامێنم، تەنانەت ئەگەر وتتان لە ئێرانیش

مەمێنە دەڕۆم. بۆ من جیاوازی نیە. جێگاو شوێن بۆمن وەکیەك وایە. بەلام بابەتەکە ئەوەیە کە کۆمپانیای نەوت و چەوساندنەوەی ئینگلیزەکان، نەبێت لەسەرمان نەمێنن. عەبدوڵلا خان بەدەستی بەتاڵی گەڕایەوەو ڕۆیشت، هاوڕێیانی ئێمەش دوو مانگ لەوێ بوون.

دواتر نزیکەی سەدو پەنجا کرێکاری گیراویان نارد بۆ گرتووخانەی خوڕەم ئاباد لای ئەمیر ئەحمەدی. کۆمەڵێکیشیان نارد بۆ بەندیخانەی ئابادان و ڕەحیم هیمدادیش نێردرا بۆ بەندیخانەی خورەمشەهر. دوای ماوەیەك لەلایەن ئاسایشەوە هاتن و پێیان وتین دەبێت ماڵەکە چۆڵ بکەین خاوەن ماڵەکە داوای دەکاتەوە. وتم بڕۆن کەلوپەلەکانی بفرۆشن. کەلوپەلی دوو کەسی سیاسیان فرۆشت بە دە تمەن، لەڕاستیدا هەرئەوەندەشی دەکرد. ژیانی ئێمە ئاوهابوو. چیدی نەیاندەتوانی بیانوی دیکەمان پێبگرن. لەژیانی ئێمەدا جگە لەو هەقدەستەی کە کۆمپانیا پێمانی دابوو، پارەیەکی دیکە نەبوو. هەر بۆیەش دەمیان داخست تا ئەوکاتەی پیشەوەری و چەند کەسێکی دیکەیان گرت. دەمیان بەستڕابوو سڵیان لەئێمە دەکردەوە. زۆربەی کاتیش لە زیندان دەهاتنە لامان و مەراییان دەکرد و دەیانوت خوا بکات زوو ئازادبکرێن. لەدوای دوو مانگ ڕەزا شا هات بۆ خوزستان. وەرزی پاییز بوو. وتیان بەبۆنەی هاتنی ڕەزاشاوە ٢٥٪ مووچەی کرێکارەکانمان زیادکردووە و لیستی ڕەش "بلاك لیست"[١٥] یشمان قەدەغەکردووەو ئەو کرێکارانەی خێزاندارن بەزووترین کات خانوویان بۆ دروست دەکەین و دەتوانن لەوماڵانەی کۆمپانیادا بژین.

---

١٥- Blak list - لیستی ڕەش.

ڕەزاشا فەرمانی کرد ئەمانە بەرن بۆ تاران. دوای گەڕانەوەی ڕەزا شا ئێمەیان برد بۆ تاران. زۆربەی ئەو مافانە کە درابوو دەستکەوتی مانگرتنەکە بوو نەك سەردانەکەی ڕەزا شا. ورەی کرێکارەکان لەدەرەوە زۆر بەرز بوو. تەنانەت ورەی ئێمە کە لەبەندیخانەی تاران بووین زۆر باش بوو. دوای ئەوەش کە لەبەندیخانە هاتمە دەرەوە، هەستم بەورە دەکرد و هەمان هەست بەرامبەر ئینگلیزەکان هەبوو دژایەتیان دەکرد. ئێمەیان برد بۆ تاران. من و ڕەحیم هیمداد و کەسێك بەناوی سورێن کە ئەرمەنی بوو گوایە لەنێو خزمەتی سەربازیدابوو. لەدوای مانگرتنەکە بۆ ئەوەی بڵێن سەر بەئینگلیز نین، کۆمەڵێك لە سیخوڕی ئینگلیزەکانیان گرت و تاراندیانن. یەکێك لەوانەیش ئەبی دزفولی بوو کە لەگەڵ ئێمە هێنابوویان بیدەنە دەستی ئاسایشی دزفول. یەکێکی دیکە کە ئێرانی بوو خەڵکی بەسرەو گوایە سیخوڕی بۆ ئاق وەلی دەکرد کە پارێزگاری ئەوێ بوو. ناومان نابوو وەتەنی. لە بەسرەوە هەواڵی بۆ ئێران دەهێنا.

لە ئەهوازیش منیان نەبردە بەندیخانە و لە ئاسایش هێشتیانمەوە، نیوە ئازاد بووم. کەسێکیان هێنابوو ناوی مودەڕیس بوو، پێموایە خزمی خوالێخۆشبوو مودەڕیس بوو. عەمامە بەسەر بوو، زۆریش تووڕە بوو هەمووکاتێك بیری لە هەڵاتن دەکردەوە. زۆربەی پاسەوانەکان لە هاوڕێکانی خۆمان بوون و ئێمە لە ئاسایش دامانمەزراندبوون و لە ئەهوازیش هەمانبوو. دوا نیوەڕۆیەك کەسی لێنەبوو، یەکێك لەو پاسەوانانە کارێکی بۆ هاتبووە پێشەوە و بەمنی وت کارم هەیە ئاگات لەمە بێت تا دێمەوە و ڕۆیشت، هەر هەڵدەستا و

دەیویست لەدەرگاکە بڕواتە دەرەوە، زۆر کەسێکی بەهێز و باڵابەرز بوو. من نەمدەزانی چۆن دەبێت ناگام لێیبێت. خۆم زیندانیم و بەندکراوێکیشیان بەمن سپاردووە، بەکورتی پاسەوانەکە زوو هاتەوەو منیش رزگارم بوو. لە ئەهواز فرۆزش هات و بەسەرۆکی ژاندارمری وت ئەم یووسف ئەردەبێڵیە میوانی دەوڵەتە، زیندانی نیە. رێزیان لێدەگرتم، پێموابێت خۆشی کەسێکی باش بوو، ئازاری کەسی نەدەدا، بەڵام پاسەوانەکانی زۆر خراپ بوون. هاتینە خورەمئاباد. لەخورەمئاباد بردیانین بۆ قەڵایەك. هێشتا خۆرئاوا نەبووبوو مشك هێرشیان هێنا و لەمرۆڤ نەدەترسان، بانگمانکرد کاکی پاسەوان وەرەو چارەسەرێکی ئەمانە بکە یان بمانبە بۆ شوێنێکی باشتر، وتی ئەبێ مەمنون بن کە هاوین نیە ئەگینا لەجیاتی ئەمانە دووپشك دەبوون دووپشك پەلاماریان دەدان. ئێمە سوپاسمان کردو خەوتین و بەیانی بەرێکەوتینەوە!

**تاران**

ڕۆژی هەینی گەیشتینە شاری ڕەی. ئەو ئەفسەرەی ژاندارمەری کە بەرپرسی گەیاندنی ئێمە بوو ناوی مورتەزەوی بوو بەمن و ڕەحیمیی وت برۆن زیارەتێك بکەن و وەرنەوە، ئێمە لە گۆڕەپانەکە چاوەڕێتان دەبین. لەوەی کە ئاوا بڕوای پێکردبووین سەرمان سوڕما و وتمان ئێمە ناڕۆین. پێیوتین بچن دەموچاوێك بشۆرن لەبەرئەوەی دەچین بۆ ئاسایش. ڕۆیشتین سوڕێکمان دایەوە و هاتینەوە. ئێمەی برد بۆ گۆڕەپانی تۆپخانە و لەوێ رادەستی گرتوخانەکەی کردین.

بردیانینه زیندانی ژماره۲. ئەم گرتوخانەیە لەسەردەمی سویدییەکان دروستکرابوو وابڕیاربوو گیراوەکان لەپازدەرۆژ زیاتر لەوێ نەهێڵنەوە. ئەو کەسەی لەوەزیاتر بمایەتەوە ئەگەری کوێر بوون یان ئیفلیج بوونی زۆربوو. ئەوێ زۆر بۆگەن و پیس بوو. رەحیمیان کردە ژوورێك و منیشیان کردە ژورێکی دیکەو دەرگاکەیان داخست و رۆیشتن. ئەوێ دوو پاسەوانی لێبوو. یەکیان ناوی موحەمەد حەسەن خان بوو. پیاوێکی موسوڵمان و نوێژکەر بوو ئەوی دیکەیان ناوی یەزدی بوو، یەزدی زۆر دڵڕەق بوو کوڕەکەشی بەدەستی ئەسغەر قاتڵ کوژرابوو. ئەویش بەدەستی خۆی ئەسغەر قاتڵی لەسێدارە دابوو، پیاوێکی زۆر خراپ بوو. دوو ڕۆژ دواتر یەزدی هاتوو دەرگاکەی کردەوە و وتی کاکە تۆ وەرە بەردەرگاکە دابنیشە. وتی رەحیمیش دەنێرم بۆلات، منیش لە خوام دەویست، کەمێك دانیشتین و پێکەوە قسەمان کرد. دواتر بەرەحیمی وت بچۆرەوە بۆ ژوورەکەت و ئەویش رۆیشت و منیش رۆیشتم و دەرگاکەی داخست. بەیانیەکەی پاسەوانەکەی دیکە کە موسڵمان بوو نوێژی دەخوێند هات، وتی بۆ ناچن بۆ حەوشە پیاسە بکەن؟ وتم : بچین بۆ حەوشە بۆ پیاسە؟ وتی دوێنێ سەرۆکی ئاسایش ژوورەکان گەڕاو هەواڵی ئێوەی پرسی. وتیان ئەمانەیان لە ئەهوازەوە هێناوە. وتویەتی ئەمانە لێکۆڵینەوەیان نیە بۆ لە ژووری تاکە کەسین؟ دەرگاکە بکەنەوە.

دوای چەندرۆژ ئێمەیان برد بۆ بەندیخانەی قەسر کە تازە کرابووەوە.

# بەشی دووەم
# بەندیخانەی قەسر

یەکەمین گیراوی سیاسی کە چووە بەندیخانەی قەسرەوە من و ڕەحیم بووین. دالانێکیان بە حەوشەکەیەوە خستبووە بەردەستی ئێمە، ژوورەکانیشی هەریەکەی دوو قەرەوێڵەی تێدابوو. من و ڕەحیم وتمان ئێمە لە ژوورێك دەخەوین.حەزماندەکرد یەکێك بێنن لانیکەم قسەی لەگەڵ بکەین. ڕێگایان نەدەدا، ڕۆژنامە و کتێب و قەڵەم و هیچ شتێکی دیکەیان نەدەهێشت بێتە زیندانەوە. هەڵدەستاین کەمێك پیاسەمان دەکرد، هیلاك دەبووین و دەهاتینەوە لەسەر قەرەوێڵەکە ڕادەکشاین. قەرەوێڵەکان باش و پێخەفەکان پاکوخاوێن بوون، شارستانیەتێکی پێوەدیاربوو. یەکەم کەسانێك کە هێنایانن بۆ ئەوێ بەڕێز **ئەحمەدخان هۆمایۆن**، سەرهەنگ **نەسروڵلاخان کەلهوڕ**، **سامۆئێل حییم** نوێنەری کەلیمیەکان و **مشکین قەڵەم** (کە دوای ئازادکردنی ناوی خۆی گۆڕی بۆ **خادم ئازاد**) بوون. ئەوان دەیانوت یەکێك لە ئێمەیان لە سێدارەداوە. (**فولادییان** لەسێدارە دابوو) تۆمەتبار کرابوون بەوەی کە ویستویانە شا تیرۆر بکەن. کەسانێکی خراپ نەبوون، خۆیانیان بەباشی بەڕێوەدەبرد. زیانێکیان نەبوو، لەسەرخۆ بوون. دەیانوت ئێمەیان بەبێ هۆ تۆمەتبارکردووە و

پێموابێت ڕاستیان دەوت، لەبەرئـەوەی کـە **سامۆئێل حییم** ماومیـەکی زۆر خزمـەتی ئینگلیزەکـانی کردبـوو. پیـاوێکی بەڕواڵەت زۆر پتـەو و بەڕێز بوو، کەس نەیدەتوانی گومانی لێبکات. پێموابێت یەك دوو ساڵ لە زینـدان بوو دوایی سزای لەسێدارەدانیان بەسـەردا سـەپاند. مـن لای ئـەو زمـانی فەرەنـسیم خوێنـد. فەرەنـسی لەکرماشـان فێـر بووبـوو. کتێبـێکم هـەبوو دەمـبرد بـۆ لای وانـەم پێبڵـێ. کاتێـك سـزای لـە سێدارەدانەکەیان پێڕاگەیانـد لـە بەشـەکەی ئێمـە نـەمابوو لـە هـۆڵی تەنیشتمانبوو. هەر ئەوشەوە چووم بۆ لای بەڵام کتێبەکەم لەگەڵخۆم نەبرد. وتی بۆچی کتێبەکەت نەهێناوە؟ وتم تاقـەتم نـەبوو. وتـی، نـا، بیـستوتە لـە سێدارەم دەدەن نـەتهێناوە؟ پێیـوتم بـڕۆ کتێبەکـە بێنـە. پیاوێکی بەجەرگ بوو، نەدەترسا، پێموابێت لەگـەڵ ئینگلیزەکـان یـان وڵاتێکـی دیکـە پەیوەنـدیی هـەبوو لەبەرئـەوەی ڕۆژێـك لـەکاتی قـسەکردنـدا لـەدەمی دەرچـوو. وتـی بێتـو لێـرە دەرچـم خزمـەت بـە وڵاتەکـەم بکـەم. وتم بۆچـی تائێـستا بـەوڵات خزمـەتت نـەکردووە؟ قـسەکەی گـۆڕی. ئـەم پیـاوە عەشیرەتەکانی ئـەردەبیلی لـە مـن باشـتر دەناسـی. لەحاڵێکـدا کەسـێکی شۆڕشـگێڕ نـەبوو کـە بڵێیـت دەیـەوێت بیانخاتە ریزی شۆڕشەوە.

کاتێـك سـەرهەنگ **هۆمایۆنیـان** گرتبـوو ویـستبوویان نیـشانەکەی لێبکەنـەوە، خـۆی لێـی کردبـۆوە، دوای پازدەسـتاڵ زینـدان هێـشتا ئازادنەکرابوو. لەدوای گەلاوێژ ئازادکرا.

لـە قەسـر لەهـەموو ڕوویەکـەوە ئاسـوودە بـووین. یەکـەم هێـشتا بەنـدکراوی زۆری لێنـەبوو، حەوشـەیەکی پـڕ لـە دارودرەخـت

بەدەستمانەوە بوو، خۆمان باخەوانیمان دەکرد. کە تازە چووبووین مێشوولەی زۆربوو قەلاچۆمانکرد. لەوێ خەمرەخساو بووین، بەرەبەرە بەندکراویش زیادی دەکرد، زۆرتر لە عەشایرەکان بوون. سەرۆکەکانیان دەناردن بۆ لای ئێمە و ئەوانی تریان دەنارد بۆ هۆڵە گەورەکان. لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی زیندانیەکان کە بەزۆری عەشایر و سزادراوانی وەك دز و پیاوکوژەکان بوون، بەرەبەرە نەخۆشییەکانیش سەریانهەڵدا. تەنانەت **هیمدادی** هاورێشم توشی نەخۆشی بوو. ئەو کەسانەی دەچوونە نەخۆشخانە بەساغی نەدەهاتنەوە. من نەمهێشت ئەو بەرن، خۆم تەنها لەژوورەکە چاودێری و خزمەتم دەکردو **ئەحمەدخان هۆمایۆن** هاورێی سەرهەنگ پولادین لەدەرەوە بەپارەی خۆی دەواودەرمانی بۆ دەهێناو دەیداپێمان. هیمدادمان ڕزگارکرد بەڵام نەخۆشی زۆرکەسی کوشت. لەنێو عەشایرەکاندا، کوردەکان لەڕووی تەندروستییەوە لەلوڕەکان زیاتر پارێزگاری لە خۆیان دەکرد.

### نەخشەی هەڵاتن لە زیندان

هەرلەسەرەتاوە لەبیری ئەوەدابووین نەخشەیەك بۆ هەڵاتن دابنێین.چونکە پێمانوابوو ئەگەر دۆخەکە نەگۆڕێت ئازادمان ناکەن. ئینگلیزەکان لەو کارانەی کردبوومان زۆر ناڕازی بوون. هیوایەکمان بە ئازادی نەبوو. لەهەوڵە ئەوەدا بووین دۆخێك فەراهەم بکەین راکەین. لەگەڵ سەرۆك خێڵەکان قسەمانکردو ڕازی بوون. لەگەڵ ژمارەیەك بەندکراوی هەتا هەتایی قسەمان کرد و ئەوانیش ڕازی بوون و

دەستمانکرد بەکارەکە. پلانی ئێمە ئەوەبوو گرتوخانەکە بگرینە دەست و هۆیەکانی پێوەندی بپچڕێنین. دواتر شەو لەناکاو پەلاماری سەربازگەی عەشرەت ئاباد بدەین و چەك بەدەست بچینە باکور و لە کێو و دارستانەکانی ئەوێ دەستبکەین بە شەڕی پارتیزانی. ئەو کەسانەی ئامادەی ئەو کارەبوون هەموویان لە شەڕدا شارەزایی تەواویان هەبوو. چەندجارێك پێکەوە کۆبووینەوە. کۆبوونەوەکان بەو شێوەیە بوون کە لە حەوشە گەورەکەی زیندان کاتێك دەچووین بۆ دووگۆڵی(تۆپی پێ) پێوەندی بکەین بەکەسانێك کەدەهاتن بۆ سەیری یاریەکە، یان بەبۆنەی نەخۆشینەوە دەچووین بۆ نەخۆشخانە و لەوێ پێکەوە قسەماندەکرد. بڕیاروابوو کاتێك کەجەو گەرم دەبێت کارەکە بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لە کێوەکاندا خۆمان ڕابگرین و ئەگەر خواردنمان دەستنەکەوت بەمیوەو گژوگیا خۆمان بژیەنین. نزیك سێسەدکەس ئامادەبوون بۆ هەڵاتن و ئامادەبوون بەهەر ڕێگایەك بێت ئەو کارە بکرێت، سەید فەرهادیش لەناو کۆبونەوەکانی ئێمەدا بوو. سەید فەرهاد سەیدێك بوو لەنێوان قوم و تاران ژاندارم بووە. گوایە بەرپرسەکەی ناردبووی بۆ کارێك و شەو دەستدرێژی کردبووە سەر ژنەکەی. سەید دەگەڕێتەوەو بەرپرسەکەی دەکوژێت و یاخی دەبێت، دواتر بەڵێنی لێبووردنیان پێداوە بەڵام حەپسی هەتاهەتاییان بەسەردا سەپاندبوو. کەسێکی زۆر کەمدو بوو بەڵام قورس و قایم بوو. کەسێك بوو لەبواری شەڕدا دەکرا هەژماری لەسەر بکرێت.

زۆربەی بەندکراوەکان بۆ بێگاری دەیانبردن بۆ حەوشەکە و باخەوانی یاخۆ لەکارگەکانی زیندان کاریان پێدەکردن. ڕۆژێك کە

هێشتا زستان بوو سەید فەرهاد لەکار دەگەڕێتەوە و دەبینێ هەلێکی گونجاوە. زوو چەقۆکەی دەردێنێ و چەك لە پاسەوانەکە دەستێنێ. پاسەوانەکان چەکدەکەن و لەگەڵ کۆمەڵێکدا دەستدەگرن بەسەر گرتوخانەکەدا. ئێمە ئامادە نەبووین هەڵبێین. تەنانەت هەموومان وتمان بەم سەرلەنێوارەو سەرماو سۆڵە بۆ کوێ بچین. ئێمە دەمانویست لەنیوەشەوێکی کۆتایی بەهارو سەرەتای هاوین ئەوکارە بکەین. بەشێك لە پاسەوانەکان هەڵهاتن و بەشێکیشیان خۆیان حەشاردا. یەکێك لە پاسەوانەکان ناوی غولام عەلیخان بوو. زۆر نانەجیب بوو. خۆی لەژێر قەرەوێڵەکە حەشاردابوو. بەلام نیوەی گیانی بەدەرەوە بوو. بانگم لێکردو وتم غولام عەلیخان هەستە ئەوان رۆشتن. بڕۆن دەرگای گرتوخانەکە دابخەن، کەس نەدەچوو. وتی: بەراستی رۆیشتن؟ وتم: بەلێ بەراستی رۆیشتن. دەرگای گرتوخانەکەیان داخست. دوای ماوەیەك سەید فەرهاد و بەشێك لەهەلاتووەکان دەگیرێن. بەشێکیان بریندار بووبوون. سەید فەرهاد چووبوو بۆ کاشان. خۆی خەڵکی ئەو ناوە بوو گوایە دەچێت میوانی کوێخا دەبێت ئەویش راپۆرتی لێدەدا و دەچن دەیگرن. ئیدی لەو بیرۆکەیە پەشیمانبوینەوە. لەبەرئەوەی ئاسایش چاوی کرابووەوە، بەلام وتمان با بێکار دانەنیشین و رێکخراوێك لەنێو بەندیخانە پێکبهێنین.

## ڕێکخستنی زیندان

دەستمان بە دامەزراندنی ڕێکخراو کرد. وتمان دەبێت بەهەرشێوەیەك بێت یەکگرتووبین. ئەو کاتە کۆمەڵێك سیاسەتمەدار، لە عەشایەرو سەرخێڵی وەك خێڵەکانی تەنگستانی، بەختیاری، قەشقایی، سەنجابی، کەلهوڕی و هی تر هەموویان لەوێبوون. ئامانجی ڕێکخراوەکە خەبات دژی پۆلیس و زیندان بوو. بۆ ئەوەی گیراوەکان نەچنە ژێر کۆنترۆڵی پۆلیسەکان و تەنانەت ئەگەر دزیش کرا بەپۆلیس نەڵێن. ئەگەر پێویست بوو بەخۆمان بڵێن. لیژنەیەکی سێ کەسیمان پێکهێنا کە بریتیبوون لە ڕەحیم هیمداد، عەتائوڵلا خان ئارش و قازار سیمونیان کە لیژنەی بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکە بوو. من و ئارداشس راوێژکاریان بووین. ئەم ڕێکخراوەیە بەکەڵك بوو، چونکە توانیمان لە هەموو روداوو هەواڵەکانی زیندان ئاگادار بین. بەندکراوەکانیش متمانەیان پێکردین. لەبەرئەوەی دەیانزانی پشتیوانییان لێدەکەین. ئەم لیژنە سێ کەسیە لایەنێکی سیاسیشی هەبوو. لە ڕۆژەکانی ١ی ئایاردا، یازدەی گوڵان ڕێوڕەسمی ڕێکدەخست و بەندکراوەکان گوڵیان دەدا لە یەخەکانیان و خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی. هەم لایەنی سیاسی هەبوو هەم لایەنی بەرگری. بەهۆی زۆربوونی گیراوی سیاسییەوە لەناوبردنی کەسەکانیش دەستی پێکردبوو. ڕۆژێك قەوام شیرازیان هێنا بۆ لای ئێمە. دەرکەوت لەوسەفەرەی کە ڕەزاشا بۆ شیراز کردبووی، قەوام یەك سندوق زێڕی بەدیاری پێدابوو کە سندوقەکەشی زێڕین بوو. ئەم مەسەلەیە تەماح وەبەر ڕەزا شا دەنێ و ئەوە دەبێتە سەرەتای ئەوەی فەرمان دەکات

قەوام بگرن. لەو سەردەمەدا ئایرۆم سەرۆکی ئاسایش بوو. قەوام پیاوێکی زیرەك بوو دەستبەجێ داوایکرد سەرۆکی ئاسایش هاتە ئەوێ دانیشت. ئایرۆمیش هات بۆلای و چیان وت و نەیانوت من ئاگادار نیم. بەڵام ئایرۆم ڕۆیشت و لەدوای سێ ڕۆژ قەوامیش ئازادکرا. نازانم بەرتیل و شتی دابوو یان چی بوو. مشکین قەڵەم کە دواتر ناوی خۆی گۆڕی بۆ خادم ئازاد، جارو بارە مۆڵەتی وەردەگرت و لەبەندیخانە دەچوە دەرەوەو زۆربەی کاتەکان دەچوو بۆ لای سەرتیپ سەیف، کە لەو سەردەمەدا بەرپرسی فەرمانگەی سیاسی بوو. ڕۆژێك ڕۆیشت و هەواڵی هێنایەوە کە مزگێنیم بدەنێ، سەرتیپ سەیف وتوویەتی بەزووترین کات تۆ و ڕەحیم ئازاد دەکات. بێخەم بن ئازاد دەکرێن. ئێمەش بەهیوابووین.

هاوڕێیانی دیکەی ئێمە کەدوورخرابوونەوە بۆ خورەم ئابادو هاوڕێیانی زیندانی لە خورەمشەهر بە شوێنەکانی دیکەی ئێران پەرتکرابوون. بەشێکیان ئاسنەڕێی باکوور کاریان دەکرد و باقییەکەیان لە شوێنەکانی دیکە. ئەمانە هەموویان پسپۆڕ بوون و ئەمەش بۆ ئێمە سەرکەوتنێك بوو. لەبەرئەوەی من پارەی ئەوەم نەبوو ئەوان دابەشبکەم و بیاننێرم بۆ شوێنەکان. دەوڵەت بۆ خۆی ئەو کارەی کردبوو ئەوانیش لە شوێنی کارەکانیان، دەستەوسان نەبوون. دواجار لەژێر چاودێریی توندا ئەوان ئازادبووبوون و ئێمەش ئەم دوو کەسە مانای نەبوو بمێنینەوە چونکە تۆمەتی هەموومان یەك بوو. لە تاران بەشێوەی فەرمی لێکۆڵینەومیان لەگەڵ نەکردین.جاروبار لەهەندێك مەسەلەیان دەپرسی، بەڵام پرسیارەکان سەرەتایی بوون و بەتەمابووین ئازادبکرێین.

## دەستگیرکردنی پیشەوەری و هاوڕێکانی و دەستپێکی گیرۆدەیی ئێمە

ڕۆژێـك وتیـان وەرن. زیندانییـەکانیش هـاتن و خۆشـحاڵ بـوون و پیرۆزباییان کرد. ئێمەش دڵخۆش بووین کە ئازاد دەبین. ئێمەیان بـرد بۆ ئاسایش و لێکۆڵینەوە دەستیپێکرد. وتیان لە رووسیە خوێندووتـە و دەڵێی نەخوێندەوارم؟ کەسانێکمان گرتووەو دەڵێن ئێوە لـە رووسـیە بـوون. وتم ئەمـە ڕێککـەوتنی نێـوان ئێـوە و ئینگلیزەکانـە، وتم ئـەوان درۆ دەکـەن بـا بـێن رووبـەڕووی خـۆم وابڵـێن تـا وەڵامیـان بدەمـەوە. لێکۆڵەرەکە بەرپرسی کارگێڕی سیاسی بوو لە زیندانی ئەهوازەوە مـنی دەناسی لەبەرئەوەی کە ئەوان بۆ لێکۆڵینەوە هاتبوون بۆ ئـەوێ وتـی: ئـەو شـتانەی وتوتـە راسـت نـین، تـۆ کرێکـار نـەبوویت و بەمەبەسـتی سیاسی چووی بـۆ خوزسـتان و ئێـستا دەبێـت ڕاسـتیەکانمان پێبڵێیـت. وتم ئەمانەیان فێر کردون. ئینگلیزەکان، لەپشتی ئـەم کـارەوەن. ئێمـە حاشـامان کـرد. ڕووبـەڕوویان نەکردینـەوە. ترسـان ئێمـە ئـەوان هەڵبخرێنین.

سـاڵی ١٣١٠ ــ ( ١٩٣١ ز) بـوو، دەرکـەوت پیـشەوەری و کۆمـەڵێکي دیکـەیان گرتـووە و ئـەوان نـاوی ئێمـەیان هێنـاوە، بـەڵام شانـسی خـۆم نـاوی بنەماڵـەیی منیـان نـەدەزانی، بـەهۆی ئـەوەی کـە لـە ئابـادان ناسـنامەم بـەناوی ئـەردەبیلی دەرکردبـوو، بـەڵام نـاوو نیـشانی منیـان وتبـوو. یـەکێك لەوهۆکارانـەی کـە مـن دانم پێـدا نـەدەنا ئـەوەبوو کـە باسی شتی وایاندەکرد، کە من هەرگیز نەمکردبوو. هـەروەك بـاسمکرد

ئێمە لە ئابادان قوتابخانەیەکی نهێنیمان بۆ کرێکارەکان دروستکردبوو من و ئەوان زانیاریی سیاسیمان وەردەگرت و کەسێك بەناوی شەکیبا کە پێشتر ناویمان هێنا لەو قوتابخانەیە وانەی دەوتەوە، دوای دەستگیرکردنی پێیانی وتبوو کە من پارەم پێداوە بۆ ئەوەی دەرس بداتەوە. لەحاڵێکدا من پارەم نەبوو بیدەم بەو. ئەو جۆرە تۆمەتانەیان دەدایە پاڵ ئێمە و دەیانزانی ئێمە حاشای لێدەکەین. بۆ نموونە دەیانوت تۆ پارەت وەرگرتووە بۆ وانەوتنەوە. لێکۆڵەرەکان خۆیان دەنواند و پۆزیان لێدەدا. **فروزش**، وایدەزانی من هەموو شتێك باسدەکەم. وردە وردە کە زانیان من و ڕەحیم هیمداد هیچ ناڵێین وازیان لێهێناین، وتەی کەسانی دیکەیان دژ بە ئێمە وەردەگرت. هێشتا گیراوەکانیان نەهێنابووە هۆڵەکەی ئێمە تا بزانین لەبارەی ئێمەوە چیان وتووە. دواتر بە(**پیشەوەری**)م وت خۆ تۆ سەرۆکی حیزب بووی، ڕابەر بووی، تۆ بۆچی دانت بە تۆمەتەکاندا ناوە؟ وتی من دانم بەهیچدا نەناوە. بەس ناوی ئەو کەسانەم هێناوە کە لە سۆفیەتن نەك لەئێران، دڵنیابووم کە ناگیرێن، بەڵام ئەو بەو قسانە دەیویست بێتاوانیی خۆی نیشاندات چونکە زۆر کەسیان بەگرت دابوو.

دوای دەستگیرکردنی پیشەوەری کۆمەڵێکیان دەستگیرکرد کە لەناویاندا ژمارەیەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی تێدابوو. گیرانی پیشەوەری و دکتۆر جاوید و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست بەو شێوەیە بوو کە حسێن شەرقی لە کۆبونەوەیەکدا لە یەکێتی سۆڤیەت دژ بە ڕەزا شا قسەی کردبوو. لەلایەن ڕەزاشا و سەرۆکایەتیی بنکەی پۆلیسەکانەوە فەرمان بە

هۆتێلەکان دەکەن کە ئەگەر کەسێك بە ناوی شەرقی چووە هۆتێلەکەیانەوە دەستبەجێ پۆلیس ئاگاداربکەنەوە. بەڕێکەوت عەلی شەرقی بە جانتایەك کتێبەوە کە لە رووسیاوە هێنابوونی دەچێت و ژوورێك دەگرێت لە میوانخانەی ئیقتسادی تاران. بەرپرسی میوانخانەکە پۆلیس ئاگاداردەکاتەوە کە کەسێك بەناوی شەرقی لە میوانخانەکەیانە. پۆلیس دەچێت بۆ سۆراغی شەرقی و ژوورەکەی دەپشکنن و کتێبەکان و چەکێکی پارەش دەدۆزنەوە، کە بەناوی پیشەوەری و دکتۆر جاویدەوەیە. شەرقی هەر ئەوشەوە بە پۆلیس دەڵێت کە ئەوان ئەو حەواڵەیان پێداوە. گوایە ژنەکەی دەچێت لە گرتوخانە چاوی پێدەکەوێت و هەست بەوە دەکات کە زۆر ترساوەو لەوانەیە قسەی کردبێت هەربۆیە هاوڕێکانی شەرقی لە بارودۆخەکە ئاگارداردەکاتەوە. دیارە ترساوە و شتی وتووە بۆیە دەستبەجێ دکتۆر جاوید و پیشەوەری دەگرن، کە لەو کاتەدا لە تاران دەبن و هەر لەوێشەوە رێکخراوەکە ئاشکرا دەبێت. دواتر بەهۆی دانپێدانانی ئەوان زۆر کەسی دیکە لە ئەردەبیل و تەورێز و شوێنەکانی دیکە دەگیرێن. وردەکاریی دیکە لەو بابەتەوە نازانم، چونکە نە دۆسیەکانیانم دیوەو نە ڕووبەڕوویانکردینەوە و نە هیچ زانیارییەکم لە سەریان هەبوو، دکتۆر جاوید دەیوت مادام ئیفتخاری خۆڕاگریی کردووە ئێمەش دەتوانین خۆڕاگری بکەین و من دانم بەهیچ دا نەناوە. پیشەوەریش دەیوت من بەس ناوی ئەوکەسانەم هێناوە کە لە سۆڤیەتن. شەرقیش خۆ هەموومانی ئەدەناسی، ئەمانە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بوون. پێموایە ئەوانیش وەکو دەستەی (٥٣) کەس، هاوڕێکانیان

بەدەستەوەداوە. دەیانویست دۆسیەکەی ئەوان پەیوەست بە ئێمە بکەنەوە، کە نەیانتوانی. لەبەرئەوەی لەڕاستیدا نەئەوان دەستیان لە کاری ئێمە وەردەدا و نە ئێمەش کارمان بە کاری ئەوانەوە بوو. بەڵام پێکەوە ناسیاویمان هەبوو، بە هۆی ئەوەی کە کەسانێك لەوان وەك دکتۆر جاوید لە باکۆ بوون. جاوید رایەڵی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و نێونەتەوەیی کرێکاری سێهەم بوو.

لە ئەردەبیل رەحیم و عەزیزی برامیان گرت، تاهری و جەودەت و چەندکەسێکی دیکەشیان لەگەڵ ئەواندا گرت.[1] لە گیلانیش ئارداشس ئەرمەنیان گرتبوو. ئارداشس لەئەرمەنییەکانی گیلان بوو. پێشتر جارێکی دیکەش گرتبوویان. گوایە راگەیاندراوی بلاوکردبووەوە. لەپێشدا حاشای کردبوو. دواتر سوهەیلی سەرۆکی بەشی سیاسی هەڵدەستێت وزللەیەك لە بناگوێی دەسترەوێنێت و پێیدەڵێت راستییەکان نەڵێیت بەلێدان دەتکوژم. ئارداشس دەڵێت ئەو راگەیاندراوە "ئورتەپلیان" لەباڵوێزخانەی سۆڤیەت پێیداوم. ئەم رووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٠٩ـ( ١٩٣٠ز ). لەسەر داوای ئێران، "ئورتەپلیان" یان بانگهێشت کرد بۆ ئێران، لە تاران گیرا، چونکە دەستی لەکاروباری ناوخۆی ئێران وەرداوە و راگەیاندراوی بلاوکردوەتەوە. من نازانم لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت کاری چی بوو، لە بەشی سیاسی بووە یا خود هەواڵگری. ئەمە جاری یەکەمی

[1] – باوکی تاهیری لە مەشروتەخوازە کۆنەکان بوو . دەیانووت ئەو پزیشکە جەماعەتێك لەکۆنەپەرستەکانی ئەردەبیلی بانگهێشت کردووە بۆ قەلای ئەردەبیل و لەوێ گوللەبارانی کردوون .

دەستگیربوونی ناراشس بوو. جاری دووهەم خۆراگربوو هیچی نەدرکاند. لە زیندان بەسەرهاتەکەی بۆ من گێڕایەوە.

لە تەوریز حوسێن ئێتتکا و چەند کەسێکی دیکەیان گرتبوو، کە من ناویانم لەبیرنەماوە. عەلی شەرقی نەیدەتوانی ئەو زانیارییانە بدات، دەرکەوت ئەمانە لە ناوەندەوە ناویان دراوە، لە ڕەشت دکتۆر شەفیعی و رەسوڵی و کۆمەڵێکی دی دەستگیرکرابوون، لە ئاستاراش سادق خان و مەمی نام و عێزەت و لە مازەندەرانیش کۆمەڵێکیان گرتبوو هێنابوویانن. لەوانە کەسێك بوو بەناوی عەلیزادە کە نازناوەکەی پێشتر قەیانەزادە بوو بەتۆمەتی سیخوڕی گرتبوویان. رەزا روستاشیان لە باشوور گرتبوو. لەوێ لە فەرمانگەی ڕووسەکان کاریدەکرد، ئەویش بەتۆمەتی سیخوڕی دەستگیرکرابوو.

گیراوە سیاسیەکان دوو بەش بوون، بەشێکیان تۆمەتیان سیخوڕی بوو بەشێکیشیان چالاکی حیزبی و سیاسی. ئەوانەی بەتۆمەتی سیخوڕی گیرابوون، دادگایی دەکران و دوای تەواوکردنی حوکمەکەیان ئازاد دەکران. بڕوا ناکەم ئیبراهیم عەلیزادە سیخوڕ بووبێت، بەڵام ئاسایش ئەو تۆمەتەیان دابووەپاڵ. کەسانێك بوون لە فەرمانگەکانی سۆڤیەت کاریان وەرگێڕان بوو. وەرگێڕ هەرشتێکی بۆ بێنن وەری دەگێڕێت، پێوەندیان بە ناوەرۆکی نووسراوەکەوە نیە. چونکە خۆی نەینووسیوە. عەلیزادە وەرگێڕ بوو، بەڵام رەزا ڕوستا کە دواتر بوو بەسەرۆکی سەندیکای حیزبی توودە، سیخوڕی کردبوو. دەچوو بۆ ئەهوازو زانیاریی کۆدەکردەوەو دەیدا بە ڕووسەکان. روستا بەختی هەبوو کە لەسێدارەیان نەدا. روستا کەسێکی نەفام بوو. ئەو

زانیارییانەی کۆیدەکردنەوە کۆپییەکی لێدەگرت نەکا ڕۆژێك بەکەڵکی بێت. ئەویان بەو کۆپیانەوە گرتبوو. لە دادگای سەربازیدا، داواکاری گشتیی سوپا داوای لەسێدارەدانی بۆ کردبوو، پارێزەرەکەیشی باش پشتیوانیی لێکردبوو. ئەو وتبووی ئێمە لێرەدا بۆ ئەوە کۆبووینەتەوە دەوڵەتی ئێران سەربەرز بکەین نەك حەیای ببەین. داواکاری گشتی داوای سزای لەسێدارەدانی بۆ ئەم پیاوە کردووە بەڵام پیاوی وا گێل دەتوانێت سیخوڕ بێت و هەر سیخوڕییەکی کردبێت کۆپیەکەی لای خۆی دابنێت؟ ئەگەر ئێمە ئەم پیاوە بکوژین بۆ دەوڵەتی ئێران حەیاچوون نیە؟ ئەم شێوە بەڵگەهێنانەوە بە سوودی ڕوستا بوو سزای پێنج ساڵ بەندیخانەیان بەسەریدا سەپاند. عەلیزادەشیان حوکم دا. عەلیزادەیان بۆ بەندەر عەباس و ڕەزا ڕوستاییشیان بۆ ساوە نارد.

## گیراوەکانی دیکە

ڕۆژێك سەوڵەتوودەولە و ناسرخانی کوڕیان هێنا بۆ زیندان. بەڕێکەوت ئێمەیان سزادا و لەیەکیان جیاکردینەوەو منیان برد بۆ ساڵۆنی ٢ کە ئەوانی لێبوو، ئەم باوك و کوڕە یەکتریان زۆر خۆشدەویست. لەبەر دەرگای ژوورەکە دادەنیشتن و پێکەوە قسەیان دەکرد. کاتێك منیان برد بۆ ئەوێ خۆشحاڵ بوون، سەبارەت بە خوزستان و کاری من لەوێ پرسیاریان لێدەکردم. چاییان لێنابوو. سەوڵەت و الدوله وتی: پیاڵەیەك چایت بۆ تێدەکەم بیخۆ. وتم: من چایی ناخۆم و ئێستا هاوڕێکانم هەموو شتێکم بۆ دێنن و ناهێڵن بێ خواردن بمێنمەوە. وتی: ئەم چایە کە دەمەوێت بیتێ بدەم تا ئێستا

نەتخواردووە. پێکەنینم بەقسەکەی هات. لە دڵی خۆمدا وتم وادەزانێ چونکە کرێکارم تا ئێستا چایم نەدیووە. وتم: ئەو کاتەی من منداڵ بووم کاتێک دەچووینە نێو حەوشەکەمانەوە دەمزانی دایکم چای لێناوە یان نا ئەوەندە بۆنی چاکەمان خۆش بوو هەر بۆیە ئێمەش چامان خواردووە. وتی: نا ئەم چایەت نەخواردووە. وتی: ئەمە بەتایبەتی لە بەریتانیا دروستی دەکەن و لەبازاڕدا دەستناکەوێت. پیاڵەیەکی بۆ تێکردم خواردمەوە. بەڕاستی تام و بۆنێکی زۆر خۆشی هەبوو. سەوڵەتوودەولەیان لە بەندیخانە ژەهرخوارد کرد و ناسرخانیشیان بەبۆنەی زەماوەندی فەوزییەوە ئازادکرد. بێتو زۆر بمایەتەوە ئەویشیان لەناو دەبرد. باسی زەماوەندمانکرد، فەروخی یەزدیشیان دەرمانخوارد کرد. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە هۆنراوەیەکی وتبوو کە تیایدا ژن هێنانی کوڕەکەی شا (**موحەممەد رەزا**) ی وەك و زەماوەندەکەی قاسم وەسف کرد بوو. لێرەدا دێڕێك لەو شیعرەتان بۆ دەنووسمەوە.

لە ئازادیی جیهان ئاوەدانی و وەرچەرخانی وڵات پەیدادەبێ

لەدوای مەشروتە (ئەو ئاڵوگۆڕە) بە ئامرازی سەرکوت دەکرێ

لەم شیعرەیدا وای باسکردووە کە ئەم زەماوەندەش، زەماوەندی قاسم ە [۲]. یەکێك لەو بەندکراوانەی کە تۆمەتەکەی سیخوڕی بوو، ئەم

---

[۲] – واپێدەچێت ئەم دێرە مەبەستی ئەوە بێت : (( دڵم لە زەماوەندەدا بەسەختی دەلەرزێت کە قاسمیش – وەکو شەڕی نەینەوا نێزیك بووەوە ئەبێت بەزاوا . دیوانی فەروخی یەزدی ، بەهەوڵ و کۆششی حسێنی مەکی ، تاران ، ئەمیرکەبیر ، ۱۳۵۷ هەتاوی (۱۹۷۸ ی . ز ) ، لاپەڕەی ۱۲۰.

شیعرەی بە شێوازێك لێوەرگرتبوو یان دزی بووی و دابوویە دەستی بەرپرسانی گرتوخانەکە. ئەوانیش بە شایان ڕاگەیاندبوو ئەویش فەرمانی کردبوو دەرمانخواردی بکەن. من بۆ خۆم جارێکیان بینیم لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە قسەی دەکرد، پێموت ئەوە نەکات. بەلآم خۆی پیاوێکی نەترس بوو گوێی بەو شتانە نەدەدا.

بە تۆمەتی هەوڵی کوشتنی رەزاخان چوار کەسیان گرتبوو. یەکێکیان ناوی عەلی بۆلشویك بوو. هەر ئەو کەسە بوو کە شیعرەکەی لە فەروخ دزی و دایە دەستی بەرپرسانی گرتوخانەکەوە. ئەو لەگرتوخانەدا سیخوڕیی دەکرد. یەکێکیشیان ناوی ئەکبەرۆف بوو، ئەویش بۆ گرتوخانە سیخوڕی دەکرد. یەکێکیشیان ناوی فیروز بوو کەتورك بوو بەدار دابوویان بەسەریدا و شێت ببوو. بەلآم دەیانوت زۆر پیاوێکی جوامێرە. کەسەکەی دیکەشیان یووسف ئەرمەنی بوو کە زۆر کاری کردبوو گوایە لەگەڵ ئازادیخوازانی مەشروتەدا بووەو زۆربەی تیرۆرەکانی شاری قەزوین بەدەستی ئەو کراوە. یووسف پیاوێکی باش و جێگای متمانە بوو. دەتتوانی متمانەی پێبکەیت، بەلآم فیروز شێت بوو ئەو دوانەی دیکەش سیخوڕ بوون. گیراوێکی دیکە تەیمور تاش بوو کە ئەویشیان دەرمانخوارد کرد. هۆکەشی ئەوە بوو کە کاراخان جێگری وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت هاتبوو بۆ ئێران و ویستبووی بژیوانی بکات کە تەیمورتاش ئازاد بکەن. داوای کردبوو بێت بۆ بەندیخانە. فەرمانیان کردبوو پێش هاتنی کاراخان دەبێت تەیمورتاش لەناو ببرێت. ڕۆژێکیان تەیمورتاش پێی وتم دەمویست کارێك بۆ تۆ و رەحیم خو وینی (هیمداد) بکەم

بەڵکو ئازادتان بکەم. دۆسیەکەی ئێمەی دەزانی، بەهۆی ئەوەی ئەوکاتەی لەناو کۆشکدا وەزیر بوو ئەو هاوڕێیانەی ئێمە کە تاراندرابوون (دوورخرابوونەوە) دەچوون بۆ لای ئەو بەڵکو سزاکەیان بۆ سووك بکات. بەکورتی تەیمورتاش هێشتا نەمردبوو کە کاراخان هات بۆ گرتوخانە. دەیانوت دکتۆر ئەحمەدی [٢] پشتییەکی خستووەتە سەر دەمی و خۆی لەسەری دانیشتووە.

سەردار ئەسعەدیش گیرابوو کە وەزیری بەرگری بوو، ئەویشیان هێنا و لە نەخۆشخانە هێشتیانەوە. ئەوانەی کەزۆر بەناوبانگ بوونایە لەخەستەخانە دایان دەنان. گوایە ژەهریان کردبووە ناو خواردنەکەیەوە. عەلی ئەسغەرخانێکی لێبوو کە کاری دەرزی لێدان بوو. عەلی ئەسغەرخان فێر بووبوو لە خواردنەکەی سەردار ئەسعەدی دەخوارد، لەبەرئەوەی لەدەرەوە خواردنیان بۆ دەهێنا. عەلی ئەسغەر خان کە دەیخوات دەستبەجێ دەزانێت خواردنەکە ژەهری تێکراوە. دەیەوێت لە گرتوخانە بچێتە دەرەوە، بەڵام ڕێگای پێنادەن، عەلی ئەسغەرخان هاتوهاوار دەکات و حەیایان دەبات و ئەوانیش ڕێگای پێدەدەن. سەرەنجام نەمرد و خۆی دەربازکرد سەردار ئەسعەدیش کەمی خواردبوو نەمرد، بەڵام چیدی خواردنی نەخوارد. دواتر ئەویان برد بۆ ژووری تاکەکەسی و ئێمە ئاگامان لێی نەما بەڵام پاسەوانەکان

---

[٢] – دکتۆر ئەحمەدی، دکتۆر نەبوو . ئەو پێشتر لە عیشقاباد دوکانی عەتاریی هەبوو . لە دوای شۆڕشەکەی ڕووسیا بڕێك شتومەکی دکتۆر دەکڕێت و دێتەوە بۆ مەشهەد . لەبەرئەوەی گیانی خۆی بپارێزێت وتبووی زۆرێك لە بۆلشوویکەکانی دەرمانخوارد کردووە . ئاسایشیش پێویستیی بە کەسانی ئاوا بوو ، پێیان وتبوو بێت و لەسەر ئەو ئیشەت بەردەوام بیت بڕوانامەی دکتۆریت پێدەبەخشین.

دەیانوت لەکۆتاییدا ئەویش دەرمانخوارد دەکەن. گوایە شەوێك زۆر تینوو دەبێت عەرزەکە هەڵدەکەنێت، پاسەوانەکان دەیانوت سەرپەنجەکانی هەمووی بریندار بووە.

پێش ئەوەی ئێمە بێننە ئەو بەندیخانەیە، ئاسایش کەسێکی گرتبوو بەناوی حیجازی. حیجازی کرێکاری چاپخانە بوو لەژێر ئەشکەنجەدا کوشتیان. کۆمۆنیستەکان لەدنیادا هاتوهاواری زۆر سازدەکەن، یەکەم ڕۆژەکانی پاشایەتیی ڕەزاشا بووە، حەیاچوونێکی زۆر گەورە بوو هەربۆیەش ڕەزاشا فەرمانی پێکردبوون ئەشکەنجەی کۆمۆنیستەکان نەدەن. هەتا ئەو کاتەی هیتلەر سەری هەڵنەدا و ستالین ڕسوایی بەرهەمنەهێنا، لە ئێراندا کۆمۆنیستەکانیان ئەشکەنجە نەدەدا، بەڵام کەسانێك بەهۆی نەبوونی دەواو دەرمان و خواردنەوە دەمردن. دوو کەس لەکۆمۆنیستەکانیش بەو هۆیەوە لەگرتوخانەدا گیانیان لەدەست دا. یەکێکیان ناوی دادی زادە بوو کە لەتاران گرتبوویان لەهاوڕێیانی پیشەوەری و ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست بوو یەکێکی تریشیان پێیاندەوت سەید موحەمەد تەنها، من دەمناسی. لە KUTTV دەرسی دەخوێند و خەڵکی ئیسفەهان بوو. دواتر چووبۆوە بۆ ئەسفەهان لەوێ گرتبوویان و لەگرتوخانە گیانی لەدەست دا.

سەید باقر ئیمامی کە دواتر تاقمی کروژکی پێکهێنا، ئەویش لەزیندان بوو. گوایە لەگەڵ (وتارخوێنی نوێژی هەینی) ی تارانیش خزمایەتی هەبوو، وادیار بوو باوکیان یەکێك بوو. دووجار حوکمدرابوو. جاری یەکەم بەهۆی کوشتنی دوایین مێردی دایکی

(دایکی شووی زۆری کردبـوون) کەسێك ئـەوی هەڵخڕانـدبوو، ئـەویش ئــەو کەســەی کوشــتبوو. ســەید باقریــان ســێ ســاڵ ســزا دابــوو. هاندەرەکەشــی حــوکمی هــەتا هــەتایی درابــوو. جــاری دووهــەمیش بەتۆمەتی سیخوڕی و لەگەڵ تاقمی ئێرانیـان گرتبوویـان و پازدەسـتاڵ سزایان دابوو لەدوای خەرمانانی ١٣٢٠ ـ ( ١٩٤١ ز) ئازادکرا.

هەڵبەت تاقمی سەید ئەبولقاسم موسەویش لەوێ بوون. موسەوی لە مەشروتەخوازە کۆنەکان بوو کە لـە شۆڕشـی گیلانیـشدا بەشـداریی کردبــوو. دواتــر لــەتاران لەگــەڵ ئاخونــدزادە و یــەکێك لەبازرگانــە قەزوینیەکان کە نـاویم لەبیرنـەماوە، لەگـەڵ ڕووسـەکاندا، پێوەنـدییان هـەبوو، ڕەزاخانیـان هەڵدەخڕانـد بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتی کۆمـاری. موسەویم لە مۆسکۆ ناسی. براکەی لەوێ دەرسـی دەخوێنـد و ئـەمیش دەهـات بـۆ سـەردانی. موسـەوی و دکتـۆر موسـەنین و چـەند کەسێکی دیکـە بەتۆمـەتی تـیرۆری ڕەزا شـا گیرابـوون. بـەڵام ئـەوان تیرۆریـست نەبوون. تەنانەت یـەکێکیان کـە دەیـانوت ویـستویەتی تیرۆرەکـە بکـات بەردەوام دەگریا و دەیوت خۆ ئێـوە هـیچ شـتێك بـەمن نـادەن و بـەس ئــازارم دەدەن. کارەکــەیان زۆرتــر لایــەنی نەتەوایــەتیی هــەبوو. ئەبوالقاسم موسـەوی دواتـر بـوو بـە ئەنـدامی "کۆمەڵەی لایـەنگرانی ئاشتی" سۆڤیەتییەکانەوە.

بەنــدکراوێکی دیکــە ســەرهەنگ گیکــۆ بــوو کــە یــەکێکبوو لەشۆڕشگێڕانی قەفقاز لەساڵانی ١٩٠٥ لەسۆڤیەتدا دەستبەسـەر کرابـوو بەو شێوەیەی کە بۆ مـنی باسـدەکرد، دەیـوت کـە منیـان گـرت وابڕیـار بوو بۆ بەیانی لە سێدارەم بدەن. وتم خودایـا مـن بـەچ شـێوەیەك لـەم

بەندیخانەی خۆم ڕزگار بکەم. تا دەمەو بەیان هەرچەند دۆگشتی کرد سوودی نەبوو. دواتر دەستم دایە قوفڵی دەرگاکە. پەنجەم شکا بەڵام دەرگاکە کرایەوەو منیش هەڵهاتم و گەڕامەوە بۆ ئێران. ئەندامی تاقمی پەپرۆم خان بووەو دواتر چووەتە نێو سوپاوە. هۆی گیرانەکەشی دژایەتی لەگەڵ سیستەمەکەدا بوو. گوایە ڕۆژێك لە سەردەمی ئەمیر ئەحمەدی، ڕەزاشا بۆ سەردان دەچێت بۆ خوڕەم ئاباد. سەرهەنگ گیکۆ شمشێرێکی زۆر جوانی دەبێت کەکێلانەکەی لەپێستی مار دروست کرابوو، ڕەزاشایش پیاوێکی تەماحکار بوو، پێی دەڵێت بەڕێز گیکۆ شمشێرەکەت زۆر جوانە. ئەویش دەڵێ بەڵێ جوانە، دواتر ئەمیر ئەحمەدی پێی دەڵێت بۆ چی نەتوت سوپاس قوربان، پێشکەشە. دەڵێت پێشکەشی چی؟ بێت و مارەکە پێوەی دایەم ڕەزاشا شتێکی پێ دەبەخشیم؟ بۆچی پێشکەشی بکەم؟ ئاوا پیاوێکی چاونەترس و ئازادیخواز بوو لەپیریشدا هەروابوو لەدوای خەرمانانی ١٣٢٠ (١٩٤١ز) دارایکی هەبوو لەشەقامی مۆخبەرولدەولە و لەوێ لە کتێبێکی ڕووسییەوە فێری دروستکردنی سابون ببوو، سابونی بۆنداری دروستدەکرد و دەیفرۆشتن و بەوە بژیوی ژیانی خۆی دابیندەکرد.

دەبوو چارەیەکمان بۆ ئەم هەموو کێشە و مردنانە بدۆزیایەتەوە بۆ ئەوەی چیتر بەندکراوەکان بەهۆی نەبوونی دەواو دەرمانەوە نەمرن، بەڵام ئێمە پارەمان لەکەس وەرنەدەگرت. ڕۆژێك مەنوچێهرخان ئەسعەد برای سەردار ئەسعەد هات بۆ لام و وتی: مانگی هەزار تمەن دەدەمن بە من و منیش دووسەد تمەنی دەدەم بەتۆ دابەشی بکە بەسەر هاورێکاندا با لەناونەچن. وتم نابێت، ئەوان لە

خـان پـارە وەرنـاگرن و لــە منیـشەوە دوورن. ئێـوە خۆتـان باشـتر دەیانناسـن. دەتـوانن ڕاسـتەوخۆ پارمـەتیان بـدەن. هەڵبـەت ئـەو بەپاکییەوە هاتبوو هیچ مەبەستێکی خراپی نەبوو. تەنانەت وتی من ئەو پارەیەتان بە قەرز پێدەدەم دواتر لەدەرەوە بمدەنـەوە. وتم: ئێمە چـارەنوسمان دیارنیـە. یـان هـەر لێـرەدا دەمـرین و یـانیش هـەروا بەهـەژاری و نـەداری دەمێنینـەوە. ئەمانـە بەشوێنمانەوەن، هەربۆیـە قـــەرزیش وەرنـــاگرم. لەزینـــدان مـــن و عـــەتائوڵڵاخانی ئـــارش کەللەقەنـدمان دەشـکاند و لەبەرامبەریـدا پارەیـەکیان پێـدەداین. بـەو پارەیە دەمانتوانی خواردنەکەمان نەختێك زۆر بکەین، پیـاز و ڕۆنمـان دەکڕی و لەگەڵ شتی دیکەدا تێکەڵمان دەکرد. بەم شێوازە ئێمە هاوڕێ سەندیکالیستەکانمان دەپاراست. خـەلیل مەلـەکیش لـەناو کتێبەکەیـدا نووسیبووی ئەمانە "کۆمۆن"یان پێکهێنابوو. تەنانەت کاتێك کـە ئـەم خواردنـەمان دروسـت دەکـرد، سـەرۆك عەشـیرەتەکان دەیـانوت کاتێـك ئێوە خواردن دروستـدەکەن ئێمە خەریکە لەهۆش خۆمان بچین، بەشی ئێمەش بدەن. لەکاتێکدا خواردنی زۆر بـاش و پـڕوزە و بەکـەڵکیان بـۆ ئەوان دەهێنا.

لە بەندیخانـە هـەموو شـتێك کـۆن دەبـوو. هەرکەسێك هەرقسەو باسێکی بوایە ئەوەندە گێڕابوویەوە کاتێك گوێت لێدەگرت موچڕکەت پێـدادەهات. باسـێکی تازەمـان پێنـەبوو هـەمووی کـۆن بـوو. بەختیارییـەکان ئێمـەیان زۆر ئـازار دەدا. ئـەوان لـەبارەی ژنێکـی بـەختیاریی شۆڕشـگێڕ کەلەگـەڵ مەشـروتە کاریـدەکرد، هـەررۆژەو شتێکیان باسدەکرد. هەڵبەت بۆ جاری یەکەم و دووهەم و چوارەمیش

باش بوو بەڵام لەدوای ئەوە زۆر دووپات کرا بووەوەو ئێمەی هیلاك دەکردو خواخوامان بوو ئەو قسانە نەبیستین، تاکەی باسی میمکە مریەم ببیستین. ڕۆژێك شتێك ڕووی دا دەمی ئەمانەی داخست و ئیدی ئێمەش ڕزگاریمان هات. ڕووداوەکە وابوو کە ڕۆژێك یەکێك لە ئاغاکانی بەختیارییان لە نەخۆشخانەدا خەواند، ناوی زوهێر بوو. لە گرتوخانە کاتێك دەرمانێکی گرانبەهایان دەدا بە نەخۆش فەرمانبەرەکانی نەخۆشخانە ئەوەیان بۆ بەکارنەدەهێنا و هەڵیاندەگرت بۆ خۆیان. لەوێ دکتۆرێکی لێبوو بەناوی سەرهەنگ محەمەدخان فروش کە پیاوێکی زۆر باش بوو. دەستی لەو تاوانانەدا نەبوو کەلەوێ دەکرا هەر شتێك دەکرا بەدەستی دکتۆر ئەحمەدی و کەسانی دیکە دەکرا. دکتۆر فروش دەیزانی پەرستارەکان دەرمان دەدزن. بۆ ڕێزگرتن لەخان دەچێت بۆ لای و گولاجێك و دەرزییەکی پێدەدات و دەڵێت شەو ئەم گولاجە بخۆ و دەرزییەکەش نیشانی کەس مەدە تا بەیانی خۆم دێمەوەو لێتی دەدەم. لەبەرئەوەی دەرزییەکەی بەبەها بووەو دەیزانی پەرستارەکان دەیدزن. بەیانی دێت و دەپرسێت چیت لەدەرمانەکان کرد؟ دەڵێت دەرزییەکەم خواردو گولاجەکەم هەلگرت. لەو ڕۆژەوە ئەوان کەمێك پاشەکشەیان کرد و ئێمەش ئەجاتمان بوو.

دوو سەرکردەی لوڕ لە گرتوخانە بوون. یەکێکیان ناوی **میر ئەسفەندیار** خان و ئەوی دیکەشیان **میر محەمەدخان** بوو. ڕۆژێك **میر ئەسفەندیارخان** کاتژمێرێکی باخەڵی پێنیشاندام و وتی بەڕای تۆ ئەم کاتژمێرە نرخی چەندە. لەڕاستیدا من تا ئەوکاتە کاتژمێرم نەبووەو

نازانم نرخی چەندە. کاتژمێرەکەی هی بەرباخەڵ بوو لەوانەیە سێ چوار تمەنێکی بکردایە. وتم نازانم. وتی: چۆن نازانی؟ تۆ پیاوێکی سیاسیت و نازانی نرخی ئەوە چەندە؟ وتم: ئەمە چ پێوەندییەکی بەسیاسەتەوە هەیە؟ وابزانم سێ بۆ سێ تمەن و نیو نرخی بێت. وتی: حەی حەی! چەندە سیاسیت! وتم: بۆچی؟ وتی: ئەمە باڵوێزی بریتانیا لە ئەسفەهان پێیداوم، شای بەریتانیا بۆی ناردوم. هەرکەسێك بەم کاتژمێرەوە بچێتە لەندەن بەخۆشی ئەو سێ دانە تۆپ دەتەقێنن. وادەرکەوت ئەم بیانیە ساختەچییانە بەم شتە سادانە ئەم خەڵکە تەفرە دەدەن. کاتێك ئەمیر ئەحمەدی لە لورستان بەتەمابوو کۆمەڵێك لە لورەکان بەدژی کۆمەڵێکی دیکە هەڵبخرێنێت پلەوپایەی پێدەدان، لە یەکێکیانی پرسی چ پلەیەکت دەوێ؟ وتی ئێمە پلەی سەرتیپ و سەرهەنگمان ناوێت، ئێمە پلەی سوڵتانمان دەوێت.

لەنێو بەختیارییەکاندا بێجگە لە سەردار ئەسعەد کەسانی دیکەش کوژرابوون. خان بابا خانی برایان هەرگیز زیندانی قەسر نەهێنا. ئەو کاتەی کە من لە ژووری تاکە کەسیدا بووم ئەوم بینی دواتر بیستم ژەهرخواردیان کردووە و کوشتویانە. ئاگاداری وردەکارییەکانی ئەم بابەتە نیم. بەهۆی ئەوەی لە ئێمەوە دوور بوو بەڵام عەلی مورادخان گوایە دەوڵەت بەڵێنی پێدابوو نەیکوژێت و خۆی بەدەستەوە دابوو هێنابویانە گرتوخانە. ئەم پیاوە لەناو عەشایردا بەپیاوێکی ئازاو بەجەرگ ناوی دەرکرابوو. بەڵام زۆر تلیاکی دەکێشا. ڕۆژێك پێیان وتبوو کە دەبێ بێیتە ژێر هەشتەکە[1] تلیاکەکەت

[1]. ژێر هەشت - بەشی چونە ژوورەوەی گرتووخانەیە. شوێنی بەرپرسی گرتووخانەش

بکێشی. عەلی مەردان خان ئەم شتەی پێناخۆش بوو وتی نایەم هەر بەو هۆیەشەوە تلیاك کێشانی تەرككرد. كاتێك كە پاسەوانەكان دەیانبرد بۆلای دیواری گوللەبارانكردن، دەیانویست چاوی ببەستن. وتی چاوم مەبەستن هەرناوا كە سەیر دەكەم بمكوژن. بەڵام چاویان بەست، خۆی دابوو بەسەر گۆچانەكەیداو هەر فیشەكێكیان پێوەدەنا جووڵەیەكی دەكرد. بەڵام بەگۆچانەكەی خۆی ڕاگرتبوو لەكۆتاییدا كەوت. ئەمەش بەسەرهاتی بەختیارییەكان بوو كە بەم شێوازە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ دەكردن.

لەم نێوەدا یەكێك لەو كرێكارانەیان بۆ زیندان هێنا كە پێشتر لە مانگرتنی كۆمپانیای نەوتدا یارمەتیی دابووین. لەو كەسانە بوو كە بۆ تاران هەڵیانداشتبوو. لە تاران هەندێك راگەیاندراویان پێدابوو تاكوو بڵاویان بكاتەوە. پۆلیس گرتبووی. لە لێكۆڵینەوەكاندا وتبووی من لە چاپخانە خەریكی چاخواردنەوە بووم ئەم نوسینانە پۆلیس خوستویەتە گیرفانم. سێ جار ئەشكەنجەیان دابوو تەنانەت لەژێر ئەشكەنجەدا لەهۆش خۆی چووبوو. ئەو كاتانە ئەشكەنجە و لێدان باوبوو. مژاری هیتلەر و ستالینیش لەسەر ئێران كاریگەریی دانابوو.

### دەستگیركردنی تاقمی پەنجاوسێ كەسی

لەساڵی ١٣١٥ـ ( ١٩٣٦ ز ) كۆمەڵێكیان دەستگیركرد كە بە تاقمی دكتۆر ئەرانی یان پەنجاوسێ كەسی ناسرا بوون. دكتۆر ئەرانی لەئەڵمانیا دەرسی خوێندبوو مەیلی بەلای حیزبی كۆمۆنیستی

---

ـەوێ یەو ئەوانەیش كەڵیشی ساختەیان دەكرد دەیانبردن بۆ ئەوێ.

ئەڵمانیادا بوو لەڕێگای سۆڤیەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. لە مۆسکۆ پێی دەڵێن ڕێکخراوەکەی ئێمە لە ئێران زەبری وێکەوتوە و دەمانەوێت کەسێك ساغی بکاتەوە. دکتۆر ئەرانی بەڵێندەدات ئەو کارە وەئەستۆ بگرێت. دەگەڕێتەوە بۆ ئێران بەڵام هیچ کارێك ناکات. کەسێك بەناوی کامەران کە خەڵکی قەزوین بوو لە زانکۆی KUTTV دەرسی خوێندبوو رادەستپێردرێ بگەڕێتەوە ئێران و لەگەڵ دکتۆر ئەرانی قسەبکات و کارەکان ڕێکبخەن دکتۆر ئەرانیش رازی دەبێت. دواتر کەسێك بەناوی شورشیان لەسۆڤیەتەوە دەنێرن و پاشان کامبەخش و ئەلەموتییەکان کە پێشینەیان هەیە بە ئەرانی دەناسێنن. ئەوان گۆڤارێکیان بەناوی دنیا دەردەکرد، بەڵام پۆلیس ئاگای لێنەبوو. زۆربەی دادوەرەکان نەخوێندەوار بوون و پۆلیسیش ئاگای لێنەبوو کە ڕێکخراوەکەیان پەرەپێدەدەن و زۆریش گەشەیان کردبوو زۆرینەشیان ڕۆشنبیرو خوێندەوار بوون. چەند نەخوێندەوارێکیشیان لەگەڵدا بوو. گێچەڵی ئەوانیش لەوێوە دەستیپێکرد کە شورشیان چوو بۆ خوزستان. بیستبووی لەوێ ڕێکخراوێك هەیەو سەندیکای جیهانییش گرنگیی پێدەدات. دەچێت و جووتێك پوت لەپێدەکات و ریشی بە شێوازێکی نامۆ درێژ دەکات و وانیشاندەدات گوایە ئەکتەرە و دەیەوێت کاری شانۆ بکا. ئاسایش بانگی دەکەن و دەڵێن تۆ لە شۆفار دەچیت. دەڵێت من سیخوڕ نیم سەروو شۆفارم. لێی دەپرسن "سەروو شۆفار" چیە؟ لەوەڵامدا دەڵێت: بەنێوە نالێم ئەوە بەبەرپرسەکەتان دەڵێم. جواب دەنێرن بۆ بەرپرسی ئاسایشی گشتی و دەڵێن کەسێکمان گرتووەو ئاوا دەڵێت.

دەیبەن بۆ تاران و ناوی هاوڕێکانی لێدەپرسن. دەڵێت مەرجێکم هەیە. لێیدەپرسن: مەرجەکەت چیە؟ وتبووی بمبەن بۆ سەر سنوور کاتێك لەسنوور چوومە ئەودیو پێتاندەڵێم. سەرۆکی ئاسایش سێ شەپازللەی لێدەدا و برێ جنێوی پێدەداو دەڵێت ئەو قسە بێمانایانە چین و لەکۆتاییدا هەموو شتێکی بۆ باسدەکات.

دکتۆر ئەرانی دەیگێڕاوە کە رۆژێکیان لەماڵەوە دانیشتبووم لە پەنجەرەی کۆلانەوە چاوم لێبوو شورشیان لەگەڵ دوو کەسی دیکە خەریکن دێن بۆ ئەوێ. بەخزمەتکارەکەم وت دەرگاکە بکەرەوە هاوڕێیان هاتن. وابیرم دەکردەوە شورشیان لەگەڵ هاوڕکانیدا هاتووە. هاتنە ژورەوە. شورشیان وتی هاتوین بتگرین. ئەرانی دەیوت وامزانی گاڵتەم لەگەڵ دەکەن، وتم قەیناکا وەرن جارێ دانیشن، چایەك بخۆنەوە ئەمجا بمگرن. پاسەوانەکە وتی: کاکەگیان دانیشتن مانای چیە؟ هاوڕێکانت هەموو شتێکیان وتوە. دەیوت ئەوکاتە زانیم کە شورشیان بەگرتی داوین. شورشیان، کامبەخش و چەند کەسێکی دیکە دەناسێت و دەیانـدات بەدەستەوە. کام بەخشیش کە بەتۆمەتی سیخوڕی فایلی هەبوو لەترسان هەموو شتێك باسدەکات. ئەمانەیان گرت و هێنایانن بۆ قەسر، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەیان تەواوبوو ئێمە ویستمان زانیارییان لێدەرکێشین. کامبەخش دەیوت: دکتۆر ئەرانی ئێمەی بەدەستەوە داوەو هەر بۆیەش قسەیان لەگەڵ نەدەکرد. کەسێکی جوولەکەی ئەڵمانی گیرابوو بەتۆمەتی پارەخواردن و دزی. ئەرانیی بێچارە لەبەرئەوەی کەس لەگەڵی قسەی نەدەکرد بەناچاری لەگەڵ ئەو ئەڵمانییە هەڵسوکەوتی دەکرد. دوای ئەوە دەیانوت

ئەڵمانییەکە سیخورەو ئەرانیش سیخورە بۆیە پێکەوە پێوەندییان هەیە. شەوێك کاتژمێر حەوت و هەشت بوو وتیان وەرن بۆ ژێر هەشت دۆسیەکانتان دەخوێننەوە. ئائەو کاتە شتی وانەبوو دۆسیەی کەسێك لەژێر هەشت بخوێننەوە. هەڵبەت من نەچووم. بەڵام چەندکەسێك لە هاوڕێیانمان دەچن و دەردەکەوێت ئەرانی هیچ شتێکی باس نەکردووەو هەمووی ئەم کەسانە شورشیان و کامبەخش بەگرتیان داون. دواتریش یەکتریان بەدەستەوە داوە. هیچ خۆ ڕاگرییەکیان نەکردووەو بەئاسانی یەکتریان بەدەستەوە داوەو ئەشکەنجە نەدراون. هاتبوون بۆ گرتوخانە و لەوێش لەسەر سەرۆکایەتی شەڕیان بوو. **کامبەخش، دکتۆر یەزدی، بەهرامی و ئەسکەندەری** و هەرکامێکیان دەیانویست ببن بە سەرۆك. هەموویان پێیان خۆش بوو لەسەروی ئەوانی ترەوە بن. بەتوندی ڕکابەریی یەکتریان دەکردو تۆمەتی زۆر خراپیان دەدایە پاڵ یەکتری. جاری وابوو کاری زۆر ناشیرینیان دەکرد بۆ نمونە تەبەری بەهۆی ئەوەی کە گەنج بوو لەگەڵ **جهانشاهلو ئەوەی جهانشاه، میری ئەفشار** هاوڕێ بوون و دادەنیشتن و پێکەوە قسەیان دەکرد. ئەوانی دیکە پێیان ناخۆش بوو کە بۆچی لەگەڵ ئەودا هەڵسوکەوت دەکات. دواتر کە نێوانیان تێکچوو **تەبەری** لەگەڵ پیشەوەریدا پیاسەی دەکردو لەبارەی ئەدەبیات و ئەوجۆرە شتانەوە قسەیاندەکرد، کە قسەیاندەکرد ئێمە دەمانبیست قسەکانیان لەبارەی وێژەی فارسی و هەڵەکانی زاراوەی فارسی بوو.

بەکورتی هەڵسوکەوتیان باش نەبوو و خۆیان سووك و چرووك

کردبــوو. ئیــدی ورده ورده ڕێزیــان لای ئێمــە و گــیراوە سیاســییەکانی دیکەش نەما. هۆی ئەشکەنجەدانی دکتۆر ئەرانی و ئەوانی تریش هەر ئەو بێڕێزییە بوو. چیدی ڕێزمان لێ نەدەگرتن. یەکەمجار کە ئـەوان هاتن بردیانن بۆ دالانـی ٩ کـە دەیـانوت ژوورەکـانی گـەورەن. دەیانوت دکتــۆر یــەزدی و هاوڕێکـانی گۆشـەیەکیان بـۆ خۆیـان دروسـتکردبوو ناویان لێنابوو "**لیبس ئیکە**" [٥] کە لەزمانی ئەڵمانیدا واتـای " قـوژبنی خۆشەویـستی"ە لـەوێ لەگـەڵ منداڵەکانـدا یاریانـدەکرد. بـەو شـێوەیە ڕێــزو بــەهای گــیراوی سیاســییان کــەمکردەوە. لــە پــەنای ئاسایــشدا گرتوخانەیــەکی کــاتیی لێبــوو کاتێــك دەیانویــست بمانخەنــە ژووری تاکەکەسی دەیانبردین بۆ ئەوێ.

ڕۆژێـك دکتـۆر ئـەرانیان هێنایـە ژورەکـەی تەنیـشتی مـن. دەنگـی یەکترمان دەبیست، قسەمان دەکرد. لێمپرسی تۆیان بۆ هێناوەتە ئێرە؟ وتی بەرپرسێك شـەپازللەی لـە **خـەلیل مەلـەکی** داوە، بەفـەرمانی مـن مانمان لەخواردن گرت و ئەوانیش لە حەوشە ئەشـکەنجەیان دایـن. لـە **خەلیل مەلەکی** یان نەدا بەڵام لەهەمووومانیان دا و منیـشیان هێنـا بـۆ ئێرە. وتی ئێوەش خواردن مەخۆن. وتم بەڕێز دکتۆر ئەمـە بـاش نیـە لەبەرئەوەی ئێمە پێشینەی زۆرمان هەیە (لەوکاتەدا حـەوت سـاڵ بـوو لەگرتوخانە بـووین ئـەوانیان تـازە هێنـابوو) بەباشـی شارەزای دۆخـی ئێـرەین! ئێـرە ئـەورووپا نیـە لێـرە کـەس ناتوانێـت خـواردن نـەخوات. تەنانــەت ئێمــە جارێکیــان ســێزدە ڕۆژ نانمــان نــەخواردو کارەکـەشمان هەڵە بوو. وتی نا، ئێوە دەمێکە لێرەن ئاگاداری دەرەوە نین هەتا ئێـوە

---

[٥] - گۆشەی خۆشەویستی

مانـــەگرن، هاوڕێکانیـــشتان لەســـەرەوە مانـــاگرن و ئێمـــە دەدوڕێـــین و هۆیەکەشـی ئێـوەن. وتم نـاتوانم مـانبگرم بـەڵام ئێـستا کـە هەڵـە و دۆڕاندنەکەتان دەخەنە ئەستۆی مـن، منـیش نـان نـاخۆم. خواردنیـان هێنـا، نـەمخوارد. ڕۆیـشتن بەبەرپرسـەکەیان وت، ئـەویش هـات و لێـی پرسیم بۆ نان ناخۆیت؟ وتم بەهۆی ئەوەی ئێوە دکتـۆرێکی بـەڕێزتان سووکایەتیکردووە، منیش نـان نـاخۆم. وتـی: لێـی بـدەن. چـوار کـەس بـوون، عـەریفێك و دوو پاسـەوان و خـۆی. هـەروتی لێیـدەن مـن شـەپازللەیەکم لـە خـۆی دا. ئـیتر نـەمزانی چـی ڕووی دا. پێدەچـوو دابێتیـان بەسـەرمدا و منـیش لـەهۆش خـۆم چـووبووم. کاتێـك هاتمەوەهۆش بەو زستانە ئارەقێکی زۆرم کردبوو. بەلامەوە سەیر بوو، وردە وردە بیرم هاتەوە چی ڕووی داوە، هەستامەوە سەیرمکرد هەموو گیانم شین و مۆر بووەتەوە. دیار بـوو دوای بوورانـەوەش لێیانـدابووم. نەیاندەهێشت دکتۆر چارەسەرم بکـات. دواتـر دەرکـەوت کەدەیانـەوێت لەناومان بەرن. ئـەویش لـەڕێگای هێنـانی چەندکەسێکی نـەخۆش بـە تیفوس کە هێنابوویانن بۆ ئەو بەشەی من و عەبدولقەدیر ئـازاد (کە ڕۆژنامەی ئازادیی دەردەکرد) و دکتۆر ئەرانی لێبووین. عەبدولقـەدیر ئـازاد زوو پێـی زانـین و هاوڕێیـەکی هـەبوو لـە دەرەوە ( **میرزا هاشم ئەفسەر** کە خـۆی شـاعیرو ڕوونـاکبیر و نوێنـەری پەرلـەمان و هـاوڕێی تـەیمور تـاش بـوو) لـەڕێگای ئـەوەوە عەبدولقـەدیر ئازادیـان لـەوێ گواستەوە بۆ گرتوخانەی سەرەوە. من و دکتۆر ئەرانی لەوێ ماینـەوە. عەبدولقەدیر هاوڕێکانمان ئاگاداردەکاتەوە گەر بێت و فریایان نەکەون گیانیـان لـە مەترسـیدایە. سـەردار ڕەشـید کـە یـەکێکبوو لەسـەرۆك

عەشیرەتە کوردەکان و نێوانی لەگەڵ مندا زۆرخۆش بوو، دەچێت بۆلای بەرپرسی گرتوخانەکە و پێی دەڵێت ئەگەر ئێستا ئیفتخاری نەهێننەوە بۆ ئێرە فەرماندەکەم هەموو کوردەکان ڕاپەڕن.

بەوهۆیەوە منیان هێنایەوە گرتوخانە و لەمەترسی ڕزگارم بوو. بەهاوڕێکانی ئەرانیم وت ئێوە هەڵەتانکرد مانتان لەخواردن گرت، لەم کاتەدا کە دنیا ئاگری تێبەربووە منش ناچار بووم ئەو کارە بکەم و زۆریشیان لێدام. بەلام ئێستا لەخواردن مانبگرن و بڵێن دکتۆر ئەرانیمان دەوێت. دکتۆر یەزدی وتی ئەم کارە زۆر هەڵەیە و ئێمە ئەمە ناکەین. وتم بەڕێز یەزدی ئاخر ئێوە لەسەر یەك باوەڕ گیراون. وتی بەهەر شتێك بڕوات هەیە ئێمە ئەسڵەن هیچ باوەڕێکمان نیە، پێوە بووین! بەکورتی هەر بەو هۆیەوە دکتۆر ئەرانی لەوێ مایەوەو نەخۆش کەوت. ئەوەندە دەواو دەرمانیان پێنەدا هەتا بەوشێوەیە ئەویش لەناوچوو. هەڵبەت هاوڕێیانی ئێمە بەتەمابوون لەبەر دکتۆر ئەرانی مانبگرن بەلام لە تاقمی پەنجاوسێ کەسی کەسیان، ئامادە نەبوون.

## ئاکۆکیی بیروڕا لەگەڵ گیراوە چەپەکانی دیکەی ناو زیندان

شێوەی ژیانی ئێمە لەسەرەتاوە دیاربوو. لە خوزستان ڕۆژی بەدوو قەڕان دەژیاین و کرێ خانوشمان دەدا. من سەرەتا مانگی هەشت تمەن و دواتر دە تمەن مووچەم هەبوو. ڕەحیمیش هەشت تمەنی وەردەگرت، کرێکاریمان دەکرد. مەبەستم دوای تەواوکردنی خوێندنە، لەبەیانییەوە تا ئێوارە لە خوزستان کارماندەکرد، لەگەڵ

ئەوکەسانەی چاویان بەشوێن پلەوپایەوە بوو نێوانمان خۆش نەبوو. لەزینـدان لەئەسـکەندەریم پرسـی گـەورەترین ئاواتـت چـیە؟ هـەر کەسێکی دیکە بوایە بۆ لەخشتەبردنیش بوایـە شتێکی دیکـەی دەوت. بـەڵام ئەسکەندەری بەڕاشکاوی وتـی: حـەزم دەکـرد لەپشتی مێزێکـی گـەورە دابنیـشتایەم و لێپرسـینەوەم لەگـەڵ ئەمانـەدا بکردایـە. **ئەسکەندەری** نە لەبیری کرێکارو نە لەبیری ئێراندا نەبوو.

لـە زینـدان ژمارەیـەك کرێکـارو زەحمەتکێـشیش هـەبوون، کە لـە خوزسـتان و شـوێنەکانی دیکـە بەتۆمـەتی جۆراوجـۆری پیـشەیی و چـالاکیی سەندیکالیـستی گیرابـوون. ئـەوان لەخـەمی نانـدا بـوون و بەڕاسـتی بـەدوای ئـەو ڕێکخراوەیـەدا دەگـەڕان کـە لەگرتوخانـە پێکمانهێنـا بـوو بەمەبەسـتی دابینکردنـی ژیانمـان. بیرمـان لـە سـەرۆکایەتی و پلەوپایـە نـەدەکردەوەو خۆشمـان لـە چـینی سـەرەوە نـەبووین هـەتا بکەوینـە شـوێن ئـەم قاجاریانـە. ئێمـە بڕوامـان بـەو پەنجاوسێ کەسە نەبوو، ئەوانمان ناسیبوو. یەکتریان دابوو بەدەستەوە، سۆڤیەتیان نـەدیبوو ستایـشی ستالینیان دەکـرد، ئێمـە خۆمـان لـەوێ بـووین و بەچـاوی خۆمـان دیبوومـان. لـەبڕێك لەکۆبوونەوەکانـدا دەیانپرسی بۆچی وادەڵێن، ستالین بەس کەسانی خـەتاباری سـزا داوە، هـەر بۆیـەش ئێمـە دانومـان پێکـەوە نـەدەکولا. مەسـەلەکە هـەر ئـەوە نـەبوو کـە ئێمـە کۆمـەڵی پەنجاوسێ کەسـیمان خۆشنەدەویـست کـە یەکتریان بەگرتدابوو، بەڵکو ئەوان بەبـەردەوام تۆمـەتی سیاسییان بـۆ هەڵدەبەستین وەك ئەوەی کە یووسف ترۆتسکیستە و شتی دیکە.

هـەر ئەوەنـدەیان لەسـەر ترۆتـسکی دەزانـی کـەدەیانگوت کاتێـك

ئەگەڵ لنین دوورخرابوونەوە هەڵەی کردووە کە وتویەتی دەبێ لەدنیادا شۆڕشەکان بەدووی یەکدا بێن. ئەو کاتەی لە مۆسکۆ خوێندکار بووین هەم ترۆتسکی و هەم بوخارین و هەم ستالین دەهاتن و قسەیان بۆ دەکردین. قسەکانیشیان وەکو یەك وابوو. ئەو کاتەش کە من گەڕامەوە بۆ ئێران، ترۆتسکی تازە لە وەزارەتی جەنگ وازیهێنابوو. مەسەلەکە ترۆتسکی نەبوو، دواتر من لە ئابادانیش دەستگیرکرام و هیچیشم لە بیروڕای ترۆتسکی نەدەزانی. کەسێك کە بیروڕایەك نەزانێت چۆن دەتوانێت ترۆتسکیست یان ستالینیست بێت. ئێستا ریشەی ئەم قسانە لەکوێوە هاتووە؟ ئارداشس ئەرمەنی هەڵەیەکی کردبوو. من لەباری رەوشتییەوە نەموتووەو ئێستاش نایڵێم، لەسەر ئەو هەڵەیە لە بەندیخانە بەگژیداچووم. ئەم مەسەلەیە عەتائوڵڵا خان ئارش ئاشکرای کرد و باسکردنەکەشی لەلایەن قازار سیمۆنیان بوو. من سەرکۆنەم کرد و بابەتەکە لەکۆبوونەوەی رێکخراوی زیندان گفتوگۆی لەبارەوە کرا. ئیتر من هیچم لەگەڵیدا نەوتووە. تەنانەت کاتێك بردیانین بۆ بەندەرعەباس و پێکەوە کەوتینە یەك زوور قسەم لەگەڵ نەدەکرد. دەنگۆی (ترۆتسکی بوونم) لەلایەن ئەوەوە بڵاوبووەوەو لەبەندیخانەوە دەستی پێکرد، تاقمی پەنجا و سێ کەسی دەیانبینی گوێ بەیەکتر نادەین، پێیانخۆش بوو ئەم دەنگۆیە گەورە بکەن کە بگاتە گوێی ستالین و رووسەکان. لەدوای خەرمانانی ١٩٤١ یش کە دەترسان من لە رووسەکان نزیك ببمەوە ئەم بابەتەیان گەورە کردو لەبەرئەوەی من لەسێدارە بدرێم. من هەر لەوسەردەمەی کە لە رووسیا دەژیام بابەتی ستالینم بۆ دەرکەوت بوو.

لە رووسیا دەمبینی کە هەڵبژاردنەکانی ستالین چۆنە و بەچ شێوەیەك کایە دەکەن. هەموو ئەو شتانەم بەچاوی خۆم بینیبوو. هەر لەو کاتەوە بۆم دەرکەوتبوو. تەنانەت لنینیش لە وەسیەتنامەکەیدا باس لەوە دەکات کە ئەم پیاوە چەند خۆپەرستە، بەردەوام ئاگاتان لێبێت. جیا لەوەی دەنگۆی ئەوە هەبوو کە دکتۆر نەریمانۆف جێگری لنین و سەرۆك وەزیران یەکێك لە رێبەرانی ئازەربایجانی بوو، بەدەستی ستالین دەرمانخوارد کراوە. هەر بۆیە من رقم لە ستالین بوو. تەنانەت لاهوتی پێیوتم من زۆر پێمخۆشە. لەبەرئەوەی ئەگەر ئەرۆشتایەی ستالین تۆیشی دەکوشت. لەبارەی زیندان و گیراوەکان، قسەوباس زۆرە. ئێمە کۆمەڵێك بووین لە کۆمپانیای نەوتی باشوور، بارودۆخمان دیاربوو، مانمان گرتبوو کە زەمینەی هەبوو، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبوو تا بتوانن تۆمەتێك بخەنە پاڵمان. تەنانەت ئەگەر دەریش بکەوتایە کە ئێمە پێوەندیمان بە سەندیکای جیهانییەوە هەیە، ئەوێ دامەزراوەیەکی جیهانییە. هەموو کاتێك ئێمە دەنگمان هەڵدەبڕی و دواتر پێوەندیمان بەسەندیکای جیهانییەوە دەکرد و دوای ئازاد بوونیشم لە بەندیخانە خوڵك کرام و لە دەرەوەی وڵات چووم لە سەندیکای جیهانیدا بەشداریمکرد. بۆیە ئەمە بابەتێکی قێزەون نەبوو واتە شتێك نەبوو بتوانن ناتۆرەیەکم لێبدەن.

لەبارەی تاقمی پەنجاوسێ کەسی دەتوانین بڵێین لەناویاندا دکتۆر ئەرانی بەراستی کەسێکی بەرەوشت و رووخۆش و مرۆڤدۆست بوو، دکتۆر ئەرانی زاناو فێرخواز بوو. مرۆڤ بوو نەدەبووە داردەستی کەس. هۆگری گەلی خۆی بوو. ئەگەر دکتۆر ئەرانی لەگەڵ

پەنجاوسێ کەسی بهاتایەتە دەرەوە بەدڵنیاییەوە نەدەکەوتە ژێر کاریگەریی بیانیەکان. ئەویان لەناوبرد. زۆربەی ئەوانەی کەوتبوونە زیندانەوە لاوانێکی باش بوون. هەموویان خوێندەوارو پاك و بێغەش و راستگۆ بوون. بەوانیان دەوت کۆمۆنیستی زۆرەملێ. زۆربەیان کۆمۆنیست نەبوون. لەوانەیە لەناویاندا چەند کۆمۆنیستێك یان سیخوڕی تێدابووبێت. وەك کامبەخش بەڵام دڵسۆزەکانی ئەو تاقمە وانەبوون. کەسانێك وەك تەبەری، حەکەمی، مەنوو هێتر لەو کاتەدا کەسانی پاك بوون. لەدوای ئازادبوونیان کەوتنە سەر ئەو رێگایە و هیچکامیان هەنگاوێکیان بەقازانجی خەڵکی ئێران بێت، نەنا. بەڵام کۆمەڵێکیش هەبوون کە بەتۆمەتی سیخوڕی گیرابوون. ئاغا بیگۆف لە راسپێردراوانی رێکخراوی ك.گ.ب ی سۆڤیەت بوو کە ماوەیەك لە ئێران چالاکیی کردبوو کەسی شاراوەی هەبوو لە وەزارەتە گرنگەکانی وەك وەزارەتی شەڕو دارایی و فەرمانگەی پۆستە. ئاغا بیگۆف پارەیەك لە رووسەکان دەخوات و لەڕێگای ئێرانەوە لە فەرەنسا دەبێت بە پەنابەر. دەوڵەتی فەرەنسا پێی دەڵێت دەبێت بیرەوەرییەکانت بنووسیتەوە هەتاکو ئێمە وەك پەنابەر وەرتبگرین. ئاغا بیگۆف تەنانەت ناونیشانی ئەو کەسانەش دەنوسێت کە لەیادی نەماون. چەند کەس لەوانە دەگرن و ئەوانیش کەسانی دیکە دەدەن بەدەستەوە. سەرۆکەکەیان ئێرانیان بوو. پیاوانی ئاسایش شەوێك عارەق و شەراب و تلیاکیان پێدەدەن و بەڵێنیان پێدەدەن کە ئێمە بەشوێن کەسی وەك ئێوەدا دەگەڕێین بۆ دەچن بۆ بیانیەکان کاردەکەن خۆتان ببن بەبەرپرسی هەالگری و ئەوانیش دان بەهەمەوو شتێکدا دەنێن و

دەیانگرن. دوو کەسیان سزای لەسێدارەدانیان بەسەردا دەستەپێت، ئێرانبان و خاقانی. ئەوانیان لەسێدارە دا و ئەوانی دیکەشیان حوکمی جیاجیای ماوەدرێژیان بەسەردا سەپاندن، کە یەکێك لەوانە خزمی وتاخوێنی تاران، سەید باقر ئیمامی بوو و سزای هەتاهەتاییان بەسەردا سەپاند. کۆمەڵێکیان وا بوون.

## هەڵاتنی عێزەتوڵلا لەزیندان

عیزەتوڵلا یەکێك لە گیراوەکان بوو، لاوێکی زۆر سادە و بەرەوشت بوو. خوێندەواریشی نەبوو بەڵام جێگای متمانە بوو، سزای هەتاهەتایی هەبوو. پێمانوت رابکات لە زیندان. وتی چۆن هەڵبێم؟ وتم ئەم حەوشەیە بەدەستی ئێمەوەیە. (لەوێدا ئێمە کەللەقەندمان دەشکاند.) من ئێوارە تۆ دەخەمە ئەوێوەو دەرگاکە دادەخەم. بە پلوسکەکەدا سەرکەوەو هەڵێ. عێزەتوڵلا پێی خۆش بوو. ئەو کارەمان کرد و عێزەتیش هەڵهات. دوو رۆژ دوای ئەوە عێزەتوڵلایان هێنایەوە. ئەویان لەدەرەوەی بەندیخانە گرتبوو، هەموو بەرپرسەکان و پاسەوانەکان کۆبوونەوە بزانن ئەمە چۆن هەڵهاتووە بۆ ئەوەی لەمەودوا رێگای لێبگرن. بەعێزەتمان وت ئەگەر هەڵبێیت تەقەت لێناکەن، لەبەرئەوەی بۆ تاقیکردنەوەی جۆری هەڵاتنەکەیە. ئەویش هەلەکەی قۆستەوەو ئەمجارە بەیەکجاری هەڵهات!

## دوورخستنەوە بۆ زیندانی بەندەرعەباس

ڕۆژێکیان لەگەڵ نۆ کەس لە هاوڕێیانی دیکەی زیندان ئێمەیان دووان دووان بەزنجیر پێکەوە کۆتکرد، سواری پاسێکیان کردن و منیشیان لەنێوان خۆیاندا سواری قەمەرەیەك کرد. ئەو ئەفسەرەی ئێمەی برد ناوی **خەلعەتبەری** بوو. ئێمە نەماندەزانی بۆ کوێ دەچین، بەڵام هەرکە لە شاعەبدولعەزیم دەرچووین تێگەیشتم بەرەو باشوور دەڕۆین. بردیانین بۆ ئەسفەهان و شیرازو بەرازجان. سەرۆکی ئاسایشی بوشەهر پیاوێکی پیر بوو باوەشی پێداکردین و وتی ڕۆڵەکانی خۆم، کوڕەکانی خۆم هاتن! ئەمانە مرۆڤی باشن و زۆر ڕێزو خۆشەویستی بۆمان دەربڕی. دڵخۆشبووین لانیکەم دوای هاتنەدەر لەبەندیخانە، لانیکەم لەژێر چاودێری کەسێکی وادا بین، خۆشحاڵ بووین کە هێنایانین بۆ ئاسایش، دەمەو ئێوارە بوو سەرۆکی ئاسایش بانگی پاسەوانێکی کردو وتی ئەم کوڕانەی من ئەمشەو میوانی ئێمەن، بڕۆ پڵاووکەبابیان بۆ بێنە. پاسەوانەکە ڕۆیشت و دوای نیوسەعات هاتەوە وتی: قوربان پڵاووکەباب نەماوە. وتی بڕۆ کەبابیان بۆبێنە، پاسەوانەکە ڕۆیشت و هاتەوە وتی قوربان کەبابیش نەماوە، وتی شتێکی ئامادەیان بۆ بێنە. دوای ئەو ڕووی لەئێمە کردو وتی: ببینن لەگەڵ کێ کار دەکەم. دەبێت لەگەڵ ئەمانە کار بکەین؟ پاسەوانەکەی چوو خواردنەکەمان بۆ بێنێت و سەرۆکی ئاسایش وتی من دەڕۆم کارم هەیە هەتا ئەو دێتەوە پشوو بدەن. پاسەوانەکەی هاتەوەو وتی قوربان شتی ئامادەش نەبوو هەموو دوکانەکان داخراون. ئێمەیان برد بۆ

زیندان. دە کەس بووین، من و٣ کەسی ئەلەموتییەکان (زیا، نورەدین و عیمادەدین ئەلەموتی) کامبەخش، شورشیان، رەحیم هیمداد (خو وینی)، عەلی ئومید، ئارداشس ئەرمەنی و ئازەربایجانییەك بەناوی فەرهیختە. لەسالۆنی ژنانەوە، ژنێك هاواری کرد نانتان ناوێت، بۆتانی بێنم؟ وتمان نا. وتی من دڵنیام برسیتانە، چۆن نا؟ وتمان لەڕێگاوە هاتووین هیلاکین برسیمان نیە. وتی ئەم سەرۆکی ئاسایشە هەروایە هەموو کاتێك گیراوەکان بەبرسێتی دێنێتە ئێرە. وادیاربوو ئەو ژنە هەرزمیە لە سەرۆکی ئاسایش زۆر باشتر بوو. ئێمە بەدەستی ئەو جۆرە کەسانەوە گیرمان کردبوو. دوای چەند ڕۆژێك دابەشیانکردین. من، ئارداشس، شورشیان و فەرهیختەیان برد بۆ بەندەر عەباس و ئەوانی دیکەیان برد. بۆ دورگەکان. ئێمەیان سواری پاپۆڕ کرد. ئەفسەرێکی ئاسایش و سێ چوار پاسەوان هاتن و وتیان ئەبێت کەلەپچەتان بکەین. هەرچوارمانیان پێکەوە بەستەوە. بەڕێکەوت شورشیان کە دەیانوت نەخۆشیی سفلیسی هەیە بە منەوە کەلەپچەیان کرد. منیش گەنج بووم و زۆر قینم لەو شتانە بوو.

ئەو شەوەی کە لە پاپۆڕەکەدا بووین بیرمکردەوە خۆ ئێمە لەمانە داماوتر نین ئێرەش ئێران نیە ناوەڕاستی دەریایە و ئاوێکی جیهانییە بۆ نەبێ دەستەڵاتیان لەسەرمان بێ. هاوڕێکانم لەخەو هەڵساندو وتم ئەمانە بۆیان نیە ئێمە کەلەپچە بکەن و ئێمە دەتوانین ئەوان چەك بکەین و لێرە بڕۆین. پاسەوانە، دوولەفەی لێدەین دەکەوێت. ڕازی بوون و وتیان یارمەتیت دەدەین. بانگم کردو وتم ئێمە دەمانەوێت بچینە سەر ناو. دەست و پێمانیان کردەوە. بانگی ئەفسەرەکەم کرد

وتم هەتیو شەرم ناکەی؟ سەگباب بۆ ئێمەت حەپسکردوە؟ وتی: مـن نازانم. وتم ئێستا چەکتدەکەم تابزانی. وتـی ئێمـە چیمانکردووە؟ وتم ئـەم کەلەپـچەیە چـیە؟ وتـی فـەرمانیان پێکـردوین. بـەکورتی لـەو کەلەپچەیە ڕزگـاربوین. سـەرۆکی ئاسایـشی بەنـدەر عـەباس لەوکاتـەدا عیمادی بوو کـە پێشتر لـەتاران بەرپرسـی گرتوخانـە بـوو، هـەرکاتێك بمانویـستایە ڕاپـەڕین بکـەین یـان کەسـێك دەربازبکـەین، کاتێـك ئـەو لەوێ نەبوایە دەمـانکرد. ئـەویش لەبەرامبـەردا بەدزییـەوە ڕۆژنامـەی بـۆ دەهێنـاین. ئێـستا دڵمـان بـەوە خـۆش بـوو کـە سـەرۆکی ئاسـایش دۆسـتمانە و ئێمـە دەدەنـە دەسـتی ئـەو. لەگرتوخانـەدا ژوورێکیـان دا بەمن و ئارداشس کە هەواگۆڕکێی تێدابوو. لەوکاتـەدا هـەواگۆڕکێ زۆر گرنگ بوو لەبەرئەوەی موبەریدە نـەبوو، شورشـیان و فەرهیختەشـیان خستە ژوورەکەی دواوە. سەرۆکی ئاسایش و سـەرۆکی زینـدان هـاتن و میوەیـەکی زۆریـان هێنـا، لەکاتێکـدا کـە میـوە لـەوێ پەیـدا نـەدەبوو. دواتر پاسەوانەکان وتیـان سـەرۆك ئەمـەی لـە سـیرجانەوە بـۆ هێنـاون دەمیزانـی ئێـوە دێـن. خۆشـحاڵبووین چـونکە لانیکـەم لێـرە تەنگـەلان نەبووین.

دووسـاڵ لەگرتوخانـەی بەنـدەر عـەباس بـووین. لـەم دووسـاڵەدا هەمیشە نەخۆش بووین، زۆرتـر پـەتای مـەلاریامان دەگـرت، هـەمووی نـەخۆش بـوو. گرتوخانـە نـەبوو. کەلاوەیـەکیان گرتبـوو کۆمـەڵێکیان تێکردبوو. ئێمەشیان بردە ئەوێ. لەوێ خۆ بەندکراوی سیاسی نـەبوو. کۆمەڵێك دزیـان گرتبـوو کردبوویاننـە ئەوێوە، دوو ژوورە باشـەکەیان دابـوو بەئێمـە. لەتارانـــەوە ئاگاداریـــان کردبونـــەوە ئەمانـــە نابێـــت

بگەڕێنـــەوە، دەبـــێ لـــەوێ بمـــرن. لـــەو ڕۆژەوە عیمـــادی ڕووی لێوەرگێڕابووین. دوو ساڵ لـەوێ بـووین. ١٩٣٩ بـۆ ١٩٤١ز . کەمـە کەمـە لەگەڵ دەرەوەش پەیوەندیمان پەیداکرد. لەبەرئەوەی پێشتر عـەلیزادە لەگەڵ ئێمە لە بەندیخانە بوو، دوورخرابۆوە بۆ بەنـدەر عـەباس و لـە لەشارەوانیی ئـەوێ کاریـدەکرد. لەبەرئـەوە بێئاگا نـەبووین لـەدەرەوە، عەلیزادە خوێنـدەوار بـوو، خوێنـدنی لەئـەڵمانیا تـەواوکردبوو. دوایـی لـەKUTTV لەگـەڵ ئێمـە دەیخوێنـد دواتـر گرتیـان و لـە تـاران لـە گرتوخانـەدا بـوو بـەڵام لـە تـاران ئـەو کەسـانەیان نەدەهێـشتەوە کـە تۆمـەتیان سـیخوڕی بـوو، چـەند سـاڵێك حوکمیـان دەدان و دواتـر دووریاندەخـستنەوە بـۆ شـارێکی دیکـە. عەلیزادەشـیان تاراندبوو بـۆ بەندەر عەباس.

### پلانی هەڵهاتن لە گرتوخانەی بەندەر عەباس

سەرۆکی گرتوخانەی بەنـدەر عـەباس نـاوی مەشـکین قەڵـەم بـوو، لەگـەڵی ببـوین بـەبرادەر و کابرایـەکی خـراپ نـەبوو، بـەڵام ناسـایش بـەوەی زانـــی و ئـــەویان گـــۆڕی و کۆمـــەڵێك کەســـی خراپیـــان کـــرد بەپاسەوانمان. زانیمان لێرە خەریکە دەفەوتێین. لەگەڵ ئەوانی دیکەدا قسەمکرد کە لـە زینـدان هـەڵبێین. قبوڵیـانکرد. سـەرۆکی ناسـایش و سـەرۆکی گرتوخانـە هاتوچووی ژوورەکـەی ئێمـەیان دەکـرد. وا بڕیـار بوو شورشیان و فەرهیختە دیـواری ژوورەکـەیان هەڵبکـەنن کـە خـشت بـــوو، وردەوردە شـــەوانە ئـــەو کونـــە بـــچووکە هەڵبکـــەنن کـــە لەژوورەکەیانـــدا بـــوو، نزیکـــەی بیـــست ڕۆژ بەکەوچـــك خـــەریکی

هەڵگەندن بوون، ئاویان بەدیوارەکاندا دەکرد بۆ نەرمبوونەوە. رۆژێک هاتن و وتیان ئامادەیە و دەتوانین هەڵبێین. ئێمە لەبەرئەوەی شارەزای هیچ شوێنێک نەبووین بڕیارمان دا یەکێک لەو زیندانیانەی خەڵکی بەندەر عەباس وەکو شارەزا لەگەڵ خۆمان بەرین. گەنجێکمان دۆزییەوە کە چاوێکی کوێر بوو. دەیانوت شارەزای هەموو شوێنێکە، شەو هێنامان بۆ ژوورەکەی خۆمان بۆ ئەوەی نیوەشەو هەڵبێین. من نەخۆش بووم دەستم بۆ بەرزنەدەکرایەوە، بە ئارداشسم وت بچن کونەکە بکەنەوە تا رابکەین، من ناتوانم ئەوە بکەم، بۆ رێگا بڕێک خواردن و یەکی بتڵێک ئاومان لەگەڵ خۆمان هەڵگرت. بۆ ئەوەی لەکاتی پیویستی بەکاری بێنین و ئەگەر توشی پۆلیسیش بووین بەرگری پێ لەخۆمان بکەین، لەپێشدا ئەو کوڕە چوو وتی کونەکە تەسکە. لەکونەکەوە ڕوناکی دەچوە دەرەوەو مەترسیدار بوو. لەوانەبوو لەحەوشەکە پاسەوانێک بیبینێت. من وامدەزانی ترساوەو درۆدەکات. ئەوم هێنایە خوارەوەو بۆ خۆم چووم. ڕاستی دەوت زۆر ئەستەم بوو، وتم ئەختێک قوڕم پێبدەن لەبەرئەوەی ڕوناکی ئەکەوێتە ناو حەشەکەوە. هاتینەوەو خەوتین ئەو کوڕەشمان ناردەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و وتمان بەیانی دیسان دەستدەکەینەوە بەهەڵکەندنی. بەیانی دیسان دەستیان کردەوە بەهەڵکەندنی. بەڵام بەهۆی ئەوەی دیوارەکە ناسک بووەوە دەنگی دەچێتە دەرەوەو پاسەوانێک گوێی لێدەبێت. سەیردەکات و چاوی بەقوڕەکە دەکەوێت و ئاگاداریان دەکاتەوە. کۆمەڵێک لەئاسایشەوە هاتن و ژوورەکان دەگەڕان. لەپێشدا وایاندەزانی ئەوە کاری ئەو بەندکراوانەی دیکەیە. دواتر

چوون لەسەربانەوە سەیریان کردو زانیان ئەمە لەژورەکەی شورشیان و فەرهیختەوەیە. وتم هاوڕێیان ئێستا دۆخەکەی ئێمە وای لێهاتووە ئەگەر نەشمانکوژن دواتر ژەهرمان دەرخوارد دەدەن. ئێمە هەر دەمرین باشتروایە ئێستا خۆڕاگری بکەین، لێیان نەپاڕێینەوەو ئەوانیش گوێ بەو شتانە نادەن. من هاتمە ناو حەوشەکە و پیاسەمدەکرد. چاوم لێبوو سەرۆکی گرتوخانەکە کە خەڵکی مەشهەد بوو هات و شەپازللەیەکی لە شورشیان دا. لەبەرئەوەی لە ژوورەکەی ئەوانەوە کونەکە کرابوو. ژوورەکەی ئێمە هیچی لێنەکرابوو من و ئارداشس کێشەمان نەبوو. منیش چووم و شەپازللەیەکم لەسەرۆکی گرتوخانە سرەواند. کە لێم دا هەڵهات. لەبەرئەوەی دەترسا گیراوەکانی دیکەش برژێن بەسەریدا. دوای ماوەیەك پاسەوانێك هات وتی: داوای تۆو شورشیان دەکەن. لەگەڵ شورشیان چووینە حەوشە و دەستمانکرد بەقسەکردن بۆ بەندکراوەکان کە دنیا شلەژاوە، شەڕی جیهانی دەستی پێکردووە، بۆچی دانیشتوون، بۆچی راناپەڕن، بۆچی دەرگای گرتوخانە ناشکێنن و لەو قسانە.

دوای ماوەیەك ئارداشس و فەریهختەیان بانگکرد. لە پاسەوانەکەم پرسی بۆ کوێیان بردن؟ وتی: بردنیانن بۆ بەندیخانە - بەندیخانەیەکی تازەیان دروستکردبوو. دواتر هاتن و منیان برد بۆ لای عیمادی سەرۆکی ئاسایش. وتی یووسف خان! بینیت چیت کرد، لەوانەبوو لەسێدارەمدەدەن. وتم لەسێدارەت بدەن. من لێرەدا بمرم لەبەرئەوەی تۆ نەدەن لەسێدارە. هەرچەندە من بەتوندی قسەم دەکرد ئەویش نەرمونیانتر قسەی دەکرد. پێم سەیر بوو. وتی خۆ

ئێمە پێکەوە هاوڕێ بووین و دەتوانین دیسانیش هاوڕێ بمێنینەوە. وتم چۆن؟ ئێوە سێ هاوڕێی منتان بردووە ئێستاش دەڵێن پێکەوە هاوڕێ بین؟ وتی نا، هاوڕێکانی تۆش دێنەوە. زۆر حەپەسام. وامدەزانی دەرمانخواردمان دەکەن، وتم هاوڕێکانم بێننەوە هەتا دژ بەئێوە قسە نەکەین و خەڵکتان لێ هان نەدەین. وتی: دەیانهێننەوە. دوای ماوەیەك ئەوانیان هێنایەوە. ئێستا هەر چوارمان دانیشتوین و زۆر بەلامانەوە سەیرەو هۆیەکەشی نازانین. هێشتا ئاگادار نەبووین و ولاتە یەکگرتوەکان هاتوونەتە ئێرانەوە. ئەوان وایاندەزانی ئێمە ئاگاداری ئەو بابەتەین بۆیە ویستومانە هەڵبێین. بەلام هیچ ئاگادارییەکمان نەبوو، ئەگەر بمانزانیبایە ئیتر ئەو هەموو دیوارەمان هەڵنەدەکەند.

# بەشی سێهەم
# ڕزگاربوون لەبەندیخانەو گەڕانەوە بۆ تاران

لەدوای سێ ڕۆژ هاتن و وتیان ئازادن و وەرن بۆ ئاسایش. وتم مادام ئازادین بۆچی بێین بۆ ئاسایش، من پێم ناخەمە ناو ئاسایشەوە. وتیان نا، ئێوەیان بانگهێشت کردووە بۆ دارایی سەرۆکی ئاسایش. ڕۆیشتین بۆ ئەوێ و قسەمانکرد. وتیان شێو ئامادەیە، وتم ناخۆین و هەستاین بێنەدەرەوە. هاوسەرەکەی پێشی پێگرتین و وتی ناهێڵم بڕۆن. نانمانخواردو بەیانی عەلیزادەمان دۆزییەوە. عەلیزادە پیاوێکی خوێندەوارو زیرەك بوو، بارودۆخەکەشی دەزانی، لە ئاسایش پێیانوتین داوای پارەمان کردووە بۆ خەرجی ڕێگاتان دووسێ ڕۆژێك لێرە بمێننەوە خۆمان دەتان نێرینەوە بۆ تاران. لە عەلیزادەم پرسی تۆ پارەت پێیە؟ وتی: بڕێك پارەم هەیە و دەتوانین پێی بگەینەوە تاران. وتم مادام وایە باچاوەڕێ نەکەین لەوانەیە ئینگلیزەکان بێن و ئێرە داگیربکەن و ئێمەش بنێرنە هیندستان و عەرەبستان و دیسان بکەوینەوە دەستیان. بەڕێکەوتین و چووینە ئیسفەهان. دارایی یەکێك لە گیراوەکانی هاوڕێمان کە خەڵکی کرماشان بوو لە ئیسفەهان بوو. ناوی ڕەوشەن بوو ئەو کەسە بوو کە لەپەرلەمان بەردی لە فروغی گرت. ڕەوشەن لە ئیسفەهان بوو، دوو سێ ڕۆژێك لە ماڵەکەی بووین.

سەیرمانکرد ئەو داماوە لە سوچێکی ماڵەکەیدا کومبارێکی شڕەی هەبوو بە ژن و منداڵەوە لە دۆخێکی نەگریسدا لەوێ دەژیان. وتم هەستە بابڕۆین. وتی لێناگەڕێن. وتم هەستە بابڕۆین. بارودۆخەکە شێواوە. هێنامان و خستمانە سەیارەوە. پاسەوانێك هاتوو وتی ئەم پیاوە ناتوانێت بڕوات. ئێمەش پەلامارمان دا و تمان کەسە سەرزلەکان هەموویان ڕۆیشتون و هەر ئێوە ماونەتەوە. ترسا و چووە دواوە. ڕەوشەنیشمان هەلگرت و چووین بۆ تاران.

لە تاران، لە سێ ڕێیانی ئەمین حوزور میوانخانەیەکی لێبوو بەناوی ڕەوشەن یان گوڵشەن. لەوێ دابەزاین. ئێستا نە عەلیزادە پارەی پێیە و نە من و نە ڕەوشەنیش. لە دوای سێزدە ساڵ تەواوی جلەکانمان شڕ بووبوو سێ پیاوی بێ پارە لە میوانخانەیەکدا بووین. سێزدە ساڵ یەخسیری ئێمەی لە هەموو شتێك نامۆ کردبوو. تەنانەت لە تارانیش نەشارەزای شوێنێك بووین و نە کەسیشمان دەناسی. هاوڕێکانی دیکەمان هاتن و ئێمەیان دۆزییەوە لەبەرئەوەی ئێمە لە بارودۆخێکی زۆر خراپدا بووین و دەستمان بەبنەماڵەکانیشمان نەدەگەیشت تا یارمەتیمان بدەن. یەکەم کەس کە هات بۆ دیتنمان ڕەزا ڕوستا بوو. ڕەزا ڕوستا بەتۆمەتی سیخوڕی گیرابوو، لەگەڵ ئەو لە مۆسکۆ و لە بەندیخانە پێکەوە بووین. لەبەرئەوەی لە خوێندکارەکانی KUTTV بوو هات بۆ لامان و وتی بەختتان هەبوو باش هاتن. وتمان بۆچی؟ وتی لەبەرئەوەی ئێمە حیزبێکمان پێکهێناوە بەناوی حیزبی توودە. وتم ئێوە کێن ئەو کارەتان کردووە؟ وتی بەهاوکاری شازادە سۆلیمان میرزا. وتم بۆ واتان کرد؟ چونکە ژمارەیەکی زۆر لە گیراوان و

دوورخراوەکان، چاوەڕێتان بکردایە ئەوانیش بێنەوە و ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریمان پێکبهێنایەو تەگبیرێکمان بکردایە بۆ داهاتووی ئێران. پەلەتان کرد. وتی هاوڕێیان وتوویانە. (مەبەستی لەهاوڕێیان نێردراوەکانی ستالین بوو) هاوڕێیان فەرمانیان کردووەو ئێمەش بەڕێوەمان بردووە. زۆر باشە. کاتێکی باش هاتن و وەرن پێکەوە کاربکەین. وتم نا ئەمە بۆ ئێمە باش نیە کە بێین و بەفەرمانی بیانیەکان حیزب پێکبهێنین. ئەویش بەبێ ئامادەیی گەلی ئێران دووکەس دابنیشن و دواتر دانە دانە خەڵکی کۆ بکەینەوە ئەمە دروست نیە و ئێوە کارێکی هەڵەتان کردووە. لێمان دوور بکەنەوە چونکە ئێمە بابەتی ئەو کارانە نین، ڕوستا بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە و عەلیزادە ماوەیەك داما دوایی وتی لەم کاتەدا کە ئێمە بێ پارەین بۆ واتکرد؟ ئێستا دەڕۆیشتین و دواتر بیرمان دەکردەوە بزانین چی بکەین. وتم نا ئەگەر مرۆڤ لەسیاسەتدا شەرمن بێت ئیدی ناتوانێت وەکو بازرگانی لە ساختەچیەتی ڕزگاری ببێت. دووەم کەسێك کە لەدوای چوونمان بۆ تاران هات بۆ لامان شادان بوو. شادان خەڵکی قەفقازو ئازەربایجانی بوو. ئاوەڵزاوای براکەی عەلیزادەش بوو. ئەو هات بردینی بۆ ماڵەکەی خۆی. کۆمەڵێکی زۆر هاتن بۆ سەردانمان هەندێکیانمان دەناسی و هەندێکیانیش نا. یان ئێمەیان پێ سەیر بوو یان بۆ ڕێزلێنان بوو. شادانی ڕەحمەتیش میوانداریی هەموویانی کرد. لەو کەسانەی کە هاتن بۆ لامان عەبدلقەدیر ئازاد بوو. من پێمخۆش بوو هاتوچۆ کەم بێتەوە و زیاتر شەرمەزاری بنەماڵەی شادان نەبین، لەبەرئەوەی هیچ ڕابردوویەکیشمان لەگەڵ ئەودا نەبوو. عەبدلقەدیر

ئازاد هات و تا بەرەبەری نیوەشەو دانیشت. پێی وتم فاشستەکانی ئەڵمانیا دێن و ئێمە دەبێت هاوکارییان بکەین. من پێم سەیر بوو. وتم ئەمە چۆن دەبێت، ئێوە ماوەیەك لەپێناوی ئازادیدا خەباتتان کردووە، تووشی هەڵداشتن و گرتن و ئازارو ئەشکەنجە بوون. وتی نا ئەوان یارمەتیمان دەدەن و ئێمەش ئێران ئاوەدان دەکەینەوە.

دووەم شت کە بەلامەوە سەیر بوو لە پێشنیارەکەی ڕوستا و ئازاد ئەوەبوو کە لەیەکێتی سۆڤیەت نێونەتەوەیی سێهەمی کۆمۆنیستی و سەندیکای جیهانیان هەڵوەشاندوەتەوە، چۆن دەیانەوێت لە ئێران ڕێکخستن بکەن. ئەمە زۆر مایەی سەرسوڕمان و جێگای باوەڕ نەبوو. لەبەرئەوەی ئەم کارە پێویستیی بە هاوکاریی ئینگلیز و فەرمانیکا هەیە و ئەگەر ڕێکخراوەیەك لە ئێران پێکبهێنرێت رووبەڕووی ئەوان دەبێتەوەو ئەوان دەتوانن پێشی پێبگرن. کەوتینە لێکۆڵینەوەو دەرکەوت بەبۆچوونی ئینگلیزەکان ئەوکارە دەکەن. چونکە لەو سەردەمەدا لایەنگری فاشیزم لە ئێران زۆر بوو، ئینگلیز و رووسەکان دەیانویست ڕێکخراوێك پێکبهێنن و ئەوانەی شوێن فاشیزم کەوتوون بەرەو ئەم ڕێکخستنە نوێیە ڕایانبکێشن. ئەم ڕێکخراوە لەلایەن رووسیاوە حیزبی توودە و لەلایەن ئینگلیزەکانیشەوە حیزبی هەمراهان بوو. حیزبی هەمراهان لەلایەن مستەفاخان فاتیح کارمەندی کۆمپانیای نەوت پێکهێنراو حیزبی توودەیش لەلایەن سولەیمان میرزا و روستا پێکهێنرا. روستا لە ساوە بوو لەبەرئەوەی زووتر گەیشتە تاران رووسەکان و ئەوانیش ڕینوێنیان کرد. بۆ ئێمە ڕۆشن بوو کە رووسەکان لە بارودۆخێکدا کە خۆیان لەمەترسیدابوون

و نێونەتەوەیی کۆمۆنیستیان هەڵوشاندبۆوەو هەموو ڕێبەرەکانیان کوشتبوو بەتەنیا نەیاندەتوانی ئەو کارە ئەنجامبدەن و حیزبی توودە پێکبهێنن و بیبانەوێت دەستەڵات بگرنە دەست.

هەڵبەت لەوکاتەدا کەسانێکی وەك عەتیقەچی، مەنو، خەلیل مەلەکی، لە تاقمی پەنجاوسێ کەسی، بەپێکهێنانی ئەو حیزبە گەشبین نەبوون. ڕۆژێك کۆچکردوو خەلیل مەلەکی لە شەقام منی بینی و وتی نەچوومەتە نێو حیزبی توودەو پەشیمانیش نیم. وتم زۆر کارێکی باشت کردووە. حیزبی توودە ئەو حیزبە نیە بنەڕەتێکی باشی هەبێت. دواتر کە حیزبی توودە پەرەی سەند بینیم خەلیل مەلەکیش چووەتە ئەوێ و تەنانەت بووە بەوتەبێژیشیان. من بەنهێنی چەند کرێکارێکم دەنارد بۆ ناو کۆبوونەوەکانیان و پرسیارگەلێکیان دەکرد کە ئەوان نەیاندەتوانی وەڵامی بدەنەوە. زۆر زوو پێیان دەزانین و دەیانوت ئەمانە لەهاوڕێکانی ئیفتخارین.

### بەپەجۆری کار

دۆخی ئێمە جۆرێك بوو نەماندەتوانی زۆر لەتاران بمێنینەوە، دۆخی ئابووریمان زۆر خراپ بوو، عەلیزادە ئاسیاوی دیبا بوو، قسەی لەگەڵ ئەو کردو لە دلیجان کاری بۆ من و ڕەحیم هیمدادو عەلیزادە دۆزیەوە. دیبا کۆمپانیایەکی هەبوو بە ناوی دیباو بەیات کە ڕێگای دلیجان ـ ئیسفەهانی بە قۆنتەرات گرتبوو. کاری جیاجیایان بە ئێمە سپارد. عەلیزادەیان کرد بە کارگێڕی "سیتوناسیۆن"[1] لەبەرئەوەی

---

[1] – Sityotiom وشەیەکی فەرەنسیە بەواتای بارودۆخ دێت.

زمانی رووسی، ئینگلزی و فەرەنسیی دەزانی. بۆ ئەوەی کاتێك دێن بۆ سەردانی کارەکان رێنوێنییان بکات. ڕەحیم هیمدادیان لە بەشی ژمێریاری دامەزراندو منیش بووم بەکارگێڕی دابینکردنی دانەوێڵە. لەبەرئەوەی لەو چۆلگەیە خواردەمەنی بۆ کرکارەکان پەیدا نەدەبوو. گواستنەوەی دانەوێڵەش قەدەغەبوو. بۆیە دەبوایە بەنهێنی هاوردەی بکەم. دیبا وتی هەرچەندێك بەرتیل بدەن، بۆتانی دەبژێرین، لێتان ناپرسن بۆچی داوتانە و بەکێتان داوە؟ ئوتۆمبێلتان بۆ دابین دەکەین و لەباشترین میوانخانەکان بمێننەوە. ڕایسپارد خۆتان لەسەیارەکە دامەبەزن هەتا شۆفێرەکە بەڕێزەوە بۆتانی دەکاتەوە. بەلام هەرجۆرێك بووە دانەوێڵەمان بۆ بێنن. چووم بۆ خومەین و گولپایەگان و ئەلیگودەرز، لەو شوێنانە دانەوێڵەم دەکڕی و بە قاچاخ دەمهێناوە بۆ دلیجان. دوومانگ ماینەوەو بەهۆی ئەوەی خەرجیمان نەبوو بەو مووچە دەمانتوانی جلوبەرگ بکڕین. لە دلیجان کەسێك هات بۆ لام و وتی من باشترین چێشتلێنەرم بەلام لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانە بووم جلەکانم هەمووی شڕ بووگن و بۆ هەر شوێنێك دەچم وەرم ناگرن. منیش لە کۆمپانیی دیبا دامەزراند. بەڕاستیش باشترین چێشتلێنەر بوو. لەوکاتەدا کە ئەو قسەیەی پێوتم زۆر کاری تێکردم. تێگەیشتم مرۆڤ کاتێك لە بەندیخانە ئازاددەبێت، سەرەتا دەبێ جلوبەرگی دابین بکات.

## پێکهێنانی سەندیکای کرێکاری

دوای دوو مانگ دەستم لەکار کێشایەوە و گەڕامەوە بۆ تاران. بەڵام عەلیزادە و هیمداد لە کۆمپانیای دیبا و بەیات ساڵێك مانەوە. لەبەرئەوەی ئەو دوو مانگە لە بیابان بووم ئاگام لەگۆڕانکارییەکانی تاران نەبوو. هەندێك بەدواداچوونم کرد بینیم هێشتا هیچ سەندیکایەك پێکنەهاتووەو هەمووی کەوتونەتە دوای حیزبایەتی. حیزبی زۆری لێبوو بەڵام حیزبێك کە نیشتمانی بێت و مرۆڤ بتوانێت بێدوودڵی ببێتە ئەندامی، نەبوو. زەمینەش بۆ ڕێکخستن لەباربوو. بەهۆی ئەوەی ئێمە لەهەموو شوێنێك هاوڕێمان هەبوو، بۆ نموونە چەند کەسێك لە هاوڕێیانمان لە ئابادانەوە تارێندرا بوون و لەدوای درێژکردنەوەی ماوەی گرێبەستی نەوت (چەندساڵ دوای زیندانی بوونی ئێمە ئەوگرێبەستە درێژکرایەوە) هەندێکیان گەڕابوونەوە سەر کارەکانیان. لە تاران شوێنێکمان نەبوو. پارەشمان نەبوو ژوورێك دابین بکەین. یەکەم کارم ئەوەبوو لەگەڵ ئەندازیار عەتیقەچی کە یەکێکبوو لە گروپی ٥٣ کەسی پێوەندیم کرد. ئەندازیار پێیوتم ئێمە کۆمپانیایەکمان هەیە و ئێوە دەتوانن شەوانە بچن بۆ ئەوێ. بەپاسەوانەکە دەڵێم کە ڕێگاتان پێبدات لەوێ کۆبوونەوە بکەن. نزیك مانگێك لەوێ کۆبوونەوەمان دەکرد هەتا توانیمان هاوڕێیان کۆبکەینەوە. لەو کەسانەی کە هاتن بۆ کۆبوونەوەکان عەباس ناوێك بوو، جەیران بوو کە مامۆستا بوو، ئیستا مردووەو چەند کەسێکی دیکە. دواتر لەشەقامی لالەزار بازاڕی بەهرامی ژوورێکمان بە کرێ

گـرت و تابلۆیـەکمان هەڵواسـی و پێکهـاتنی سـەندیکای کرێکـاران و جوتیارانی ئێرانمان ڕاگەیانـد. هاوڕێیـان کۆبوونـەوە. هەنـدێك لەوانـە کرێکار بوون و چەند کەسێکیش لەگروپی ٥٣ کەسی لەوانە فەرمیـدون منـو و حەکـەمی کـە مافنـاس بـوو و ئەنـدازیار **عەتیقەچی** پێمانـەوە پەیوەسـتبوون. لـە کرێکارەکـانیش **داداش بەخـشی** و کۆمـەڵێکی تـر لەدەورمان کۆبوونەوە، ڕێکخراوێکی ڕاستەقینە پێکهات. هەڵبـەت نـە وەزارەتی کار هەبوو نە دەوڵەتیش وەها یاسایەکی بـوو کـە مۆڵەت بـۆ سەندیکاکە دەربکا.

ئیتر پێویست بوو لەشارەکانی دیکەدا ڕێکخراومـان هـەبێت. مـن و **خەلیل ئینقلاب** (کە مافناس بوو لەگروپی ٥٣ کەسی بـوو) چووین بـۆ تـەورێزو ڕێکخراوەیـەکمان لـەوێ پێکهێنـا. ڕێکخراوەکـە بـەخێرایی پەرەیـسەند و بـەهێزبوو. دوای تۆکمـەبوونی ڕێکخراوەکـە، دیـسان گەڕامـەوە بـۆ تـاران و لەوێـشەوە چـووم بـۆ مازنـدەران. لـە مازنـدەران هـەتا گورگـانیش ڕێکخـستمانکرد. زۆربـەی ئەنـدامانی ڕێکخراوەکـە فەرمانبەری فەرمانگەی ڕێگاوبان و پسپۆڕ بوون و لەنێو کرێکارەکاندا نۆتۆریتەیان هەبوو. سەرەتا هیچ ڕێگرییەك لەڕێماندا نەبوو، تەنانەت رووسەکانیش ڕێگریـان نـەدەکردین. حیزبـی تـوودەیش لـەو سـەردەمە ڕێکخـراوی کرێکـاری نـەبوو، هەربۆیـە هـەتا گورگـان ئێمـە تیایـدا باڵادەست بووین. ڕێبەرایەتی ڕێکخراوی گورگـان کەسێك بـوو بـەناوی بابایی کە تۆرکەمەن بوو لەگروپی٥٣ کەسی بوو.

کاتێك لەبارودۆخی ئەوێ ئەرخـەیان بـووم گەڕامـەوە بـۆ تـاران و کرێکـارێکی نـەوتی باشـوور کـە نـاوی **عـەلی ئومێد** بـوو زینـدانی بـوو

لەگەڵمان، ناردم بۆ ئەهواز تا لەوێ ڕێکخراو پێکبهێنێت. لەوێ دەستی بەکار کردو ڕێکخراوەکەمان لەماوەی دوو ساڵدا( لەهەموو شوێنەکان) پەرەیسەند. کاربەدەستانی سۆڤیەت بەهیوابوون لەکۆتاییدا هەربچین بۆ لای ئەوان بەڵام پێچەوانەوە ئەوەیان بینی و بەحیزبی توودەیان وت ئەم بارودۆخە چیە؟ ئەوان ڕێکخراویان هەیە و ئێوە نیتانە. هەربۆیە حیزبی توودەش دواتر دەستیدایە پێکهێنانی ڕێکخراوە کرێکارییەکان.

## ئامانجەکانی ئێمە

بەڕای من شورا باشترین دیموکراسیە. لەوڵاتانی ئەورووپا و فەرمانیکاش دیموکراسی ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە. دەتوانین بۆ نموونە ئاوا باس لە شورا بکەین کە ئێمە لەلادێیەکدا کۆبووینەتەوە بۆ ئەوەی بەپێی فراوانی و ژمارەی دانیشتوان ئەندامانی شورا هەڵبژێرین. پێنج کەس، حەوت کەس، یازدە کەس یان کەمترو زۆرتر بۆ بەڕێوەبردنی ئەو شوێنە. چیدی پێویست ناکات لە شوێنێکی دیکەوە فەرمانبەرێك بێت و ئەو شوێنە بەڕێوەببات. خەڵکی دێ لەناو خۆیاندا بۆ بەڕێوەبردنی لادێکەیان کەس هەڵدەبژێرن و هەر لادێیەك بۆ خۆی ئەو کارە دەکات. دواتر دەچنە شارۆچکە. هەر دێیەك بەپێی قەبارەکەی نوێنەر دەنێرێت بۆ ئەوێ و شورا بۆ شارۆچکە هەڵدەبژێرن ئەو پرۆسەیە هەتا شار و پارێزگا و ناوەند دەڕوات. ئەوە باشترین ڕێگایە بۆ هەڵبژاردن و پێموانیە لەوە دیموکراسی تر هەبێت. بەڵام لەسۆڤیەت شورا لەناوچوو. شوراکانی ئەوێ سێ چوار ساڵ زیاتر

بەرگەیان نەگرت. بەس بەناو شورایی بوو وەکو مەشروتە و دیموکراسییەکەی ئێمە.

داخوازی ئێمە لەباری سیاسییەوە سیستمێکی دیموکراسی بوو. لەم سیستمەدا هەر کەس زۆربەی دەنگەکانی بەدەستهێنا ئەو حکومەت پێکدێنێت. ئەگەر ئێمەی کرێکار زۆرینە بووین حکومەت پێکدێنین و ئەگەر چینێکی تریش زۆرینەی برد ئەو پێکی بێنێت. دیارە هەر کەس بەپێی بەرژەوەندیی چینایەتیی خۆی وڵات بەڕێوەدەبات. ئەگەر ئێمە بردمانەوە، دەبێت بەجۆرێك بیکەین بێکاری نەهێڵین و هەرکەس کە دێتەدنیاوە لەکاتی لەدایکبوونیەوە ژیانی دابین بکرێت هەتا ئەوکاتەی دەتوانێت کاربکات و تا مردن بیمە بێت. ئێمە لەبانگەشەکانماندا باسی حکومەتی سۆسیالیستیمان دەکرد و دەمانوت ئەگەر حکومەت و دەوڵەتێکی دیموکراسی بەرقەرار بێت و ئێمە تیایدا زۆرینە بین و حکومەتی سۆسیالیستی پێکبێنین وانابێت کەسانێك لەناو کۆشکدا و کەسانێکیش بەسەرمای زستان لە شەقام و کۆڵان بخەوێت. دەبێ دادی کۆمەڵایەتی و هاوسەنگییەك لە ژیانی مرۆڤدا بێت.

ئێمە هەوڵماندەدا کرێکارو جوتیارو ڕۆشنبیرو کارمەند بتوانن زۆرینەبن تا ئەگەر هاتوو دیموکراسییەك هاتەئاراوە، زۆرینەی پەرلەمان بەدەستبێنین. ببینە زۆرینە و حکومەتێك پێکبێنین کە وردە وردە ببێت بە رژێمێك خەڵك بگەیەنێتە خۆشبژیوی و لە چارەڕەشی ڕزگاریان بکات. کەسانی پاڵێوراوی ئێمە دەبوو سەندیکا بیناساندنایە. ڕێکخراوەیەکی دیکەمان نەبوو. لەوانەبوو دواتر

حیزبێـــك پێكبهاتایـــە بـــەڵام ئێـــستا حیزبمـــان نـــەبوو. دەرفـــەتی پێكهێنانیمـان بـۆ نەرەخـسابوو. چـونكە هۆشـیاریی سیاسـیی خـەڵكی ئێـران بـەو ئاسـتە نەگەشـتبوو. حیزبـەكان رێبـەری چینەكانن، هـەر حیزبە رێبەری چینەكەی خۆیەتی، رێبەر دەبێت هۆشیارتر بێـت لـە خەڵك تا بتوانێت رێبەرایەتی بكات. هەربۆیە من دۆخەكـەم بـە لـەبار نـــەدەزانی بـــۆ پێكهێنـــانی حیـــزب. رۆژێـــك **جەهانـــشاهلو** داوایلێكـــردم حیزبێـك پێكبێـنین، تـازە سـەندیكامان پێكهێنـابوو وتـی حیـزبێكیش دروست دەكەین، من رازینەبووم.

لەبابەتی پێوەندیی نێوان كرێكارو رۆشنبیریش هیچ كێشەیەكمان نەبوو. ئەو كێشەیە كاتێك دروست دەبێت كە كەسانێكی وەك **ئیرەج ئەسكەندەری** شازادە بێـت و لـە ژیـانی كرێكـار تێنـەگات، برسیـەتی و داماوی نەكێشابێت. ئێمـە كەسـی وامـان لەگـەڵ نـەبوو. تـەنها كەسـێك هـەبوو (**ئەنـدازیار عەتیقەچـی**) كـە ئـەویش خـۆی هەڵنەدەقورتانـد، رۆشـنبیرەكانی ئێمـە بـۆ كرێكـاران بەكـەڵك بـوون بـۆ ئـەوەی هـەواڵ و زانیارییـان پێـدەدان. ئاخاوتنیـان لەگـەڵ دەكـردن و گەشـەی فكرییـان زیادیدەكرد. ئێمە بەراستی ئاستی وشیاریمان بردە سەرەوە، بۆ نموونە ئـــەو كرێكارانـــەی لەســـاڵی ١٣٠٦ (١٩٢٧ز) هـــەتا داخرانـــی رێكخراوەكـــە لەگەڵ ئێمە بوون هەموویان منداڵەكانیان خوێنـدەوار بـوون و بوونـە خاوەنی ئەو هەستەی شوێن زانست بكەون. منداڵـەكانیان بەهـەژاری و نەهامـەتی پێگەیانـد. كرێكـاری وامـان لەگـەڵ بـوو كورەكـەی بـوو بـە دكتـۆر. بـاوكی كرێكـارو كـوری دكتـۆر، بـبووینـە هۆكـاری زیـادبوونی ئاستی هۆشیاری.

## خۆپێشاندانی "دژە فاشستی"

**کافتارادزە** هاتبوو بۆ ئێران و نەوتی دەویست. ئەوان چاوەڕێ بوون ئێمە هەستین و خۆپێشاندان بکەین. لەحاڵێکدا دوو وڵات خەریکن ڕێکەوتننامە بکەن چ مانایەکی هەیە ئێمە بێین و بژی و بڕوخێ بکەین؟ بەڵام ئەم نەچوونەی ئێمەیان وەك تاوانێکی گەورە چاولێکرد، کە بۆچی نەچووین و بڵێین بژی ستالین. هەربۆیە سەندیکای کرێکارانی ئێران هەم لەلایەن ئینگلیزەکان و هەم لەلایەن ڕووسەکانەوە کەوتە ژێر فشارەوە. لەبەرئەوە بڕیارمان دا لەتارانەوە تا گورگان کۆبونەوەیەکی دژە فاشیستی ڕێکبخەین. لە ساری خۆپێشاندانمان کردو چووین بۆ گورگان. لەوێ پارێزگار بانگهێشتی کردین و پێیوتین روسەکان وتویانە ئێوە نابێت لێرە خۆپێشاندان بکەن. دواتر زانیم لە ساری یەکێك لەو تاجیکانەی سۆڤیەت بەناوی **گوڵستانی** کە من لە تاجیکستان مامۆستای بووم و ئێستا لەگەڵ هێزەکانی سۆڤیەت هاتبوو بۆ ئێران. بیستبووی کە من هاتووم بۆ ئەوێ و قسە دەکەم. بەتامەزرۆییەکی زۆرەوە هاتبوو بۆ گردبوونەوەکە. لە قسەکانمدا کە دژ بە نەژادپەرستی بوو زۆرتر بەسوودی خۆمان قسەم دەکرد. قسەم ئەوە بوو کە نەژادپەرستی دۆڕاوەو لەناودەچێت، لەم ئاڵوگۆڕانەدا چینی کرێکار دەبێ زۆرترین دەستکەوت بۆ خۆی دەستەبەر بکات. لەبەرئەوەی ئەوە کرێکارانی ئێرانن کەچەك و تەقەمەنی لەباشوورەوە دەبەن بۆ باکورو بەسەر فاشیستەکانیدا دەبارێنن. **گوڵستانی** ڕاپۆرت دەدات کە ئیفتخاری لە

قسەکانیدا ناوی سوپای سوری نەهێناوە، دەڵێت ئەوە کرێکارانی ئێرانن کە سەرکەوتن بەدەستدێنن. لەحاڵێکدا ئەوە بەس سوپای سورە کە گیانبازی دەکات. هەر ئەوەبوو کە رووسەکان فەرمان دەدەن لە گورگان پێش بەئێمە بگرن. پارێزگار وتی: ناهێڵم خۆپیشاندان بکەن. وتم خۆپیشاندان دەکەین و هیچیشتان پێناکرێت، شێوازی کارکردنمان وابوو کە لەپێشدا ڕاماندەگەیاند کە تاقمەکەمان لەکاتێکی دیاریکراو کۆببینەوە. بڕیار بوو لەیەکێك لەگۆڕەپانەکانی شار گردبینەوە، چووم بینیم پۆلیس چواردەوری گۆڕەپانەکەی گرتووەو ناهێڵێت خەڵك بچنە شوێنەکە. دەمزانی ئەگەر باڵوێزخانە کارێك بکات پۆلیس ئاگادار نیە، هەرکامێکیان بیکەن ئەوی دیکە بێئاگایە. هەریەکە دەیەوێت ئەو "شاکارە" بەناوی خۆیەوە بێت. چووم بۆ بنکەی سوپای سوورو پێموتن ئێمە سەندیکای کرێکارانی ئێرانین و بەنیازین لێرە کۆبوونەوەیەکی دژە فاشیستی بکەین. ئێوە بڵندگۆیەکمان بدەنێ. هەروەك بیرم لێکردبۆوە لەقەدەغەبوونی کۆبوونەوەکەی ئێمە ئاگادارنەبوون. لەبارەی بڵندگۆکەشەوە وتی یەك دو ڕۆژ دەرفەتمان بدەن. بینیم ئامادەیە یارمەتیمان بدات، بەڵام ئامرازی بەدەستەوە نیە. وتم دەی بەئەرك نەبێت حەوت هەشت پاسەوانمان پێبدەن، جادەکان بگرن تا ئۆتۆمۆبیل هاتوچۆ نەکات. خۆ دەتوانن ئەم کارەمان بۆ بکەن؟ وتی: بەڵێ دەتوانین. هەشت پاسەوانم لێوەرگرتن و لەگۆڕەپانەکە دامنان. ئاسایش و پارێزگایش وایانزانی رووسەکان مۆڵەتیانداوین. خەڵکەکە هاتن. قسەمان کردو کۆبوونەوەکە تەواو بوو. منیش گەڕامەوە بۆ تاران. دواتر پارێزگاریان

لەسەر کارەکەی لابرد. هەر ئەوکەسە بوو بەبەرپرسی بەشێك لەوەزارەتی کارو دەیوت: بەهۆی ئەو کارەی تۆوە منیان لەسەر کارەکەم لابرد.

## هەوڵی حیزبەکان بۆ راکێشانی رێکخراوەکەی ئێمە

زۆر حیزب دەهاتن بۆ لامان و دەیانوت وەرن کاری هاوبەش بکەین. لەهەڵبژاردندا ئێمە شانسی سەرکەوتنمان زۆرە پێکەوە یەکێك لەوانەش حیزبی **هەمراهان** بوو. ئێمەش بەرێز منۆو چەند کەسێکی دیکەمان راسپارد برۆن بزانن ئەمانە کێن و لەگەڵ کێ پەیوەندییان هەیە، ئەوان رۆیشتن و هەواڵیانهێنایەوە کە لەگەڵ ئینگلیزەکان پەیوەندییان هەیە و سەربەخۆنین، ئێمەش لەگەڵیان رێکنەکەوتین. دوای ماوەیەك بانگهێشتکراین بۆ رۆژنامەی رەعد. رۆیشتین و بینیمان **موزەفەر فەیروز** لەوێیە. وتی دەمەوێ قسەتان لەگەڵ بکەم. فەیروز، رۆژنامەی رەعدی **فەرمانۆای** بۆ بەرژەوەندیی **سەید زیا** بەرێوەدەبرد. وتی ئەو شوێنە بۆ ئێوە بچوکە و ئیمە دەمانەوێت شوێنێکی گەورەترتان بدەینێ. من وام بیرکردەوە کەلەبەرئەوەی نوسینگەی سەندیکاکەی ئێمە و کارگێری رۆژنامەکەی ئەوان لەیەك بازاردایە، ئەو لەهاتوچووی کرێکاران دەترسێت و بەنیازە بەو شێوەیە لەوێ دوورمانبخاتەوە. وتم زۆر باشە، وتی ئێوە کەلوپول و پێداویستیشتان نیە ئێمە دەتوانین ئەو شتانەتان بۆ دابینبکەین. ئەگەرچی ئەوە بۆ من جێگای سەرسورمان بوو بەلام وتم زۆر باشە، گەورەیی دەکەیت. هەر کەسێك یارمەتی رێکخراو بدات ئێمە لێیوەردەگرین. دەستخۆشیم

لێکردو وتی بەدەوڵەتیش دەڵێم یارمەتیتان بکات. ئیدی مەسەلەکە سەرسوڕمانی نەدەویست، دەرکەوت ئەمانە پێیانوایە دەتوانن ئێمە بکڕن. وتم لەبەرامبەریدا چیتاندەوێت؟ وتی ئێوە سەردانێکی بەڕێز سەید زیائەدین بکەن. من لەو دواییانە لەگەڵ سەید زیائەدین نەختێك ناسیاویم پەیداکردبوو، بەڵام کە وای وت زۆر ڕەشبین بووم. چونکە دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ئەو ڕەزاخانی هێنابێتە سەر تەخت و گوێرەوەری زۆریشمان بەدەست ڕەزاشاوە چەشتبوو، ئەوەشمان بەهەڵەی سەید زیائەدین دەزانی. وتم بەڕێز موزەفەر فەیروز شەرم ناکەیت بەو شێوەیە لەگەڵ من قسەدەکەیت؟ باوکی تۆ لەڕاپەڕیندا لەناوچوو. ئێستا ئێوە هاتوون و ئەو کارانە دەکەن. زۆر شەرمەزار بوو منیش هەستام و نەچووم بۆ لای سەید زیائەدینیش.

### بەرهەڵستیی روسەکان لەتەورێز و تاران

بەڵام روسەکان لەپێکهاتنی ئەم ڕێکخراوەیە کە پێوەندیی سیاسی لەگەڵیان نەبوو زۆر هەراسان بوون. من ڕێکخراوەکەم سپارد بوو بە عەلیزادە و ڕەحیم هیمداد هاوڕێیانێك کە ساڵێك بوو بەئێمەوە پەیوەست بووبوون و خۆم چووم بۆ تەورێز. لەبەرئەوەی وادەی هەڵبژاردن نزیك بوو ڕێکخراوەکەی تەورێزیشمان لە ڕێکخراوەکانی دیکە شۆڕشگێڕتر بوون. لە تەورێز زۆربەی کاتەکان پۆلیس بەهۆی هاندانی ڕوسەکانەوە کێشەی بۆ دەنایەوە. ئەو شەوەی لە تارانەوە دەچووم بۆ تەورێز مانگی ڕەمەزان بوو، وتیان پۆلیس سەندیکاکەی داگیرکردووە. لەوسەردەمەدا خەڵکی تەورێز شەوانی مانگی ڕەمەزان

دەچوون بۆ چاپخانەکان. رۆیشتم لەچاپخانەکان سەد کەسێکم لە ئەندامانی سەندیکا کۆکردەوەو چووین بۆ نوسینگەی سەندیکا، پاسەوانەکانمان چەککردو ئۆفیسی سەندیکاکەمان لێسەندنەوە. سەرۆکی ئاسایش تەلەفۆنی کرد. وتم بۆچی ئەوکارە چەپەڵەتان کرد، پەیوەندی چیە بەئێوەوە دێن و سەندیکا داگیردەکەن، هۆکاری چیە ئەوەتانکردووە؟ وتی فەرمانمان پێکراوە، تکایە چەکەکانمان پێبدەنەوە. چەکەکانمان پێدانەوە. لەو جۆرە کارانەیان دژ بەئێمە دەکرد. دوای ماوەیەك گەڕامەوە بۆ تاران. ئیتر نۆرەی حیزبی توودە بوو. بەتەمابوو لەتاران ئۆفیسی سەندیکا بەدەستەوەبگرێت. لەوێ پیاوێکی بەتەمەنمان دانابوو بۆ وەڵامدانەوەی تەلەفۆنەکان. توودەییەکان لەدەرەوە بینیبوویان و پێیانوتبوو هەرچیت دەوێت دەتدەینێ بەس کە هاتین بۆ ئەوێ بلێی ئەمانە خاوەنی سەندیکان. ئەویش بەڵێنیان پێدەدات. پاش ماوەیەك **عەلی ئەمیر خیزی و ئارداشس و بی ریا** (وەزیری رۆشنبیریی دوای پیشەوەری) و چەند کەسێکی دیکە هاتن بۆ سەندیکا. " **تەمارا**" یەکێك لەئەندامانی سەندیکامان راسپاردبوو کە ئاگادار بێت ئەگەر کەسانێك هاتن وتیان سەندیکای ئێمەیە رێگریان لێبکات و نەهێڵێت بێنە ژوورەوە. (تامارا خەڵکی ئاستارا و ژنێکی زۆر رۆشنبیر بوو ماوەیەك پێش ئێستا مرد) هەرکە ئەوان گەیشتبوونە ئەوێ تامارا بەکرێکارەکانی وتبوو لێیاندەن. ئەوانیش هەڵدێن. عەلی ئەمیر خیزی کە رادەکاتە کۆڵان دەبینێ پڕە لەکرێکار، دەترسێت و دەگەڕێتەوە. لەخواروی کۆڵانەکە حەمامێکی لێبوو رادەکاتە ئەوێوە. حەمامی ژنان بوو. ژنەکان

هاواردەکـەن و جنێـوی پێـدەدەن و پـەلاماری دەدەن. ئـەمیر خیـزی هەڵدێت بەڵام لێدانێکی چاکی خواردبوو ئـەم بەرنامەیەشیان بـەناکام نەگەیشت.

لـە تـاران تـەواوی کارگـەکانی تەقەمـەنی و جـۆلایی بەدەسـتی ئێمەوە بوو بەڵام لە کارگەی جگەرە بڕشتمان نەبوو. لەنێو کرێکارانی مەیـسازی وەك مەجیدیـە و کارگـەکانی دلۆپانـدنی مـەی بڕشـتمان هـەبوو. لـە تـەورێزیش کارگـەی جۆراوجـۆری وەك بەرهـەمهێنانی شـقارتە و چـەرم و قوماشـچنین و خـاولی چـنینی لێبـوو هاوشـێوەی ئیسفەهان یەکێك بوو لەناوەندە پیشەسازییەکانی ئێران.

### رێکخراوەکەمان لە ئازەربایجان

لـە ئازەربایجـانیش ڕووداوی دیکـە هاتـەپێش، پارێزگـار کـە نـاوی جـوان بـوو خـاوەنی کارگـەی فەرشـچنین بـوو کۆمـەڵێك چەقۆکێـشی هانـدابوو هەڵبکوتنـە سـەر ئۆفیـسی سـەندیکا. ئـەوانیش هـاتبوون و لێدانێکی باشیان لە خەلیل ئینقلاب دابوو. دوایی هەر ئەو رووداوەیان کرد بەبیانوو سەندیکاکەیان داخـست و خەلیلیـشیان دوورخـستەوە بـۆ تـاران. مـن ئەوکاتـە لـە تـاران بـووم. خـەلیل هـات و بابەتەکـەیان بـۆ باسـکردم. خێـرا چـووم بـۆ تـەورێزو ئۆفیـسەکەم کـردەوە. ڕۆژێـك سەرلەشـکر موقـەدەم بانگهێـشتی کـردم و وتـی: رای هاوپـەیمانان (فەرمانیکا و بـەریتانیا و رووسـیا) وایـە ئێـوە دەنـگ بـدەن بـەحیزبی تـوودە و خۆیـشتان بپـاڵێون بـۆ هەڵبـژاردن. وتم بـەڕێز سەرلەشـکەر! ئەوان من ناناسن. فەرمانیکیەکان کە هـەر نامناسـن و ئینگلیزەکانیش

کە سێزدەساڵ زیندانیی ئەوانم کێشاوە. روسەکان بەهۆی ئەوەی لەوێ خوێندومە دەمناسن. ئەمانە هەموویان کۆبوونەتەوە کە من دەنگ بدەم بەحیزبی توودە. وتی هەر ئەوەیە، خۆت دەزانی. وتم، بەڕێز سەرلەشکر پێیاندەوتی کۆنەپەرست، سەرکوتگەر، بەڵام من تۆم بەنیشتمانپەروەر دەزانی. چۆن فەرمانی وا بەمن دەکەیت بۆ ئەوەی خۆم بپاڵێوم و کارێکی وا بکەم؟ من پارێزەر نیم. هەر کاتێك ویستم ببمە پارێزەر، خۆم دەتوانم. ناشبم بە پارێزەر، کارەکەم وایە.

ئێمە لەئازەربایجان خزمەتێکی چاکمان کرد بەکرێکاران. گرێبەستێکمان لەگەڵ خاوەنکارەکان بەست بۆ ئەوەی هەقدەستی کرێکاران کە گوزەرانیان زۆر خراپ بوو ببەینە سەرێ. لەگەڵ وەزارەتی دارایی قسەمانکرد بۆ ئەوەی ئارد بدەن بە کارگەکان هەتا لەوێ نان دروستبکەن بۆ کرێکارەکان و رۆژی کیلۆیەك بەخۆیان و نیوکیلۆش بەخێزانەکانیان نان بدەن. ئەمە لەڕواڵەتدا شتێکی زۆر گرینگ نیە بەڵام بۆ ئەو سەردەمە زۆر بەنرخ بوو. بەهۆی ئەوەی خۆیان نەیادەتوانی بۆ خۆیان و بنەماڵەکانیان نان بکڕن. خاوەنکارەکانیش ئەم گرێبەستەیان پێخۆش بوو. بەپێی ئەو گرێبەستە سێ کەس لەوەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتییەوە چاودێری ئەو دابەشکردنەیان دەکرد.

دوای ماوەیەك سەرپێچی دەستی پێکرد. دەنگۆی ئەوە بڵاوببۆوە کە خاوەنکارەکان ناچنە ژێرباری ئەم گرێبەستە. بەڵام سەرەتا وانەبوو. ئەوان خۆشحاڵ بوون تەنانەت بەخشیشیان دەدا بەوانەی لەوەزارەتی کارەوە هاتبوون بۆ چاودێری کردنی ڕەوتی

دابەشـــکردنەکە. بـــەلام کـــەم کـــەم دۆخەکـــە گـــۆڕا. خاوەنکارەکـــان بەهاندانی نەیارەکانمان چوون بۆ لای بەرپرسانی روسی و پێیـان وتـن بـەهۆی ئـەم گرێبەسـتەوە ئێمـە ناچـارین کالاکانمـان گـرانتر بـەنێوە بفرۆشین. ئەوانیش وتبوویان پێویست ناکات گرێبەستەکە جێبـەجێ بکەن.

من بە ئەندامانی سـەندیکام وتبـوو لـە ئیـدارەی تەلـەفۆن ئەگـەر خاوەنکارەکان بەتەلەفۆن قسەیان لەگـەڵ بالۆێزخانـەی سـۆڤیەت کـرد ئەنانەت نیوەشەویش بوو ئاگادارم بکەن با گوێ لەقسەکانیان بگـرین. من شەوانە لە سەندیکا دەخـەوتم. شـەوێك تەلەفۆنەکـە زرینگایـەوە و تەلەفۆنەکـەم هـەلگرت بیـستم جورابـچی لەگـەڵ حەسـەن سـەدقیانی قسەدەکات. یەکێکیان بەوەی دیکەی وت (ئیستا بیرم نیە کامیـان بـوو) کەفلانی دەبـەن و ئـەویش پێدەکـەنی و دەیـوت پێموانیـە. ئـەویتریان دەیـوت بـالۆێز بـەخۆمی وت دەریدەکـەین. لـەمڕووەوە خاوەنکارەکـان، پیاوەکـانی دەوڵـەت، بەرپرسـانی سـۆڤیەتو توودەیـەکان هـەموویان دەسـتیان تێکـەڵ کردبـوو بـۆ ئـەوەی مـن لـەوێ دەربکـەن. کرێکـاران بەزۆری لەکارگـەکانی چەرمـسازی مانیـان گـرت. ئەگـەر چـەرمەکانیان لـەئاش (بەوتـەی خۆیـان) دەرنەهێنایـە خەسـار دەبـوو. مـانگرتنی کرێکارەکان بۆ ئەوان زۆر قورس بوو. من چووم بـۆ کارگـەی بافتـەیی. بینـیم کۆمـەڵێك ئەفـسەرو سـەربازی روسـی لـەوناوەن. تێگەیـشتم مەسـەلەکە ئێـران نیـە، مەسـەلەکە کـارو کرێکـارو خاوەنکـار نیـە، مەسەلەکە دانوستان نیە، مەسەلەکە سوودو زیـانی ولاتێـك و چینێك نیـە، ئێمـە لێـرە لەگـەڵ ئەفـسەرانی سـتالینی رووبـەڕووین. مـن

قسەمکردو پێیانم وت هەر لێرە بچمە دەرەوە، تەلەفۆن بۆ ستالین دەکەم و پێیدەڵێم ئەمە حەیاچوونەو هیچ پێوەندی بەچینی کرێکارەوە نیەو بەندوبەستە لەگەڵ سەرمایەداران. لەبەرئەوەی ئەوان خاوەن ئیرادە نەبوون (لەحکومەتی دیکتاتۆریدا ئیرادە نامێنێت) لەو تانەو تەشەرەی من بەناگا هاتن و بلاوەیان کرد. یەکەم کەس بافتەیی هات بۆ لام و پێیوتم: ئێوە سێ ڕۆژ بوار بەمن بدەن با هەژمار لەگەڵ کرێکارەکان بکەم و مووچەکەیان پێبدەم. بەکرێکارەکانم وت بچنەوە سەر کارەکانیان. خاوەنکارەکان تێگەیشتن کەروسەکان ناتوانن هیچیان بۆ بکەن یەك لەدوای یەك خۆیان دا بەدەستەوە. نەخێر کارگەیش کەتەسلیمی داخوازی کرێکارەکان بوو کارگەی جوراچی بوو کەکارگەی قوماش چنین بوو. هەر ئەو شەوە چووم بۆ کارگەی جورابچی. بینیم پۆلیس بەردەرگاکەی گرتووە بۆ ئەوەی کرێکارەکان نەتوانن هاتوو چوو بکەن. پۆلیسەکانمان لەوێ دەرکرد. (بەهۆی ئەوەی لەوسەردەمەدا دەزگای پۆلیس زۆر لاواز ببوو لەئازەربایجانیش هیچ دەستەلاتێکی نەبوو). جوورابچیش هاتوو وتی: منیش ئامادەم گرێبەستەکە قەبوڵ بکەم و کرێکارەکان چوونەوە سەر کارەکانیان، گرێبەستێك کەلەگەڵ وەزارەتی کارو خاوەنکارەکان بەستبوومان زۆر ڕەوا بوو. بەڵام روسەکان خاوەنکارەکانیان هاندەدا بۆ ئەوەی کار بەو گرێبەستە نەکەن. بەو شێوەیە مانگرتنەکە کۆتایی پێهات، کرێکارەکان چوونەوە بۆ سەر کارەکانیان و زۆر خۆشحاڵ بوون کە ئەو گرێبەستە کاری پێ دەکرێت.

## هەڵبژاردن لەنازەربایجان

ئێمە سەرقاڵی ئامادەکاری بووین بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان. لەملاو لەولاوە خەڵك دەهاتن یارمەتیمان بدەن. براکەی جەمال ئیمامی هات و وتی: من بۆ سواڵکردن هاتوم. وتم سواڵی چی؟ وتی سواڵی دەنگ. دەنگم پێبدەن. دکتۆر شەفەقیش لەنامەیەکدا نووسیبووی تکادەکەم فەرامۆشم نەکەن، بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردن سەردانی لادێکانیشمان کرد. بەپێی ئەوەی سەندیکاکەمان جوتیارانیشی دەگرتەوە بەڵام بەکردەوە نەمانتوانی ڕێکخراوی جوتیاران پێکبێنین، بەهۆی ئەوەی دەرەبەگەکان بەهێزبوون و نەیاندەهێشت. بەڵام لەگەڵ ئەو جووتیارانەی هاتبوونە شار یان هاتوچۆی شاریان دەکرد پێوەندیی دۆستانەمان هەبوو، بە سەرسوڕمانی زۆرەوە بینیم لەدێهاتەکان ناوی منیان نووسیوە. پرسیم لەکوێوە زانیوتانە؟ وتیان بەڕێز سەرتیپ زادە کە لەنێو جوتیاراندا برشتی هەبوو وتویەتی کە نەگەر دەنگ دەدەن بەنیفتیخاریش دەنگ بدەن. ئەو لە لادێکاندا خاوەن جەماوەر بوو. سەرتیپ زادە ئازادیخواز بوو هاوڕێیەتیی خیابانی کردبوو لەو ڕێگەیەدا زیانی زۆریشی پێگەیشتبوو. لەسەردەمی ڕەزاشا دا زیندانی کرابوو و لەگەڵ ئێمە لەبەندیخانە بوو. هۆی دەستگیرکردنیشی ئەوەبوو کە یارمەتی کۆمۆنیستەکانی دابوو، خۆیشی کابرایەکی چەپ بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی بەبرشت بوو ڕەزاشا لە زیندان توندی کردبوو، ئەگینا خۆی تاوانێکی نەکردبوو.

لەو سەردەمەدا بارودۆخ بۆ هەڵبژاردنی ئێمە و سەرکەوتنی ئێمە لەهەڵبژاردندا لەبار بوو. من لەناو قسە و وتارەکانمدا هەموو کاتێک دەموت ئەو نوێنەرانەی پێشووی پەرلەمان ئەگەر دەیانەوێت دەنگیان پێبدەین دەبێ لەپێشدا بێن وبڵێن چییان بۆ ئێمە کردووە، پاشان ئێمەیش دەنگیان پێدەدەین. ئەگەر ئەوە نەکەن لەخۆڕا نەیەن بۆ لای ئێمە. هەربۆیە ئەوانیش دەترسان و زۆربەی شار بەدەستی ئێمەوە بوو. کەسێك بەناوی **کاویانی** کەدواتر بوو بەیەکێك لە بەرپرسانی پیشەوەری و پێیاندەوت **مەشهەدی جەعفەر**، هات بۆ لام وتی جەنابی پارێزگار (**سەرلەشکەر موقەدەم**) داواتدەکات. چووم بۆ لای، پارێزگار وتی: بەڕێز ئیفتیخاری، بیستومە ئێوە زۆر زیانتان پێگەیشتووەو بەبێ هۆ زیندانی کراون و هیچ تاوانێکتان نەبووە و پیاوێکی چاکن. هەربۆیەش بیرۆکەیەکم بۆتان هەیە کە لە هەڵبژاردندا سەرکەوتو بیت و ببیت بەئەندامی پەرلەمان. وتم ئەو بیرۆکەیە چیە؟ خاوەنکارەکان نیوملیۆن تمەنیان کۆکردوەتەوە تا لەڕێگای منەوە بیدەن بەتۆ و لەتەورێزەوە بچیت بۆ تاران. لەوێ لەشەمیران خانوویەك بکڕیت و ژیانێکی خۆش بەسەر ببەیت. لەو سەردەمەدا نیوملیۆن تمەن پارەیەکی زۆر بوو، هەڵبەت بۆ خاوەنکار هیچ نەبوو. ئەوان بەپێی گرێبەستەکە مانگانە زیاتر لەدوو ملیۆن تمەنیان بۆ نان خەرج دەکرد. دواتر وتی: پارەی مانگێکی دەدەین بەئێوە، دیسان قەبوڵم نەکرد. **سەرلەشکەر موقەدەم** وتی: زۆر بەداخەوەم بۆچی قەبوڵی ناکەیت؟ وتم: ژیان چیە لەپێناویدا پشت لەکرێکاران بکەیت و لەبرسان بیانکوژیت؟ لەبەرئەوەی من ئەو نانەیان پێدەدەم. من ئەو شێوە ژیانەم ناوێت. سەرلەشکریش بێ هیوابوو.

لــەو هەڵــسوڕانەی بــۆ هەڵبــژاردن دەکــرا کەســانی دەرەوەی سەندیکایش یارمەتیان دەدام. چونکە ئەوەی سەندیکاکەمان ببوو بە نەتەوەیی. لەبەرئەوەی سەربەخۆ بوو، بارنەبوو بەسەر کەسەوە. لەپێناو ژیاندا رەنجی دەکێشا. پەرلەمانتارەکانی دیکەیش بێهیوا بوون کە بێن و لەوێ هەڵبژاردنەکە ببەنەوەو چالاکی بکەن. ئەوێ مەیدانێك نەبوو بۆ چالاکیی ئەوان. سەندیکا پتەو ببوو ئێمەیش ئەرخەیان بووین. وردە وردە لەشارەکان رێکخستنمان کردبوو. ڕۆژێك هاتن وتیان: لە ئاسایش کاریان پێتە. چووم بۆ ئاسایش و بە بەرپرسەکەم وت کارتان بە من چیە؟ وتی: هیچ، ئێوە ئەمشەو لێرە میوانن، بۆم دەرکەوت دەستبەسەر کراوم. شەو منیان هێشتەوە. بۆ بەیانیەکەی کرێکارەکان زانیان و ئاسایشیان گەمارۆدا. بەسەرۆکی ئاسایشم وت کە من نامەوێت ئەمانە مان بگرن. من دەڕۆم با کەسێکی دیکە بێتە جێگاکەم. دەچم و بە کرێکارەکان دەڵێم بڵاوە بکەن دواتریش ئەگەر پێتانخۆشبوو دەتوانن دەستبەسەرم بکەنەوە. سەرۆکی ئاسایش قبووڵی نەکرد و تەقەیان لەخەڵك کرد. کرێکارێکی شارەوانی کوژرا و هەتا ئێوارە گەمارۆکە بەردەوام بوو شەو کرێکارەکان چوونەوە ماڵەکانیان.

### هەڵداشتن (تبعید/ نفی) لە ئازەربایجان

هەر بەو شەوە منیان هێنا بۆ تاران و لەسەر جادە بەرەڵڵایان کردم. شەو چوومەوە بۆ ماڵ و بۆ بەیانیەکەی چووم بۆلای سەرۆکی ئاسایشی گشتی. پێموت: شتێکی ئاوا ڕووی داوە. وتی روسەکان

فەرمانیان کردووەو ئێمە بێتاوانین. لەساڵی ١٣٢٢ (١٩٤٣ ز) بوو. چووم بۆ لای **یەمیلیانۆف**، باڵوێزی روسەکان. وتم چ تاوانێکم کردووە وا فەرمانتان کردووە من لەتەورێز دەربکەن. وتی هیچ، ئێمە دژی ئەوە نین تۆ لەوێ بیت، ئەوە کاری پۆلیسە. درۆیان کردووە. چووم بۆلای **تەدەیون** وەزیری ناوخۆ. لێم پرسی بەچ تاوانێك منتان گرتووەو ناردوتانمەوە بۆ تاران؟ من لە ئازەربایجان لەدایکبووم و دەمەوێت لەوێ بژیم. تەدەیون وتی سوێند بەخوا دەستی ئێمەی تێدا نەبووە. روسەکان ئەمەیانکردووە، داوایانکردووەو ئێمەیش ناچار بەقسەمان کردوون. هێشتا مەسەلەکەم بۆ روون نەبوو بەڵام زۆرتر پێموابوو روسەکان ئەو کارەیان کردبێت. چووم بۆ لای سەرۆکی ئاسایش و وتم من دەرۆمەوە بۆ تەورێز. لەبەرئەوەی هیچکەس ئاگای لەم کارە نیەو لەوانەیە منیان بەهەڵە هێنابێتەوە تاران. لەبەرئەوەی هیچ لایەنێك بەرپرسیارەتی ئەوە ناگرێتە ئەستۆ. کونسولێشم بینی سوێندی دەخوارد کە ئەوانە درۆ دەکەن. پێموایە سەرۆکی ئاسایشیش سوێندی دەخوارد کە وانیە ئەوان داوایان کردووە و ئێمەش ئێوەمان دوورخستۆتەوە.

هێشتا دڵنیا نەبووم کەکاری سۆڤیەتیەکان بێت. کاری سەندیکا کارێکی زۆر گرنگ و دەوڵەتی نەبوو. گرێبەستیش نەبوو تا بیانییەکان دەستی تێوەربدەن. دوای ماوەیەك لەلایەن یەمیلیانۆفەوە بانگهێشتکرام. چووم بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەت. یەمیلیانۆف وتی: داوادەکەین ئێوە لە تارانیش دووربخەنەوە. پرسیم بۆچی؟ وتی لەبەرئەوەی ئێوە لەنەردەبیل پاڵێوراوتان هەیە و **شێخ حسێن**

لەنکەرانیش پالێوراوی ئێمەیەو دەبێت ئەو دەنگ بێنێت و ئێوەیش ئەبێ دەنگی پێبدەن. هەڵبەت ئێمە نەماندەتوانی دەنگ بەو بدەین چونکە لەڕوانگەی ئێمەوە گومانلێکراو بوو. هەر ئەوە نەبوو پێوەندیی بە رووسەکانەوە بێت. پێوەندی لەگەڵ جێگای تریش هەبوو. ساختەچیش بوو. ڕۆژێك لەداراییان بووم، سەیرمکرد تەلەفۆنەکەی هەلگرت و وتی جەنابی شام بدەنێ. دیاربوو ئەوەی بەرامبەری دەیوت بەهەڵە لێتداوە بەلام ئەو هەر لەخۆیەوە قسەی دەکرد و ئامۆژگاریی دەکرد! لەبەر کەسێکی ئاوا ساختەچی بەئێمەیان دەوت پالێوراوەکەی خۆتان وەلابنێین و دەنگبدەن بەپالێوراوەکەی ئێمە. لەکۆتاییدا بڕیارمان دا پالێوراوەکەی خۆمان بکێشینەوە، بەلام ئامادەنەبووین دەنگیان پێبدەین. بەلام دوای ئەو مەسەلەیە بۆم دەرکەوت روسەکان لە هەڵداشتنی من و کەسانی دیکەشدا دەستیان هەبوو.

لەکۆتاییدا بڕیارمان دا رەحیم هیمداد بنێرین بۆ تەورێز. ئەو چوو بۆ ئەوێ بەلام پێنەدەچوو بەختێکی وەهای ببێت بۆ ئەوەی هەڵبژێرن. خەلکی ئەوێ بەباشی ئەویان نەدەناسی لەحالێکدا ئەو پیاوێکی لێهاتوو، میهرەبان و خزمەتگوزار بوو. ئەگەر ببوایە بەئەندامی پەرلەمان دەیتوانی یارمەتیدەری خەڵك بێت. **خەلیل** **ئازەریش** لەتەورێز دوورخرابوویەوە. **رەحیم هیمداد** ڕێکخراوی تەورێزی بەباشی بەڕێوەدەبرد. لەیەکی ئایاریشدا مەراسیمێکی پڕشکۆیان بەڕێوەبردبوو. حیزبی توودەیش ئەم مەسەلەیەی زۆر بەلاوە ناخۆش بوو. داوایان لە **هیمداد** کردبوو لەگەڵ ئەوان خۆپێشاندانی هاوبەش بکەن بەلام ئەو قبوڵی نەکردبوو.

لەو کاتەدا من لە تاران چالاکیم دەکرد. ڕێکخراوی مازندەرانیش باش بوو، بەڵام وردە وردە لەسەرکار دەرکردنی کرێکارانی ڕێگای ئاسن کە ئەندامی سەندیکاکەی ئێمە بوون دەستیپێکرد. یەکێك لەو کرێکارانە کەلەسەرکار دەرکرا ناوی (صفر) بوو شۆفێری شەمەندەفەر بوو "ئیستا ماوە" لەسەرکارەکەی لە باکوور(ی ئێران) دەریانکردو بەهاوکاریی ئێمە چوو بۆ ئازەربایجان. لەشوێنەکانی دیکەیش ڕێگری و دەرکردنی هاوڕێیانی ئێمە دەستی پێکرد. **عەلیزادە** پاڵێوراوی ئێمە بوو لە ساری. هەڕەشەیان لێکردبوو کە دەبێ بچێتەوە بۆ تاران. ئەویش ئەوێی بەجێهێشت. لە باکووریش رووسەکان لەگەڵ ئێمەدا زۆر خراپ هەڵسوکەوتیان دەکرد. ئێمە لە هەڵبژاردندا دۆڕاین و هیچکام لە هاوڕێیانمان دەرنەچوون. جگە لەچەند کەسێکی وەك **سەرتیپ زادە و تەورێزی** کە بە دۆست دادەنران. ئێمە دۆڕاین و لەولایشەوە حیزبی توودە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بۆ نمونە **ئارادشس** کە خەڵکی گیلان بوو کەسی لە تەورێز نەیدەناسی لەوێ دەرچوو. هەروەها پیشەوەری کە خەڵکی خەڵخال بوو لەژیانیدا تەورێزی نەدیبوو لە تەورێز هەڵبژێردرا.

ڕۆژێکیان **مستەفا خان فاتح** دەیگێڕاوە کە لەلایەن حیزبی هەمراهانەوە لەگەڵ ئینگلیزەکان قسەمان کرد کە لەگەڵ حیزبی توودە ڕێکبکەوین و هەڵبژاردنەکە کۆنترۆڵ بکەین، ئینگلیزەکان پێیانخۆش بوو، بەڵام وتیان رووسەکان ئەم کارە قبووڵ ناکەن. هەربۆیە بۆمان دەرکەوت هەڵبژاردن لەدەستی خەڵکی ئێراندا نەماوەو بیانیەکان هەرکەسێکیان پێخۆش بێت هەڵیدەبژێرین و ئێمەیش لەخۆڕا خۆمان ماندوودەرکرد و چالاکیمان دەکرد.

**بەهێزبوونی حیزبی توودەو لێکترازان لەڕێکخراودا**

خراپتربوونی بارودۆخەکە و سەرکەوتنەکانی حیزبی توودە کاری کردە سەر سەندیکاکەی ئێمەش. یەکێك لەو کەسانەی گاڵتەی بەئێمە کرد خەلیل ئینقلاب بوو. خەلیل لەگەڵ پۆلیس و ئاسایش پەیوەندیی نەبوو، بەڵام کەسێکی خاوخلیچ بوو. ڕۆژێك لەتەورێز ویستبوویان بیگرن. هەواڵ بە من گەیشت کە خەلیلیان گرتووە. چووم بۆ ئاسایش. زیایی سەرۆکی ئاسایش بوو. سوێندی خوارد کە ئێمە نەمانگرتووە. پرسیارمکرد وتیان هەڵهاتووە بۆ باڵوێزخانەی سۆفیەت. چووم بۆ باڵوێزخانە، بینیم لە حەوشەکە خەریکە پیاسە دەکات. بانگمکردو وتم بێمێشك ئەم ئەنگیە چیە تووشی ئێمەی دەکەیت، کەسێك چالاکی بکات دەشیگرن و ئەگەر بەردەوام بێت لەوانەیە لەسێدارەشی بدەن. ئەوم هێنایە دەرەوە. ئەختێك سەرشێت بوو. زۆر حەزی لە ئەندام پەرلەمانی بوو. هاتو پێیوتم بێتو نەبین بەئەندام پەرلەمان لەناو دەچین. وتم نەخێر ئەو قسەیەت زۆر بێجێیە لەبەرئەوەی ئەوکاتەی ئێمە دەستمان بەکارکرد نە ئەندام پەرلەمان بووین و نە وەزیر، ڕێکخراوەکەشمان گەیاندووەتە ئەم ئاستەی کە لە باکوور هەتا باشوور ڕێکخراوەمان پێکهێناوە. بەڵام کاتێك زانی نەبووە بەئەندام پەرلەمان ویستی خۆی لە رووسەکان نزیك بکاتەوە. تەنانەت پێیوتم وامەزانی ئێوە پەیوەندیتان بەڕوسەکانەوە هەیە، بەڵام ئێستا تێگەیشتم نەك پێوەندیتان لەگەڵیان نیە، بەڵکو زۆر چارەی ستالینیشتان ناوێت. ئەو سەر بەگروپی پەنجاوسێ کەسی بوو توودەییەکان باش دەیانناسی کە

کەسێکی سەرمڕۆ و بێبڕوایە، خۆی لەوان نزیک کردەوە. خەلیل شەیدای ئەندام پەرلەمانی بوو. ئەمە باوەڕی ئەو بوو.

**جیهانشاهلو**یش ئەندامی سەندیکای ئێمە بوو. ئەو لە من زویر بوو. ڕۆژێك من لە تەوریز هاتبوومەوە سەیرمکرد لەنەبوونی مندا ئەویان کردبوو بەوتەبێژی سەندیکا لەلقی شەقامی موختاری (جگە لە لالەزار کەئۆفیسی سەرەکیمان بوو لە شەقامەکانی دیکەش وەك شەقامی ئیستەخیر و موختاری ئۆفیسمان هەبوو). لەلیژنەدا قسەمکرد و وتم ئەمە چ کارێکە کردوتانە **جیهانشاهلو** دەرەبەگ و پارەدارە، بچێت قسەی چی بۆ کرێکار بکات؟ کرێکار چی لە قسەی ئەو تێدەگەن؟ چۆن دەتوانێت ئاستی هۆشیاری کرێکار بەرزبکاتەوە؟ ئەو لەو شوێنە لابەرن. لەدوای ئەوە دڵی لە من ئێشا و چوو بۆ لای توودەییەکان و لەدژی من قسەی دەکرد گوایە من ترۆتسکیستم.

عەلیزادەیش نارازی بوو. **عەلیزادە** زۆر پارەپەرست بوو. ئەوان بەنهێنی ڕێککەوتبوون کە بچن بۆ لای حیزبی توودە و منیش دەمزانی، ڕۆژێك **عەلیزادە** تەلەفۆنی کرد کاری بە **عەتیقەچی** بوو. منیش وەڵامی تەلەفۆنەکەیم داوەو هەواڵیم پرسی. وتی: هەواڵی چیم لێدەپرسی؟ بۆ ئێوە دەهێڵن ئێمە بژین. وتم من هەقم چیە بەژیانی ئێوەوە؟ وادەیان دانا یەکتر ببینین. لە شیرینی فرۆشییەك چاومان بەیەك کەوت و داوای دۆندرمەمان کرد. وتی خۆ تۆ نە موجتەهیدی و نە ئیمامی تا بمبەی بۆ بەهەشت، ئێمە دەمانەوێت بژین، ژیانێکی باش. خۆشت دەزانی لەنێو ئێمەدا کەس بەقەدەر **ڕەزا ڕوستا** دێوانە و نەزان نەبوو. لەنێو حیزبی توودە هەرچی بیڵێت ڕەتناکرێتەوە.

بۆچی ئێمە نەڕۆین؟ وتم بەڕێز عەلیزادە من پێشم بە کەس نەگرتووە حەزیش ناکەم بەر بە پێشکەوتنی کەس بگرم. ئێوە بچن و هەر هاوڕێکەی جارانیشن. وتی نا ئەگەر ئێوەش نەیەن ئێمەش پێشناکەوین و وەکو پێویست ڕێزمان لێناگرن. وتم نا. واز لەمن بێنن. من ئابرووی خۆم لەو شتانە خۆشتر دەوێ. ئەو حیزبەش ئابڕوومەند نیە و ناشبێت. لەبەرئەوەی ئیرادەی لەدەست خۆیدا نیە. دواتر بەشێوەی نهێنی **عەلیزادە** و **خەلیل ئینقلاب** و ئەندازیار **عەتیقەچی** و کرێکارێك بەناوی ئەنساری لەئێمە جیابوونەوە و چوونە ڕیزی ڕێکخراوی کرێکاریی حیزبی توودەوە.

### تۆمەت هەڵبەستنی نەیاران

هەتا ئەو کاتەی خەلیل ئینقلاب لەگەڵ ئێمە بوو بۆ دەربڕینی بیرو بۆچوونی ڕێکخراوەکەمان کەلکمان لە ڕۆژنامەی **گیتی** وەردەگرت. بەڵام دوای جیابوونەوەی ئەو، هەرکات ڕاگەیاندراومان دەربکردایە لە ڕۆژنامەکانی دیکەدا بڵاودەکرایەوە. توودەییەکان تۆمەتی زۆریان دەداینە پاڵ. ڕۆژێکیان لە تەورێز بووم، نیوەڕۆ چومەوە ماڵ. هاوسەرەکەم وتی پارەمان نیە هیچ بکڕین. منیش پارەم پێنەبوو. چووم لە هاوڕێکانم پارەم قەرزکرد و شتێکم کڕی و نانمانخوارد. دوای نیوەڕۆ بەهاوسەرەکەمم وت هەستە بابچین بۆ باخی گوڵستان. منداڵە بچکۆلەکەیشمان خستە ناو عەرەبانەکەی و لەگەڵ خۆمان بیبەین. لەسەر ڕێگاکەمان دۆندرمە فرۆشێکی لێبوو چووین بۆ ئەوێ. خاوەن دوکانەکە بەزمانی تورکی لەگەڵ یەکێك

قسەی دەکرد و یەکێك لەقسەکانیشی ئەوەبوو کە یووسف ئیفتیخاری پارە لەئینگلیزەکان وەردەگرێت و لە کۆفیەکان خەرجی دەکات. هاوسەرەکەم لێی پرسیم مەبەستی تۆیە؟ وتم: بەڵێ مەبەستی منە. وتی خۆ تۆ بەقەرز هێناوتە. وتم وادیارە لەئینگلیزەکان قەرزمکردووە! ئەوە زۆر شتێکی گرنگ نیە. دوژمن هەمووشتێك دەڵێت و هەموو تۆمەتێکت دەخاتەپاڵ. خۆ دوژمن هەر خراپەت دەڵێت نەك چاکە. بەڵام ئەوەی زۆر بەلامەوە ناخۆش بوو ئەوە بوو کە براکەم لە بەندەری ئەنزەلیەوە نامەی ناردبوو کە یووسف زۆر پارەی دەستدەکەوێت داوایکردبوو هەروا بێهۆ خەرجی نەکەم. ئەمانە ئەوەندەیان دەنگۆ کردبوو تەنانەت براکەشم کە منی بەباشی دەناسی داوای کردبوو ئەو پارەیە بەبەلاش خەرج نەکەم.

## دامەزران لەوەزارەتی پیشە و هونەر

لەو سەروبەندەدا بەدوای کاریشدا دەگەڕام. کاتێك لە بەندیخانە ئازاد بووم چووم بۆ ڕێگای ئاسن بۆ دامەزراندن تاقیکردنەوەم کرد. لەبەرئەوەی دووساڵ لە کۆمپانیای نەوت کارم کردبوو و سەرم لەکاری تکنیکی دەردەکرد، وەرگیرام، بەڵام حکومەت نەیهێشت دابمەزرێم. لەساڵی ١٣٢٤ - (١٩٤٥ ز) لەگەڵ براکەم بە شەقامی نادری دا دەڕۆیشتین. تابلۆیەکم بینی لێی نوسرابوو وەزارەتی پیشە و هونەر. وتم ئەمە باشە. هەمان وەزارەتی پیشەیە. بۆچی ئێمەیش مووچەیەك وەرنەگرین و لەنێو کرێکارانیشدا دەبین؟ بچین و داوای دامەزراندن بکەین. چووین و بینیمان نووسیبویان دامەزراندن نیە تکایە دەستەی

دامەزراندن بێزار مەکەن. چووم بۆلای گوڵشائیان کە وەزیر بوو. گوڵشائیان منی دەناسی. براکەم لەدەرەوە بوو، ئێمە پێکەوە قسەماندەکرد لێی پرسیم بەڕێز ئیفتیخاری چیدەکەیت؟ وتم خۆ ئێوە کار بەئێمە نادەن. دەڵێن ئێوە نەیارن. ئیتر بۆ دەپرسی چی دەکەیت؟ وتی تۆ چیت ویستوەو ئێمە بۆمان نەکردویت؟ داواکارییەکەم نووسی بۆ دامەزراندن. گوڵشائیان لەژێریدا نووسی زوو بەزوو کاری بۆ بکەن. چووم بۆ بەشی دامەزراندن. وتیان بەیانی وەرەوە. لە گوڵشائیان دەترسان. وتم نابێت، دەبێت هەر ئێستا کارەکەم بۆ بکەن. ئەوانیش کارەکەیان بۆ جێبەجێ کردم و منیش هێنامەوە بۆ گوڵشائیان ئەویش واژووی کرد و منیش بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەم خستە باخەڵمەوە. کاتێك هاتمە دەرەوە براکەم وتی مەگەر پێتم نەوت بێسوودە مەچۆ ژوورەوە، منیش بەڵگەی دامەزراندنەکەم پێنیشاندا.

لە بەشی بەڕێوەبەرێتی کار دامەزرام و بەرپرسی ئەو فەرمانگەیەش ئەندازیار نەفیسی بوو. منیش لەوێ وەك پشکێنەری کارگەکان دامەزرام. بۆ منیش ئەوە باشتر بوو کە وەکو پشکێنەر سەردانی کارگەکان بکەن. من لەو فەرمانگەیە بووم کە بڕیار درا وەزارەتی کار دابمەزرێت. من، ئەندازیار نەفیسی، ئەندازیار هۆمایۆن و چەند کەسێکی دیکە ئەو دائیرەیەمان دامەزراند. لەڕاستیدا یەکێك لەدامەزرێنەرانی وەزارەتی کار من بووم. دوای دامەزراندنی وەزارەتی کار من بوومە بەرپرسی کاروباری کرێکاران بۆ ئەوەی لەگەڵ کرێکاران لەپێوەندیدابم. دوای ماوەیەك دکتۆر بەختیار هات و بەرپرسیارێتی

ئەو بەشەی لەئەستۆ گرت. من هەر لەوەزارەتی کار مابوومەوە (پێموابێت چوومە بەشی ماف و لێکۆڵینەوە).

**شکاتی رەزا روستا و کامبەخش لە چالاکییەکانی من لەلای قایمقامیەتی سەربازی**

رۆژێك لەساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥ ز) قایمقامیەتی سەربازیی تاران (پێموابێت سوپاسالار موقەدەم) منی بانگکرد. چووم و سەیرمکرد رەزا روستا کە بەرپرسی سەندیکای حیزبی توودە بوو لەگەڵ **کامبەخش** لەوێ دانیشتوون. دووکەسی دیکەیش لەوێ بوون، یەکێکیان ناوی موحەرەم بوو لە چەقۆ وەشێنەکانی حیزبی توودە بوو ئەوی دیکەیشیان ناوی سادقیانی بوو لەشارەوانی کاری دەکرد. بە قایمقامم وت داوای منتان کردبوو؟ وتی: بەڵێ. ئەم پیاوانە ئەڵێن ئێمە کارگەیەکمان کڕیوە، ئیفتیخاری ناهێڵێت کاری پێبکەین. وتم سوپاسالار ئێمە هەتا ئێستا لەبەڕێوەبردنی هیچ کارگەیەك دەستوەردانمان نەکردووە و نایکەین. ئەگەر سەندیکایەك لەنێو کارگەکان پێکهاتووە بۆ ئەوەیە مافی هیچ کرێکارێك پێشێل نەکرێت. ئێمە هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ بەڕێوەبردنی کارگەدا نیە، ئەمانە کارگەیان کڕیوە بچن و بەڕێوەی ببەن. **کامبەخش** وتی ئێمە دەڕۆین بەڵام کرێکارەکان لێماندەدەن. وتم سوپاسالار با ئەمانە بەڵگەنامەی خاوەندارێتی بەئێوە نیشانبدەن، ئەگەر کرێکارەکان لێیاندان ئەوە من بەرپرسیارم و لێپرسینەوە لەگەڵ من بکەن، ئێمە کارمان بەسەر بەڕێوەبەرایەتیی کارگەکانەوە نیە. کامبەخش وتی عیسایۆف پێی وتووین ئەو کارگەیە دەدەم بەئێوە. عیسایۆف سپی پێستێکی روسی

بوو کە لە ئەوروپا کاری ساختەی کردبوو هەڵهاتبوو بۆ ئێران. سەربوردەکەی ئەوە بوو کە لەگەڵ کۆمەڵێك رووسی هەڵدێت بۆ ئەوروپا. لەوێ کۆمەڵێك ئەرمەنیی دەوڵەمەند کۆدەکاتەوەو پێیاندەڵێت ئێمە هەرچیمان هەیە لێرە خەرجدەبێت، باشترە ئێوە پارەیەك کۆبکەنەوەو بانکێك دامەزرێنن و لەسودەکەی کەڵکوەربگرن، لەوێ برێکی زۆر پارە هەڵدەگرێت و دێت بۆ ئێران. لەئێرانیش زۆرتر پێوەندیی لەگەڵ بانکی **سپەهـ** دا بوو. کارگەی دروستکردنی ئاوجۆ(بیرە)ی دانابوو، چەند کۆمپانیایەکی دیکەیشی بوو. رووسەکان پێیان وتبوو بەرێوەبردنی ئەوێ بسپێرێت بە کامبەخش. وتیان عیسایۆف بە زارەکی وتویەتی هێشتا بەڵگەنامەی نەداوە پێمان. وتم سوپاسالار ئەمانە شکاتیان لە من کردووە سەیری بەڵگەکانیشیانت نەکردووە منتان بانگکردووە تکایە ئێستا ئەختێك بەوردی لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بکەن. وتی چۆن لێکۆڵینەوە بکەم؟ وتم ئەم **موحەڕەمە** پەنابەرەو تازە لەرووسیاوە هاتووە کەسێکی چەقۆکێش و مرۆڤکوژە، ئێوە چۆن بەقسەی ئەو منتان بانکردووە کە ئێرانیم؟ لەوشتە بکۆڵنەوە.

لە موحەڕەمی پرسی ئێوە پەنابەرن؟ وتی بەڵێ. وتی کارت چیە؟ وتی کرێکارم. لێی پرسی لەکوێ کاردەکەی؟ وتی لەهیچ شوێنێك بەس مانگانەیەك لەحیزبی توودە وەردەگرم. سوپاسالار موقەدەم پیاوێکی کورتەبالاو زۆر تووڕە بوو. سەرێکی ڕاوەشاندو وتی بچۆ دەرەوەو موحەڕەمی دەرکرد. ئەو دانەی دیکە کە ناوی سادقیان بوو نیشانی سوپاسالارم دا و وتم لەمەش بپرسە بلێ کاری چیە؟ ئەویش ئەوەی

کۆچبەرەکانە. وتی تۆش کۆچبەری؟ وتی بەڵێ. ئەویشی کردە دەرەوە. وتم ئێستا ئێوە دەڵێن ئەمانە کارگەیان کڕیوەو من ناهێڵێم کاربکەن. لەم بەڕێز ڕوستایە بپرسن پێشووتر بۆچی و بەتاوانی چی حوکمدراوی ؟ موقەدەم لێی پرسی: وتی تاوانتان چی بووە؟ وتی هیچ شتێك، موختاری لەخۆیەوە دۆسیەی بۆ کردبووم. وتی نا لێت دەپرسم تاوانەکەت چی بووەو بەچی تۆمەتبار کراوی؟ وتی تاوانم نەبوو، وتم تۆ سیخوڕیت، تاوانباریش کراویت، موقەدەم ئەویشی کردە دەرەوە. کامبەخش پیاوێکی زۆر ترسنۆك بوو، لە منیش زۆر دەترسا. دەستمکرد بە وتنی ڕابردووی کە ئەم برادەرە **تەهماسبی** داوە بەگرت کە لەخوێندکارانی KUTTV بووە و لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی لەدەستداوە، خەریکبووم ڕابردوویم باسدەکرد کە وتی بەیارمەتیتان من دەڕۆم. لەوەی کە بەتەنیا مابوو دەترسا. ئەو هەوڵەشیان بێئاکام مایەوە.

لەوساڵەدا بەو هەموو پیلانەشەوە کە دژی ئێمە گێڕایان، هێشتا ڕێکخراوەکەمان پاراست. ئەگەر یەکێك لە هاوڕێیانمانیان دوور بخستایەتەوە دەستبەجێ کەسێکی دیکەمان لەجێگای دادەنا. هەر لەو ساڵەدا **لویی سایان** سەرۆکی سەندیکای نێونەتەوەیی کرێکاران تەلەگرافی بۆ کردم و داوایکرد بەشداری لەکۆنگرەی سەندیکای نێونەتەوەیی بکەم. هەڵبەت بەناوی خۆمەوە خولکی کردبووم نەك بەناوی سەندیکاوە. بەڵام پێش ئەوەی باسی ئەو مەسەلەیە بکەم، پێویستە لەسەر چاوپێکەوتنم لەگەڵ پیشەوەری بدوێم.

## دیدار لەگەڵ پیشەوەری

زۆر دەمێك بوو لەرۆژانی زیندانەوە پیشەوەریم دەناسی بەڵام لەدوای ڕووداوەکانی خەرمانانی ۱۳۲۰ (۱۹٤۱ ز) ئەوم نەبینیبوو هەتا ئەو ڕۆژەی چووم بۆ نوسینگەی ڕۆژنامەکەی لە شەقامی فیردەوسی. پێمگوت جەنابی پیشەوەری هاتوون بەشوێنمدا کە لەجێگایەکەوە شۆڕشێك دەستپێبکەین و من ئەو کەسەم نەدەناسی. بەڵام دەیانوت وەرە ستالین گرەنتیی کردووە. من بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی سەندیکای نێونەتەوەیی دەچم بۆ پاریس و دڵنیام دێن بەشوێنی ئێوەو هاوڕێیانتاندا. بینیتان لەگیلان کاتێك پشتت چۆڵ دەبێت، ناکامەکەی شکستە. ئێمە کاتێك دەتوانین دەست بۆ چەك ببەین کە لەسەدا شەستی خەڵك لەپشتمان بن. پیشەوەری وتی بەڕێز ئیفتخاری مانای وایە من ئەوەندە نەزانکارم، یانی ئەو تەمەنەم بەخۆڕایی بەڕێکردووەو ئەم موانەم لەخۆڕا سپی بووە. ئێستا دێم و هەڵەیەکی ئاوا دەکەم؟ هەتا گەیشتینە پاریس، ڕۆژنامەکان نووسیان کە پیشەوەری چووە بۆ ئازەربایجان و ڕێکخراوەیەکی پێکهێناوە.

## سەفەر بۆ پاریس و کۆنفرانسی سەندیکا کرێکارییەکان

وا بڕیاربوو لەلایەن ئێرانەوە نوێنەرانێك بچن بۆ کۆبوونەوەکانی سەندیکا کرێکارییەکان. لە سەندیکای ئێران من بووم، لەسەندیکای ئسفەهان دووکەس بەناوی شەمس و کەیوان کە لەپێشدا ئەندامی حیزبی توودە بوون و دواتر جیابوبونەوە و لە ئیسفەهان لەژێر

ڕێبەرایەتیی **فیداکار** سەندیکایەکیان پێکهێنا. لەڕێکخراوی کرێکاری **سەیدزیائەدین**، ئەندازیار **تاجبەخش**. لە چاپەمەنیەکانیش خوالێخۆشبوو **حوسێن فاتمی**. لە خاوەنکارەکان ئەندازیار **غەیوور**، لەلایەن دەوڵەتیشەوە ئەندازیار **نەفیسی** هاتبوو. ژمارەیەکی زۆر بووین.[٢] خۆمان ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەوێ، بە دوو حەفتە یەك فرۆکە هەبوو سەفەری پێبکەین. حیزبی توودە چوون کاربەدەستانی سۆفیەتیان بینی و ئەوانیش سەرۆك وەزیران **سەدرولئەشرەف**، یان بەوتەی خۆیان "**جەلادی باخی شا**" یان بینی کە ڕۆیشتنی ئێمە بۆ کۆنفرانسی نێونەتەوەیی کار بەهەر شێوازێك بووە دوابخەن. وتیان ئەو پاسپۆرتی دەوڵەتیی نیە، ئەبێ بیگۆڕێت. هەموویان ڕۆیشتن و ئێمە ماینەوە. لەدوای دوو حەوتوو فڕۆکەیان بۆ ئێمەیش دابینکرد. من بووم و بەڕێز ماجیدی و هاوسەرەکەی و دوکتۆر **ڕەزمەوی**. ئەوان لەلایەن کۆمپانیای بیمەوە هاتبوون. کاتێك گەیشتینە ئەوێ کۆنگرەکە تەواو بووبوو نوێنەرەکانی حیزبی توودە بوون بەئەندامی ئەو ڕێکخراوەیە. کۆمەڵێکی زۆر لە ئێرانەوە چووبوون بۆ ئەو کۆنگرەیە. تەنانەت چەند سەرمایەدارێکیش وەکو نوێنەری کرێکاران چووبوون. یەکێك لەو کەسانە بەڕێز **دیبا** بوو کە وەکو نوێنەری کرێکارانی چێشتخانە ڕۆیشتبوو بۆ ئەوێ. پێیانوتبوو کە ئیفتخاری ئەم مەسەلەیە بەلای سەندیکای نێونەتەوەییەوە باسدەکات. **دیبا** هات بۆلای من و وتی: ئێوە وەها نیازێکتان هەیە؟ وتم بەڵێ. سوێندی

---

[٢] – بۆ زانیاری دەربارەی پێڕستی فەرمی ئەو کەسانەی کە لەو کۆنگرەیەدا بەشداریان کرد بڕواننە بەڵگەی ژمارە ٥٢ بەشی بەڵگەنامەکان.

خوارد کە من چاوەڕێی نوێنەرایەتی نەبووم. بەس تەنها ئەوە نەبێت کە وتوومە با بلیتی خۆڕایی ئەو سەفەرە بەکار بهێنم و چاوەڕێی بەشداریکردن لەو کۆنفرانسەدا نەبووم.

حیزبی توودە لە سەندیکای جیهانی بوو بەئەندام بەڵام لەلایەن ئێمەوە کەس نەبوو بە ئەندامی ئەو ڕێکخراوەیە. بەسەرهاتەکەم نووسی بۆ بەڕێز لویی سایان سەرۆکی سەندیکانی نێونەتەوەیی کرێکاران و داواملێکرد لەمبارەوە لێکۆڵینەوە بکات. لەو نامەیەدا نوسیبووم کە ئێوە چەند کەس سەرمایەدارو چەوسێنەرتان وەکو نوێنەری کرێکاران هەڵبژاردووەو ئەوەش بەئێمە قبوڵ ناکرێت. مەسەلەیەکی دیکە کە باسم لێکردبوو ئەوەبوو کە حیزبی توودە کە خۆی بەیارمەتی و بەدەستی بیانیەکان دامەزراوە، وتبووی کە ئەوانەی هاتوون فاشیستن. لەحالێکدا لەناو ئێمەدا کەسی وای تێدانەبوو کەگومانی فاشیستبوونی لێبکرایە. نە لەنێو خاوەنکارەکان دا کەسی وای تێدابوو، نەلەنێو نوێنەرانی دەوڵەتدا ئاوا کەسانێکی تێدابوو. وابڕیار بوو وڵامی شکاتەکەی ئێمە بدەنەوە. داوا لەنوێنەرانی کرێکارانی ئێران و هەروەها حیزبی توودە کرا کە لە دانیشتنی لێپرسینەوەدا ئامادەبن. ئەو هاوڕێیانەی کە دەبوو هاوکاریی ئێمەیان بکردایە شارەزا نەبوون، قسەگەلێکیان دەکرد کە بەسوودی حیزبی توودە دەبوو. بۆ نموونە لە یەکێك لە نوێنەرانی ئیسفەهان بەڕێز کەیوانیان پرسی ئێوە کە پێشتر ئەندامی سەندیکا بوون، بۆچی دواتر لێی جودا بویتەوە؟ ئەویش لەوڵامدا وتی ئەوان دەیانویست ئەوتی ئێمە بدەن بە سۆفیەتییەکان بۆیە ئێمەش جودا بووینەوە. سایان

بەداخێکی زۆرەوە دەستی کرد بەقسە کردن و وتی بەڵێ ئەمانە دەبوو ئەوتیان وەربگرتایە و لەگەڵ فاشیزمدا شەڕیان بکردایە و ئەو جۆرە قسەو باسانە. **ئیرەج ئەسکەندەری**ش قسەی کردو وتی بەڵێ ئەمانە بەوشێوەیە بوون، کەسانێکن کە دژ بە ئێمەن. سکرتێرەکەی **سایان** ژنێك بوو کە رووسیی دەزانی. هاوسەری براکەی **حەکیمولولك** کە لە رێکخراوی نێونەتەوەیی کاردا کارمەندبوو ژنێکی زۆربەڕێز بوو لە جوولەکەکانی سۆڤیەت بوو، وەکو وەرگێڕ لەگەڵ ئێمەدا بوو. کاتێك قسەمدەکرد دەمزانی بەدروستی وەریدەگێڕێتەوە. هەڵبەت کاتێك کەلەگەڵ سایاندا بووم بەڕووسی قسەمان دەکرد و ئەو خانمەش وەریدەگێڕایەوە. وتم بەڕێز **سایان** ئێوە بەقسەی ئەو دوو کەسە کە گوایە ئێمە لەسەر نەوت جودا بووینەتەوە تووڕە مەبن و زوو لێکی مەدەنەوە. ئەو کاتەی کە ئەمانە دژی وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت وەستاون و رووسیاش داوای نەوتی لێدەکردین، سوپای سوور لەپشت دیوارەکانی بەرلین بوو. ئیدی فاشیستێك نەبوو کە ئەم وەری بگرێت و بیدات بەئەوی دیکە، کاتێك کە **کافتارادزە** هات ئەم مەسەلەیە لەئارادا نەبوو. ئێمە لەگەڵ ئەوەدا بووین کە نەوت بدرێت بە سۆڤیەتییەکان. من بۆ خۆشم لەگەڵ ئەوەدا بووم کەنەوت بدرێت بە سۆڤیەتییەکان بەلام لەگەڵ هەلومەرجێکی زۆر باشتر کە وەها هەلومەرجێکیشمان بۆ ئینگلیزەکان دانابوو کە یان قەبووڵی بکەن یان بچن بەشوێن کاری خۆیاندا. ئێمە بۆ سودی خۆمان دەمانویست وەها کارێك بکەین. ئینگلیزەکان نەیانهێشت. وتی چۆن ئینگلیزەکان نەیانهێشت؟ وتم توودەییەکان هاتن و بەسودی **کافتارادزە**

خۆپیــشاندانێکیان رێکخــست، بــۆ نموونــە مورتــەزا یــەزدی لەگــەڵ سۆڤییەتیەکاندا پێوەنـدیی هەیە بـەڵام موحەمـەد یـەزدی پێوەنـدیی بەئینگلزەکانەوە هەیـە، ئیرەج ئەسکەندەری کە ئێستا لێـرە وەسـتاوە لەگــەڵ ســۆڤییەتەکانە و عەباســی ئەســکەندەریی مــامی لەگــەڵ ئینگلیزەکاندایــە. ئــەو رێکخراوەیــەش کــە لــەئێران پێکیانهێنــاوە بـەهاودەنگی و هاوکـاریی هـەردوو لایـەن پێکهـاتووە. ئینگلیزەکـان بـۆ رسواکردنی سۆڤیەت حیزبی توودەیـان ناچارکرد لەخۆپیـشاندانەکانی خۆیاندا کەڵك لەسوپای سوور وەربگرن. کاتێك بینیم سوپای سوور لـە شەقامەکاندا خۆپیشاندان دەکات. لەپێـشەوە سـوپای سـوورەو لـەدواوە ئەوانەی حیزبی تـوودە. لەبەرئـەوە بڕیـاریش وابـوو سەرپـشکی نـەوت بەهیچ لایەك نەدرێت. ئەوە بابەتەکە بوو نەك ئەوەی کـەیوان ناوێـك بێـت و گرێبەسـتی نـەوت تێکبـدات. هەرشـتێك بـوو لـەنێوان خۆیانـدا بوو. ئەمە مامی لەگەڵ ئەواندایـە. ئێـستا خۆیـشی هـاتووە بـۆ ئێـرە و ئێمە زۆر بەداخەوەین کە ئێوە ئەم سەرمایەدارانەتان قبوڵکردووە

سایان وتی ئێوە یەکیەك باسی بکەن ئەمانـە کاریـان چیـە؟ وتم: ئەمــەیان بــەڕێز عەتیقەچــیە خاوەنکــارم بــووەو مــن مووچــەم لێوەرگرتـووە. بـەڵێنی دابـوو بەفەرمانیکیـەکان کـە لـە تـاران داریـان پێبدات. بردنی دارەکان لە مازندەرانەوە لەئەستۆی مـن بـوو. مـن ئـەو مووچەیەم بۆ سەندیکاکەمان خـەرج دەکـرد بێتـو کـارم نەکردایـە، بـۆ ئـەو سـەندیکایەی تـازە دامانمەزرانـدبوو پارەیـەکمان نـەبوو بیخـۆین. ئەگەر حاشای لێبکات بەڵگەم هەیـە. خـاوەن کارەکـەمتان کـردووە بـە ئەندام و خۆمتان وەرنەگرت؟ دواتر ئـیرەج ئەسـکەندەری پێشان دام و

وتی ئەی ئەو کابرایە کاری چیبوو؟ وتم ئەم کابرایە لەخێڵی قاجارە. ئەمانە شازادەن، دەوڵەمەندن. ئەم شازادانە لەئێران پێیانەڵێن هەزارخزم. لەهەموو کونێك بوونیان هەیە. لەهەر شوێنێك ڕێکخراوێك هەبێت ئەوانیش هەن و لەسەرەوەی هەموانیشن. ئێستاش هاتوون لە ئێران ئەختێك ئازادیی رووکەشی هەیە، هاتووەو جێگای ئێمەیان گرتووە. ئیرەج وتی کێشەی شەخسیی لەگەڵ من هەیە بۆیە وا قسەدەکات. سایان پرسی تۆ کێشەت لەگەڵ ئەودا هەیە؟ وتم بەڵێ. سایان دیسان تووڕە بوو وتی بۆچی کێشەی خۆتان تێکەڵی کاری مەدەنی دەکەن؟ وتم بۆچی پرسیارناکەیت کێشەی شەخسیتان چیە؟ وتی چیە؟ وتم ئەمە کوڕی ئەسرەدین شایە و منیش کوڕی میرزا رەزای کرمانیم، باوکی من باوکی ئەوی کوشتووە لەوکاتەوە ئێمە کێشەمان هەیە. باوك کوشتنە ئیتر. دواتر بابەتەکەم بۆ باسکرد، کە ئەمە کێشەی چینایەتیە، چینی کرێکار دەیەوێت لەژێر دەستی ئەمانە ڕزگاری بێت، بەڵام ئێوە دیسان ئەوانتان خستە سەر کۆڵی ئێمە. بی ریایش لەگەڵ ئەوان هاتبوو. سایان پرسی ئەی ئەو کابرایە کاری چیە؟ وتم: من بە فارسی دەتوانم باسی ئەمەتان بۆ بکەم نەك بە زمانی رووسی. لەبەرئەوەی بێت و پێتان بڵێم ئەمە کاری چیە ئێوە وادەزانن زۆر پیاوێکی شەریفە. وتی چۆن؟ وتم ئەگەر بڵێم ئەمە چیدەکات ئێوە وادەزانن ئەکتەرە، دەڵێن زۆر باشە بەسوودی کرێکارانە. وتم منداڵی بێتووك لەئێران زۆر باوە. ئەمیش دەچوە سەر کۆڵی ئەوان و سەمای دەکرد ئەوانیش پارەیان پێدەدا، پیاوێکی بێئابڕووە. دواتر نۆرەی دکتۆر حەکیمی هات. وتم ئەمە لە هاوڕێیانی

ئێمە بوو بەڵام ئێستا لەگەڵ ئەواندایە، حەکیمی پیاوێکی باشە و من دراوسێیان بووم. ژوورێکم بەکرێ گرتبوو حەوشەکەی پڕبوو لە مریشك و جووجەڵە و بۆگەن بوو. ئەو دەهاتو منی خوڵك دەكرد بۆ باخەکەیان لە شەمێران و جاروبارە من دەچووم بۆ ئەوێ. ئەمانە بژیوییان باشە و پێویستیان بەچینی کرێکار نیە. من کاتێك کە وتم ئینگلیزەکان بوون بەهۆی کشانە دوواوەی ئێمە، هەندێك لەپشتی مێزەکانەوە بە زمانی رووسی وتیان، دادا [٢]، درێژەی پێبدە. تێگەیشتم شاندێکیش لە رووسیاوە هاتوون بۆ کۆبوونەوەکە.

رووسەکان بەبابەتەکە دەزانن و کاتێك ئیرەج ئەسکەندەری لەرێگای رووسیاوە دەگەڕێتەوە بۆ ئێران دەیگرن. بەڵام لاهوتی دەربازی دەکات. لەکۆتاییدا رووسەکان تێدەگەن کە حیزبی توودە لە مەسەلەی نەوتدا نیازی باشیان نەبووە. لەبەرئەوەی خۆپێشاندان لەگەڵ سوپای سۆڤیەت خەڵك زویر دەکات. ڕازی نابن نەوتی خۆیان بدەن بە وڵاتێك کە هێشتا وەرینەگرتووە لەناو شەقامەکانی دا هێزی نیشانبدات. بڕیار درا ئەندامەتیەکەیان جارێ ڕابگرن و دواتر بێن بۆ ئێران و لێکۆڵینەوە بکەن هەتا بزانن کێ بکەن بەئەندام و ماق ئەندامێتی لەکێ وەربگرنەوە.

کێشەی دووەمی ئێمە کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی کار بوو. لەبەرئەوەی کە ئەگەر کۆمەڵێك لە نوێنەرانی ئێران وەرنەدەگیران کەسی دیکە لە نوێنەران ماق دەنگدانیان نەبوو. بەس وەکو چاودێر دەیانتوانی بەشداری بکەن. هەربۆیە وەرنەگیران بەهۆی فاشیزمەوە

---

[٢] – لەزمانی ڕووسیدا بەمانای بەڵێیە .

بـــۆ ئێمـــە مایـــەی شـــەرمەزاری بـــوو. بەتایبـــەت کـــە نوێنـــەرانی ئەرجەنتینیـــشیان هـــەر بـــەو تۆمەتـــە قەبوڵنـــەکردبوو ڕێگایـــان بـــە نوێنەراکانیشیان نەدابوو لە کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی کاردا بەشداری بکـەن لەبەرئـەوەی ئـەوان ئەنـدامی سـەندیکا پڕونیـستییەکان بـوون. کارەکـە لەدەسـتی "لۆمبـاردۆ تولودانـو" دا بـوو. لۆبـاردۆ تولودانـو لەکۆمۆنیـستەکانی مەکسیك بوو بەرپرسی لێکۆڵینـەوەی کۆبونـەوەی نێونەتەوەیی کار بـوو. بـەوجۆرەی کـە دەیـانوت، دەستەڕاسـتی سـتالین بـوو. هەربۆیـە دەبوایـە ئەویـشمان بەقەناعـەت بگەیاندایـە. کێشەی قسەکردن لەگەڵ لۆباردۆ ئەوەبوو کە ئەو جگـە لـە زمـانی ئێسپانیولی هـیچ زمـانێکی دیکـەی نـەدەزانی. مـن تێمگەیانـد کـە کـارم پێتـە. لەبەرئـەوەی کـە لـە هۆتێلێکـدا بـووین. وتـی دەگـەڕێم و وەرگێڕێـك دەدۆزمەوە. دواتر ناوی یەکێك لە شازادەکانی قاجار کەلەگەڵ ئیرەج دا بـوو هێنـا کـەمن ئـەو ببـەم بـۆ وەرگێـڕی. قـەبوڵم نـەکرد. ڕۆژێـك لـەهۆتێل دانیـشتبووم تەلـەفۆن کـراو ژنێـك بـەزمانی روسـی لەگـەڵم قسەیکرد. وتی لۆمباردۆ بەتەمایە لەگـەڵت قـسەبکات دەتـوانی بێیـت؟ قەبوڵمکرد و چووم بۆ لای لۆمباردۆ. ئەو ژنـەی کە لـە تەلەفۆنەکـەدا قـسەی بـۆ کـردم لـەوێبوو پێیـوتم: مـن لەباڵوێزخانـەی رووسـیادا کاردەکەم و لۆمباردۆ دەپرسێت من دەتوانم وەکو وەرگێڕ لەگەڵتان بم؟ وتم من هیچ قسەیەکی نهێنیم لەگەڵ ئەودا نیە. قسەی من ئاشکرایە، لەبەرئەوەی ئەوانی دیکـەم وەکـو وەرگێـڕ قبوڵنـەکرد ترسـام قـسەکانم باش پاچەڤە نەکەن و بەخواستی خۆیـان بیگـۆڕن. هەربۆیـە متمانـەم بە تۆ هەیە بەهۆی ئەوەی کە لە نـەژادی ئیـسلاویت و ئامـادەم قـسە و

باسەکانم بکەم. بابەتی سەندیکای نێونەتەوەییم باسکرد و وتم کۆمەڵێک سەرمایەدار، دەوڵەمەند، شازادە و بازرگان هاتوون بۆ ئێرەو بوون بە ئەندام و ئێمەشتان هەڵپەساردووە. ئەوان بە ئێوەیان وتووە لەئێرانەوە کۆمەڵێک نەژادپەرست هاتوون. ئەمە ڕابردووی منە کە سێزدەساڵ زیندانی بووم و دوای چوار ساڵ لە ئازادبوونیشم ئێستا لەبەرامبەر ئێوەدام. یەکێک لەو نەژادپەرستانە منم. ئەمانە درۆزن و خیانەتکارن. لۆمباردۆ وتی: دەڵێن ئەمانە وەزیرو گزیرن، دەنگیان هێناوەو بوون بەنوێنەر. ئێوە چۆن دەڵێن ئەوان درۆزن و خیانەتکارن. من دۆخی هەڵبژاردنی ئێرانم بەو شێوازەی کە بوو باسکرد. لۆباردۆ دەستیکرد بەپێکەنین. ئەو شتەی کە بۆ ئێمە ئاسایی بوو بۆ ئەو پێکەنیناوی بوو.

دواتر وتی بەرێز ئیفتیخاری من داواکاریەکم لە ئێوە هەیە. وتم داواکارییەکەتان چیە، فەرموون. وتی من ژن و منداڵەکەم لەو ژوورەی ئەولان، جارێکیش ئەم بابەتە بۆ ئەوان باس بکە. ژن و منداڵەکەی هاتن و من بۆم باسکردن کەچۆن کەسێک دێت و دەڵێت من دەنگ دەکڕم، کەسێک دەڵێت من دەنگ دەفرۆشم. کرێکارەکانی شارەوانی دەکرن و دەیانهێنن بۆ دەنگدان. لەو کاتەوەی کە من لەدایکبووم نەمبینیوە کەسێک بەدروستی هەڵبژێردرێت هەربۆیە ئەوانی کە هەڵبژێردراون نوێنەرایەتیەکەیان یاسایی نیە. بنەماڵەی لۆمباردۆش دەستیانکرد بەپێکەنین. لۆمباردۆ دوای ئەو قسەوباسە وتی: ئێوە بڕۆن و ئەرخەیان بن. کەس بۆی نیە ئێوە قەبوڵنەکات. تەواوی وەفدەکەی ئێران قەبوڵدەکەین. پێموت دەوڵەت نەژادپەرست نیە.

لەنێو ئەمانەدا کەسی سەرەڕۆی تێدایە بەڵام نەژادپەرست نین، ئەو سەرمایەدارانەی کە هاتوون نەژادپەرست نین. بەسەرهاتی کوێرکردنی کەیوان کرێکاری نمونەیی کارگەی قوماش چنین بەدەستی کۆمەڵێك خوێڕیی حیزبی توودەیشم بۆ باسکردن (پێموابێت ئێستاش زنیدووە). لۆمباردۆ دیسان بەڵێنی دا کە لەمبارەوە هیچ خۆتان سەخڵەت مەکەن و کاتان بەسەر کەسیشتان نەبێت. ئەو وەفدەی کە لە ئێرانەوە هاتووە قەبوڵ دەکرێت. هەڵبەت ئەم دوو هەنگاوە بۆ ئێران زۆر بەنرخ بوو. یەکیان ئەوەی کە هەوڵی توودەییەکان و هەڵپەساردنی ئەندامیەتیەکانیان و دووەم ئەوەی کە بەنیاز بوون ئێرانیەکان وەکو نەژادپەرست بناسێنن. بەتایبەت هێشتا نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئێران بوون و ئەو بابەتە لەسەداسەد بەسودی ئەوانە بوو کە حیزبی توودەیان پێکهێنابوو چل ڕۆژ لە فەرەنسا بووم. لەو چل ڕۆژەدا سەردانی کارگەکانی ئەوێم کرد. بارودۆخیانم بینی، زۆر پێمخۆش بوو. لەبەرئەوەی هەتا ئەو کاتە وڵاتی دیموکراسیم نەبینیبوو. لە وڵاتی ئێمە هیچ کاتێك دیموکراسی نەبووە. لەبەرئەوەی خەڵك دەبێت بە ڕەوشتیان دیموکرات بێت، دوو شت سەرنجمیان ڕاکێشا، یەکیان سەندیکای کرێکاران بوو. لەکارگەیەکدا دووسێ گروپ هەبوون. بەشێکیان پێوەندییان بە کۆمۆنیستەکانەوە بوو، بەشێکیان سوسیالست بوون، بەشێکیشیان نەتەوەپەرست بوون و ئەمانە لەبنەڕەتدا پێکەوە ناکۆك نەبوون، لە هەڵبژاردندا دەنگیان بەوکەسانە دەدا کە خۆیان دەیانویست و لەناو کارگەدا وەك ئەوە وابوو لەیەك سەندیکادابن. ڕۆژێکیان من چووم بۆ مەیدانێکی گەورە

کە ساردیەك بخۆمەوە. سەیرم کرد کۆمەڵێکی زۆر دەنگە دەنگیانە، دەنگەکە هەر دەهاتوو نێزیك دەبووەوە. بینیم پۆلێك گەنجن و لافیتەیەکیان پێیە. هاواریاندەکرد بژی حیزبی کۆمۆنیست. ئەو کەسەی کە لافیتەکەی پێبوو فەرمانی پێکردن کە دانیشن و وتی سەرو سارديان بۆ بێنن. ئەوان سەرقاڵی خواردن بوون، سەیرم کرد دەنگە دەنگێکی زۆرتر دێت و خەریکن بەرەو ئەوێ دێن. ئەوانیش پۆلێکی دیکەی گەنج بوون کە هاواریان دەکرد بژی **دوگۆل**. واهەستم کرد ئێستا دەیکەن بەشەڕ منیش لەو بنەوە وەکو کەسێکی بێلایەن لێدانێکی باش دەخۆم. هەلیش نەبوو لەوێ بێمە دەرەوە. سەیرمکرد ئەوانیش وەکو گروپی پێشوو ساردیەکیان خواردو ڕۆیشتن. شەڕیش نەکرا. فەرەنسیەکان بەڕاستی ئازادیخواز بوون نەك ئەوەی کە حیزبێکی دیموکرات پێکبهێنن.

لەڕێگای سعودیە و میسر گەڕامەوە بۆ ئێران. بارودۆخی عەرەبەکان لە ئێمەش خراپتر بوو. گوزەرانی ئێمە لەباری کاروکارو ژیانەوە باشتر بوو. دوای گەڕانەوەم بۆ تاران یەکێك لەوکارانەی کە کرا نوسینی یاسای کار بوو. لە کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی کاردا ئینگلیزەکان پەلاماریان داین و دەیانوت لە ئێراندا سەندیکاکان زۆر لاوازن و ئێرانییەکان دواکەوتوون. من ئەو بابەتەم بۆ دەوڵەت باسکرد. ئەو کاتە وەزارەتی کار نەبوو، وەزارەتی پیشە و هونەر بوو. لەدوای ئەوە قەوامولسەڵتەنە بیری لە نووسینی یاسای کار کردەوە. یاسای کارەکە من و **مەهدی شەریف ئیمامی** (برای ئەندازیار شەریف ئیمامی، کە دواتریش بوو بەجێگری وەزارەتی کار) و ئەندازیار

**هۆمایون** پێکەوە نوسیمان. ئەم یاسایەیان برد بۆ پەسندکردن بەڵام وتیان گەورەترین خاوەنکار کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز و ئێرانە هەربۆیە نێردرا بۆ ئەوێ و ڕوونکردنەوەی بۆ کرا. واتە ئەو یاسای کارە کە لەساڵی ١٣٢٥ (١٩٤٦ ز) دا پەسندکرا یاسایەك نیە کە ئێمە نووسیبوومان. یاسای کاری کۆمپانیای نەوت بوو. یاساکەی ئێمەیان پەسندنەکرد.

# بەشی چوارەم
# هەوڵەکانی حیزبی توودە بۆ شکستپێهێنانی رێکخراوی سەربەخۆی کرێکاری

دوای گەڕانـەوەم بـۆ تـاران دیـتم بـارودۆخ گـۆڕاوەو دیکتاتۆریـەت بەتـەواوی مانـا باڵادەسـتە. سـەرەتا کـە لەزینـدان بـەربووین، ئـەمیر ئەحمـەدی بەرپرسـی سـەربازی بـوو ئێمـە بـەوە زۆر قـەڵس بـووین. تەنانەت ویستمان خۆپێشاندانێك رێکبخەین. رەزا روستا کە ئەندامی حیزبی توودە بوو هات بۆ لام و پێیوتم با بێدەنگ بین، دەستەڵاتی سەربازی نامێنێت. بەڵام کاتێك لە پاریس گەڕامەوە سەد خۆزگە بەکفن دز، بینیم ئەمیر ئەحمەدی زۆر لەمانە چاکترە. لەبەرئەوەی ئەمیر ئەحمەدی نەدەهاتە ناو ئۆفیسی کەس و بیپشکنێت و لێیان بدا و تالانی بکات. بەڵام ئەمانە ئەوەش دەکەن، سەردەمانێك کە پیشەوەری چوو بۆ ئازەربایجان و توودەییەکان کاروباریان بەدەستەوەگرت. پێم سەیربوو حیزبێك کە خۆی دەبێ لایەنگری ئازادی و ئازادیخوازی بێت بەڵام خۆی وا بارودۆخەکەی تێکدابوو. ئەمی دەگرت و ئەوی دەکوشت و قەواموسەڵتەنەیش پشتیوانیی دەکردن. بۆئەوەی بتوانێت سەرنجی ستالین و رووسەکان بۆ لای خۆی رابکێشێت، پیشەوەریی لەئازەربایجان دەرکرد و دەستی توودەییەکانی ئاوەڵاکرد.

لـە ١ی ئایـار - یـازدەی گـوڵانی١٣٢٥ (١٩٤٦ ز) بـە ئەندامـەکانمان ڕاگەیانـد کـە لـە ئەسـەدئابادی شـەمێران کۆبینـەوەو لـەوێوە بـە خۆپیـشاندان بـچین بـۆ تـەجریش و لەوێـشەوە بـچینەوە بـۆ مـاڵ، پێـشمانوتبوون هـیچ شـتێك لەگـەڵ خۆیانـدا نـەهێنن. ئەگـەر پێتـان خۆشـە کەوچـکێك لەگـەڵ خۆتـان بێـنن، تەنانـەت باچەتاڵیـشتان پێنەبێت و چەقۆش مەخەنە گیرفانتانەوە. من چووم بۆ لای سەرۆکی ئاسایـشی گـشتی و پێمـوت ئێمـە ١ی ئایـار لـە ئەسـەدئابادی شـەمێران کۆدەبینـەوەو لەبەیانیـەوە تـا دوای نیـوەڕۆ لـەوێ دەبـین و نـانی نیـوەڕۆش لـەوێ دەخـۆین و دوای ئـەوە بـە خۆپیـشاندان دێـین بـۆ تـەجریش. ئـەویش پێیـوتم پۆلیـستان بـۆ دابـین بکـەم. وتم نـا. ئێمـە بەئەندامـەکانمان وتـووە تەنانـەت چـەتاڵیش لەگـەڵ خۆیـان نـەهێنن ئێمـە کێـشەمان لەگـەڵ کـەس نیـە تـا پێویـستمان بـەپۆلیس بێـت. سـەرۆکی ئاسـایش تەلـەفۆنی کـرد بـۆ بنکـەی پۆلیـسی تـەجریش و پێیـوتن ئیفتیخـاری لەگـەڵ ئەنـدامانی سـەندیکاکەیان لـە شـەمێران کۆدەبنـەوەو مـن بـاوەڕم بەقـسەکەیەتی کەتەنانـەت چەقۆشـیان لەگیرفاندا نیە. بۆیە ئێوە نیگەران مەبن. ئێمـە ئەرخـەیان بـووین و ڕۆیـشتین و بـەیانی تـا سـەعات سـێی پـاش نیـوەڕۆ لـەوێ بـووین. دوا نیـوەڕۆ لـەناو گۆمەکـەدا مەلـەشمان کـرد. کرێکارەکـان بـەخێزانی هاتبوون و زۆر خۆشـیان لێگوزەرا. یەکەم ئاهەنگی کرێکاریی ئـەوان بوو، زۆریش رایـان لێـی بـوو. خـەریکی مەلـەکردن بووین کـە هـاتن و وتیان حیزبی توودە هاتوونەتە نێو باخەکە. وتم حیزبی توودە ئیشی بەئێمـە چـیە؟ خێـرا جلـەکانم لەبـەرکردەوەو چـووم. حەوشـەیەکی

بچووك هەبوو وتیان كۆمەڵێكیان لەوێ كۆبوونەتەوە، منیش چووم بۆ ئـەوێ و سـەیرمكرد بـەڵێ توودەییـەكانن. ڕەزا ڕوسـتا، دكتـۆر هەشترودی، عەلیزادە، خەلیل ئینقلاب و تاقمێك چەقۆكێشی حیزبی توودە كە زۆربـەیان كۆچبەر بـوون لـەوێ كۆببوونـەوە. لێیـانم پرسی فەرمانۆ ڕۆژی جەژنە بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟ وتیـان هـاتووین لەگـەڵ ئێـوە یـەكبگرین. وتم باشـە یـەكگرتن پێویـستی بـە كۆبوونـەوەو ئامـادەكردنی بابـەت هەیـە و هەلومـەرجی خـۆی دەوێـت. ئێـوە چـۆن هاتوون بۆ ئێرە ئێمـە ناهـەنگ دەگێـڕین؟ وتـی: نـا ئێمـەیش هـاتووین لەگـەڵ كرێكـاران جـەژن بكـەین و یـەكبگرین. لەوكاتـەدا لەپـشتمەوە دەنگێك هات و یـەكێ كەوتـە نـاو حەوزەكـەوە. گەڕامـەوە سـەیرمكرد، یەكێك لەكرێكارەكانی سەندیكا وتی ئەو كەسـە ویـستی بەچـەقۆ لـەتۆ بدات منـیش خـستمە نـاو حەوزەكـەوە. دەركـەوت ئەمانـە بـەخۆیان و كۆمـەڵێك چەقۆكێـشەوە هـاتوون و نیازیـان خراپـە. بینـیم ئـەوان چەكدارن و ئێمەش هیچمان پێنیە، بـەو كرێكارانـەی لەوشـێوێنە بـوون وتم بـالێرە بـڕۆین. هەنـدێك لـە كرێكارەكـان مانـەوەو لەگـەڵ توودەییەكان كەوتنە دەمەقاڵە. ئێمەش چووینەوە ناو باخەكە و ژن و منداڵـەكانمان جیاكردنـەوەو خـستماننە لایەكـەوە، بـەكرێكارەكانم وت دار بشكێنن و دەورمیان بگرن. ژمارەیەك ئازەربایجانیمان لەگەڵدا بوو، ئازەربایجانی لە شەڕەتێلادا وەستان. ئەوان چوونە سـەر درەختـەكان و چەند پەلەدارێكیان شكاندەوە و چواردەوری ئەوانیان گرت، پێموتن لە كرێكارەكان مەدەن. لەوە بدەن كـە چـەقۆی پێیـە. داریـان لەهەركـەس دەدا دەكەوت و چەقۆكەیان لێدەستەند. برێك چەقومان گرت و چەند

کەسێکیشیان هەڵهاتن و لەدیواری سەعدئاباد خۆیان هەڵدایە ئەودیو. سەربازەکان گرتیانن. (ئەسەدئاباد و سەعدئاباد دیواریان پێکەوە بوو) دوای ئـــەوەی چەقۆکێـــشەکانمان چـــەك كـــرد کەوتینـــە لێـــدانی بەرپرسەکانیان، خەلیل ئینقلاب هاواری دەکرد ئێمە هەڵە بووین. وتم هەڵەوپەڵە نـاخوات نـەبێ هەر کوتـەك بخۆیـت. چەنددارێکمان لێداو دوای ئەوە عەلیزادە هەڵات بەڵام سەرەو نشێو بوو کەوت و ئەوانی تـر بەسـەریدا رەتـدەبوون هاواریـدەکرد مـردم. وتم بمریـت و نـەمریت هـەردەبێت لێـدان بخۆیـت. دوای ئـەوە دایـان لـە رەزا روسـتا. دارێـك بەرسـەری کـەوت چـونکە سـەری تـاس بـوو خـوێنی لێهـات. دواجـار توودەییەکان هەڵهاتن. ئێمـەیش هـەروەك بڕیـار بـوو بـە خۆپێـشاندان کەوتینـەوەڕێ. توودەییـەکان چووبوونە بنکـەی پۆلیـسی تـەجریش و شـکاتیان لێکردبـووین. روسـتا سـەرە خوێناویەکـەی نیـشاندابوون و ئەوانی تریش وتبوویان لێیانداوین. سەرۆکی بنکە لێیاندەپرسێ ئێوە بۆچی چوون بۆ ئەوێ. ئێمە ئاگادار بووین کە ئـەوان بـۆ ئـەوێ دەچـن بـەڵام بـۆ ئێـوە ئاگـادار نـەبووین؟ وتیـان ئێمـە ڕۆیـشتبووین لەگـەڵ ئەواندا یەکبگرین!

هـەر لـەو ڕۆژەدا توودەییـەکان نـەبوونی ئێمـە بەهـەل دەزانـن و دەچنە سەر نوسینگەی سەرەکی سەندیکا لـە لالـەزارو هـەموو شـتەکان تاڵاندەکەن. ئەوان دەیانزانی لەو کاتەدا سەندیکا چۆڵە. خۆیان لـەهیچ شوێنێك خۆپێشاندانیان نەبوو سەندیکاشیان نەبوو، دواتر بەکۆمەڵێك کۆچبەر سەندیکایان دامەزراند. پەڕاو و بەڵگەکانی ئێمـەیان هـەمووی بردبوو. ئێمە هیچ شتێکی نهێنیمان نەبوو ئەوان وایاندەزانی شتێکیان

دەستدەکەوێت. کاتێک لە تەجریش بڵاوەمانکرد و هاتینەوە شار بینیمان سەندیکاکەیان تاڵانکردووە. ئەمە یەکەم هێرشیان بوو بۆ سەر سەندیکاکە بەمەبەستی کوشتن و تاڵانکردن هاتبوون. لەبنەڕەتدا حیزبی توودە بەنیاز بوو ئازادی لەناوبەرێت. بەس پەلاماری ئێمەی نەدەدا بەڵکو پەلاماری حیزبەکانی دیکەیشی دەدا. حیزبی توودە پێنجسەدکەس لە کۆچبەرانی بەکرێ گرتبوو، ڕۆژی پێنج تمەنی پێدەدان بۆ ئەوەی لەبەردەستی حیزبدا بن و لەهەر جێگایەک پێویستبوو بیاننێرێت و تاڵان و کوشتن و لێدان و کوتانیان پێبکات. دەمکوتی خەڵکیان پێبکەن، لەدەست ئەوانە ئاسایشی حیزب و ڕێکخراوەکان کەوتبووە مەترسییەوە. بەس گروپێک بەناوی پان - ئێرانیزم دروستبوون کەئەوانیش بەکرێگیراویان هەبوو. ڕۆژێک وابزانم نزیک شاە ئاباد بوو کە حیزبی توودە پەلاماری حیزبی عەدالەتی عەلی دەشتی و جەمال ئیمامی دا. لەتەلارێکدا بوون کە پیشەکەی خشتی سور بوو، تەواوی ئەو خشتانەیان لەسەریاندا شکاند، نازانم بۆچی حیزبی توودە دەیانویست ئازادییەکان بەرتەسک بکەنەوە. تەنانەت پەلاماری کۆبوونەوەیەکیان دا کە بۆ ڕۆژی نێونەتەوەیی کرێکاران ڕێکخرابوو.

## دیدار لەگەڵ کونسوڵی سۆڤیەت

دوای ئەو ڕووداوە ڕۆژێکیان منیان بانگکرد بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەت. کوڕێکی گەنج کونسوڵ بوو بەناوی یەمیلیانۆف. چەندکەسێکی دیکەش لەوێ دانیشتبوون. بە قژە ڕەشەکەیان دیاربوو

رووس نــەبوون. دیــاربوو ئەرمــەنی و غــەیرە رووس بــوون. وتم: چ فەرمایــشێکتان هەیــە؟ وتــی ڕای ســتالین وایــە بــەس حیزبــی تــوودە هەبێت و لەوانەیــە بــەیانیش نــەمێنێت. ئــەوە شتێکی بــەردەوام نیــە. واباشترە ئێوەش بچن لەناو حیزبی توودەدا چالاکی بکەن. وتم نــاتوانم لەگەڵ ئەواندا کار بکەم. ئەوانە کەسانێکن خیانەتیان لــە هاوڕێکانیــان کــردووە. یــەکتریان بەدەســتەوە داوە. ئەمانــە لەبنەڕەتــدا بابــەتی سیاسەت نین. وتی: ئێوە بچن و چاکیان بکەن. وتم ئــەوان قەبوڵناکــەن من بچمە ئەوێ و ژمارەیــەك دەربکــەم و ژمارەیــەك بهێــنم و خــەریکی چاکسازی بم. وتی ئێمە فەرمانیان پێدەکەین ئێوە قــەبوڵ بکــەن. بــرۆ لــەوێ چاکــسازی بکــە، ڕای ســتالینیش ئەوەیــە. وتم: ئێــوە فــەرمانیان پێبکەن ئەوان قەبوڵی دەکەن؟ وتی: بەڵێ قبوڵی دەکەن. وتم: ناکۆکیی ئێمە لەسەر ئەوەیە. ئێمە هــیچ کێشەیەکی دیکــەمان نیــە. وتم: ئێمــە دەڵێین ئەبێت ئێمە ســەربەخۆ بــین و بــەئیرادەی خۆمــان ئیــشەکانمان بکــەین. وتم ئــەوان ئــەو ئیرادەیــەیان نیــە و ئێمــەیش لەگــەڵ ئــەوان کارمان بۆ ناگرێت. کونسوڵ و ئەو چەند کەسە زۆر پێیانناخۆش بــوو. هەر باش بوو نەیانگرتم و بەنهێنی نەیانبردم بــۆ ســۆڤیەت. هەســتام و دڵخۆشبووم بەوەی لەوێ بەسەلامەتی هاتبوومە دەرەوە.

## ڕفاندنی ئەندامانی ئەنجومەنی یەکگرتوو

ئێوارەیــەکیان لەشــوێنێك دەگەڕامــەوە هەنــدێك ناســاخ بــووم تــام هــەبوو، بیرمکــردەوە ســەردانێکی ســەندیکا بکــەم. نزیکــی ســەندیکا بوومــەوە ســەیرمکرد نزیکــەی دووســەد کەســێك گــەمارۆیان دام و

بەچەقۆ پەلاماریان دام. بەهۆی ئەوەی من لەژێرەوە بووم چەقۆکان بەرخۆیان دەکەوت. منیش چەکم پێبوو. دەمانچەکەم دەرهێنا بەڵام گیری کردبوو. چیدی دەستم ئیشی نەدەکرد. بەهۆی ئەوەی دەستم گیرابوو نەمدەتوانی خۆم دەرباز بکەم. یەکێکیان چەقۆیەکی لەدەستمداو بریندار بووم. منیان برد بۆ بنکەی حیزبی توودە لە شەقامی فیردەوسی و لەوێ زیندانیان کردم. ئەم زیندانە چەندقات لەگرتوخانەکانی ڕەزاشا خراپتر بوو. لەگرتوخانەکانی ڕەزاشا نەختێك حاڵی مرۆڤیان لەبەرچاو دەگرت. بەڵام لێرە منیان خستە کادێنێکەوەو کەلەپچەیان کردم کەلەپچەی پۆلیس بوو دەمناسییەوە. تەنانەت دەیانوت میزەکەشت بکە نێو پانتۆڵەکەتەوە. ئەمەیش هەڵسوکەوتی ئازادیخوازەکان بوو. موزەفەر فەیروزیش زوو زوو تەلەفۆنی دەکرد کە هێشتا نەتانکوشتووە؟ دواتر دەرکەوت نایانەوێت لێرە بمکوژن، بەتەمابوون بمبەن بۆ زەنجان و بمدەنە دەست **غولام یەحیا** و ئەوان دادگاییم بکەن و بمکوژن. نزیك حەوتویەك لەوێ بووم. چەند هاوڕێیەکی دیکەشمانیان گرت و هێنایانن بۆ ئەوێ، وەکو تاهیری و بالکانی و براکەم رەحیم ئیفتیخاری. ئەوانیش چاونەترسانە بەرامبەریان وەستابوون. لەهەرکامیان پرسیبوو ئێوە سەر بە سەندیکان، وتبوویان بەڵێ لەسەندیکاین و دژ بەئێوەش بووین. ئێوە ئێرانی نین، ئێمە ئێرانین و ژیان و ئازادیمان بۆ ئێران دەوێت. بەڵام یەکێك لەوان بەناوی **میرمەجید** کە لە تەورێزەوە هاتبوو ئەندامی شاندی کارگەیەك بوو، وتی من لەگەڵ ئەوان نەبووم. چووم بۆ سەندیکا تا ئیشێکم بۆ بدۆزنەوە لەو کاتەدا ئێوە هاتن. لە منیان

پرسی ئەو ڕاست دەڵێت لەگەڵ ئێوەدا نیە؟ بینیم خۆی حاشادەکات، وتم بەڵێ ئەو هاتبوو ئیشی بۆ بدۆزینەوەو منیش نایناسم. ئەو لەوێ ئەجاتی بوو یەکسەر دەچێت بۆلای بەڕێز سەرتیپ زادەی ئەندام پەرلەمان و بابەتەکەی بۆ باسدەکات و دەڵێت گیانی ئیفتیخاری لەمەترسیدایە. سەرتیپزادەیش دەچێت بۆلای شا و پێیدەڵێت ئەم بارودۆخە بۆ وایلێهاتووە؟ (توودەییەکان جگە لەمن چەندکەسێکی دیکەیشیان گرتبوو لەوانە چەند کەسێك کە لەئازەربایجانەوە وەك و پەنابەر هاتبوون). گوایە شا تەلەفۆن بۆ **قەواموسەلتەنە** دەکات و لێی تووڕە دەبێت. قەوامیش فەرمان دەکات کە لەزووترین کاتدا من ڕادەستی پۆلیس بکەن. کەسێك لەئاسایشەوە هات و منی لەگەڵ خۆی برد بۆ بنکەی پۆلیس. ئەوکاتە بوو کە خوالێخۆشبوو کەسرەوییان کوشتبوو. کەسێك لە ژوورەکەی مندا بوو لێمپرسی تۆیان بۆچی هێناوەتە ئێرە؟ وتی من کەسرەویم کوشتووە. دوایی من بەرامبەر ئاساییش نارەزاییم دەربڕی کە بۆچی منتان لەگەڵ ئەودا لەژوورێك داناوە؟

سەرتیپ ڕەزایی کە سەرۆکی ئاسایشی گشتی بوو فەرمانی پێکردن کە من بنێرن بۆ گرتوخانەی پۆلیس. ئەو کاتە بوو کە زۆرێك لە پۆلیسەکانی سەردەمانی ڕەزاشا وەك **موختاری** و هی تر لە بەندیخانە بوون. دوو ڕۆژ بوو لەبەندیخانە بووم، هاتن. وتیان بەڕێز سەرهەنگ ڕاسخ دەیەوێت لەخەستەخانەی نێو بەندیخانە چاوی بە ئێوە بکەوێت. ئەوانیان لەوێ هێشتبووەوە. چووم بۆ ئەوەی بزانم ئێستا ڕاسخ چی دەکات؟ سڵاوم لێکرد و زۆر بەڕێزەوە بەخێرهاتنی

کردم و وتی زۆر باشبوو هاتی. ڕوو لەو دوو سێ کەسەی کە لەوێبوون وتی: ئەو دەزانێ، لەو بپرسن. من باوکی بەندییەکان بووم، من لەزیندان خزمەتم دەکرد. دەستیکرد بەقسە. منیش شەرمم کردو هیچم نەوت. هەرشتێك کە پێیخۆش بوو وتی و بێدەنگیی منیش بەمانای ڕاستی قسەکانی بوو. دوای ئەوە وتی: بەڕێز ئیفتیخاری داواکارییەکم لە ئێوە هەیە. وتم داواکارییەکەتان چیە؟ وتی تۆ لەگەڵ ئەسعەد سەرۆکی جەنگ هاوڕێیت، ئەگەر داوای لێبکەیت داوای تۆ ڕەتناکاتەوە. بێتو ئەوان شکاتەکەی خۆیان وەربگرنەوە من ئازاد دەکرێم. وتم بەڕێز ڕاسخ تۆ هەر قسەت کرد و من هیچم نەوت بەڵام ناتوانم بچم بۆلای کەسێك کە براکەیت کوشتووە پێیبڵێم لەبەرئەوەی دۆستی منی چاوپۆشی لە خوێنی براکەت بکە. ئەمە ئیشی من نیە.

دوای ماوەیەك پێیانوتم پێنج هەزار تمەن بارمتە دابنێ تا ئازاد بیت. وتم من ئەو پارەیە نادەم. پارەی بارمتە کەسێك ئەیدات تاوانبار بێت. توودەییەکان منیان گرتووە و ئێوەش منتان خستۆتە بەندیخانە و پارەش بدەم! ئێوە تاوانباران. لەڕاستیدا لەو کێشەو گرفتانەدا ئاسایش دەستی هەبوو. بەفەرمانی قەوامولسەڵتەنە لەگرتنی مندا لەگەڵ توودەییەکان دەستیان تێکەڵکردبوو. موزەفەر فەیروزیش کەلەگەڵ سەیدزیائەدین دا ئەمابوو خۆی نوساندبوو بەملاوەو زوو زوو تەلەفۆنی دەکرد کە بیکوژن. دوو کەس هاتبوون بۆ کەفیلی کردنم، یەکیان سەید موحەممەد باقر حیجازی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی وەزیفە کە سەید زیائەدین ناردبووی. وتم نا کەفالەتەکەیانم قبوڵ نەکرد. دوای ئەوە سەرهەنگ هۆمایۆن کە هاوڕێی سەرهەنگ پولادین

بوو پازدەستاڵ لە بەنديخانە بوو هات و منيش پێموت كە ئيشی وانەكات. دوای حەوتويەك بەناچار بەبێ كەفيل ئازاديان كردم.

سەنديكاكەيان تالانكردبوو، حيزبی توودە هەموو شتەكانيان بردبوو، دۆخێكی زۆر ناخۆش هاتبووە پێشەوە. ناچاربووين بەوتەی حيزبيەكان سەنديكاكە بكەينە ژێرزەمينی (بەنهێنی چالاكی بكەين). لەبەرئەوەی كارگەيشتبووە لێدان و داخستن و زۆر كێشە و لەمپەرمان لەبەردەم بوو. يەكێك لەكێشەكانمان ئەوەبوو ئەوماوەی من لەپاريس بووم و دوای ئەوەيش كە دەستبەسەر كرابووم، پيشەوەری تەواوی رابەرانی سەنديكاكەمانی لە ئازەربايجان بلاوە پێكردبوو. كۆمەڵێكی دوور خستبۆوە بۆ هەمەدان و شوێنەكانی ديكەو كۆمەڵێكيش وەك رەحيم هيمداد لەو رووداوانە زۆر بەخۆدا شكابوونەوە. هەروەك باسمكرد لەدوای دووركەوتنەوەم لەتەورێز رەحيم هيمدادم نارد بۆ ئازەربايجان بۆ رێكخستنی كارەكان، رێكخراوەكەی پيشەوەری هێشتا فەرمی نەبوو. حيزبە ديموكراتەكەيان هێشتا رەسمی نەبوو بەنهێنی هاتوچۆيان دەكرد. پيشەوەری و **كەريم كەشاوەرز** و دكتۆر جاويد لە تاران حيزبێكيان بەناوی حيزبی ديموكرات پێكهێنابوو. پيشەوەری دەچێت بۆ تەورێز بۆ ئەوەی كاروبارەكان رێكبخات. پيشەوەری كێشەيەكی بێبنەما لەنێو كرێكاران و خاوەنكار و دەرەبەگەكانی ئەهەر دەنێتەوە و بەرەحيم دەڵێت واباشە ئێوە بچن سەردانێكيان بكەن، ئەگەر ئيفتيخاری بوايە خێرا دەچوو. رەحيم دەنێرن بۆ ئەوێ و بەهێزی ئاسايش سەنديكاكە داگيردەكەن. رەحيم گەڕايەوەو دەستی لەكاركێشايەوە. وتم بۆچی دەستت لەكار كێشاوەتەوە؟ ئەو شتانە هەر

ڕوودەدات. کڵاوی دەکەنە سەر. ئازاری و ئەشکەنجەی دەدەن، لەوانەیە لەسێدارەشی بدەن، جاریوایە تیرۆری دەکەن. ئەم کارانە مەترسیشی تێدایە. وتی ئێمە ماوەیەك زەحمەتمان کێشاوەو خەڵکمان کۆکردۆتەوە. بەشێك لەوانە وەکو عەلیزادە و ئەوان رۆیشتن و خیانەتیان کرد. ئێستا لەمەودوا کێ کۆبکەینەوە؟ من وازدێنم. هیمداد زۆر شەرافەتمەندانە دەستی لەکار کێشایەوە نەك بەساختەچیەتی و لێکترازان بکات. دیسان گەڕایەوە بۆ کۆمپانیای دیبا و بەیات کە پێشتر ئیشمان لێدەکرد و تاماوەیەك پێش ئێستا کە مرد وەك ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی تاران پاڵاس کاریدەکرد.

هەروەك باسمکرد پیشەوەری تەواوی بەرپرسانی رێکخراوە کرێکارییەکەی ئێمەی دوورخستبۆوە. هیچ پارەیەکیشمان نەبوو. نەدەمانتوانی پارە لە کەس وەربگرین و نە داهاتێکی وایشمان هەبوو. کرێکارەکان ئابوونەیەکی کەمیان دەدا و سەندیکاکەمان بەو پارەیە بەڕێوەدەبرد. لەڕاستیدا دۆخی لەرووی دارایییەوە زۆر خراپ بووین. چووین بۆ وەزارەتی ناوخۆ تا کار بدەن بە دوورخراوەکانمان تا برسی نەبن. بەڕێز فەرزانە بەرپرسی ئیدارەی سیاسی وەزارەتی ناوخۆ کەسێکی کەمتەرخەم و ناکارا بوو. لەبەرئەوە نەبوو حەز نەکات یارمەتی خەڵك بدات هەرخۆی دەستوپێ سپی بوو تاقەتی نەبوو بەدواداچوون بکات و بچێت بۆ ئاسایش و سەرۆکی ئاسایش ببینێت و بلیت کۆمەڵێك کەس بێهۆ ئاوارەکراون و لەماڵ و ژیانی خۆیان دوورخراونەتەوە بۆ شارۆچکەکان و لەوێ برسین. ئەو کارەی نەکرد، تەلەفۆنێکی دەکرد وەڵامیان دەداوە یان نەیاندەداوە ئەم دۆخە

لەهەموو شتێك زیاتر ئێمەی رەنجاندبوو. ئەویش لەکاتێکدابوو کە توودەییەکان دەستیان دابووە تیرۆرکردن بەوجۆرەی کە ئاگادارم حیسام لەنکەرانی و موحەمەد مەسعود و دهقانیان تیرۆر کردبوو. پلانیان بۆ تیرۆری منیش دانا بوو. بۆیە ناچاربووم زۆر بەهۆشیارییەوە بجوولێمەوە. لەبەرئەوەی نە کەس ئاگای لێم بوو ئەماڵەکەشم وابوو کە نەتوانن هەڵبکوتنەسەرم. ژیانێکی زۆر ناخۆشم هەبوو. بەشێوەی نهێنی چالاکیمان دەکرد. سەندیکاکەمان هەر بەو حاڵەوە هێشتەوەو لەگەڵ ئەو کەسانەی کە تارێندرابوون پێوەندیمان هەبوو. ئەوانیش رووبەرووی برسێتی و بێکاری ببوونەوە.

## سەفەری لویی سایان بۆ ئێران

لەو کاتەدا لویی سایان سەرۆکی سەندیکای کرێکارانی جیهان هات بۆ ئێران. دەوڵەت زۆر رێزی لێگرت، هێشتا دەوڵەتی قەوام لەسەر حوکم بوو. ئەویان برد بۆ ئازەربایجان و گەراندیان و لەتاران لەهۆتێل دەربەند دایانناو ئەندازیار ئەفیسیش میوانداری لێدەکرد. منیش چووم بۆ چاوپێکەوتنی. ئیرەج ئەسکەندەری و رەزا روستا دانیشتبوون و قسەیان لەگەڵ دەکرد. لویی سایان لێی پرسیم حەزدەکەی لەلای ئەمان قسە بکەین یان بەتەنها. وتم نا هیچ شتێکی شاراوەم نیە. لە ئێران ئەم هەموو هاتو هاوارەی ئێمە لەبەرئەوەیە کە ئازادی بپارێزین و سەندیکا بتوانێت بەئازادی چالاکی بکات. ئەوەیش بەنهێنی ناکرێت. قسەیەکی شاراوە نیە. قسەکانم لە ئەسرەدین شاوە دەستپێکرد. ئیرەج ئەسکەندەری تێگەیشت دەمەوێت باسی چی بکەم، هەستا: چاکەتەکەی

لەبەرکردو وتی: بەیارمەتیتان من دەڕۆم (وەکو جاری پێشوو لە پاریس) وتم هاوڕێ لویی سایان پێی بڵێ دانیشێت هەتا قسەکانم دەکەم. بۆچی دەڕوات؟ ئەسکەندەری وتی: خۆ دیل نیم، دەڕۆم. لێیدا ڕۆی، وتم هاوڕێ سایان ئەبێ مەسەلەی سیخوڕی لەناو ڕێکخراوەکاندا نەمێنێت. وڵاتانێك کە دەیانەوێت سیخوڕیان هەبێت، با بیانبێت ئێمە کارمان بەسەر ئەوانەوە نیە، ئەوان زانیاریی خۆیان کۆدەکەنەوە. ڕەزا روستایش کە فایلی سیخوڕی هەبوو هەستا چاکەتەکەی لەبەرکردو وتی منیش بەیارمەتیتان. من و بەڕێز لویی سایان و ئەندازیار ئەفیسیماینەوە. هەڵبەت وەرگێڕەکەیشمان ئەفیسی بوو. وتم هاوڕێ لویی سایان ئێستا کارمان بە دادگا و دادگاییکردنەوە نیە و وەکو دوو هاوڕێ باپێکەوە قسەبکەین و ئەو کێشەیە چارەسەر بکەین. ئەوەی کە ئێوە هاتن و قەوام ئەو شانۆگەرییەی ڕێکخست و حیزبی توودەی هێنایە پێشەوە بۆ ئەوەی ئێوە وابزانن ئازادیی تەواو لێرە هەیە، هیچ ڕاست نیە. قەوام خۆی ئەمانە لەناو دەبات. با ئەم قسەی منتان لەیاد بمێنێتەوە. وتی نا، من لێکۆڵینەوەم کردووە توودەییەکان بێتاوانن ئێوە زۆر توندڕەون. خەتای ئێوەیە لەگەڵ ئەواندا شەڕدەکەن. هەڵبەت لێرەدا ئێمەی تاوانبار کردو منیش هیچ قسەیەکم نەکرد بەس تەنها پێموت لەبیرت نەچێتەوە قەوام ئەمانە چۆن لەناو دەبات. بۆ هەڵبژاردن و کاری حکومی هەمووشتێك سەندیکایی بوو بەڵام لەڕاستیدا هیچ سەندیکایەك بوونی نەبوو.

## رێکخراوی خوزستان

لـە خوزسـتان توودەییـەکان هەڵیانکوتایـە سـەر رێکخراوەکـەمان لەنێو کرێکارانی کۆمپانیای نەوتـدا و لـە ئـەهواز دەسـتیانگرت بەسـەر سـەندیکادا و هاورێیـانی ئێمـەیان ئـازار دەدا و بـۆ خۆیـان مـیری وناغـا بـوون. ئـەوان لەگـەڵ عەشـایرەکانیش بەشـەڕ هـاتن. گوایـە ژمارەیـەك لەهــەردوولا دەکــوژرێن و دەســتەڵاتی ســەربازی رادەگەیــەنرێت. هاورێکانمـان بۆیـان نووسـیبووم پێویـستە بـچم بـۆ ئـەوێ، چـونکە هەنــدێکمان لــێگیراوە و هەندێکیــشمان لەگۆڕســتان دەخــەوین تــا نـەگیرێین. بارووودۆخمـان خراپـە و ئەگـەر توانیـت وەرە. لەسـاڵی ١٣٢٥ (١٩٤٦ ز) کە حکومەتەکەی پیشەوەری تێکشکا و هـەڵات مـن چـووم بـۆ ئابـادان. هـەر ئـەو شـەوە کۆبوونـەوەیـەکمان کـرد. پرسییان لەکاتێکـدا سەندیکاکەمان داخراوە ئایـا دەتـوانین هەرنـەبێت بـەئازادی بگـەڕێین. وتم چاوەڕێ دەکـەین ئەگـەر سـۆڤیەتیەکان و توودەییـەکان دژی ئێمـە قسەیانکرد حەتمـەن رزگارتـان دەکـەم. ئەگـەر بەباشـە باسیانکردین و وتیان بگەڕێنەوە رابەرایەتی ئەوانە بەدەستەوە بگرن، ئەوە من دەچم و ئێوەش بەجۆرێك خۆتان بپارێزن. سبەی بەیانیەکەی لـە میوانخانـە بـووم. هاوســەری یــەکێك لــە هاورێیانمــان هــات وتــی دوێنــێ شــەو چاودێرییان کردوون و دوای کۆبونەوەکە هەموویان گرتوون. چووم بۆ پارێزگا بۆ ئەوەی بـزانم هـۆی ئـەو کارەیـان چـی بـووە. وتم خـۆ ئێمـە تاوانێکمــان نــەکردووە نــە کارمــان بەحکومــەت هــەبووە و نــە بــە پیـشەوەری. لەگـەڵ بیانیـەکانیش دەسـتمان تێکـەڵ نـەکردووە. هـۆی

گیرانی هاوڕێیانی ئێمە چیە؟ وتی پارێزگار فەرمانی پێکردووین. چووم بۆلای پارێزگار، پارێزگار بەڕێز مسباح فلتمی بوو. دەیانوت کە چوارده ساڵە پارێزگاری خوزستانە و پێوەندیی نزیکیشی لەگەڵ ئینگلیزەکان هەیە. من بەبێهیوایی چووم بۆلای. بەگەرمی پێشوازیی لێکردم و وتی من ناوبانگی تۆم بیستووە. ئێوە کەسێکی نیشتمانپەروەرن و ئەگەر ئێوە بڵێن فلان کەس توودەیی نەبووە و پەیوەندیی بە سۆفیەتیەکانەوە نەبووە، ئێمە ئازادیاندەکەین و نایانگرین. ئەو قسانە دڵخۆشی کردم و گەڕامەوە بۆ ئابادان. ئەو کەسانەی ئەندامی لیژنە بوون و کەسانێکی دەستڕۆیشتوو بوون کۆمکردنەوەو وتم دەچین سەندیکاکە دەکەینەوە. بە سەرۆکی ئاسایشیشمان وت و ئەویش لاریی نەبوو.

چووین سەندیکاکەمان کردەوە. وردەوردە گیراوەکانیشمان بەردا. ڕۆژێك ژنێك هات بۆ لام و وتی: کوڕەکەمیان لە شەوی زاوایەتی گرتووەو ئێستا لە بەندیخانەی ئەهوازە. ئێوە دەتوانن کارێك بکەن ئازاد بێت. من ئەو گەنجەم دەناسی و چووم بۆ لای پارێزگار لە ئەهواز. پارێزگار وتی: بەڕێز ئیفتیخاری ئێستا لەتۆ کەوتوومە گومانەوە، وتم بۆچی؟ وتی ئەو گەنجە لە بەندیخانە دەڵێت بژی ستالین و مەرگ بۆ شا، ئێستا ئێوە هاتوون و دەتانەوێت ئازادی بکەن. وتم بەڕێز پارێزگار منیش بوومایە هەر وامدەوت. وتی: تۆیش هەر ئەوەت دەکرد؟ وتم بەڵێ، شەوی زاوایەتی گرتووتانە دەتانەوێت دوعای خێرتان بۆ بکات. من دەبم بە کەفیلی ئێوە بەریدەن چیدی قسەی واناکات. ئەختێك بیری کردەوەو وتی بە دەستەبەری تۆوە

ئازادی دەکەین. هاتمە دەرەوە و گەڕامەوە بۆ ئابادان. بەو گەنجەم وت بچۆرەوە شەو لەدارایی خۆتان بخەوەو بەیانی وەرە بۆ سەندیکا کارم پێتە. بەیانی هات و بردم بۆ کۆمپانیای نەوت. وتم: ئەم کوڕە بێتاوانە و دەبێت بیخەنەوە سەر کارەکەی خۆی. وتم کە کارت تەواوبوو وەرە بۆ سەندیکا. دوو ڕۆژ دواتر هات بۆ سەندیکا. وتم بیستومە لە بەندیخانە وتوتە بژی ستالین و مەرگ و نەمان بۆ شا، ئەوە ڕاستە؟ وتی بەڵێ، وتم بۆچی؟ وتی لەبەرئەوەی ستالین لایەنگری کرێکارە و ئێمەیش کرێکارین، شا ئێمەی دەستبەسەر کردووە، دژی ئێمەیە، بەڵام ستالین لایەنگری ئێمەیە و ئێمەیش لایەنگری لەو دەکەین. بەرێکەوت ڕەسمی یەکەم حکومەتی لینینم پێبوو. ڕەسمەکانم هێنا. وتم: ئەمە یەکەم حکومەتێکە کە لینین پێکیهێناوە. سەیریکرد. وتم ئەمانە هەموویان بەدەستی ستالین کوژراون. ئێستا تۆ لایەنگری لێدەکەیت؟ نەختێك لەو شتانەمان باسکرد. ئەویش ڕای گۆڕاو وتی: من ئەو شتانەم نەدەزانی. وتم مادام وایە لە حەوشەی سەندیکا، ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران دێن و تۆیش قسەیان بۆ بکە. ئەو ڕۆیشت و قسەی کرد و لە کۆتاییدا وتی : بڕووخێ ستالین. ڕۆژێکیان بۆ کارێکی سەندیکا چووم بۆ لای پارێزگار، وتی: بەڕێز ئیفتیخاری تۆ چیت کردووە؟ ئێمە لەبەندیخانە ئەو گشتە نەشکەنجەمان دا ڕای خۆی نەگۆڕی، بیستوومە هاتووە و دژ بەستالین قسەی کردووە.

سەندیکامان گەڕاندەوە بۆ دۆخی جاران و لەوانەیە باشتریش (چونکە جێگا و ڕێگای زۆرترمان بوو). مۆڵەتی فەرمیمان بۆ سەندیکا لە دەوڵەت وەرگرت کە تا ئەوکاتە ڕەسمی نەبوو. سەندیکای ئابادانمان

وەکو کۆمپانیا تۆمارکرد. بەلام ئەم مەسەلەیە کۆمپانیای نەوتی نیگەران کرد. وابڕیار بوو لەسەر لانیکەمی مووچە قسە بکەین.

لانیکەمی مووچە چل ریال بوو، بڕیاربوو لە شوێنە ناخۆشەکان، مووچەی کرێکاران بەرێژەی ٢٥٪ زیاد بکرێت، بڕیاربوو لانیکەمی مووچەی کرێکاران لە خوزستان چل و دوو ریال بێت. ئێمەیش پێمان لەسەر ئەوە دادەگرت، ئەحمەد ئارامیش وەزیری کار لەگەڵ حەبیب نەفیسی جێگریدا، هاتن لەبارەی لانیکەمی مووچەوە هەنگاوبنێن. بەبێ ئامادەبوونی نوێنەرانی سەندیکا ڕۆیشتن لەگەڵ کۆمپانیای نەوت گرێبەستیان بەست کە لانیکەمی کرێ چل ریاڵ بێت، کە بڕیاربوو چل و دوو ریاڵ بێت. هەردوکیان لەگەڵ بەڕێز **جەمالزادە** هاتن بۆ سەندیکا و ئێمەش نارەزاییمان دەربڕی و ئەوانیش وتیان چاکی دەکەین و ڕۆیشتن. بەلام چل ریالەکە جێگیربوو. هاتم بۆ تاران تا **قەوامولسەلتەنە** ببینم و لەوبارەیەوە قسەی لەگەدا بکەم. لەو سەردەمەدا دووریاڵ زۆر بوو. چووم بۆ لای قەوام. هەروەك لە **گۆڤاری (خواندنیها)** باسکراوە ئەو منی دەناسی.[1] ڕۆژێك ئەوم لەبەرچاوی خەڵك لە تەختی پاشایەتی هێنابووە خووارەوە. بەوم وتبوو تۆ لەگەڵ دزی و خوێڕیدا دەستکیس بووی و سەندیکای ئێمەتان تالانکردووە. ئەو چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد. ڕۆژنامەکانیش ئەوەیان نووسیبوو.

---

[1] – ئەم ناسیاوییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە یوسفی ئیفتخاری لەدوای ئازادی لە بەندیخانەی شۆرای یەککگرتووی ناوەند بۆ نارەزایی دەربڕین دەچێت بۆ لای قەوامولسەلتەنە . گۆڤاری خواندنیها ، سالی پازدەیەم ، ژمارەی ٢٢ و ١٦ سەرماوەرزی ١٣٢٣ ی هەتاوی ( ١٩٥٤ ی زایینی )

قەوامولسەڵتەنە سکرتێرێکی بوو بەناوی موحەمەد قەوام. کە خزمی خۆی بوو. بەڕێز موشیری جێگری وەزیری کاریش لەوێ دانیشتبوو، بەسکرتێرەکەیم وت دەمەوێت چاوم بە بەڕێز قەوام بکەوێت. سەیرێکی جلو بەرگەکەمی کرد بە شایەنی نەزانی وتی بەڕێز قەوام کەس نابینێت. کارت چیە بەو؟ وتم چۆن کەس نابینێت، سەرۆك وەزیرانە و ئەویش یەکێکە لە خەڵکی ئێران، ئەمەوێت چاوم پێیبکەوێت، لەبارەی بارودۆخی ئێرانەوەیە. موشیری کە منی دەناسی وتی: ئەمە بەڕێز ئیفتیخارییە سەرۆکی سەندیکاکانی ئێرانە و یەکێکە لە کەسایەتییە بەرچاوەکان. ئەو کاتە موحەمەد قەوام نەختێك نەرم بوو ناسنامەکەمی وەرگرت و چووە ژوورەوەو وتی جەنابی قەوام دەفەرموێت هەرکارێکت هەیە من بۆت جێبەجێ بکەم. وتم کارەکەی من بە جەنابی سەرۆکیش جێبەجێ نابێت. بەنیازبووم قسەی لەگەڵ بکەم کە بڵێت من ناتوانم. بەڵام بەداخەوە قبوڵیان نەکرد. وتی کارەکەت چیە؟ وتم لەبارەی مووچەی کرێکارانە کە کۆمپانیای نەوت بڕیاری داوەو دەوڵەتیش پەسندی کردووە، ئێمەیش نارەزاییمان دەربڕیوە و تۆیش و سەرۆکەکەیشت هیچتان پێناکرێت. بەڵام ئێمە بەتەمابووین ئەو بڵێت هیچم پێناکرێت هەتا خۆمان کارێك بکەین. ئەوان بەکۆمپانیای نەوت نەدەوێران کۆمپانیای نەوت خاوەنیان بوو، ئەمانەی دادەنا و دەیگۆڕین. هیچمان بۆ نەکراو هەر ئەو چل ریاڵە مایەوە.

## چالاکییەکانی "ئیسکی و سەفەری شاندی فیدراسیونی سەندیکا کرێکارییەکانی جیهانی بۆ ئێران

لەنێو ئەمانەدا قەوامولسەڵتەنەیش خەریکی کاراکردنی حیزبی دیموکراتەکەی خۆی و دامەزراندنی رێکخراوی کرێکاری بوو. رێکخراوێکی بەناوی ئیسکی و بە رێبەرایەتی **خەسرەو هیدایەت** دامەزراندبوو. لەراستیدا رێکخراوەکەی کرێکاری نەبوو. کۆمەڵێك سەرسەری لەبابەتی قزڵباش و بیوك صابرو حەسەن عەرەب و کەسانی شەڕەنگێزی ناو کارگەکانی کۆکردبووەوە. لە شەقامی پەهلەویش شوێنێکیان گرتبوو. هەوڵیان دا ئێمە و ئیسکی یەکبگرین. خوسرەو هیدایەت چەندجار هات بۆ لام و وتی تۆ لەم دنیایەدا چیت دەوێت؟ ئەگەر رێکخراوت دەوێت ئەوە ئێمە هەمانە. هێزیش لای ئێمەیە. بەڵام ئێمە قبووڵمان نەکرد. ئەمجارەیان مەسەلەکە پێچەوانە بۆوە: گوشار لەلایەن قەوام و دەوڵەت و ئیسکی با بڵێین لەلایەن راستڕەوەکانەوە دەستی پێکرد.

ئەوە سەردەمانێك بوو کە رێکخراوەکەی ئێمە بەنهێنی کاریدەکرد و ئەوانیش دەستیان پێمان نەدەگەیشت و نەیاندەتوانی زیانمان پێبگەیەنن. هەلێکی باش بوو کەوتبوونە گیانی حیزبی توودە. جارێکیان کرێکارەکانی سەربە ئێمە هاتن و وتیان دەمانەوێت لەگەڵ ئێسکیدا یەك بگرین و حیزبی توودە تاڵان بکەین. نەمهێشت ئەو کارە بکەن و سەرزەنشتیشم کردن. وتیان ئێمە دەبێت تۆڵەی خۆمان بسێنینەوە. وتم نابێت ئێمە لە سیاسەتدا تۆڵە بسێنینەوە.

ئێمە خێرو خۆشیی وڵات لەبەرچاو دەگرین. ئەگەر ئێمەیش ببین بەدزو تاڵانچی جیاوازیمان چی دەبێت لەگەڵ دەوڵەت و حیزبی توودە؟ ئێمە رەنجدەرین، ئێمە کار دەکەین، ئێمە رەنجی شانی خۆمان دەخۆین. ئێمە وەکو ئەوان نین. نەمهێشت هاورێیانی ئێمە لەو تاڵانکردنەدا بەشداری بکەن. هەڵبەت ئەو گوشارە حیزبی توودەی زۆر تووڕە کرد و لەلای رێکخراوی نێونەتەوەیی کارو سەندیکای جیهانی شکاتیان کرد. وابرپار بوو لەلایەن سەندیکای جیهانییەوە چەند کەسێك بێن بۆ چارەسەری کێشەکە.

شاندەکە هاتن بۆ ئێران. لە سۆڤیەتوە **بوریسۆف**، لەئینگلیزەوە **هاریس** و لە سوریاوە **ئەلعەریس** و یەکێکیش لە فەرەنساوە هاتن.[۲] ئەمجارەیان حیزبی توودە شکاتی هەبوو. واتە ئەو دۆخەی حیزبی توودە بۆ خەڵکی دروستکردبوو ئەمجارەیان بەسەر خۆیدا هاتبوو. ئەم مەسەلەیە دەبوو لەپێشدا لە ئابادان تاوتوێ و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرایە بۆ ئەوەی بزانن لەڕاستیدا هیچ گوشارێك هەیە یان نا؟ چونکە لە ئابادان حیزبی توودە لەگەڵ عەشایەر بەشەڕهاتبوو چەند کەسیش کوژرابوون، حکومەتی سەربازی راگەیەنرابوو. سەرهەنگێك کە خەڵکی گیلان بوو بەڕێوەبەری ئاسایشی ئەوێ بوو. توودەییەکان شکاتیان هەبوو لەوەی ناهێڵن بەئازادی چالاکی بکەن. لەڕاستیدا رێگایان لەهەموو کەسێك گرتبوو نەك تەنها لەوان. دەوڵەت گرنگییەکی

---

[۲] – ئەلعەریس Ariss ئەندامی فیدراسیون جیهانی سەندیکای کرنکاریەکان و سەرۆکی شاندەکە ، بۆریسۆف Borissov نوێنەری سەندیکای رووسیا ، هەریس Haries نوێنەری شورای سەندیکا کرنکاریەکانی ئینگلیس ، مالفەت Malfette سکرتێری شاندەکە .

زۆرتـری بـەئاباداـن دەدا و وا بیریـدەکردەوە ئەگـەر ئـەو شانـدە بـچێتە ئەویٚ تەواوی خەڵك شکاتیان لێدەکات و ئەوەیش بۆ ئـەوان هـیچ بـاش نـەبوو. کاتێـك ئـەو شـاندە هاتنــە ئابـادان چـەند کەسـێکی حیزبـی توودەشـیان لەگـەڵ خۆیـان هێنـابوو. بـەڕای مـن ئـەو کـارە هەڵـە بـوو دەبوایە هەرخۆیان بەتـەنیا بچوونایە لێکۆڵینـەوەی خۆیـان بکردایـەو ڕاستیی ڕووداوەکانیان پەیدا بکردایە. سیٚ عەرەبانەمان بەکریٚ گرت و پازدەکەس لەکرێکارە شارەزا و ناسـراوەکانمان لەگـەڵیان نـارد. خۆیـشم لەئادان بووم. ئـەوان چـوون و لـەلای نوێنـەرانی سـەندیکای جیهانی و دەوڵەت شکاتیان کردبوو کە سەندیکای ئێران ناهێڵێـت ئێمە بە ئازادی لێکۆڵینەوە لەبارەی بابەتەکـە بکـەین. هـاتن بـۆ لای مـن و وتم: هیـوام وایـە ئـەوان بتـوانن بـەئازادی لـەو بارەیـەوە لێکۆڵینــەوە بکـەن بـەڵام بۆچـی حیزبـی توودەیـان لەگـەڵ خۆیـان هێنـاوە؟ ئەگـەر دەیانــەوێت بەئازادی لێکۆڵینەوە بکەن ئەوە دەبێت نوێنەرەکانی حیزبی توودەیان لەگەڵ نەبێت. کرێکارەکـان دەڵـێن ئـەوان دەسـتیان بـە خـوێنی خـەڵك سـوور بـووەو خــەڵکیان ئـازارداوە، ئازادییـەکانی خــەڵکیان بەرتەسـك کـردووە و خـەڵك لـە دەسـتیان ڕازی نیـە. هیـچکەس لـە بەرژەوەنـدیی حیزبی توودە قسەی نـەکرد. شـاندی نـاوبراو هـات بـۆ وەزارەتـی کـارو لەگـەڵ چەندکەسـێك لـە ئێمـە قـسەی کـرد. ئـەو کەسـانەی کـە لـە شـەڕەکەی حیزبـی تـوودە لەگـەڵ عەشـایردا کەسـێکیان کوژرابـوو یـان کەمئەنــدام بووبــوون هــەموویان لەبــەر دەرگــای وەزارەتــی کــار کۆببوونەوە و دەیانوت حیزبی توودە پارەیەکی زۆری بـەناوی ئێمـەوە کۆکردووەتــەوەو هیچیــشی بــە ئێمــە نــەداوە. خۆشەویــستەکانمان

لەدەستداوە و دلگران و برسی. بیستوومانە ئێوە هاتوون، هاتین بەڵکو ئێوە فریامان بکەون. لەوەزارەتی کار چەند پرسیارێکیان لەئێمە کرد. ئێمە وەڵاممان دایەوەو دوای ئەوە لەبەرپرسی فەرمانگەی کار کە ناوی لوتفی بوو راستیی قسەکانی ئێمەیان دەپرسی. ئەوەی کە توودەییەکان ئازادییان لە خەڵکی ئێران سەندووەتەوە بەتەواوی وردەکارییەکانی بۆم باسکرد.

**بۆریسۆف** نوێنەری سەندیکای جیهانی لە رووسیاوە نەختێکیش دەشەلی، پێیوتم: وەرە لای من دانیشە و قسەکانم بۆ تەرجەمە بکە. کەسێکی لێبوو بەناوی **شەعبان**، روسی باش دەزانی، وتم شەعبان قسەکانت بۆ تەرجەمە دەکات. وتی نا، پێمخۆشە تۆ تەرجەمەی بکەیت. وتم ئەگەر مەبەستت تەرجۆمەیە ئەو لە من باشتر دەزانێ. بۆریسۆف بەدانیشتنەوە کورسییەکەی خۆی راکێشا بۆ لای من و وتی: رابردوو، رابردوو بوو، لەداهاتوویشدا پێکەوە کار دەکەین. وتم هاورێ بۆریسۆف ئێمە زیاتر گرنگی بەرابردوو دەدەین. بەڵام ئێوە رابردوو لەبەرچاو ناگرن و پێکەوە کار دەکەن.

بۆ سەندیکای جیهانی سەلمێنرا کە ئەمانە (شورای یەکگرتوو) کەسانێکی وەرسکەر بوون و سەرکوت کراون. بەڵام دەوڵەت زۆر نیگەران بوو. چەندجار لەلایەنی دەوڵەتی قەوامەوە پێوەندییان لەگەڵ گرتم. هەم راستەوخۆ پێوەندییان لەگەڵ گرتم و چەندجارێکیش شەریف ئیمامیان نارد بۆ لام کە لەگەڵ ئێسکیدا یەکبگرین هەر شتێکیشمان پێویست بێ قەوام بۆمانی دابین دەکات، بەڵێنی نوێنەرایەتیی پەرلەمانیشیان پێداین. زۆر نیگەران بوون و

هەموو شتێکیان دەکرد بۆ ئەوەی ئێمە دژ بەدەوڵەت قسە نەکەین نەیاندەزانی من هەموو ڕاستییەکان باس دەکەم. بەشاندەکەی ئەلعەریسم وت: دەوڵەت، دەوڵەتی دیکتاتۆرییە. دیموکرات نییە. سەردەمانێك لەگەڵ توودەییەکاندا دەستیان تێکەڵ کردوو ئێمەیان تاڵانکرد. ئێستاش یەکترین تاڵان دەکەن. هیچ شتێك نەگۆڕاوە بەس تەنها ئەوە نەبێت ئێمە هیچ شتێکمان نییە هەتا تاڵانی بکەن. نۆفیسەکەیان پێ داخستین، ژێربەژێر کار دەکەین و خۆیشمان نانوێنین.

لەکۆتاییدا ئەو شاندە بەو قەناعەتە گەیشتن کە حیزبی توودە هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکدا باش نەبووە. حیزبێکی ئازادیخواز دەبێت دژ بەدەوڵەت بوایە، نەك لەگەڵ دەوڵەت دەست تێکەڵ بکەن و ڕێکخراوە کرێکارییەکانی دیکە تاڵان بکەن. شاندەکەی **ئەلعەریس** کاری تەواو بوو، هەوا زۆر گەرم بوو. کاتێك سواری سەیارە بوون، ئەو تاقمەی کە پێشتر باسم کرد و زەرەرمەند ببوون لە شەڕی حیزبی توودە لەگەڵ عەشایردا چوونە ژێری سەیارەکان و وتیان هەتا وەڵامی داواکارییەکانی ئێمە نەدەنەوە لێرە ناڕۆین. کۆمەڵێك لە ئێمە کوژراون بەناوی ئێمەوە ئەو هەموو پارەیان کۆکردۆتەوەو قەرانێکیشیان بەئێمە نەداوە، ئێوە هاتوون بۆ چارەسەری ئەو مەسەلەیە، بۆ کوێ دەڕۆن؟ چیتان بۆ ئێمە کردووە؟ قسەتان کردوو چای و ئاوی سارتان خواردوەتەوەو هاتوونەتە دەرەوە. بۆریسۆف لەگەرمادا خەریکبوو دابووراوە. وتی: بەمانە بڵێن بچنە ئەولاوەو ڕێگاکە بەردەن. وتم خۆ ئەوان بەقسەی من ناکەن. دەڵێن لێکۆڵینەوە

لە کێشەکەی ئێمە بکەن. پێی وتم ئەمانە تۆ هێناوتن بۆ ئێرە و هانیانت داون و ئەم شتانەت فێر کردوون. وتم بەڕێز بۆریسۆف لەسەداسەد قسەکانت هەمووی ڕاستە. بەوانم وت ڕۆژتائێوارە دێن و من بێزار دەکەن، ئێستا نوێنەرەکانی ئێمە هاتوون و داوای یارمەتی لەوان دەکەین. ئێستا بابزانین ئەمانە ڕاست دەکەن یان درۆ؟ دەڵێن حیزبی توودە پارەیەکی کۆکردۆتەوە و خواردویەتی. ئێستا ئێمە ئەو پارەیەمانان دەوێتەوە. بۆریسۆف وتی: پێیان بڵێ ڕێگاکە بەردەن خەریکە دەمرم. بڕوا بکە بەسودی ئەوان کار دەکەین. وتم هاوڕێیان هەستن وەرن بۆ سەندیکا. ئێمە بەو دۆخەمانەوە یارمەتیتان دەکەین، ئەمانە یارمەتی کەس ناکەن. هەستان و ڕۆیشتن و بۆریسۆفیش ڕۆیشت. دەوڵەتیش ئەرخەیان بوو کە دەتوانێت هەرکارێك پێی خۆشبێت بیکات. بەسەرهاتی سەندیکای جیهانی بەو شێوەیە کۆتایی پێهات. لە ڕاستیدا کرێکارەکان تەنها توانیان قسەو داواکارییەکانی خۆیان باس بکەن. هیچ دەستکەوتێکیشمان نەبوو. نەبەسوودی ئێمە و نە حیزبی توودە و نەدەوڵەت بوو. هیچیان نەکرد چوار کەس هاتن سەفەرێکیان کرد و ڕۆیشتنەوە. کاتێك لە ئابادانەوە گەڕانەوە بۆ تاران لە هۆتێل دەربەند مانەوە و منیش چووم بۆ لایان و بەوردی شتەکانم بۆ باسکردن و وتم ئەوە دەوڵەت نیە بەر بە ئازادی دەگرێت. لەڕاستیدا ئەوە ئازادیخوازەکانن دەوڵەت هاندەدەن بۆ بەرتەسك کردنی ئازادییەکانی خەڵك. ئەگەر ئێوە بەڕاستی دەتانەوێت لەئێران ئازادی بێت ئەوە دەبێت داوا لەئازادی خوازەکان بکەن بەر بەئازادی نەگرن. بارودۆخی ئازەربایجان لەدوای هەرەسهێنانی پیشەوەری لەدوای

هەرەسهێنانی پیشەوەری دووبارە ئێمە هەناسەیەکمان بەئازادی هەڵمژی، بەنیازبووین رێکخراوەکەمان ئاشکرا بکەین هەربۆیە هاتم بۆ تاران هەتا وردەوردە کرێکارەکان رێك بخەم و دەست بەکار بکەین. چووم بۆ وەزارەتی کار، سەیرمکرد منیان خانەنشین کردووە. بەپێی ئەوەی ئیزنیشم وەرگرتبوو، بەهۆی دیارنەمانی دوورو درێژەوە منیان خانەنشین کردبوو.

ئەمەیش بۆمان هەلێك بوو بۆ ئەوەی بتوانم بۆ پارێزگاکانی دیکە سەفەر بکەم. چووم بۆ تەورێز و لەگەڵ کۆمەڵێکدا کە خەڵکی ئازەربایجان بوون چووین بۆ لای شا و داوامانکرد کە سادقی کە جێگری پارێزگارە نەیکەن بەپارێزگار و کەسێکی دیکە بنێرن بۆ ئەو پۆستە. لەبەرئەوەی سادقی لەگەڵ قەواموڵسەلتەنەدا نێوانیان خۆش بوو ئێمەیش نەماندەویست پیاوی قەوام دیسان بەسەرماندا حوکم بکات. شا قەبوڵی کردو و وتی: چارەسەری دەکەین. لەجێگای ئەو مەنسوورولمۆلکیان کرد بەپارێزگاری ئازەربایجان. لەحاڵێکدا سادقی چەندقات لەو باشتر بوو. سادەقی پیاوێکی باش بوو بەس ئەوەی بوو ئەگەڵ قەوام دا دۆستایەتییان بوو. بەڵام مەنسور پیاوێکی گومانـاوی بوو. جارێکیش لەسەر بەرتیل وەرگرتن خرابووە زیندانەوە. چووم بۆ تەورێز سەیرمکرد بارودۆخەکە زۆر نالەبارە. گرووپەکەی پیشەوەری کۆمەڵێکیان لەژێرناوی دواکەوتوو لەسێدارە دابوو کۆمەڵێکیش بەدەستی دەوڵەت بەهۆی شۆڕشگێڕییەوە لەناو برابوون. لەم ناوەدا پیشەوەری و هاورێکانی هیچ زیانێکیان بەرنەکەوتبوو. تەنانەت دوکتۆر جاوید کە پارێزگاری دەوڵەتی پیشەوەری بوو بەئازادی

دەستوورپایەوە بەڵام خەڵکانێکی بێتاوان لەسەر هیچ کوژرابوون

من هەر چوومە تەوریز، کەوتمە ژێر چاودێرییەوە. دوو کەس لێکۆڵەر هەموو کاتێک لەگەڵمدا بوون. ئەوان جلەکانیان دیاربوو خەڵك دەیانزانی کە پۆلیس چاودێریم دەکات. چووم بۆ لای دانیشوەر سەرۆکی پۆلیس. وامدەزانی ئێستا ئەو حاشا دەکات کە پۆلیس چاودێریم دەکات. وتم جەناب ئێوە چەند کەسێکتان خستووەتە شوێنی من و لەهەر شوێنێك قسە بۆ خەڵك دەکەم ئەوان گوێ لە قسەکانم دەگرن. ئەمە حەیاچوونە، ئەم کارەتان بۆ کردووە؟ وتی: پێیان دەڵێم زۆر نزیکت نەکەونەوە. چەند رۆژێك تێپەڕ بوو پۆلیسێك هات و وتی: سەرۆك بانگهێشتی کردوویت. رۆیشتم لێی پرسیم: بۆچی سەیارەت کڕیوە. منیش نە پارەم بوو نە سەیارە. ویستم نەختێك گاڵتەی لەگەڵ بکەم. وتم: باشە بۆ سەیارە نەکڕم. خۆ منیش مرۆڤم. مەگەر ئێوە سەیارەتان نیە؟ وتی: هەمە، بەس بۆچی تۆ جێبت کڕیوە؟ وتم سەرۆك من نە جێبم کڕیوەو، نە جێبیشم هەیە، ئەگەریش بمبێت داومە بە پۆلیس. ئێوە بڕۆن وەریبگرن بۆ خۆتان و بەکاری بێنن. هاتمە دەرەوەو چەند رۆژ دواتر دیسان بانگهێشتیان کردمەوە. چووم پێیان وتم چۆن حاشات لەوە کردووە بەڵگەمان هەیە. وتم چ بەڵگەیەکتان هەیە؟ وتیان ئێمە پرسیارمان لەکۆمپانیاکە کردووە وتوویانە ئێمە سەیارەمان فرۆشتووە بە یووسف ئیفتیخاری. دیسان نەختێك گاڵتەم لەگەڵ کرد و وتم سەرۆك سەرۆك ئێوە هەڵە دەکەن سەیارەی جێبم نەکڕیوە و کۆمپانیاکەش هەڵە دەکات. وتی شتی وا چۆن دەبێت. من دەزانم هەڵەکەیان لەکوێدایە.

یووسف ئیفتیخارییەك بوو كە خەڵكی مەراغە بوو زۆر دەوڵەمەند بوو، ئەوە سەیارەی لەویّ كرِی بوو. ئەوان بەرۆكی منیان گرت بوو. پێیانم وت بچن بەرۆكی ئەو بگرن و چیدی من وەڕس مەكەن.

ڕۆژێكیان بۆ یەكێك لە هاوڕێیانمان كە دەیویست بچێت بۆ تاران كۆڕێكمان گرتبوو، وتیان پۆلیسەكان ماڵەكەیان گەمارۆ داوە. لەنێو ئێمەدا كەسێكی سەربازی لێبوو. وتم ئەمە دەرباز بكەن و دواتر دەرگاكەیان بۆ بكەنەوە. لەناكاودا هاتنە ژوورەوە. من بەسەرۆكەكەیانم وت كاتێك كە دوژمن دێت ئێوە جلی ژنانە دەكەنە بەرتان و هەڵدێن ئێستا كە دوژمن نەماوە پەلاماری ئێمە دەدەن. مانای چیە؟ چیتان ئەویّ؟ دواتر بۆمان دەركەوت ڕاپۆرتیان لێداوین و ئەو كەسەیش یەكێك لەئەندامانی كۆنی حیزبی توودە بوو. وتبوویان كە ئەمانە دەیانەوێت كۆمار دروست بكەن. پۆلیس و ئاسایشیش ترسابوون كە نەكا ئێمە چەكوچۆڵمان پێبێت. لەدوای ماوەیەك پۆلیسەكان ڕۆیشتن. بارودۆخەكە ئاوا بوو. خەڵكیان تاڵاندەكرد بەو هۆیەوە كە تۆ لەگەڵ پیشەوەریدا هاوكاریت كردووە. بارودۆخەكە زۆر نالەبار بوو وای لێهات ئەوانەی كە ڤینیان لەپیشەوەری بوو دەیانوت وەك شتیّ ئەو باشتربوو لەمانە. چووم بۆ لای مەنسورو ڕووداوەكانم بۆ باسكرد. وتم خەڵكی ئازەربایجان لە ئێوە ڕازی نین هەموو ئازادییەكانتان لە ناو بردووە ئەم باردودۆخە هیچ باش نیە. ئێمە لەگەڵ سۆڤیەتدا دراوسێین. ئەگەر بێت و خەڵكی ئەویّ بەختەوەرتر بن ئەوە بە دڵنیاییەوە خەڵكی ئێرە بەلای ئەواندا دەچن. ئێوە ئەو كارە مەكەن. وتی من هەمووی ئەو شتانە بەدرۆ دەخەوە، ئەمە دوورە

لەڕاستییەوە. ئێمە زۆر یارمەتیی خەڵك دەدەین.

دوای ئەوە وردە وردە دەچووم بۆ کارگەکان و سەردانی هاوڕێکانم دەکرد. ئێمە لەتەواوی ئەو کاتانەی کە پیشەوەری لەسەر حوکم بوو بەشێوەی نهێنی ڕێکخراوەکەمان پاراستبوو تەنانەت یەکێك لە هاوڕێیانیشمان بووبوو بەئەندامی پەرلەمان. دوای ئەوەی کە پیشەوەری هەڵهات، ئەویان دەستبەسەر کرد، ناوی حەسەن زەفیری بوو. سەرۆکی چاپخانەی ئیتلاعات بوو، ئەو چاپخانەیە هیی خۆی بوو. چووم بۆ لای بەڕێز مەمەقانی بۆ ئەوەی ئازادی بکەن. وتم ئەو سەر بە تاقمەکەی پیشەوەری نەبووە و بەئاگاداریی ئێمە چووەتە ئەو شوێنە و ئێمە ویستوومانە لەوێ بێت.

هەرچەندە کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێیانمان بەدەستی پیشەوەری تارێندرابوون بەڵام هێشتا ڕێکخراوەکەمان گرو تینێکی مابوو. من سەردانی زۆرێك لە کارگەکانم دەکرد. سەرۆکی فەرمانگەی کار ئەندازیارێکی ئازەربایجانی بوو. ئەو کارگەکانی ڕاسپاردبوو کە ڕێگا بە یووسف ئیفتیخاری مەدەن، منیش دژ بە ئەو بەکرێکارەکانم وتبوو زۆر بەگەرمی پێشوازیی لێبکەن. لەحاڵێکدا من لەژیانمدا کاری وامنەکردبوو ئەو کارانەشم پێخۆش نەبوو. تەنانەت لە خۆپیشاندانەکانیشدا نەدەچومە ڕیزی پێشەوە، بۆئەوەی بەناوی منەوە تەواو نەبێت. لەڕاستیشدا من قەت کاری وامنەکرد و هەمووکاتێك وەکو کرێکارێك خۆم نیشاندەدا. من هیچ کاتێك بەتەنیایی کارم نەکردووە و هەمیشە لەگەڵ خەڵکدا بووم. دەچووم بۆ هەر کارگەیەك کرێکارەکان دەستیان لەکارەکەیان هەڵدەگرت و دەهاتن

بـۆ پێـشوازیی مـن. پـۆلیس و پارێزگـا و سـوپا کـە سـەرۆکەکەی سەرلەشـکەر شـابەختی بـوو (پێـشتر بـەهۆی ئـەوەی لـە شـەقامی ئیستەخر ئێمە ماڵەکەیمان بەکرێ گرتبوو دەمناسی) لەو بابەتە زۆر ترسابوون و زۆرتر لەمپەریان دەخستە سەر رێگای ئێمە.

## گەڕانەوە بۆ تاران

لەتەورێزەوە گەڕامەوە بۆ تاران، هەرکە گەیشتمە ناو شار، هاتن و وتیان سەرلەشکەر رەزم ئارا، سەرۆکی ئەرکان بانگهێشتی کردوویت. چووم سەیرمکرد یەکێك لە بەڕێوەبەرەگشتییەکانی وەزارەتی کار بەناوی بەڕێز ئاشتیانی لەلای دانیشتووە. رەزم ئارا لەڕواڵەتدا پیاوێکی زۆر بـەڕێزو ئـەرمونیان بـوو. پێـی وتم زۆر حەزمـدەکرد تـۆ ببیـنم پێکەوە ئاشنا بین. وتی مەسـەلەیەك هەیـە کەجـەنابتی وەرسـکردووە. دەمەوێت ئەو مەسەلەیە نەمێنێن. وتم مەسـەلەی چی؟ وتـی گـەیلان شا بەدەستی جەنابتەوە تووڕەیە. منـیش گـەیلان شـام نەدەناسـی. وتم گەیلان شـا کێیـە و بۆچی لـەمن تووڕەیـە؟ وتـی گـەیلان شـا سـەرۆکی ئەرکانە. وتم: من سەربازیم نەکردووە و نـازانم ئـەرکان مانـای چیە و کـاری چـیە؟ وتـی کـاری لێکۆڵینەوەیـە، وتم یـانی سـیخوڕە؟ وتم هـەرکاتێك ئـەو لـە مـن رازی بـوو ئـەوە مـن خـۆم دەکـوژم و وتـی مـن مەبەستێکی خراپم نەبووە، ویستم کێشەیەك بۆ ئێوە دروست نـەبێت و هەتا سـەر جادەکە بـەڕێی کـردم. دواتـر بـۆم دەرکـەوت دەوڵـەت لـە سـەفەرکردنەکانی مـن زۆر ترسـاوە و سـەرۆکی پۆلیـسیش لـە راپۆرتەکەیدا وتویەتی من سەفەر کردنەکانی فلاّن کەسـم زۆر بـەلاوە

ناخۆشە. سەرۆکی پۆلیس ئەوکات سەفاری بوو. ڕۆژێکیان چووم بۆلای ساعد، لەناو قسەکردنەکانی دا وتی نێوە لەوەزارەتی کاردا کارتاندەکرد، ئێستا بۆچی لەوێ نەماوی؟ وتم لەوێ خانەنشین کراوم. وتم من چوو بووم بۆ ئابادان مۆڵەتیشم کردبوو بەڵام بەهۆی ئەوەی زۆرم پێچوو لەسەر کارەکەم لایان دام و ئێستا کاری حکومیم نیە. وتی من ئێستا نوسراوەیەکت بۆ دەنووسم، بچۆ بۆلای فروهەر وەزیری کارو خەریکی کار بە. وتم: نا فروهەر بانگهێشت بکە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی بزانین لەسەر کارلادانی من هۆیەکەی چی بووە؟ لەبەرئەوەی من مۆڵەتم وەرگرتبوو بۆ هەر کوێ پێم خۆشبێ سەفەر دەکەم. وتی: بەیانی نیوەڕۆ وەرە بۆ ئێرە، ئەویش بانگهێشت دەکەم و پێکەوە قسە دەکەین. بەیانی بۆ نیوەڕۆکەی ڕۆیشتمەوە. ساعێد پێی وتم فروهەر هات بۆ ئێرەو زۆر گلەیی لەجەنابت هەبووە. وتم بۆچی؟ وتی: پێی وتوم من و یووسف ئیفتخاری پێکەوە هاوڕێین و لە پاریسیشەوە پێکەوە هاتوینەتەوە. تەنانەت وابڕیاربوو بڕۆین بۆ لای شا و لەبارەی داهاتووی ئێرانەوە پێکەوە قسەوباس بکەین. بۆچی نەهاتووە بۆلای خۆم و هاتووە بۆلای تۆ؟ ساعێدیش پێی وتبوو فلان کەس بۆ کارێکی دیکە هاتووە بۆ لای من نەك بۆ ئەو قسانە. چووم بۆ لای بەڕێز فروهەر، دیسان گلەیی کرد کە من و تۆ پێکەوە دۆست و برادەرین، فەرمانیکرد دیسان من دام بمەزرێننەوە، هەڵبەت فروهەر فەرمانی ئەوەی نەکردبوو من لەسەر کار لابدەن، ئارامش ئەو فەرمانەی دەرکردبوو.

## ڕەزم ئارا و سووالکەرەکانی ئامین ئاباد

رەزمەم ئارا لەسەردەمی سەرۆکایەتیی خۆیدا فەرمانی دەرکردبوو کەسوالکەرەکان کۆ بکەنەوەو مووچەیەکی لەسەر زیادەی نرخی بەنزین بۆ دیاری کردبوون. بەلام سووالکەر بیانوو بوو. بەو پارەیە دەیویست دڵی مەلاکانی قوم بەدەست بهێنێت. ڕۆژێکیان فروهەر منی بانگکرد و وتی بەڕێز ئیفتیخاری دەمەوێت کارێکت پێ بسپێرم بەلام لەڕووم نایەت. وتم کاری چی. وتی دەمەوێت بچین بۆ ئەمین ئاباد و سەرپەرشتی ئەو سوالکەرانە بکەیت کە لەوێ کۆمانکردونەتەوە. وتم بەسەرچاو دەڕۆم.

ئەو ناوەندیان ناونابوو هاوکاری. چووم و سەیرمکرد کۆمەڵێک ئاسایشی بەسەرپەرشتی ئەفسەرێك بەناوی کاشانی لەوێن. تەنها شتێك کەلەوێ نەبوو "هاریکاری" بوو. سوالکەرەکانیان ئەشکەنجە دەداو بێرێزیان بەرامبەر دەکردن. گەڕامەوە بۆ فەرمانگە. فروهەر وتی چوویت؟ وتم چووم بەس نەچووم بۆ بنکەی هاریکاری. چووم بۆ شوێنێك کەئەشکەنجە و ئازار بوو. وتی چی بووە؟ دۆخەکەم بۆ باسکرد. تەلەفۆنی کرد بۆ ئاسایش و پێیانی وت ئەبێت ئاسایشەکانیش بە فەرمانی ئێفخاری بجولێنەوە و ئەو بەرپرسی ئەوێیە. گەڕامەوە بۆ ئەوێ. کاشانی هات و زۆر بەتوندی قسەی لەگەڵ کردم و وتی بەڕێز ئیفتیخاری بیستوومە تۆ کۆمۆنیستی. دوای ئەوەی کە زانی ئەو هەڕەشەو گوڕەشە سوودی نیە ڕاستەوخۆ داوای بەرتیلی لێکردم. دەیوت ئەگەر لەم سولکەرانە نەدەم ئەوە خۆ پارە نادەن.

بەس لەوانە دەدەم کە خانوو پارەی چاکیان هەیە لە هەژارەکان نادەم. وتم بەڕێز کاشانی شا خۆیشی دەزانێ کە من کۆمۆنیستم. هەموو کەسێك دەزانێ. بەڵام لێرە قسە لەسەر کۆمۆنیستەوە نیە. قسە لەسەر ئەوەیە ئێمە کۆمەڵێکمان لەژێر ناوی ئەوەی کە یارمەتیان دەکەین لێرە کۆکردوەتەوە بەڵام ئێوە لێیان دەدەن. دەبێ لێرە بڕۆیت. لەکۆتاییدا کاشانییان لەوێ برد و جێگرەکەی لەوێ مایەوە لەژێر چاودێری من دا.

ڕۆژێك ئاگاداریان کردم کە ڕەزم ئارا بەنیازە بێت بۆ ئەوێ و چاوی بەسواڵکەرەکان بکەوێت.

منیان ئاگادارکردەوە کە رەزم ئارا دێت بۆ هەرەوەزگە و دەیهەوێ سواڵکەرەکان ببینێ. فەرمانیان پێکردین کە شەو لەوێ بخەون. لەبەرئەوە لەوانەیە رەزم ئارا بەیانی زوو بگاتە ئەوێ. من شەو لەوێ نەمامەوە. بەیانیش ئاوڕشێنی ئەوێم نەکرد. بەیانی خەریکی پیاسە بووم لەناو باخەکەدا. ڕەزم ئارا هات و منی بینی. زۆر زیرەك بوو منی ناسییەوەو وتی بەڕێز ئیفتیخاری ئێوەش لێرەن؟

وتم بەڵێ من لێرە کار دەکەم، وتی فەرمانم کردبوو ئەم جادەیە ئاوڕشێن بکرێت، ئەی بۆچی ئەوەتان نەکردووە؟ وتم: با جەنابت بێیت و وەکو ئێمە تەپوتۆزاوی بیت. هەموو کاتێك ئێمە، جارێکیش ئێوە. وتی: ئەڵێم بۆتان چاك بکەن. پیاوێکی تێکۆشەربوو ڕۆیشت و دوو ڕۆژ دوای ئەوە دەستیانکرد بە چاککردنی جادەکە.

## دواگوتە

براکانم سۆشیالست بوون. منیش لەژێر دەستی ئەوان وەکو بەردەست وابووم. نەك ئەوەی خۆم رای خۆم دەربڕم. کاتێك چووم بۆ سۆڤیەت و سەیرمکرد لەباری مادییەوە بارودۆخیان باش نیە بەڵام خەڵکەکەی پێکەوە جیاوازییان نیە و ئەوە بەلامەوە زۆر دڵخۆشکەر بوو. لەوێ دەرسم خوێند و دواتر بەفەرمانی پرۆفینتێرن چووم بۆ ئابادان.

مانگرتنەکەی ئێمە لەوێ زۆرتر بەهۆی سەفەرەکەی سێرجان کێدمەوە بەرپرسی کۆمپانیای نەوت بۆ درێژکردنەوە ماوەی گرێبەستەکە بوو. ئەگەر ئەو مەسەلەیە نەبوایە ئێمە مانمان نەدەگرت. لەبەرئەوەی ئێمە بۆ بەهێزکردنی رێکخراوەکەمان بەنهێنی کارمان دەکرد. بەڵام ئەو مەسەلەیە ناچاری کردین زۆر زوو خۆمان ئاشکرا بکەین.

تەواوی ئەو قۆناخانەی کە تێپەڕم کرد هەم لایەنی سەندیکایی بوو هەم لایەنی نەتەوەیی. هەردوو لایەنم لەبەرچاوگرتبوو. هیچ کاتێك لەگەڵ بیانیەکاندا نێوانم خۆش نەبووە. ئەوە ئینگلیزەکان بوون، مانمان گرتبوو رقیان لەئێمە دەبووەوە. ئەوەیش رووسەکان بوون بەهۆی ئەوەی دژی ئستالین بووین، لەگەڵ ئێمەدا دوژمنایەتیان هەبوو. ستالین دیکتاتۆر و پیاوکوژ بوو. لەڕاستیدا سۆڤیەتش ئەنجومەنی نەبوو. لەوێش وەکو مەشروتەی لای ئێمە بەس ناوەکەی مابوو. لە ئێرانیش جگە لەو سەندیکای کە باسمان لێکرد، لە هیچ رێکخراوێك و حیزبێکی دیکەدا ئەندام نەبووم. هەموو کاتێك لایەنی مرۆڤی و نەتەوەییم لەبەرچاودەگرت و بەپێی ئەوە دەجووڵامەوە.

# پاری دووەم
# نووسراوەکان

# بەشی یەکەم
# پێشینەی بزووتنەوە

## کورتەمێژووی ڕاپەڕینی کرێکاری لە ئێراندا

ڕاپەڕینی ڕاستەقینەی کرێکارانی ئێران لەساڵی ١٩٢٠ ز دەستی پێکرد. تا ئەو کاتەی هەرچەندە کرێکارانی ئێران لەلایەن خاوەکارانی ناوخۆی و دەرەکی بەدڕندانەترین شێوە دەچەوسانەوە، هەرچەندە ڕۆژی زێتر لە ١٢ کاتژمێر کاریان دەکرد، لە تەواوەتی مافەکانی ژیانی مرۆڤی بێبەش بوون.

بەهۆی بێ ئاگای لەسەندیکا و کرێکاری و نەبوونی ڕێکخراوەیەکی ڕێکوپێکی کرێکاری دەخوازییەك لەبەرامبەر پاڵەپەستۆیەك و گوشاری خاوەنکارەکان لەوان بەدینەکرا.

لەساڵی ١٩٢٠ کە کرێکارەکان **بادکووبە** بەهۆی ڕاپەڕینی مەدەنی لەژێر ستەم و زۆری دەوڵەتی تێزاری سۆڤیەت و خاوەنکارەکان خۆیان دەربازکرد، کۆمەڵێك لەو ئێرانیانەی کە دانیشتووی **بادکووبە** بوون و لەو ڕاپەڕینەدا بەشداری بەرچاویان هەبوو گەڕانەوە بۆ ئێران و

ڕێکخراوەیـەکی بـەربلاویان پێـك هێنـا کـەبوو بـەهۆی ڕاپەڕینەکـەی گیلان. سەرەکی خەبات کارەکانی گیلان بەرێبـەری **حەیدەر عەمو و ئـۆغلی** دەرکردنـی هێـزە داگیرکـەرەکانی ئینگلیـز لـە ئێـران و دەسـتەبەرکردنی ئـازادی بـوو. لەوسـەردەمەدا ئێـران داگیرکرابـوو و نوێنـەرانی ئـەو ولاتـە لەهـەموو کـار و بـارێکی حکومیـدا دەسـتیان وەردەدا.

ڕاپـەڕینی گـیلان گۆڕانکارییـەکی تـەواوی لەسـەر چـۆنیەتیی بیرکردنەوەی کرێکاران دروستکردبوو، ئەوان بەنیاز بوون ڕێکخراوێکی ڕاسـتەقینەی کرێکـاری بەبەرنامـەو پرۆگرامێکـی پێـشکەوتوو دابمەزرێنن و خەباتەکەیان درێژە پێبدەن. هەر لەوساڵەدا لە بەندەری پەهلـەوی و ئازەربایجـان و تـاران سـەندیکای کرێکـاری پێکهـات. لـە بەنـدەری پەهلـەوی و تـاران، سـەندیکاکان نیـوە نهێنـی و لەئازەربایجانیش سەندیکاکە بەتەواوی نهێنی بـوو. دوای ماوەیـەك لـە خوزستان و مەشهەدیش کرێکارەکان خۆیان ڕێکخست.

دامەزرانـدنی ڕێکخراوە نهێنییـەکان و بلاوبونـەوەی نووسـراوەکان کە بانگهێشتی کرێکـارانی دەکـرد بـۆ خـەبات دژی چـینی دەسـتەلاتدار، دەسـتەلاتدارانی ترسـاندبوو و بـەنیازبوون دژی ئـەو ڕێکخـراوە کرێکارییانە بوەستنەوە.

گـرتن و هەڵداشـتن و کوشـتن لەلایـەن دەسـتەلاتدارانەوە دەسـتی پێکرد. لە **بەندەر پەهلەوی** و تاران **موحەممەد ئاخوندزادە** کە ڕێبەری ڕیکخراوی کرێکارانی بەندەر پەهلەوی و بوو گیرا و دوورخرایەوە.

لـە تـارانیش کۆمـەڵێکی زۆر لـە کرێکـاران و ڕێبـەرەکانیان

دەستبەسەر کران و تەنانەت بەڕێز حیجازی کە یەکێك لە ڕێبەرانی کرێکارانی چاپخانەکانی تاران بوو لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی بەختکرد.

تەواوی بەندیخانەکانی ئازەربایجان بەتایبەت قەلاَی ئەردەبیل پڕببوو لەوکرێکارو وەرزێرانەی کە بەبێ دادگایی و بەنایاسایی دەستبەسەرکرابوون. جێگای سەرنجە کە پیاوەکانی دەوڵەتی نەیاندەهێشت هیچ جۆرە خواردنێکیان پێبگات، چەند کەسێکی بێتاوان بەهۆی برسیەتییەوە لەوێ گیانیان لەدەستدا، شەوانە لەلایەن بەرپرسانی قەلاَی ئەردەبیلەوە دەیاننناشتن.

### سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی

پرۆگرامی کرێکارانی سەندیکای بەندەر پەهلەوی بەکورتی باسی لەباشتر کردنی بژیوی ژیانی کرێکاران دەکرد. زۆربەی کرێکارانی بەندەر پەهلەوی بەهۆی ئەوەی خاوەنکارێکی دیاریکراویان نەبوو هەستی خەباتی کرێکارییان زۆرلاواز بوو. ڕێبەرانی سەندیکاکە زۆربەی کاتەکەی خۆیان بۆ خێرکردن و ڕاهێنان و ئاشنا کردنی کرێکارەکان بەشێوازی خەباتی پیشەیی و چینایەتی دەکرد. وردە وردە کرێکارەکانیان تێگەیاند کە خاوەنکارەکان بەری ڕەنجی ئەرکەکانی ئێوە دەدزن و ئێوە لە هەموو مافێکی مرۆیی بێبەش دەکات و کاتێکیش داوای مافی خۆتان بکەن ئەوە بەیارمەتیی دەوڵەت ئێوە سەرکوت دەکات و لەناوتان دەبات. ئەگەر دەتانهەوێت لەتەواوی خۆشییەکانی ژیان بەهرەمەندبن دەبێ هەوڵبدەن دەستەلاَت بەدەستەوە بگرن و یاسایەکی وادابنێن کە دەستی سەرمایەدار کورت

بکەنــــەوە و خۆتـــان لـــەم نەهامەتیانـــە ڕزگـــار بکـــەن، تـــەواوی فێرکارییـــەکانی ڕێبـــەرە کرێکارییـــەکانی بەنـــدەر پەهلـــەوی لەســـەر بنەمای خەباتی چینایەتی و بەدەستهێنانی دەسـتەڵات و دامەزرانـدنی حکومەتی کرێکاری بوو. کرێکارەکان ئەو ڕێکخراوەیـان بـەناوی **سایۆز** دەناسـیەوە، ( **سـایۆز** لـە زمـانی ڕوسـیدا بـەمانای سـەندیکایە) هـیچ بنەمایەکی ڕێکخراوەیی تێدا نەبوو لەبەرئەوەی زۆربەی ئەندامـەکانی کۆڵبەر بوون و خـەڵکی لادێ بـوون و هیوایـەتیان گەڕانـەوە بـۆ لادێ و کاری وەرزێری بوو. هەر بۆیەش زۆر حەزیان لە کاری سەندیکا نـەبوو هەر ئەوەندە کە بڕێکی کـەم پارەیـان لـەژێر نـاوی مـافی ئەنـدامی دەدا بەســـەندیکا و لەکۆبوونەوەکانـــدا بەشـــدارییان دەکـــرد و تەنانـــەت کۆمەڵێکی کـەم لەکۆڵبـەرەکان ببـوون بەئەنـدامی سـەندیکا. کۆمـەڵێك لەو کەسانەی لەسەر لەسەر پاپۆڕەکـان کاریـان دەکـرد خۆیـان خـاوەنی بـــوون، بـــەهۆی ئـــەوەی خاوەنکاریـــان نـــەبوو، لەلایـــەن کەســـێکی دیـاریکراوەوە نەدەچەوسـانەوە، وەك کرێکـارێکی پیـشەیی پێشوازییان لەســـەندیکا نـــەدەکرد بـــەس تـــەنها لەبـــەر دەســـتکەوتە کاتیـــەکان لەسەندیکادا بەشدارییان دەکرد، کەسی دڵسۆزو چالاك لەنێویانـدا زۆر کەم بوو. کێشەی گەورەی سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی ئەوە بوو کە بـەهێز بـوون یـان لاوازییەکـەی پێوەنـدی بـەبازرگانی ئێـران و سـۆڤیەتوە بـوو. بـەو مانایـە کەئەگـەر هەرچـەند کەلوپـەلی زۆتـر بهاتایەتە ئێـران بـۆ داگـرتنی ئـەو کەلوپەلانـە پێویـستیان بـەکرێکاری زۆرتـــر هـــەبوو. بـــەهۆی ئـــەوەی ســـەرۆکەکانی ئارشـیل لەڕێبـــەرانی ســـەندیکا بـــوون، هـــەر بۆیـــەش ئـــەو کرێکـــارە نوێیانـــە لەبـــەر دڵـــی

سەرۆکەکانیان دەبوون بەئەندامی سەندیکا. کاتێك بازرگانی لەگەڵ سۆڤیەت کەم دەبووەوە، پێویستیان بەکرێکار نەدەما، ئەو کرێکارە نوێیانە کەبەگشتی خەڵکی لادێ بوون پێوەندیان لەگەڵ سەندیکا دەپچڕاو دەچوونەوە بۆ لادێکانی خۆیان.

رێبەری سیاسیی سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی بەڕێز ئاخووندزادە بوو کەلە دوای تاراندن و گرتن و کوشتنەکانی ساڵی ١٩٢٥ ز ئەویش دوور خرایەوە بۆ سۆڤیەت. بەڕێز جەمال زادە سەرۆکی سەندیکای پاپۆڕدارەکان و ئیبراهیم گۆگانی سەرۆکی سەندیکای کۆڵبەرەکان و زۆر یەك لەئەندامانی سەندیکاکانیان گیران و لەبەندەر پەهلەوی تارێندران. بەهۆی ئەوەی سەدیکای کرێکاری بەندەر پەهلەوی بنەڕەتێکی باشی نەبوو، هەر بۆیەش بەنەمانی ئەو سێ کەسە سەندیکاکە لەساڵی ١٩٢٣ ز دا هەڵوەشایەوە. لەدوای ئەوە چەندکەسێکی دی کە هەوڵی دووبارە دامەزراندنەوەی سەندیکاکەیان دا بەڵام بەداخەوە هیچ سوودی نەبوو.

لەو سەردەمەوە کەمرۆڤ هەوڵی خۆپاراستن و دابین کردنی بژیوی ژیان وەك خواردن و جلوبەرگی دەدا، بەهۆکار گەلێ جیاواز وردە وردە جیاوازی چینایەتی و پێکهێنانی عەشیرەت و بنەماڵە دەستی پێکردو بەو هۆیەشەوە شەڕگەلێکی گەورەو خوێناوی ڕوویان دەداو لەکۆتایدا دەوڵەتەکان دروست بوون و هەتا دەهات ئەو جیاوازییەی نێوان چینەکان زۆرتر دەبوو. بەهۆی ئاشنا بوونی خەڵك بە فەرهەنگ و هونەرو دامەزراندنی کارگەکان و ڕێگای ئاسن و دۆزینەوەو بەکارهێنانی کانگەکان و تەماع و خۆپەرستی خاوەن

سـەرمایەکان، زۆرینـەی خـەڵك کـە بریتیـب و لـەکرێکارو وەرزێـرو کارمەنـدو هونەرمەنـدو نووسـەر ژیانیـان پـەکی کـەوت بـوو بەدەسـتی سـەرمایەداران دەچەوسـانەوە، هەسـتیان بەپێویـستیی خۆرێکخـستن و خەبات دژی ئەو بارو دۆخە کرد هەر بـەو هۆیەشـەوە حـەزو ئـارەزوی چەوساوەکان بۆ دامەزراندن و بەشداریکردن لە سـەندیکا پیـشەییەکان ڕۆژ بەدوای ڕۆژ ڕووی لەزیادبوون دەکرد.

خەباتی پیشەیی و چینایەتی بەشێواز گـەلی جۆراو جـۆر بـووەو جاری وابووە لاوازیش بووە.

جـاری وابـووە ئـەو کەسـانەی کەچەوسـێندراونەتەوە بـەگریان و پاڕانـەوە داوای مـافی خۆیـان کـردووەو کـاتی واش هـەبوو بەچـەك و بـەدارو بەبـەرد فـافی خۆیـان وەرگرتـووەو ئـەو کەسـانەی کەلایـەنگرو پشتیوانی چینی سەرمایەدار بوون لەناویان بردوون.

لـە خـەباتی چـینایەتیدا هـەموو کاتێـك کرێکـارە پیـشەیەکان پێشڕەو بوون. چۆنیـەتی بیرکردنەوەو شێوازی خەباتی کرێکارانی نـاو کارگـە گـەورەکان وەك پالأوگـەی نـەوتی ئینگلیـز و ئێـران لەگـەڵ کرێکارێکی پێلاو دوور یان کۆڵبەرێك زۆر جیاوازیان هەیە. بۆ نموونـە کرێکـارێکی نـاو پالأوگـە زۆر زوو هەسـت بەسـتەم و زۆری خـاوەن سـەرمایەکان دەکـات، بـەهۆی ئـەوەی زۆر بـەڕوونی دەی بینێـت کەهاوڕێکانی ئەو بەو هەموو بەو هەموو چەرمە سەریەوە ئەو هەموو ساڵە چـەند سـەر خێزانیـان بـەداماوی و هەژاریـەوە بـەڕێوە بـردووەو لەپاش بیست سـاڵ بـەبیانوی پیری و نەخۆشینەوە لەسـەر کارەکـەیان دەریان دەکەن و تەنانـەت لـەو خـانوەش کـەپێیان داوە دەری دەکـەن و

ئەویش لەڕووی ناچاریەوە لەنێو شەقامەکانی شاردا وێڵ دەبێت و دەکەوێتە سوالکردن.

کرێکار بەجوانی دەی بینێت کە هاوڕێی ئەو بەهۆی کاری تاقەتپڕوکێنەوە گیانی لەدەستدەدات و لەدوای ئەو بنەماڵەکەی یان دەکەونە سوالکردن یان بەهۆی گرنگینەدان بە چارەنوسیان لەلایەن دەستەلأتدارانەوە دەکەونە دوای لەشفرۆشییەوە. بینینی ئەو هەمووە نەهامەتیە کرێکارانی پالأوگە هۆشیار دەکاتەوەو هەستی دووژمنی بەرامبەر بەچینی سەرمایەدار لەناو ناخیدا ئەبزوێنێت، ئەو ناچار دەکات بۆ دەربازبوون لەدەستی چینی چەوسێنەر دەست بداتە خەباتێکی نەپساوە دژبە سەرمایەداران و لەگەڵ هاوچینەکانی خۆیدا یەکبگرن و بۆ لەناوبردنی بەتێکڕایی خەبات بکەن. بەلأم ئەو کرێکارە پینەچییە کە بەردەوام لەگەڵ خاوەنکارەکەیدا پێوەندییان هەیە و زۆربەی کاتەکان لەسەر سفرەیەك پێکەوە نان دەخۆن لەهەمانکاتیشدا لە وەستاکەی فێری کار دەبێت و بەو هیوایەوە کەڕۆژێك ببێت بەوەستا لەو کارەداو بتوانێت کارگەیەکی بچکۆلەش بۆ خۆی دابنێت لەگەڵ دووژمنی چینایەتی خۆیدا کەمتر بەرەنگاری دەکات، جاری واش هەیە خاوەنکارەکەی بەباوك یان بەمامۆستا ناوزەد دەکات.

ئەم کرێکارە لەگەڵ خاوەنکارەکەی خۆیدا شەڕێکی ڕاستەقینە ناکات لەبەرئەوەی وابیر دەکاتەوە کەخۆیشی ڕۆژێك دێت کە ببێت بەخاوەنکارو سەرمایەدار. بەلأم شێوازی بیرکردنەوەی کرێکاری کۆمپانیای نەوت و کارگەی فۆردو هیتر جیاواز بوو لەگەڵ بەردەستی دارتاشی یان پینەچی.

کرێکاری کۆمپانیا دڵنیایە کەهیچ کاتێك نابێت بە سەرمایەدار بەڵکو بەچارەنووسی دڵتەزێنی کرێکارەکانی دیکەی کۆمپانیا دووچار دەبێت هەر بۆیە بڕوای وایە یان ئەبێت خاوەنکارەکەی خۆی لەناو بەرێت یان دەبێت چاوەڕێی ئەو چارەنووسەبێت.

هەروەها هەست و شێوازی بیرکردنەوەو تەنانەت شێوازی خەباتی کرێکاری کۆڵبەر کە جاری وایە کۆڵبەری دەکات و جاری واشە دەبێت بەکاسبکار لەگەڵ کرێکارێکی کارگەیەکی گەورە فەرق و جیاوازییەکی زۆری هەیە. ئەو کەسانەی کە سەردەمێك کۆڵبەرن، ماوەیەك دەستفرۆشی و هاوینیش خەریکی چەوەندەرفرۆشین، پرولیتریای ڕاستەقینەنین، ئەوانە لۆمپەنن جاری وایش هەیە کە دەبن بەلایەنگر و داردەستی سەرمایەدارو دژبە چینی کرێکار دەوەستنەوە. هەربۆیە ئەوجۆرە کرێکارانە نابنە پاڵپشتی سەندیکای کرێکاری. زۆربەی ئەندامانی سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی لەو چەشنە کرێکارانە بوون. هەروا کە پێشتر باسمانکرد هەر ئەوەیش هۆکارێکبوو کە سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی بنەڕەتێکی باش نەبوو نەرخی ڕێکخراوەیشی زۆر کەم بوو. هەرچەند سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی ئەندامەکانی کرێکاری پیشەیی نەبوون، بەڵام بەهۆی ڕێبەری و فێرکردنی دروستی بەڕێز ئاخوند زادە، زۆربەی ئەو کرێکارانە لەدوای گرتن و تاراندن و ئەشکەنجەیش لەسەر بیروباوەڕی خۆیان سوور بوون، بەشێك لەوان لەبەندیخانەیش وەك گیراوێکی سیاسی هەموو کاتێك دژ بە بەرپرسانی بەندیخانە دەوەستانەوە. بەڕێز بابا جەمال زادە و قەدری و عەلی لە ئەندامانی سەندیکای

بەندەر پەهلەوی کەلەساڵی ١٣١٠ی هەتاوی ( ١٩٣١ ز) بەتاوانی هەبوونی هەستی کرێکاری لە لایەن پۆلیسەوە دەستبەسەر کران و بۆ ماوەیەکی زۆر لەباردۆخێکی خراپدا لەگرتوخانەی قەسر مانەوە. ئەوان لەبەندیخانەدا رووت و برسی بوون و نەلەدەرەوەی بەندیخانەو نە لەلایەن گیراوە سیاسییەکانی دیکە کە لە ژیانیان باشتر بوو بەهیچ شێوازێکی یارمەتی نەدەدران. ئەم کرێکارانە بۆ یەك چرکەیش وازیان لەخەبات دژ بەپۆلیس و دام و دەزگای سەرکوت نەهێنا و لەسەختترین شەڕەکان دژ بەدەستەڵاتدارانی سەر بەڕۆکن، دین موختاری لەڕیزی گیراوە سیاسیەکاندا بوون.

عەلی کە زۆر گەنج بوو بەهۆی نەخۆشین و نەبوونی دەرمان و خواردنی باشەوە لەبەندیخانە گیانی بەختکرد بەڵام بەڕێز جەمال زادە و قەدیر لەدوای ڕزگار بوون لەدەستی پۆلیس دیسان گەڕانەوە بۆ نێو ڕێکخراوە کرێکارییەکان، جەمال زادە لەشاهی و قەدیریش لە بەندەر پەهلەوی دەستیاندایە چالاکی.

بەڕێز ئاخوند زادە ڕێبەرو بەدیهێنەری سەندیکای کرێکارانی بەندەر پەهلەوی لەهەموو کارێکی کەترسیدارو سەختدا خۆی پێشڕەو بوو بارو دۆخی ژیانیشی زۆر خراپتر بوو لەژیانی کرێکاران. بەڕێز ئاخوند زادە زۆربەی کاتەکان یان برسی بوو یان بەنانی وشك خۆی بەڕێوە دەبرد بەڵام بۆ ساتێکیش کاروکارێك کە وەئەستۆی بوو بەجێی نەدەهێشت. ئاخوندزادە بەپێچەوانەی ڕێبەرە ساختەکانەوە (شازدە و سەرمایەدارەکان) لە دوژمن نەدەترسا و لەهەموو قۆناغەکانی خەباتدا خۆی یەکەم هەنگاوی دەنا. هەر بەو هۆیەشەوە

زۆربەی کاتەکان یان لەبەندیخانە بوو یان لەژێر چاودێری پۆلیسدا ژیانی بەسەر دەبرد. هەر بۆیە بەڕێز لاهوتی لەو شیعرانەی بەبالآی ئاخووندزادەدا وتویەتی: تۆ مەگەر ئاشقی سجن و لێدان قامچیت؟ ئاخوندزادە لەگەڵ کرێکاراندا هەڵسوکەوتی دەکردو لەناو قاپێکدا لەگەڵ ئەوان نانی دەخوارد. زۆربەی شەوەکان لەماڵ ئەوان دەخەوت. کرێکارانی بەندەر پەهلەوی ئاخوندزادەیان خۆشدەویست. کاتێك کەدەستەلآتی کۆنەپەرستان زۆر ببوو ئازادی خوازانیان بێدەنگ دەکرد، کرێکارانی بەندەر پەهلەوی بەوپەڕی بوێریەوە ئاخوندزادەیان بۆ نوێنەری پەرلەمان کاندید کرد و بۆ دەرچوونی ئەو لە هەڵبژاردندا هەموو کارێکیان دەکرد. ئاخوندزادە بەتەنها رێبەری کرێکارانی بەندەر پەهلەوی نەبوو بەڵکو یەکێك رێبەرانی کرێکارانی ئێران بوو. ئەو پیاوێکی بەڕەحم و ساکار بوو. بەڕێز حاجی ڕەحیم قەزوینی ئاخوندزادەی لەگەڵ ڕازاشادا ئاشت کردەوەو پێیوت کە ڕەزاشا لایەنگری کۆماری و ئازادی و سەربەخۆییە. ئاخوندزادە ماوەیەکی کەم کاری لەگەڵ رەزاشا کرد و هیوادار بوو کە بەهۆی ڕەزاشاوە دەستەلآتی سەربازی بەدەست بگرێت و شۆڕشێکی بەربلآو بکات و بیرۆکەی خۆیشی بەرەزاشا ڕاگەیاندبوو. لەبەرئەوەی رەزا خان ئاگاداری بیرۆکەکەی ئاخوندزادە بوو دوای ئەوەی بەدەستەلآت گەیشت فەرمانی کرد ئەو بۆ دەرەوەی ولآت بتارێنن. هەرچەندە دەولەتی سۆڤیەت هەموو شتێکیان بۆ حەسانەوەی ئاخوندزادە ئامادە کردبوو. بەڕێز حاجی رەحیم قەزوینی، ئاخوندزادەی لە داماوی گیانبەختی بکات...

# بەشی دووەم
# مانگرتنی خووزستان
# کەمکردنەوەی مووچە

مەبەست لەکەمکردنـەوەی مووچـە ( بێـدەنگ) ئـەوە بـوو کـە بەشـێوازێك مووچـەی کرێکـاران کـەم بکەنـەوە کەئـەوان نـاڕەزایی دەرنەبڕن و بەو شێوەیە زەخت بخەنـە سـەریان و زۆرتـر گوێڕایـەڵیان بکەن، دۆخێکی زۆر ناخۆش بوو کرێکاری داماوی دڵپاکی خووزستان لەگەڵ کۆمپانیایەکدا کار دەکات کە سەدان ساڵە کرێکارانی تـەواوی جیهانی چەوساندوەتەوە و لـەو کـارەدا زۆر شـارەزایە. ئـەو یارییـەی کەکۆمپانیای نەوت ئینگلیز و ئێران دەستیان پێکرد بـوو ئـەو خەونـە پیسانەی کە بۆ کرێکارانیان بینیبوو ماوەیەکی زۆری پێویستبوو هـەتا ئەوان بزانن چیە. تـەواوی ئـەو یارییانـە کۆمپانیـای نـەوت بـۆ دزیـنی حـــەقی زەحمـــەتی کرێکـــاران و زەخـــت خـــستنەسەریان بـــوو. چەوسـاندنەوەی کرێکـاران پێویـستی بـە لێزانینێکـی تایبـەتی بـوو کەسـەرمایەدارەکانی بەشـێك لـەوڵاتان ئـەو زانیاریـەیان نـەبوو، بـەڵام سـەرمایەدارەکانی ئینگلیـز و بەتایبـەت بەرپرسـانی کۆمپانیـای نـەوت لـەو بەشـەدا شـارەزاییەکی تـەواویان هـەبوو. خـاوەن سـەرمایەکانی ئینگلیز زۆر بـێ ڕەحـم و بـێ مێـشك بـوون و لەگـەڵ تـەواوی جیهانـدا

ڕێکەوتنیان دەکرد، خەڵکی ئەو وڵاتەیان دەچەوساندەوەو لەناگری هەژاریدا دەیانسوتاندن، بێ ئەوەی دوارۆژ لەبەرچاو بگرن و بزانن لەداهاتوودا ئەو مەسەلەیە بەرۆکی خۆیشیان دەگرێتەوە.

ئەو خەونەی کەبۆ کرێکارەکانیان دەبینی بریتی بوو لە کەمکردنەوەی بێ دەنگی مووچەکە بەو شێوازە کرێکارەکانیان لەناو ئاگری نەهامەتیدا دەستوتاند.

ئەو ڕێگایەش بریتیبوو لەدەرکردنی بەردەوامی کرێکارە کۆنەکان و دووبارە دامەزراندنی کرێکاری گەنج و بەتوانا بە مووچەیەکی زۆر کەمتر لەجاران. کۆمپانیای نەوت بەو بیانوەی کە کارەکەیان کەم بووەتەوەو پێویستیان بەبەشێك لەکرێکارەکان نەماوە، کرێکارەکانیان لەکۆمپنی دەردەکردو دەچوونە ڕیزی بێکارانەوە. کرێکارە لەسەر کار دەرکراوەکان ماوەیەك بێکار دەبوون، جگە لەوەی ئەگەر پارەیەکیشیان کۆکردبێتەوە دەیان کرد بەخەرجیی بنەماڵەکانیان، تەواوی کەلوپەلی ناو ماڵەکەیان بەنرخێکی زۆر کەم دەدا بەدوکاندارەکانی خووزستان، لەکۆتایدا ناچار دەبوون بچنەوە بۆ کۆمپانیاو داوای کار بکەن. پیاوەکانی کۆمپانیایش بەبیانوی ئەوەی کەجارێ کار نیە، بەڵام بەهۆی ئەوەی بەرپرسی بەشەکە لەمێوە ڕازیە ئێمە دەتوانین بەمووچەیەکی کەمتر بتانخەینە سەر کار ئێوەمیش دەبێ بەڵێن بدەن هەموو کاتێك بەرپرسی بەشەکە لێتان ڕازی بێت. مەبەستیان ئەوە بوو هیچ کاتێك گلەیی لەکاری قوورس و کەمی مووچە مەکەن.

ئەو کرێکارە داماوانەیش لەڕوی ناچاریەوە ئەو شەرتانەی کۆمپانیای نەوتیان بەڕواڵەت قبوڵ دەکرد بۆ ئەوە بتوانن بەو

مووچەی کەم و کار ە تاقەت پڕوکێنە بـژیوی ژیـانی بنەماڵـەکانیان دابین بکەن. کۆمپانیا بەو شێ‌میە کرێکارەکانی ئەوەندە ترساندبوو کەلەبەرامبەر لێدان و سووکایەتی کردنـدا هیچ شێوازێکی نارەزایان دەر نەدەبڕی بەڵام ئەمە وەك ژیلەمۆی ژێـر خەڵوز وا بـوو هەرکات لەوانە بوو ئاگر بکرێتەوە. نەخشەکەی کۆمپانیـای نـەوت بەڕواڵەت خراپ نەبوو، لەبەرئەوەی توانی بووی مووچەی کرێکارەکان کەم بکاتەوەو کەسیش نارەزایی دەرنەبڕیبوو. بەڵام کۆمپانیـای نـەوت نەیدەزانی ئەم بێدەنگی و سەرکوتە ڕۆژێك دەبێت بەدەنگێکی بەرز و لەهەموو جیهاندا بڵاو دەبێتەوە. کۆمپانیـا ئاگاداری ئـەوە نـەبوو کـە مـانگرتنێکی گـشتی لـە ئارادایـە، ناچـار دەکرێـت گرێبەسـتی درێژکردنەوەی نەوت بۆ ماوەی سێ ساڵ دوابخات و دان بـنێ بەهەموو داواکاریە ڕەواکانی کرێکاران.

کۆمپانیـای نـەوت ئێـران و ئینگلیـز بێـدەنگی دنیـا و سـەرقاڵی سۆڤیەتو هەبوونی دیکتـاتۆری سـەردەمی بـەکار هێنـابوو، مووچـەی کرێکارەکانی تائەو جێگای توانی بووی کەم کردبووەوە. لەساڵی ١٣٠٦ ی هەتاوی ( ١٩٢٧ ز) مووچەی کرێکار لانیکەم شەش تمەن و ئەوپەڕی نۆ تمەن بوو. مووچەی باشترینی ئەنـدازیاری ئێرانـی چل و پێـنج تمـەن بـوو. مووچـەی نووسـەرو سـکرتێریش لـەمانگی چـل و پێـنج تمـەن تێنەدەپـەڕی. تـەنها کارمەنـدانێکی لـەکمانگی چـل و پێـنج تمـەن زۆرتریـان وەردەگـرت کـە پەیوەنـدی ژێربـەژێریان لەگەڵ کۆمپانیـای نەوتـدا هـەبوو. لـەو سـەردەمەدا ژیـانی کرێکـاران لـەقۆناغێکی زۆر خراپدا تێدەپەڕی. جگە لەو مووچە کەمەیش کە دەیاندا بە کرێکاران

مانگانــە بــەبیانوو گــەلێك وەك ( غەرامــەو دواکــەوت) و تــیتر برێــك لەمووچەکەیان لێدەبڕین. بەهۆی ئەوەی مووچـەی کرێکارەکـان لـەنێو زەرف کەپـسدا پێیـان دەدراو ئـەوانیش بۆیـان نـەبوو لـەوێ بیکەنـەوە زۆربــەی کاتــەکان پارەیــان کــەم پێــدەدان و ئــەوەیش یــەکێکی دیکــە لەهۆکارەکانی خراپی گوزەرانی کرێکارەکـان بـوو. ئـەوان بۆیـان نـەبوو دژ بــەکۆمپانیا نــاڕەزایی دەربــڕن. ئــەو کەسـانەی کــە بــەوکارە نــاڕازی بوون و دەیانویست داوای ماف خۆیان بکەن، لەلایەن کۆمپانیاوە لەسەر کارەکانیـــان دەردەکـــران و جـــاری واش بـــوو بـــۆ چاوترســـێنکردنی کرێکارەکانی دیکە ناویـان دەخـستە نێـو لیـستی ڕەشـەوە یـان بەوتـەی خۆیان ( بلاك لیست). ئەو کرێکارانـەی کـەناویان دەکەوتـە نـێ و ئـەو لیستەوە بۆ هـەتا هەتایە نەیانـدەتوانی داوای کـار لـەکۆمپانیای نـەوت بکــەن. پــێش مانگرتنەکــەی ســاڵی ١٣٠٨ ی هــەتاوی " ١٩٢٩ ز " بــەس بەتـەنها لـەئابادان پـتر لـە پێنـسەد کرێکاری لیـستی ڕەشـی لێبـوو لـەو سـەردەمەدا کرێکـارانی کۆمپانیـای نـەوتی ئینگلیـز و ئێـران لەتـەواوی کرێکـارانی کۆمپانیاکـانی نــەوتی جیهـان دامـاوترو چارەڕەشـتربوون. کرێکـارانی ئـەو کۆمپانیایـە خـواردن و جلوبـەرگ و خانوویـان نـەبوو. ئەو کرێکارانە لەهەموو مافـە سـەرەتاییەکان بێبـەش بـوون و هـەردەم مردنیــان لــەژیان پێخۆشــتر بــوو. کۆمــەڵێك لــەوان بــەهۆی ئــەوەی خانوویان نەبوو لـەژێر سێبەری دارخورمـادا دەژیـان بـەهیوای ئـەوەی ڕۆژێك بێت و ئەوانیش ژیانیان باشـتر بێـت. بەشـێك لـەوان بەحەسـیر خانوویــان دروســتکردبوو لەهەریــەك لــەم خانوانــەدا چــەند بنەماڵــە دەژیان.

بەڕێز ئەحمەد گیلانی لەو سەردەمەی کەسەرۆکی شارەوانی ئابادان بوو ( مانگرتنی ساڵی ١٩٢٩ بەشێوەیەکی گۆماناوی کوژرا) لەدەورو بەری شاردا چەند خانووی حەسیری بۆ کرێکارەکان دروستکردبوو. ئەو گەڕەکە ناسراوبوو بە ئەحمەد ئاباد. بەڕێز ئەحمەد گیلانی خۆشەویست و جێگای متمانەی خەڵکی ئابادان و یەکێك لە دوژمنانی سەرەکی کۆمپانیای نەوت بوو کە بەهەواڵ و فەرمانی ئەو کۆمپانیایە لەئابادان تارێندراو لەئەهواز خەریکی کار و کەسابەت بوو. گەڕەکی کرێکاران ( ئەحمەد ئاباد) بەهۆی نەبوونی ئاوو ئاوەڕۆ زۆر پیس بوو زۆربەی نەخۆشیەکان لەوێوە سەریان هەڵدەدا. بەشێکیش لەو کرێکارانە لەگەڕەکێك نزیك شەتولعەرەب لە خانووی حەسیردا دەژیان کەدۆخی خزمەتگوزاری گەڕەکەکەی ئەوانیش وەك ئەحمەد ئاباد وابوو. کۆمپانیای نەوت چەند خانویەکی کەمی یەك ژووری و دوو ژووری بۆ کرێکارە شارەزاکان دروستکردبوو کە ژمارەی ئەو خانوانە سەدو پەنجا خانوو بوو. بۆ هەر کرێکارێکی خێزاندار خانوویەکی دوو ژووری و بۆ شەش کرێکاری زوگورد خانوویەکی یەك ژوورییان دابینکردبوو. ئەو خانوانەی کەکۆمپانیای نەوت دروستیکردبوون، باشترو خاوێنتر بوون. خانووی بەشێك لە کرێکارەکان تاپاڵاوگەی ئابادان پتر لە دوو کیلۆمەتر بوو. کرێکارەکانیش ناچاربوون لەو گەرما تاقەتپڕوکێنەی خووزستان ئەو ڕێگەیە بەپێ ببڕن.

بەڕواڵەت ڕۆژی هەشت کاتژمێر کاردەکرا بەڵام لەڕاستیدا ڕۆژی یازدە کاتژمێر کاتی ئەو کرێکارانە لەکارگە و لەڕێگادا خەرجدەکرا.

لـەو گەرمایـەدا تـەنها مرۆڤـی دیـل ناچـار دەبێـت ئـەو کـارە بکـات بەرپرسـانی کۆمپانیـای نـەوت لەوبڕوایـەدا نـەبوون کـەڕۆژێك دادێ کەئەم مرۆڤانە کەبەدەستی کۆمپانیای نـەوت دیـل کـراون ئـەو زنجیرە دەشکێنن و ئـەو داوانـە هـەمووی تێکدەشـکێنن. کرێکارانی کۆمپانیـای نەوت جگە لەخۆراك و جل و بەرگ و خانوو، تئمینیش نەبوون، هـەر کاتێك پێیان خۆش بوایە لەسـەر کارەکانیـان دەریـان دەکـردن و بێتـوو داوای مــاف خۆشــیان بکردایــە یــان دەستبەســەریان دەکــردن یــان دەیاتارانـدن. ئـەوان ئـەوەیان بـۆ ببـوو بەکابوسـێکی شـووم ککـەڕۆژێك پێیان بڵێن ( کۆمپانیا پێویستی بەئێوە نیە) گەورەترین چارەڕەشـی و گرفتیان بۆ ساز بێت. لێدان و سوکایەتی کردن بەکرێکاران کـاری هـەر ڕۆژەی ئینگلیزەکـان بـوو. هـیچ بەرپرسـێك وڵامـی داواکـاری و شـکاتی کرێکارەکانی نەدەدایەوە. دەیانجار پـێش هـاتبوو ئینگلیـزەك کرێکـاری بەلێدان کوشتبوو، بەڵام بەداخەوە لەلایەن دادگاکانەوە بـەدوادا چـوون بـۆ ئـەو مەسـەلەیە نـەکرابوو. بـەهۆی گـوێ نـەدان بەشـکات و گـیرو گرفتـەکانی کرێکـاران لەلایـەن بەرپرسـانی حوکـومی و پـشتیوانیان لـەکۆمپانیای نـەوت، کرێکارەکـان بـەو بڕوایـە گەیـشتبوون کـە ئـەم بەرپرسانە پیاوی ئینگلیـزن و وەك شێخ خەزعـەل و گروپەکـەی ئـەو وان. سولەیمان خان سەرۆکی ئاسایشی ئابادان[٣]، ڕۆکن ە لدین موختاری سەرۆکی ئاسایشی گشتی خوزستان سـەرتیپ فـەرەجولاخان پارێزگـاری خوزسـتان [٤] ئەوەنـدە گوێڕایـەڵی کۆمپانیـای نـەوت بـوون کـە ئـەو

---

[٣] – سۆلەیمان مۆحتەشەم

[٤] – سەرتیپ فەرەجولا ئاق ئوولی

ئێرانیانەی کە لەگەڵ شێخ خەزعەل شەڕیان کردبوو لەو بابەتەشەوە زەرەرمەند بوون ئاواتیان بۆ گەڕانەوەی ئەو دەخواست. زەختی سیاسی دەمبەستی ئازادی ئەوەندە زۆر بوو کە قبوولکردنی بۆ خوێنەران زۆر ئەستەمە.

چەندکەسێك لە ئەفسەرەکانی ئینگلیز کەلەشەڕ گەڕابوونەوە لەوێ لەژێرناوی ئەندازیاردا مووچەی باشیان وەردەگرت. ئەوان هەرچەندە شۆفێر یان بۆ دابین کرد بوون بەڵام زۆربەی کاتەکان خۆیان شۆفێرییان دەکرد. بەدەیانجار بەسەیارە خەڵکیان کوشتبوو بەڵام هیچ لێپرسینەوەیەکیان لەگەڵدا نەکرابوو. ئەگەر خزم و کەسی کوژراوەکەیش زۆر دەنگە دەنگی بکردایە ئەوە دەچوون و شۆفێرە ئێرانیەکەیان بەجێگای خۆیان دەدا بەدەستەوە، یەکەم یارمەتیان دەکرد کە حوکمێکی قورسی بەسەردا نەسەپێنن و دووهەمیش مووچەی ئەو ماوەیە کە لە بەندیخانەدا بووە پێیاندەدا لەدوای ئازادبوونی لە بەندیخانە بە بیانوی ئەوەی کارێکی باشتری پێدەدەن دەیاننارد بۆ شارێکی دیکە، بەڵام چیدی ئەو کەسە دیار نەدەما. ئینگلیزەکان وتەیەکیان هەیە:

" مردوو قسەناکات". چارەی ئەو ئێرانیانەی کە لە ناوچەی کۆمپانیای نەوتدا بوون دانەو دوان نەبوو. لەوگەرما تاقەتپڕوکێنەی خووزستان ڕۆژی یازدە کاتژمێر کارکردن بە مووچەی مانگی شەش تمەن و تەنانەت خانوشیان نەبوو کە خۆیان و بنەماڵەکەیان تێیدا بحەوێنەوەو بینینی ڕوخساری زەرد و بێڕەنگیان لە تاقەتی مرۆڤدا نەبوو.

من هەرچەند كرێكاری شارەزابووم و لە بەشگەلی جیاوازدا كارم دەكرد، مانگی هەشت تمەن مووچەم وەردەگرت. لەو سەردەمەدا نرخی فەردەیەك ئارد لەئابادان پێنج تمەن بوو. بەهۆی ئەوەی كە كرێكارەكان نەیاندەتوانی بەپارەی حازر بیكڕن خاوەن دوكانەكان فەردەیەك ئاردیان پێدەدان بەشەش تمەن. هەروا كە پێشتر باسمانكرد مووچەی زۆربەی كرێكارەكان لەشەش تمەن تێنەدەپەڕی، ناچار بوون بۆ دروستكردنی نان ئەو نەوتە پیسەی كە ئینگلیزەكان فڕێیان دەدا بەكار بێنن.

بەكارهێنانی ئەو نەوتە پیسە لەلایەن خێزانی ئەو كرێكارانەوە زۆر شتێكی دڵتەزێن بوو. ئەوان دەچوون بە تەنەكە ئەو نەوتە پیسەیان دەنایە سەر سەریان و بۆ دروستكردنی نان و تێركردنی منداڵەكانیان بەرەو ماڵە حەسیرەكانیان بەڕێ دەكەوتن. جلەكانیان هەمووی پینەو پەڕۆ بوو نیوەی لەشیان بەدەرەوە بوو. ئەو نەوتە دەڕژا بەگیان و سەروچاویاندا. ئینگلیزەكانیش لەگەڵ ژنەكانیان دەهاتن لەو دیمەنە رەسمیان دەگرت و رایاندەبوارد بەخاوەنە ڕاستەقینەی ئەو نەوت و دارایە كە ئێستا چییان بەسەر هاتووە.

ئەو ڕەسمانەی كەدەیان گرت، رەسمی چوار چڵ ئێسقانی نەوتاوی بوو كە دەرونی هەموو مرۆڤێكی دەهاژاند. بەداخەوە ئەو ڕەسمانە ببوو بەهۆكاری پێكەنین و ڕابواردنی ئینگلیزەكانی ئەو ناوچەیە. نازانم ئەمە چ كارێكی خراپە كە كەسانێك پەیدا دەبن كە بەداماویی خەڵك پێكەنینیان دێت؟ لەكاتی ڕەسمگرتن و پێكەنین و ڕابواردنی ئینگلیزەكان ئەو كرێكارانەو بنەماڵەكەیان زۆر بەلایەنەوە سەخت و

دژوارتر لەو نەهامەتیانە بوو کەدەهات بەسەریاندا. ئەو جۆرە کارانە کرێکارەکانی زۆرتر هان دەدا بۆ دژایەتی کردنی کۆمپانیای ئەوت. ئاساییە کە کەسێك کە ناخۆشی و پەژارەی هاوچەشنی خۆی پێ ناخۆش و دلگران نیە، تەنانەت، پێی خۆشەو پێدەکەنێت، ئەوە دەکات بەهۆکاری خۆشی و ڕابواردنی خۆی و بنەماڵەکەی، لەبەرچاوی خەڵك ناشیرین دەبێ. و کەسیش ڕێزی لێناگرێت. بەو شێوەیە کە باسمانکرد، سووتەمەنیەکەیان بۆ خۆیان دابیندەکرد. هەڵبەت مانگی شەش تمەن مووچەی کرێکاران بەشی یەك فەردە ئاردی دەکرد و دەیانتوانی بەس نانی وشکی بخۆن. لەساڵدا خواردنی کرێکاری ڕەش (ئەوانە کەلەکاردا وەستا نەبوون) جگە لەنانی وشك هیچیتر نەبوو. ڕۆژێك لە نزیك شوێنی کارەکەی مندا (وەرکشاپ) ئاسن کەوت بەسەر قاچی کرێکارێك بەناوی عەلی عەباس و قاچی شکاند. بینینی ئەو ڕوداوە منی پەرێشان کرد و هەموو شتێکم لەبیر چووەوەو چووم بۆ یارمەتیدانی ئەو زۆر هەوڵمدەدا کە بەپێچەوانەی جاران زوو بیبەن بۆ خەستەخانە. کاتێك بریندارەکە بینی من زۆر هەوڵدەدەم بۆ نەجاتی ئەو، هەرچەند تەندروستیی زۆر خراپ بوو، وتی: ( تەمەن درێژ بیت، مەترسە هیچ نیە، من نامرم، بەڵام ئەوەی کە نیگەرانی کردووم بارودۆخی منداڵەکانمە. بەیانی کە لەماڵ هاتمە دەرەوە، ئەوان نانیان نەبوو. بەڵێنم پێدان دوای کارەکەم بڕێك پارە قەرز بکەم و خواردنیان بۆ بکڕم. ئێستا کە من دەبەن بۆ خەستەخانە، لەوانەیە ئەوان لەپرسێتیدا بمرن " ئەو داماوە لەو بارودۆخەیشدا بیری لای نانی منداڵەکانی بوو. کاتێك ناونیشانی ئەوم لێوەرگرت و وتم:

رێکخراوی نهێنی کرێکاران لەو ماوەیەی کە تۆ لەخەستەخانەیت خواردن بۆ منداڵەکانت دابینەدەکات و منیش ناوە ناوە سەردانت دەکەم، دیاربوو ئەو قسانەی منی بۆ باوەڕ نەدەکراو بەگومانەوە سەیری ناو چاوانمی دەکرد، کاتێك زانی کە من زۆر سوورم لەسەر ئەو قسانەی خۆم و پێموت جگە لەمانەیش مافت لەو چەوسێنەرانە وەردەگرینەوە، هیچ گومانی نەماو دەستی کرد بەگریان.

کرێکارانی ئەو کۆمپانیایە لە ماق تەندروستیش بێبەش بوون. لەلایەن وەزارەتی تەندروستییەوە بنکەیەك لە ئابادان دامەزرابوو کەهیچ شتێکی تێدانەبوو. دکتۆرێکیش بەناوی مەهدی خان سەرۆك و بەڕێوەبەری ئەوێ بوو. ئەویش ئەو کەسانەی وەردەگرت کە دەیانتوانی پارەی دەوا و دەرمان بدەن. بەڕێز دکتۆر هیچی بۆ ئەو کرێکارانە نەدەکرد.

کۆمپانیای نەوت بۆ خۆی بنکەیەکی بوو کە لەبواری دەواو دەرماندا هیچ کێشەی نەبوو. بەڕواڵەت ئەم خەستەخانەیەی بۆ کرێکارو فەرمانبەرانی کۆمپانیای نەوت دامەزرابوو. بەڵام لەڕاستیدا بۆ چارەسەر کردن و پشوودانی ئەندازیارە ئینگلیزەکان بوو. یەکەم ئەوەی کە ئەو کرێکارانە تا نەگەیشتایەتە ئاستی مردن نەیاندەبردن بۆ ئەوێ. دووهەمیش کرێکاران بڕوایان بەو دکتۆرە ئینگلیزانە نەبوو. بەبڕوای ئەوان کرێکارێکە کە لەخەستەخانەی کۆمپانیای نەوت دەمێنێتەوە بەدەستی ئەو دکتۆرە نوێیانەی ئینگلیز فەحس دەکرێت و بەهۆی نەزانکاریی ئەوانەوە لەوانەیە بمرێت. لەکاتی بڵاوبوونەوەی پەتای وەبا لەئابادان، بەشێك لەو کرێکارانەی کەخۆیان لەدەستی

دکتۆرەکانی کۆمپانیای نەوت ڕزگار کردبوو زیندوو مانەوە و ئێستاش خەریکی کارن، بەڵام ئەوانەی کەلەخەستەخانەی کۆمپانیای نەوت چارەسەریان بۆ دەکرا تەنانەت تەرمەکانیشیان نەدانەوە بەبنەماڵەکانیان. کرێکارانی کۆمپانیای نەوت دەڵێن: خەستەخانەی کۆمپانیای نەوت لەبەر خۆدەرخستنیش هیچ نەخۆشێکیان چارەسەر نەکردووە.

لە زۆربەی شوێنەکانی خوزستان بەتایبەت لە وەرزی هاویندا، ژیان بەبێ سەهۆڵ و ئاوی سارد زۆر سەخت و تاقەتپڕوکێن بوو. بەتایبەت بۆ ئەو کرێکارانەی کە ناچار بوون بۆ دابینکردنی کەمترین بژیوی ژیانیان ڕۆژی هەشت کاتژمێر لەژێر تیشکی خۆردا کار بکەن. کۆمپانیا لەوسەردەمەدا بۆخی کارگەی هەبوو دەی توانی سەهۆڵ بۆ کرێکارەکان دابین بکات، ئەم کۆمپانیا پێشکەوت و مرۆڤ دۆستە! تەنانەت کرێکارەکانی لەخواردنەوەی ئاوی سارد بێبەش کردبوو، ئەوانی ناچار بوون ئەو قوورەئاوو نەوت ئاوە پیس و گەرمە بخۆنەوە. ئەو کرێکارانەی کەدەیانتوانی بۆ خۆیان گۆزەی گەڵی یان دەهێنا و بەو شێوەیە ئەختێك ئاوەکەیان پێ پاك و سارد دەکردەوە. ئەو چەشنە کرێکارانە کەم بوون لەبەرئەوەی ئەو مووچە کەمە بەشی ئەوەی نەدەکرد کەکرێکار گۆزەی پێ بکرێت.

ئەو کرێکارانەی کە توانی بوویان ئەو گۆزەیە بکڕن لەبەر چاوی هاورێکانیان وەك و شازادە وابوون هەڵبەت کاتێك دەتوانی بەو گۆزەیە ئاو سارد بکەیت کەئەو باگەرمەی کەناسراوە بەبای باکۆر بهاتایەت. ئەگینا ئەوی ئاو گۆزەکە گەرمتریش دەبوو. کرێکارانی کۆمپانیای

نەوت هەتا پێش مانگرتنی مێژووی ساڵی ١٣٠٨ی هەتاوی ( ١٩٢٩ ز) لەپشووی ساڵانەیش بێ بەش بوون. نەبوونی خواردنی باشوو بەسوودو دوازدە مانگ کار کردن بێ ئەوەی پشوویەك بدەن زۆر زەختی خستبووە سەر کردێکاران.

کۆمپانیای نەوت بۆ ئەو پێشهاتە نەخوازراوانەی کەبەسەرکرێکاراندا دەهات هیچ پلانێکی نەبوو. ئەو کرێکارانەی کەلەکاتی کار کردندا تووشی نوقسانی دەهاتن، بێ ئەوەی هیچ قەرەبوویەکیان بۆ بکرێت لەسەر کار دەردەکران و زۆربەیان ناچار دەبوون سواڵ بکەن.

لەو شارەدا سواڵکەرو سەوزە فرۆشی زۆری لێبوو کەبەگشتی لەکۆمپانیای نەوت تووشی زیانی جەستەیی هاتبوون و لەوێ دەرکرابوون. منداڵەکانیشیان لەخوێندن بێ بەری بوون. لەئابادان کەگەورەترین ناوچەی پیشەسازی بوو، بەس قوتابخانەیەکی لێ بوو بەناوی پەهلەوی کەئەویش بەئاسانی بەدەست نەهاتبوو. نەتەوە پەرستەکانی ئابادان بۆ دروست کردنی ئەو قوتابخانەیە لەگەڵ شێخ غەزعەل و گرووپەکەی شەڕێکی دوورو درێژیان کردبوو. بەهۆی ئەوەی کەخەڵکی ئابادان بۆ دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە مەینەتی زۆریان کێشا بوو زیانیشیان لێکەوتبوو، هەر بۆیە بۆ مانەوەی ئەو قوتابخانەیە زۆر هەوڵیان دەدا. بەداخەوە لەمانگرتنەکەی ٢٣ ی پوشپەڕی ١٣٢٥ ی هەتاوی ( ١٩٤٦ ز) ئەو قووتابخانەیە بەدەستی حیزبی توودە سوتێندراو لەناوچوو. ئەو ئاگرە دڵی خەڵکی ئابادانی سوتاند. هیچ کاتێکیش ئەو بابەتەیان لەیاد نەکرد. واهەست دەکەم

لەم ئاگر کەوتنەوانەدا دەستی کەسانی نەناسراوی تێ دابوو بۆ ئەوەی حیزبی توودە لەبەر چاوی خەڵکی ئابادان رەش و بەدناو بکەن. ئینگلیزەکان لەخۆیان بەپێشکەوتوو دەزانی ناڕاستەوخۆ نەیان دەهێشت خەڵکی خوزستان بەرەو پێش بچن. زۆربەی کرێکارەکان بەهۆی رێکخراوی نهێنی کرێکارانەوە دەیان زانی ئینگلیزەکان بەیارمەتی ئەو ئێرانیانەی کە وەکو کارەکەر لەبەردەستیاندا بوون نەیاندەهێشت خەڵکی خووزستان فێری زانست بن. تەواوی ئەو نەهامەتی و بێ بەشیانە کەبەسەر کرێکاراندا هات بوو، رق و توڕەیی ئەوانی بەرامبەر بەکۆمپانیای نەوت و کومەت رۆژ بەرۆژ زیاتر دەکرد. هەرکاتێك لەدەوری یەك کۆدەبوونەوە، قسەیان لەسەر ئەوهەموو نەهامەتی و چەوساندنەوە دەکرد کەکۆمپانیاینەوت بەسەری هێنابوون. خەباتی کرێکاران دژ بە کۆمپانیای نەوت لەقۆناغی جێنێوو قسەدا بوو. زۆربەی کاتەکان لە خوا دەپاڕانەوە مافیان بسێنێت. ئەوجەوە دیکتاتۆریەوە ئەو دەزگا ئەمنیە ئینگلیزیانە نەیان دەهێشت کرێکارەکان لەجیهانی ڕاستەقینەدا مافەکانیانی خۆیان بناسن و بۆ وەرگرتنی خەبات بکەن. کۆمپانیای نەوتیش لەو دۆخە گەلێکی وەردەگرت و هەرچەندە زۆرتر کرێکارەکانی دەچەوساندەوەو دۆخی ژیانی کرێکارەکانی رۆژ بەرۆژ خراپتر دەکرد. کرێکارەکان ئامادەی خەبات دژی کۆمپانیای نەوت و دیکتاتۆری سەردەم بوون، بەڵام رێگای خەباتیان نەدەزانی. کرێکارەکان بەس رق و تووڕەیی خۆیان بەجنێودان و قسەو قسەڵۆك دژبەکۆمپانیای نەوت دەردەبڕی. لەساڵی ١٣٠٦ ی هەتاوی ( ١٩٢٧ ز)

لەلایەن رێکخراوی ناوەندی کرێکارییەوە فەرمانیان بەمن کرن کەبچم بـۆ ئـەو ناوچـە نەوتیانـەو کرێکارەکـانی ئـەوە رێکبخـەم و فێـری خەباتیان بکەم. بەهۆی ئەوەی کار و کاری رێکخراوی نهێنی کرێکاران زۆر رێـك و پێـك بـوو هـەموو ئەنـدامانی دەبـوو بـێ هـیچ ئـەملاو ئەولایەك فەرمانەکانی جێ بـەجێ بکـەن. منـیش لـەدوای بڕیارەکـەی کۆمیتەی ناوەندی خۆمم بۆ سەفەر ئامـادەکرد. بەداخـەوە سـەفەر بـۆ ئەو ناوچە نەوتیانە کێشەی زۆری بوو، وەك:

١- کۆمیتـەی ناوەنـدی لـەبارودۆخی خوزسـتان بەتـەواوی بێئاگـا بوون. تەنانەت لـەژمارەی کرێکـاران و شـوێنی ژیـان و هـەل و مـەرجی ئـەوان بێئاگـابوون. هەربۆیـەش لەوبارەیـەوە هـیچ زانیاریـەکیان پـێ نەدام.

ئینگلیزەکان ئاگایان لەو دۆخـە بـوو هـەر کەسێك تـازە بچوایەتە ئـەوێ دەیـان خـستە ژێـر چـاودێرییەوە، بێتـوو گومانیـان لەسـەر هەرکەسێك بوایە، زوو دەستبەسەریان دەکرد.

٣- تورکەکانیان بەهیچ شێوازێك دانەدەمەزراند.

٤- لەباری مادییـەوە کۆمیتـەی ناوەنـدی لـەدۆخێکی خراپـدا بـوو، بـەو هۆیەشـەوە نەیـدەتوانی یارمـەتی کەسـەکان بـدات. ئـەوان ناچـار بوون بەپارەی خۆیان بۆ ئەم لاولا سـەفەر بکـەن. تـەواوی داراییەکـەی من شەست تمەن بوو کەدەبوو بەو پارەیە لەڕێگای شـیراز بووشـێهرەوە بچوومایە بۆ خوزستان و هەتا کارم دەدۆزیەوە بەو بـڕە پارەیـە ژیـانم بکردایە لەژێر چاودێری ئینگلیزەکـان لەتـەواوی خووزسـتان بـەنهێنی کرێکارانم رێك بخستایە. ئەندامانی کارای رێکخراوەکە نـەیان دەتـوانی

بەبیانوی بوونی لەمپەر فەرمانەکانی کۆمیتەی ناوەندی پشت گوێ بخەن. ئەوان دەبوو هەموو ئەو مەشاکیلانەیان بەتەنیا چارەسەر بکردایە، چاوەڕێی کۆمیتەی ناوەندی نەبوونایە.

ئێمە بڕوای تەواومان بەکۆمیتەی ناوەندی بوو دەمانزانی ئەگەر یارمەتیەك بتوانن دەی کەن.

هەر بۆیەش بێ ئەوەی باسی ئەو مشکیلانە بکەم، لەڕێکەوتی حەوتی سەرماوەز سالّی ١٣٠٦ی هەتاوی ( ١٩٢٧ ز) بەرەو شیراز بەڕێکەوتم. هەتا بووشهێر تەئکید بووم لەژێر چاودێریدا نیم، بەلاّم نیگەران بووم. لەبەرئەوەی ئەگەر لەتاران دادەمەزرام و لەژێر ناوی کارکردن دەچووم بۆ خووزستان، پۆلیس گومانی لێ نەدەکردم، بەداخەوە بەهۆی کەم و کورِی ڕێکخراوەکەو نەبوونی کەسی کارنامە لە دام و دەزگاحکومیەکاندا، پەیدا کردنی کاری حکومی لەوماوە کەمەدا بۆ من نەدەکرا. هەر بۆیەش بەواتای " هەرچیەك دەبێت بەخێربێت " بەرەو خووزستان چووم و لەبووشێهرەوە بەپاپۆرێکی ئینگلیزی بەرەو موحەمەرە بەڕێ کەوتم و لەوێدا لەگەلّ چەند کەسێك لەپیاوانی حوکومی خووزستان بووم بەبرادەر. بەڕێز سەید عەباس خان بێهێشتی کەسەرۆکی پیاوانی فەرمانگەی ڕێگاوبان بوو دەچوو بۆ دێزفوول و سەرخۆش ببوو، بەسەرهاتی کار گەلێکی فێر کە بۆ خەلّکی کردبوو بۆی باس کردم.

ئەوان وایاندەزانی من بازرگانێکی ئازەربایجانم و منیان وا بەخەلّکەکەی دیکە دەناساند. هاتنی بازرگانێکی تورك لەوسەردەمەدا بۆ ئینگلیزەکان دەبووە جێی گومان و لەوانەبوو لەبارەی ڕابردووی من

دەستبکەن بەلێکۆڵینەوە. هەر بۆیە بەباشمزانی داواله بەڕێز بێهێشتی بکەم کە لە خوزستان کارێکی حوکومیم بۆ بدۆزێتەوە. بەسەید عەباس خانم وت کەمن بازرگان نیم و بۆ کارکردن دەچم بۆ خوزستان و هەروەها هەتا ئەگەینە ئەهواز بڵێ کەمنیش مۆزەف حکومەتم. ئەویش داواکەی منی قبوڵ کردو بەڵێنی پێدام کەیارمەتیم بکات. بەیانی گەیشتینە گومرۆکی موحەمەرە. پیاوەکانی گومرۆك پاپۆرەکەیان گەمارۆدا. تەئکید بووم کەلەناو ئەوانەدا سیخوڕی کۆمپانیای نەوتی لێیە بۆ زانینی بارودۆخی کەسەکانی ناو پاپۆرەکە. بەڕێز سەید عەباس خان منی وەك کارمەندی حکومەت پێ ناساندن. بەوهۆیە لەدەستی سیخوڕەکانی کۆمپانیای نەوت ڕزگارم بوو. ڕۆژی ٢١ ی سەرماوەز گەیشتین ئەوازو لەمیوانخانەی ئیسلامی ژورێکمان بەکرێ گرت. سەرۆك عەباس خان لەگەڵ سەرۆکی ئاسایشی خووزستان ئاسیاوی هەبوو. پێی وتم باپێکەوە بچین سەردانی بکەین. منیش بەبیانوی ماندوی یەوە لەگەڵی نەچووم و خۆم نەخستە بەرچاوی پۆلیسەوە. ماوەی سێ ڕۆژ بەڕێز بێهێشتی خەریکی ڕێکخستنی کار و کارەکانی خۆی بوو منیش لەو ماویەدا دەستمکرد بەلێکۆڵینەوە لەبارەی هەل و مەرجی کرێکارانی خوزستان. لەوێ لەگەڵ مامۆستایەك ئاشنا بوو کە لەبنەڕەتدا توورك بوو دانیشتووی خوزستان بوو. ئەو هەستێکی دژ بە ئینگلیزەکان هەبوو ماوەیەکیش دژی شێخ غەزعەل خەباتی کرد بوو چەند کەسێکی شۆڕگێڕی پێناساندم. بۆم دەرکەوت کەزۆر نیە کرێکارەکان لەپالاوگەی ئابادانن. هەربۆیەش بڕیارمدا ناوەندی ڕێکخراوەکە لەئابادان دابنم. چوونی

کەسانی نویٚ بۆ ئابادان و مەسجیٚوسوٚلەیمان زۆر گرفت بوو. چوار دەوری مەسجیٚد سولەیمان بەدەستی ئینگلیزەکان داڵدە درابوو، چوونە نیٚ و شار بەبیٚ ئاگاداری کۆمپانیای نەوت قەدەغە بوو هەروەها چوون بۆ ئابادانیش هەروا سەخت و دژوار بوو. تریشاپ [٥] یان پەیمانگەی تەکنیکی کە لە گۆڤارەکانی کۆمپانیای نەوتدا باسی لیٚدەکرا، لەڕاستی دا پەیمانگەی تەکنیکی نەبوو، بەڵکو شویٚنیٚك بوو بۆ کۆکردنەوەی کریٚکارە زیادیەکان کەکۆمپانیا دروستیکردبوو هەربەشیٚك پیٚویستی بەکریٚکار بوایە لەویٚوا بۆیان دابین دەکردو چیدی پیٚویست نەبوو لەدەرەوە کریٚکاری نویٚ بیٚنن، کۆمپانیا جگە لە کار کردن بەوکریٚکارانە دەعایەی دەکرد بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خەڵك ئەو شویٚنە بەپەیمانگەی تەکنیکی بناسریٚت. بەرپرسانی حوکومی و هەر کاتیٚك دەچوون بۆ سەردان و گەڕان لەخووزستان دەچوون و سەیری ئەو بەشەیان دەکرد. کاتیٚك یەکیٚك لەو بەرپرسانە دەچووە نیٚ و پالاْوگە، لەلایەن کۆمپانیاوە ئامیٚری نویٚیان دەدا بەکریٚکارانی ئەو بەشە کەهەتا ئەو کاتە چاویان بەشتی وا نەکەوت بوو. سودی چیە، بەرپرسانی ولاٚتی ئیٚمە هیچ نەزان بوون و هەستیان بەوشتانە نەدەکرد. چاویٚکیان بەسەر ئەو ئامیٚرە نویٚیانەدا دەخشاندوو سەیریٚکی ئەو منداڵانەیان دەکرد کەلەیەکەوە هەتا سەدیان بەزمانی ئینگلیزی دەوت و لەکارگە دەچوونە دەرەوە. پیٚش ئەوەی ئەو کریٚکارە دوا کەوتووانەی تریشاپ بەرەو لای ڕیٚکخراوەی نهیٚنی ڕابکیٚشم، بانگهیٚشتم دەکردن بۆ یەکگرتووی دژ بە بەرپرسانی کۆمپانیای نەوت.

---

[٥] – تریشاپ : ئەم وشەیە وەرگیٚردراوی work shop training

بەهۆی ئەوەی کرێکارانی ئەو بەشە لەکرێکارەکانی دیکە زۆرتر دەچەوسانەوەو هەڵسوکەوتی خەراپیان لەگەڵ دەکراو ئەو بابەتەیان بەلاوە زۆر ناخۆش بوو، داواکاریەکەی منیان زۆر پێخۆش بوو قەبووڵیان دەکرد.

ئەو کەسە بەدەستی سێ کەس بەڕێوە دەچوو ١- بەرپرس ٢- فورمەن ٣- سەرکرێکار. بەرپرسی ئەوێ کەسێك بوو بەناوی " ماریس ". ئەو کەسێکی ئارام و بێ دەنگ بوو زۆر دەستوەردانی نەدەکرد. " خۆڕمەن " کەسێك بوو بەناوی بابا خان کەنەرمەنی بوو ئێستا لە شەقامی لالەزار دووکانی هەیە. کەسێکی زۆر خراپ بوو. بەوتەی کرێکارەکان سیخوڕی کۆمپانیای نەوت بوو. ئەم پیاوە خوێڕیە بۆ بەدەست هێنانی دڵی بەرپرسانی کۆمپانیای نەوت زۆر ئازاری کرێکارانی دەداو دەیان چەوسانەوە. بەلێدان و دەرکردن واکرێکارانی ترساندبوو کە بۆ پێکەنین و ڕابواردنی ئینگلیزەکان پێیاندەوت سەری خۆتان بەتووندی بدەن بەدیواردا ئەوانیش بێ ئەملاو ئەولا بەقسەیان دەکرد. سەیر لەوەدایە کە ئینگلیزەکان بە فەرمانەکانی ئەو دڵخۆش دەبوون. لەماوەیەکی کەمدا کرێکارانی ترشاپ بێ ئەوەی ئاگایان لە ڕێکخراوی نهێنی کرێکاران بێت یەکگرتوو بوون و ئەو یەکگرتوویەش بۆ من زۆر زەرووری پێویست بوو. بەیارمەتی ئەوان من لەکاتی دەوامدا دەچووم بۆ بەشەکانی دیکە و ئەوەی کە پێویستبوو بەکرێکارەکانم دەوت. کرێکارەکانی ترشاپ لە نەبوونی مندا جگە لەوەی کەکارەکەی منیشیان دەکرد، هەرکاتێك باباخان هەواڵی منی دەپرسی دەیاوت " ئێستا چووە دەرەوە، زوودەگەڕێتەوە" و

نەیاندەهێشت بزانێت سەر کرێکارەکە هندیەکی وەرگ زەلی زۆرگەوج بوو. ئەو زۆرتربیری لەمووچەکەی خۆی دەکردەوە زۆر لەکارەکاندا دەستوەردانی نەدەکرد.

هەرچەندە کرێکارەکانی تەریشاپ لەو سەردەمەدا ئەندامی رێکخراوی کرێکارانی نەوتی خووزستان نەبوون و یەکگرتووی ئەوان بەرواڵەت ولەبەر کەمکردنەوەی گووشاری پیاوەکانی کۆمپانیای نەوت بوو، بەڵام یارمەتی کردنەکەی ئەوان بۆ نەچوونە سەر کار و سەردانی کرێکارەکانی بەشەکانی دیکە بۆ من زۆر بەنرخ بوو. بەهۆی ئەوەی کۆمەڵێکی زۆر لەکرێکارەکان لەوبەشانەی دیکەدا کاریاندەکرد، کەسانی چلاکیی رێکخراوەکە دەیانتوانی لە ماوەیەکی کەمدا زۆر رێنوێنیان بکەن. کۆبوونەوەی ئەو هەموو کرێکارە لەو شوێنە بچووکەدا زۆر باش بوو بەڵام بۆ پاراستنی رێکخراوی نهێنی کرێکاران دەبوو بۆ کۆبوونەوە زۆر ئاگامان لەخۆمان بوایە. لەبەرئەوەی پۆلیس لەئابادان و ئەو گەرەکە کرێکاریانەدا بەردەوام خەریکی لێکۆڵینەوە بوو. هەر بۆیە بەباشمان زانی کەهەر بنکەیەك لەسێ کەس زۆرتر نەبێت. ئەندامانی بنکەکانیش یان پێکەوە خزم بوون و یان لەمێژبوو پێکەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. هەربۆیەش پۆلیس هەرگیز گومانی ئەوەی نەدەکرد کەلەوێ رێکخراوێکی کرێکاری هەبێت. بنکەکانی رێکخراوی کرێکاران لەمانگی رەزبەری ساڵی ١٣٠٦ ی هەتاوی ( ١٩٢٧ ز) پێکهات. لەم بنکانەدا لێهاتووترین و چالاکترین کرێکاری کۆمپانیای نەوت بەشدار بوون پێشووتر کەسانێك لەرێکخراوەکەدا ببوون بەئەندام کە دژبە شێخ غەزعەل خەباتیان کردبوو لەو بوارەدا تەواو

شارەزا بوون بەهۆی ئەوەی زۆرینەی خەڵکی خووزستان کرێکار بوون و ڕقیان لەکۆمپانیای نەوت بوو، ڕێکخستن و پەرەپێدانی ڕێکخراوەکە زۆر دژوار نەبوو بەڵام بەڕێوە بردن و ڕێبەرایەتی کردنی کەسەکان بەهۆی نەبوونی ئەندامی کارامەو لێهاتوو زۆر سەخت و دژوار بوو. هەر بۆیەش زۆربەی کۆبوونەوەکانمان لەسەر قسەو باسی سیاسی و ڕێکخراوەی بوو. ڕێکخراوەکەی خوزستان لەماوەیەکی کەمدا ئەوەندە پەرەی سەند بوو کە ناچار بووین ئەندامی بنکەکان لەسێ کەسەوە بکەین بەیازدە کەس. هەروا کەپێشتر باسم کرد ئەم کارە لەو شوێنە بچووکەدا زۆر مەترسیدار بوو هەرکات پێدەچوو پۆلیس ڕێکخراوەکە کەشف بکات. لەلایەن پۆلیسی ئێرانەوە ئەرخەیان بووین لەبەرئەوەی یەکەم پۆلیسی ئێران لەخووزستان زۆر لاواز بوو، دووهەمیش لەبواری سیاسی دا زانیارییان نەبوو کە بتوانن ڕێکخراوەکە کەشف بکەن و سێهەمیش بەهۆی ئەوەی ئەوان مووچە خۆری کۆمپانیای نەوت بوون، بەبێ ترس خەریکی دزی کردن بوون و کاتەکەی خۆیان بەو شتانە بەفیڕۆ نەدەدا. هەربۆیە لەوانە بوو ڕێکخراوەکە لەلایەن پیاوەکانی کۆمپانیای نەوتەوە کەشف بکرێت. وابڕیارماندا کەکۆبوونەوەی بنکەکان حەوتوی جارێك و لەدەرەوەی شار ڕێك بخرێت. ئەندامانی بنکەیەك بنکەکانی دیکەیان نەدەناسی. بەس تەنها ئەو کەسانەی کەکاری ڕێکخستنیان دەکرد لەوانە بوو ئەندامی بنکەکانی دیکە بەڕواڵەت بناسن، ئەندامانی ڕێکخراوەکە بەناوی ڕاستەقینەی خۆیان نەدەناسرانەوە. لەبەرئەوەی پۆلیس نەتوانێت بیانناسێت، ئەوان هەموویان ناوی خوازراویان هەبوو، بەهۆی ئەوەی

ڕێکخراوەکـە گـەنج بـوو تـازە پێکهـاتبوو، ئەندامـەکانی زۆر کارامـەو لێهاتوو نەبوون و نەیاندەویست ناوی ڕاستەقینەی ئەندامـەکانی دیکـە و شـوێنی کارکردنـەکانیان بـزانن. ئەندامـەکان بۆیـان نـەبوو بـەبێ ئاگـاداری ڕێبـەری ڕێکخراوەکـە لـەبارەی ڕێکخراوەکـە لەگـەڵ کەسـدا قسەوباس بکەن. ئەوان بۆیان هەبوو لەگەڵ کرێکار گەلێك کەخۆیان پێیان باش بوو بە بێ ئەوەی ناوێك لەڕێکخراوەکە بهێنن قسە بکەن و ڕێنوێنیـان بکـەن و بـۆ خـەبات لـەنێو ڕێکخراوێکـی کرێکـاری دژ بـە چەوسـێنەران و لـەوبوارەدا ئامادەیـان بکـەن. لـەدوای ئـەوەی کـە لـەدەرەوی ڕێکخراوەکـەدا ئامـادە کـران، بـۆ قـسەو بـاس لەسـەر بـۆ بـە ئەندام بوونیان لەگەڵ ڕێبەریدا هاو ئاهـەنگ بکرێت. لەدوای ئـەوەی بەشـێوەیەکی نهـێنی ئـەو کەسـەیان دەخـستەژێر چـاودێری و لێکۆڵینەوەو بۆیان دەردەکەوت کەلەباری ئەمنیـەوە بـێ گرفتیـە ئـەوە وەکو ئەنـدام وەریـان دەگـرت. لـە ئەنـدام بـوونی ئـەو کەسـەیش بـەس بەتـەنها ئەوکەسـانە ئاگـادار بـوون کەقسەیان لەگـەڵ کـرد بـوو ویـان چاودێریان کرد بوو. کەسەکانی دیکە لەو بابەتە بێئاگابوون. ئەوانیش بۆیان نەبوو لەو بارەیەوە لەگەڵ ئەندامانی دیکەدا هیچ قسەو باسێك بکـەن. هەربـەو هۆیەشـەوە لـەکاتی دەستبەسـەر کردنـی ئەنـدامانی ڕێکخراوەکە لەلایەن پۆلیسی خووزستانەوە ڕێکخراوەکە کەشف نەبوو. لـەو سـەردەمەدا پـۆلیس ئـەو کەسـانەی دەستبەسـەر کـرد کـەیان لـە مانگرتنەکـەی سـاڵی ١٣٠٨ ی هـەتاوی ( ١٩٢٩ز) بەشـداریان کردبوویـان ئەندامی یانەی کاوە بـوون. پـۆلیس ئـەوەی نـەدەزانی کـە لـەو هـەموو سـەرکوت و گوشـارەدا یانەیـەك کـە بەئاشـکرا دادەمـەزرێت،

دامەزرێنـــەرەکانی دیـارو بەرچـاون، تـــەواوی ئەندامـــەکانی ئەنـــدامی ڕێکخـراوی نهـێنی کرێکـاران بـن. بـەهۆی ئـەوەی کـە پۆلیـسی ئابـادان نەیـدەتوانی ڕێکخراوەکـە کەشـف بکـات، تـەواوی ئەنـدامانی یانەکـەی لـەژێر نـاوی ڕێکخـەرانی مانگرتنەکـە دەستبەسـەر کـردو تارانـدیانی. لەحاڵێکـدا زۆربـەی ئـەوان لـەبوونی ڕێکخـراوی نهـێنی بێئاگـا بـوون. ڕێکخراوەکـەمان واپێکهێنـابوو کەئەگـەر هـاتوو بەشـێکی تووشـی زیـان بوو، خودی ڕێکخراوەکە تووشی گرفت نەبێت. شێوازی کارکردنی ئێمە بەپێـچەوانەی ڕێکخراوەکـەی ئـەرانیی ڕەحمـەتی ( ٥٣ کەسـی) بـوو. لەڕێکخراوەکەی دکتۆر ئەرانیدا تەواوی ئەندامەکانی یەکیان دەناسی و دەیانزانی کاری چی دەکەن. هەربۆیە کاتێك لەخوزستان شورشیان یان دەستبەسـەر کـرد و تۆمـەتی سـیخوڕییان دایـە پـاڵی هـەموو شـتێکی باسـکرد. بـەهۆی ئـەوەی هـەموویان یـەکیان دەناسـی یەکـە یەکـە هەموویان دەستبەسـەر کـران و ڕێکخراوەکـەیان لەناوچوو. ئەنـدامانی ڕێکخراوەکە لەجێگای ئەوەی بەدوای کـەم و کووڕییەکانیانـدا بگـەڕێن، لە بەندیخانـەدا یـەکتریان تۆمـەتبار دەکـرد و بـە سـەرۆکایەتی خـەلیل مەلەکی دکتۆر ئـەرانیان بـە خیانـەتکار ناسـاند ( کامبـەخش هـەڵیانی خڕاند) و لەبەندیخانە کەس لەگەڵیدا هەڵسوکەوتی نـەدەکرد. لـەدوای ماوەیـەك پـاوەر نیرومەنـد سـەرۆکی خیانـەتکاری گرتوخانـەی قەسـر تەواوی گیراوە سیاسییەکانی کۆکردەوەو دۆسیەی ٥٣ کەسی خوێندەوە. دەرکەوت کە جگە لە دکتۆر ئەرانی و چەندکەسێکی دیکە هـەموویان خیانــەتیان کردبـوو، ئــەوانی دیکــەیان بەدەســتەوە دابــوو. لــەدوای خوێندنەوەی دۆسیەکە دکتۆر ئەرانی ڕووسوور و ئەوانی دیکـەیش بـە

ڕوورەشی گەڕانەوە. بەداخەوە لەدوای ماوەیەك هاوڕێکانی لەپاکی و ڕاستیی ئەو کەلکاوەژوویان کرد و ئەویان بەکوشتن دا.

ڕێکخراوی نهێنیی کرێکارانی خووزستان لەبەرئەوەی خۆی لەبەرچاوی پۆلیس حەشار بدات، هەموو شتێکی لەبەرچاوگرتبوو، هەربۆیە کۆبوونەوەکان لەدەرەوەی شار زۆر بەنهێنی دەگیران و لە ئەنجامی کۆبوونەوەکان ڕێبەری ئاگادار دەکرایەوەو فەرمانی پۆلیس بۆ ئەندامانی دەردەچوو.

ڕێکخراوەکە زۆر خێرا پەرەی سەندبوو کە بەڕێوەبردنی بەهۆی نەبوونی ئەندامی لێهاتوو و وتاربێژی پێویست زۆر سەختبوو، لەوانە بوو لەداهاتوودا تووشی گرفت بوایە. هەربۆیە دەستەی بەڕێوەبەریی ڕێکخراوی کرێکارانی کۆمپانیای نەوت بڕیاری دا بەهەر شێوازێك بووبێت شوێنێکی باش بۆ کۆبوونەوەی کرێکاران دابین بکرێت. لەساڵی ( ١٩٢٨ ز) سەرقاڵی دەمەزراندنی یانەی وەرزشیی کاوە بووین. لەبەرئەوەی تەواوی ئەندامانی نهێنی ڕێکخراوەکە بەشدارییان نەکرد و بۆ دەمەزراندنی ئەو یانەیە لە کرێکارانی دیکە و چەند کارمەندێکی کۆمپانیای نەوت کەلکمان وەرگرت هەتا پۆلیس گومان لەو یانەیە نەکات. وەرگرتنی ڕەزامەندی لە پیاوانی حکومەت لەوانە سەرتیپ فەرەجوڵڵاخان و ڕۆکنەدین خان نەدەکرا. لەبەرئەوەی دەمانزانی ئەوان بەبێ ئاگاداری کۆمپانیای نەوت کاری وەها ناکەن و کۆمپانیای نەوتیش پێی خۆش نەبوو یانەیەکی ئێرانی دابمەزرێت. تەنها کەسێك کەدەیتوانی لەو بارەیەوە یارمەتیمان بکات سەرۆکی فەرمانگەی ڕۆشنبیریی ئابادان بوو، ئەو گەنجێکی زۆر باش بوو، زۆر

پێوەندیی بە کۆمپانیای نەوتەوە نەبوو. چەند کەسێك لە شاندی دامەزرێنەر چوون بۆ لای و داوایان لێکرد کە بۆ دامەزراندنی ئەو یانەیە یارمەتییان بدات. ئەویش ڕاستەوخۆ بەنوسراوە ڕەزامەندیی نیشان دا بۆ دامەزراندنی یانەی وەرزشیی کاوە. ئێمەیش زوو شوێنێکمان بۆ بەکرێ گرت و خەڵکمان بانگهێشتکرد بو مەراسمی دامەزراندنی یەکەمین یانەی ئێرانی لە ئابادان. چیدی هەوڵی پۆلیس و نەیارەکان بۆ داخستنی ئەو یانەیە بێسوود بوو.خەڵکێکی زۆر بەشداریی ئەو ئاهەنگە بوون. بەفەرمی یانەکە دەستی کرد بەکارکردن. زۆر زوو کۆمپانیای نەوت فەرمانی بەپۆلیس کرد کە ئەبێت ئەو یانەیە دابخرێت و ئەوانیش بۆ بەجێهێنانی فەرمانی کۆمپانیای نەوت ویستیان یانەکە دابخەن بەڵام کرێکارەکان لەبەرامبەر ئەم گوشارەدا دوومانگ خۆڕاگرییان کرد. ئەم یانەیە باشترین شوێن بوو بۆ کۆبوونەوەو پەرەپێدانی ڕێکخراوی نهێنی. لەدوای دوو مانگ ململانێ لەنێوان کرێکاران و پۆلیس دا لەکۆتاییدا بەفەرمانی سەرتیپ فەرەجوڵلاخان ئاق ئولی و ڕۆکنەدین خان جانی یانە ئێرانییەکان داخران.

بۆ فێردن و بارهێنانی کرێکاران لەگەڵ مەسەلە سیاسی و ڕێکخراوەییەکاندا جگە لە یانە پێویستمان بەقوتابخانەش بوو. لەو سەردەمەدا دامەزراندنی قوتابخانەی کرێکاری بەتایبەت لە خووزستان زۆر ئاستەم بوو. لەلایەکی دیکەشەوە بەڕێوەبردنی ڕێکخراوێکی کرێکاریی بەربلاو بەو شێوەیە زۆر دژوار بوو. هەربۆیەش بەیارمەتیی یانەی کرێکاران بینایەکی گەورەمان بەکرێ گرت و

بەڕواڵەی چەند بنەماڵەیەکمان لەوێ دانا و ئەوێمان بۆ پێگەیاندنی کرێکارەکان لەباری سیاسییەوە ئامادە کرد. هەموو ڕۆژێك بەیانیان و دوای نیوەڕوان بەشێك لەو کرێکارانەی کە جێگای متمانە بوون لەوێ فێری زمانی دایکی و زانستی سیاسی دەبوون. خولەکانی ئەوێ شەش مانگە بوو. باشترین مامۆستاکان بەبێ مووچە لەوێ وانەیان دەگوتەوە. قوتابییەکانیش زۆر بەباوەڕەوە خەریکی فێربوونی زانستەکان بوون. بەشێك لەوان ئێستاش خەریکی خەباتی پیشەین. هەتا کۆتایی ساڵی ١٣٠٧ ( ١٩٢٨ ز) سەرکوت لە خووزستان زۆر بوو ئێمە نەماندەتوانی بەرێکوپێکی کاروبارەکانمان بکەین. لەوسەردەمەدا دەستەی بەڕێوەبەر وابڕیاری دا بەهەر شێوازێك بووبێت کۆبوونەوەیەکی بەرفراوان بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی نوێی دەستەی بەڕێوەبەرو قسەو باس لەسەر چۆنیەتی درێژەدان بەخەبات دژ بەکۆمپانیای نەوت و ڕژێمی دیکتاتۆر ببسترێت. لەدەرەوەی خووزستان نەدەکرا وەها کۆبوونەوەیەك بکرێت لەبەرئەوەی لەوانەبوو پۆلیس لەو کەین و بەینەی بزانیبایە. لەبەرئەوەی لەوەرزی زستان و لە یەك ڕۆژدا ئەو هەموو کرێکارە بەناوبانگە ئەچن بۆ سەر کار و سەفەر بکەن، بۆ کۆمپانیای نەوت و پۆلیس جێگای گومانە و لەوانەیە لەوبارەیەوە لێکۆڵینەوە بکەن. لەلایەکی دیکەشەوە وەها کۆبوونەوەیەك لەناو خووزستاندا گێرەوکێشەی تایبەت بەخۆی هەبوو. هەربۆیە دەستەی بەڕێوەبەر بڕیاری دا کە:

١- کۆبوونەوەکە لەڕۆژێکی پشوو دا ببەسترێت.

٢- پرۆگرامەکە وەها بێت کە ماوەی کۆبوونەوەکە لەدوازدە

کاتژمێر تێپەڕ نەبێت.

٣- شوێنی کۆبوونەوەکە لەدەرەوەی شار بێت.

٤ – جگە لەئەندامانی بەڕێوەبەر، تەواوی ئەندامانی دیکە هەتا کاتی بەڕێکەوتن لە شوێنی کۆبوونەوەکە ئاگادار نەبن.

لە مانگی ڕەمەزان لەڕۆژێکی پشوودا کەناری چۆمی بەهمەن شیر لەنێو یەکێك لە دارستانەکاندا یەکەمین کۆبوونەوەی گشتی کرێکارانی خووزستان بەئامادە بوونی ٤٨ کەس لەنوێنەرانی کرێکاران بەڕێوە چوو.

سەرۆکی ڕێکخراوی کرێکاران لەدوای پیرۆزبایی و داوای یەکگرتوویی کرێکاران بەرنامەی کۆبوونەوەی گشتیی کرێکارانی بەشێوازی لای خوارەوە باسکرد:

١- ڕاپۆرتی دەستەی بەڕێوەبەر سەبارەت بەکارو چالاکییەکانی هەژدە مانگی ڕابردوو قسەو باس لەو بارەیەوە.

٢- ڕاپۆرتی سەرۆکی ڕێکخراوەکە.

٣- ڕاپۆرتی بەرپرسی ڕاگەیاندن و بەرپرسی دارایی ڕێکخراوەکە.

٤- ڕێکخستن و پەسندکردنی پەیڕەو پرۆگرامی نوێ.

٥- قسەو باس لەسەر پێشهاتەکانی ڕۆژ و هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەریی نوێ.

لەدوای خوێندنەوەی بەرنامەکە وتی کە هەریەك لە نێوە نوێنەری بەشێك لەکرێکارانن لە پرۆسەی هەڵبژاردنی ئێوەدا ڕێکخراوەکە چاودێری ئەو دەنگدانەی کردووە.

ئەو لەدرێژەی قسەکانی دا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە

زۆربەی ئێوە ئاگاداری پێوەندیی نێوان رێکخراوی کرێکارانی خووزستان لەگەڵ رێکخراوی جیهانیی کرێکاران نین. هەر بۆیە داواکارم ئەوە پەسند بکەن کە تەواوی ئەندامەکانی ئاگاداری ئەو پێوەندییە بکرێنەوە. سەرمایەدارەکانی جیهان پێکەوە پێوەندییان هەیە ئێمەیش دەبێ وابین. بەچەپڵەی ئامادەبووان قسە و باسەکانی سەرۆك کۆتاییهات.

بەرپرسانی رێکخراوەکە راپۆرتی کارو چالاکییەکانی هەژدە مانگی رابردوویان باسکرد و لەدوای قسە و باسێکی زۆر لەسەر شێوازی خەباتی دژ بە کۆمپانیای نەوت زۆرینەی نوێنەرانی بەشداربوو شێوازی کارکردنی دەستەی بەرێوەبەرییان پێ باش و بەنەرخ بوو. هەر لەبارەی شێوازی خەباتی یەکگرتووانە لەبەرامبەر کۆمپانیای نەوت و بەکرێگیراوە ئێرانییەکانیانەوە سەرۆك هێمای بەوەکرد ئێمە لەماوەی ئەو ساڵ و نیوەدا بەو پێیەی کە هیچ کەرەستەیەکیشمان لەبەردەستدا نەبوو رێکخراوێکی وەها گەورەمان لەخووزستان پێکهێناوەو نەمانهێشتووە سەرمایەدارانی ئینگلیز و داردەستەکانیان پێمان بزانن.

لەو کۆبوونەوەدا پێشهاتەکانی رۆژ بەشێوازێکی زۆر جوان لە کەشێکی زۆر گەرم و هاورێیانەدا شیدەکرایەوە کەهەموو ئەو ئەندامە لێهاتوانەی کە لەدەرەوە هاتبوون زۆر بەلایانەوە سەیر بوو.

لەو کۆبوونەوەدا کە بەهۆی کەمیی کاتەوە تەواوی باسەکان بەپەلە شیدەکرایەوەو باسی لێدەکرا. پەیرەو و پرۆگرامی رێکخراوی کرێکارانی خووزستان بەزۆرینەی دەنگ پەسندکرا و چەندکرێکارێکی

لێهـاتووی بەئــەزمونیش وەك دەســتەی بەڕێوەبــەریی ڕێکخــراوی کرێکارانی خووزستان دەستنیشانکران.

هەرچـەندە لەوکاتـەوەی کـە ڕێکخـراوی کرێکـارانی خووزسـتان پێکهاتبوو ڕێبـەرانی ئـەو ڕێکخـراوە لەگـەڵ ڕێکخـراوی نێونەتـەوەیی کرێکارانـدا پێوەنـدییان هـەبوو خۆیـان بـە بەشـێك لـەو ڕێکخراوەیـە دەزانی.

کۆبوونەوەکە ئـەو شـێوازی کارکردنـەی بـەباش زانـی و پەسـندی کـرد و دەسـتەی بەڕێوەبـەری نـوێی ڕاسپارد کـە تـەواوی ئەنـدامانی ڕێکخراوەکــە بەشــێوازێك پــەروەردە بکــات کــە لــە ڕۆژی یەکــەمی بەئەنـدامبوونی خـۆی بەئەنـدامی ڕێکخـراوی نێونەتـەوەیی کرێکـاران بزانێـت و هـەروەها بڕیـاردرا لەکۆبوونەوەکانـدا لەسـەر گرنگیـی ئـەو مەسەلەیە قسەو باس بکرێت، هەتا کرێکارەکان بـەو قەناعەتـە بگـەن. لـەو کۆبوونەوەیـەدا بڕیـاری زۆر سـەخت دژبـە کۆمپانیـای نـەوت و ڕژێمی دیکتاتۆر لەلایەن ئەندامانەوە پەسندکرا.

هەروەها بڕیار درا بـۆ بەگژداچوونەوەی نـەیارانی چینی کرێکار لەگەڵ ڕێکخـراوی نهێنی دیکـەدا پێوەنـدییان هـەبێت. هـەروەها دەبـێ پیاوانی کۆمپانیای نەوت ڕیسوابکرێن.

دامەزرانــــدنی قوتابخانــــەی نهــێنی بــۆ کرێکـــاران لەلایـــەن بەشــداربوانەوە ڕێــزی لــێگیرا و هــەروەها بڕیـاردرا بـۆ دامەزرانـدنی قوتابخانـەی دیکـە بـۆ کرێکـاران و نـاردنی چـەند کەسـێك لـەوان بـۆ خوێندن لەدەرەوەی خووزستان. ماوەی کۆبوونەوەکە دوازدە کاتـژمێر بـوو. گـەورەترین و گـرنگترین کۆبوونـەوەی کرێکـاران بـە بـێ کێـشە

کۆتـایی پێهـات و هـەموان بەخۆشـحاڵییەوە گەڕانـەوە بـۆماڵـەکانی خۆیـان. پـەیڕەوو پڕۆگرامـی کرێکـاران پەسـندکرا. لەبەرئـەوەی زۆر کاتی خوێنەران نەگرین. باسی هەمووی پەسند کراوەکان ناکەین بەس چەند پەسند کراوێکی گرنگ لێرەدا باسدەکەین. بڕگەی ۲ ی پرۆگـرام ـ " ناساندنی مـاف یاسایی رێکخـراوی کرێکارانی خووزسـتان. " لـەو سـەردەمەدا دامەزرانـدنی ڕێکخـراوی کرێکـاری بـەبێ ئـەوەی نایاسایی بێـت، لەلایـەن ئاسایـشەوە قەدەغـەکرابوو. ئەگـەر بێتـوو ئەنـدامێکی ڕێکخراوەکـەیان کەشـف بکردایـە ئـەوە دەیـانگرت و دەیانخـستە ژێـر ئەشـکەنجەوە. زۆربـەی گیراوەکـان بـەهۆی ئەشـکەنجە و خراپـی بـارودۆخی بەندیخانـە و نـەبوونی خـواردن و دەواو دەرمـان لەبەندیخانـەکان دا گیانیـان بـەخت دەکـرد. هەربۆیـەش ڕێکخراوەکـە بەئازادی چالاکی و ماف یاسایی کارکردن گرنگی زۆری دەدا.

هەروەك پێشتر باسمانکرد لەخراپی بارودۆخی کرێکاران و بژیوی ژیانی ئەوان کرد، هەر لەو بارەیەوە بڕگەی ٥ی پرۆگرامەکە دەڵێت: " خەبات بۆ باشترکردنی بژیوی ژیان و دەستەبەر کردنی ماف مرۆیی بۆ کرێکارانی خووزستان ".

بڕگـەی ٧ی پرۆگـرام - ناچـارکردنی کۆمپانیـای نـەوت بـۆ دابینکردنی ماف بیمەی بێکاری، پەککەوتن، هی دیکە بۆ کرێکاران.

بڕگەی ۹ ی پرۆگرام – ماف خۆپێشاندان و مانگرتن بۆ کرێکاران.

بڕگـەی ۱۲ – هەوڵـدان بـۆ دامەزرانـدنی یانـە کۆمەڵایـەتی و وەرزشییەکان بۆ کرێکاران.

## ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی کرێکاران

١- تەواوی ئەو کەسانەی کە کار دەکەن و بەدەستی خۆیان بژیوی ژیانی خۆیان دابین دەکەن و ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ماف کەس ناخۆن، دەتوانن ببن بەئەندامی ڕێکخراوەکە.

٢- پەیرەو پرۆگرامی ڕێکخراوەکەیان قەبووڵ بێت.

٣- ڕابردوویەکی خراپیان نەبووبێت.

بەپێی ڕێنمایی دەبێت لەکۆبوونەوەکاندا بەشداری بکات، هەقی ئەندامێتی بدات و بۆ بەرەوپێشچوونی ڕێکخراوەکە هەوڵبدات، نهێنییەکانی ڕێکخراوەکە بپارێزێت. ڕێنمایی ڕێکخراوی کرێکارانی خووزستان تەواوی ئەو کەسانەی کە ماف کەسی دیکە پێشێل دەکەن لە ماف بوون بەئەندامی بێ بەری کردووە. هەر بەپێی ئەو ڕێنماییە، هەڵبژاردنەکان بەشێوەی ئاشکرا بەڕێوە دەچوو. ئەندامانی ڕێکخراوەکە، پەیرەوی زۆرینە دەبوون، دەنگی نیوەی زێدە یەکی ئەندامان لەبەرچاو دەگیرا. لەدوای باس لەسەر ئەو بابەتانەی کە باسمانکردن، هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەریی سەندیکا کرێکارییەکان بەڕێوە چوو ئەو کرێکارانەی لای خوارەوە بەدەنگی زۆرینە لەڵبژێردران:

١- مووسا جنوبی کرێکاری لۆکۆ شاب ٢- شەعبان کرێکاری سڵینگ ٣- ڕەمەزان کرێکاری کارەبا ٤- حەسەن عەلی سابتی کرێکاری کارە قورسەکان ٥- سەید خەلیل پەیغەمبەر نەژاد بڕبەن کار ٦-ڕەحیم خوونی بڕبەنکار ٧- یووسف ئیفتخاری کرێکاری تەڕیشاب ٨- غولام ڕەوانی ٩- غولام سام.

ئەنـــدامی بەڕێوەبەرایـــەتیی تـــازە هەڵبـــژێردراو هەرلەوکاتـــەدا کۆبوونەوەیەکیان کرد و سەرۆکی شاندەکانیان هەڵبـژارد بـە شـێوازی لای خوارەوە:

١- شاندی ڕێکخراو ٢- شـــاندی بانگەشـــە ٣- شـــاندی پـــشکنین

٤- شاندی ستایشکردن ٥- شاندی بەڕێوەبەرایەتی ٦- سەرۆکایەتی

بەڕێوەبـــەرەکان دەبـــوو خۆیـــان ئەنـــدامانی شـــاندەکەیان هەڵبژاردایـەت. سـەرۆکایەتی سـەندیکا بەرپرسـی هـەموو کارەکـانی شاندەکان بوو. هەتا ئـەو سـەردەمە شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی مانایـەکی تایبـەتی نـەبوو، بـەڵام لەخووزسـتان باردۆخەکـە وا بـوو کەجگـە لـەو شاندانەی دیکـە شـاندی بەڕێوەبەرایـەتیش دابمـەزرێت. لـەدوای تـەواو بوونی یەکەم کۆبوونـەوەی گـشتیی ڕێکخـراوی کرێکارانی خووزسـتان، کرێکـاران دەسـتیاندایە چـالاکییەکی بـێ وێنـە، سـەرنجی ڕێکخـراوی جیهانیـان بـۆلای خۆیـان ڕاکێـشا. لەسـاڵی ١٣٠٨ ی هـەتاوی ( ١٩٢٩ ز) ڕێکخراوی کرێکـارانی خووزسـتان گـەورەترین و چالاکترین ڕێکخـراوی ئێـران هـەژمار دەکـرا. لـەنێوان دوو سـاڵدا نوێنـەرانی ناوەنـدی ڕێکخراوەکـە وەهـا چـالاکییەکیان کردبـوو کـە بەشـێك لەئەنـدامانی ڕێکخراوەکە سەریان سوڕمابوو لەو هەموو پێشکەوتنە. ڕێکخراوەکـەی خووزستان بەو پارەی کە ئەندامەکان وەکو ماق ئەندامیـەتی دەیـان دا بەڕێوە دەچوو، هـیچ پارەیـەکیان لەناوەنـدەوە بـۆ خـەرج نـەدەکرا. لـە سەروبەنـدی سـاڵی ١٣٠٨ ی هـەتاوی ( ١٩٢٩ ز) جـان کیدمـەن سـکرتێری گـشتیی کۆمپانیـای نـەوتی ئێـران و ئینگلیـز بـۆ درێژکردنـەوەی پەیماننامـەی دارسـی هـات بـۆ ئێـران و لەگـەڵ کاربەدەسـتانی ئێرانـدا

دانیشتنیان کرد و پیشکەوتنێکی بەرچاویشیان لەوبارەیەوە بەدەست هێنا. ئەو کاربەدەستانەیش یان بەهۆی دۆستایەتی لەگەڵ ئینگلیزەکان و یان بەهۆی ترسەوە نەیاندەتوانی دژایەتی جان کیدمەن بکەن.

ڕێکخراوە کرێکارییەکانیش جگە لە ڕێکخراوی کرێکارانی خووزستانیش ئەوەندە لاواز بوون کە نەیاندەتوانی دژ بەو بابەتە هەڵوێستی ڕاشکاوانەیان هەبێت. لەو سەردەمەدا ڕێکخراوی کرێکارانی خووزستان یەکەمین ڕاگەیەندراوی خۆی لەو بارەیەوە کەبە ژێلاتین چاپکرابوو لەڕێگای پۆستە و چەسپاندنی بەسەر دیوارەکان دا بۆ خەڵکی بڵاو ردەوە.

دەقی ڕاگەیەندراوەکە

هاوڵاتییانی بەڕێز! بازرگانان و کاسپکاران و کرێکاران و وەرزێرانی چەوساوە و بەشمەینەت. لەوکاتەوەی کە دارسی ناوێکی ئینگلیزی، بێ مەیلی و نەزانکاریی شا قاجارەکانی بەهار هێناوە بۆ بردنی نەوت و سەرمایەی ئەم وڵاتە، تەنیا هیوای ئێمە، ئێران کە شوێنی باوباپیرانی ئێمەیە خستویانەتە ژێردەستەڵاتی خۆیان و بەهەوەسی خۆیان خەڵك دەچەوسێننەوەو دزی دەکەن و لەهەموو کاروبارێکی ئەم وڵاتە دەستومر دەدەن و لەڕێگای مووچەخۆرەکانیانەوە هەموو جۆرە ئازادییەکیان لە ئێمە زەوت کردووە، لەم سەردەمەدا کە دونیا بەخێرایی بەرەو پیشکەوتن هەنگاو هەڵدەگرێت پێشیان بەپێشکەوتنی ئێمە گرتووەو هەروا کە هەمووتان

ئاگادارن ئێران بەرەو نەهامەتی و نەمان دەچێت.

ئێمە بەشەڕکردن و دژایەتی لەگەڵ شێخ غەزعەل و کەسانی خۆفرۆشی دیکە ئەم حکومەتەمان بەهێز کرد بەو هیوایەی کە کار بۆ خەڵکی هەژار بکەن و چیتر ڕێگای وڵاتان دیکە نەدەن کە ماق ئەم خەڵکە پێشێل بکەن و ئێمە لەو پەتایە بەتایبەت کۆمپانیای خوێنمژی نەوت ڕزگار دەکەن. بەداخەوە تەوای ئەو خەون و ئاواتانەی ئێمە بێ جێگا و ئەو هەموو خەباتەمان بەفیڕۆ چوو.

ئەم دەوڵەتەی کەئێستا لەسەر دەستەڵاتە لە سەرەتاوە داواکاریی ئازادی و وڵات پەرستی بوو بەڵام لەدوای ئەوەی کە شوێنپێی خۆی کردەوە، ئەو دەمامکەی لەسەر ڕووی لادا. ڕووی ڕاستەقینەی خۆی کە دژ بە ئازادی و مرۆڤایەتی بوو نیشانی دا. هەڵبەت هاووڵاتیانی خۆشەویست لەبیادیان نەچووە کە بەدڵێکی خۆش لەبابەت نەمانی یاسای کاپیتۆلاسیۆن پیرۆزباییان لەیەکدی دەکرد، بڕوامان وابوو بەنەمانی ئەو یاسایە چیدی ئێران و ئێرانی لەکۆت و بەند ڕزگاریان دەبێت و لەمەبەدواوە بەئازادی دەژین. بەڵام بەداخەوە خەونەکانمان وەکو خەیاڵی خاو وابوو. هەروا کە بۆ خۆتان دەبینن خەڵکی ئێران بەدەستی ئینگلیزەکانەوە خەریکن لەناو دەچن و ئەوانیش بە هەموو شێوازێك خەریکی تاوانکاری و چەوساندنەوە دژ بە خەڵکن. وادیارە نەمانی یاساکە بەس بەتەنها بۆ ڕووسەکان بوو ئینگلیزەکان ناگرێتەوە.

هاووڵاتیی خۆشەویستا جان کیدمەن بۆ درێژکردنەوەی پەیماننامەی دارسی هاتووە بۆ ئێران و بەداخەوە تەواوی پیاوەکان و

**مووچەخۆرەکانی ئینگلیز کە ئێستا لەم وڵاتە کاربەدەستن لەگەڵیدا هاوڕان و بەنیازن هەتا هەتایە ئێران لەژێر دەستی خۆیان بهێڵنەوە. تەواوی خەڵك دژ بەوبڕیارەن، بەڵام ئێمە دەزانین دەوڵەتی ئێران هیچ ڕێزێك لەبیرو ڕای گشتی ناگرێت و ئەو پەیماننامەیە درێژ دەکرێتەوە. بەبڕوای ئێمە تاکەڕێگەچارە ئەوەیە جان کیدمەن لەم وڵاتە وەدەرنێین. ئەویش ناڕوات مەگەر لەکاتێکدا هەموو خەڵك یەکدەنگبن. خەبات دژ بە دەستدرێژییەکانی ئینگلیز، خەبات بۆ دەستەبەر کردنی ئازادیی ڕاستەقینەیە. ئێمە هەموو چین و توێژەکانی ئێران، بەتایبەت کرێکاران و وەرزێران بانگهێشت دەکەین بۆ ئەم ڕاپەڕینە مەزنە بۆئەوەی لەم هەل و مەرجە هەستیارەدا ئێران لەدەستی داگیرکەران ڕزگار بکەین و هەروەها هۆشداری دەدەین بەدەوڵەت کەخەڵکی ئێران دژی ئەو پەیماننامەیەن و ئەگەر بێتوو ئەو دانیشتنانە ڕانەگرێت ئەوە ئێمە دژ بە دەوڵەتی خۆفرۆشیش دەوەستینەوە. ئازادیخوازانی خووزستان.**

لەدوای هاتنی جان کیدمەن بۆ ئێران و بلاوبوونەوەی ئەو ڕاگەیاندراوە، پیاوەکانی کۆمپانیای نەوت و پۆلیس کەوتنە خۆیان و دەستیاندایە گوشارو لێکۆڵینەوە لەخەڵك. زۆر یەك لەوکاسبکارانەی کە هەستی نەتەوایەتیان بوو بەشێوەیەکی نایاسایی دەستبەسەر و تارێندران.

تاراندنی بەکۆمەڵی ئەو کەسایەتییە بەناوبانگانە ئەوەندەی دیکە خەڵکی نارازی و تووڕەکردو هەرچەندە پۆلیس زۆر بەتوندی چاودێری خەڵکی دەکرد بەڵام خەڵك ڕاشکاوانە بیروڕای خۆیان

دەردەبـــڕی و پـــشتیوانییان لەدەستبەســـەرکراوان دەکـــرد و داوای ئازادبوونیـــان دەکـــرد. دەستبەســـەرکردن و تارانـــدنی بازرگانـــان و کاسبکارانی ئابـادان کاریگـەری ڕاگەیاندراوەکـەی چـەندقات کردبـوو. لەهـــەموو جێگایـــەك بـــاس لەســـەر ڕاگەیاندنەکـــەی ئـــازادیخوازانی خووزســـتان بـــوو. تەنانـــەت ئەوکەســـانەیش کـــە بێلایـــەن بـــوون پـــشتیوانییان لـــەو ڕاگەیانـــدراوە دەکـــرد و لەگـــەڵ هەڵـــسووکەوتی چەوسێنەرەوانەی دەوڵەتدا دژایەتیان دەکرد.

لـەو کاتـەدا سمایـل ناوێـك کەخـەڵکی دەوان بـوو لەگـەڵ ئەحمـەد دەوانــی کرێکـاری کۆمپانیـای نـەوت و ئەنـدامی ڕێکخـراوی کرێکـاران دەبێـت بەشـەڕە قـسەیان. وادیـار بـوو سمایـل پێـی نـاخۆش بـوو کـە ئەحمەد ئەندامی ڕێکخراوێکە و لەوی شاردومتەوە. سمایل دەچێت بـۆ لای محەمەد کێرمانی سکرتێری " لیبر ئافیس "[٦] و هەموو شتێکی بۆ باس دەکات. موحەمـەد کرمـانیش دەچێت و ئـەو هەواڵـە دڵخۆشـکەرە دەدات بە مێترووبل سەرۆکی پۆلیسی کۆمپانیای نەوت.

لەکۆتاییـــشدا کۆمپانیـــای نـــەوت فـــەرمانی گـــرتن و لێکۆڵینـــەوە لەئەحمـەد و هاورێکـانی دەدات بەسـولەیمان خـان سـەرۆکی ئاسایـشی ئابادان.

ئاسایشیش لەکاتی گەڕان لـە خـانوی کرێکارەکـان لـەدارایی سـەید خـــەلیل پەیغەمبـــەر نـــەژاد ڕێنماییـنامەیـــەکی کـــاتیی ڕێکخراوەکـــە دەدۆزێتەوە کە زۆر بەنرخ نیە لەبەرئەوەی پێش کۆبوونەوە گشتیەکە نووسرابوو.

---

[٦] – فەرمانگەی کار

ڕۆکنەدین موختاری کە بەبابەتەکە دەزانێت لەزووترین کاتدا لە ئەهوازەوە دەچێت بۆ ئابادان. لەیەکەم دانیشتنیدا دەیەوێت فێڵ لە سەید خەلیل بکات کە ئەگەر بێتوو ڕاستییەکان باس بکات، سەرۆکی ئاسایش ژیانێکی خۆش بۆ خۆی و بنەماڵەکەی دابین دەکات. سەید خەلیلی داماویش لەڕووی ناچارییەوە دان دەنێت بەهەموو ڕاستییەکاندا. بەهۆی ئەوەی کەجگە لە چەند کەسێك کەخزمەکانی خۆی کەسی دیکەی نەدەناسی، بەموختاری پێشنیار دەکات کە دوو کەس لەدامەزرانی یانەی کاوە کە بریتیبوون لە شەعبان و ڕەحیم کونی دەستبەسەر بکات و بەئەشکەنجە و لێدان تەواوی ڕاستییەکان ئاشکرا بکات. بەهۆی ئەوەی ناونیشانی دامەزرێنەرانی یانەکەی ڕوونبوو، بەفەرمانی موختاری تەواویان دەستبەسەر دەکەن و دەست دەکەن بەلێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا. ئەو دەستبەسەر کردنانە دەبێتە هۆی ڕق و بێزاری زۆرتری خەڵکی ئابادان. خەڵك هەستیان بەوە دەکرد کە ئەو هەموو زەخت و گوشارە بۆ درێژکردنەوەی ماوەی گرێبەستەکەیە و دەیانزانی کە پیاوانی دەوڵەت و تەنانەت دام و دەزگای پۆلیسیش بوونەتە داردەستی کۆمپانیای نەوت و دەوڵەتی ئینگلیز و بەنیازن نەیاران سەرکوت بکەن. بەهۆی ئەو هەموو گوشارە لەگەڵ نەیارانی کۆمپانیای نەوت و تەنانەت ئەو کەسانەی کە سەر بەدەوڵەت بوون، بوونە دژی دەوڵەت و کۆمپانیای نەوت. نارەزایی خەڵك لەو هەلومەرجەدا لەبارەی درێژکردنەوەی ماوەی گرێبەستەکە لەگەڵ جان کیدمەن گەیشتبووە ئاستێکی بەرزو دەرفەتێکی گونجاو بوو بۆ دەربڕینی ئەو نارەزاییە بەرینە. لەو کاتەدا بەشێك لە ئەندامانی

ناوەنـدی ڕێکخراوەکە لـە بەندیخانـەی ئابادانـەوە فـەرمانی مـانگرتنی گشتییان دەرکرد.

لەڕۆژی دووشەم سێزدەی گولانی سالی ١٣٠٨ ی هەتاوی ( ١٩٢٩ ز) تـەواوی ئـەو چـواردەهەزار کرێکـارەی کـە لـە پالاوگـەی ئابـادان کاریاندەکرد دەستیاندایە مانگرتن.

کۆمپانیای نەوت لەبەرنەوەی مانگرتنەکە بەرەو کارگەکانی دیکە مەسـجید سـولەیمان ڕۆژی دووشـەممەی بـەبیانوی جەژنـەوە کـردە پشووی ڕەسمی. ( لەوسـەردەمەدا ئابـادان و مەسجدسولەیمان ناوەنـدی کرێکار بـوون، هـەفتکۆل و گەچساران و شـوێنەکانی دیکە زۆر گـرنگ نـەبوون). مانگرتووەکـان لەبـەردەرگای پالاوگـە کۆبوونـەوەو، داواکارییەکانیان بریتی بوون لە:

١- تەواوی ئەو کەسانەی کە لەم ماوەیەدا بـەهۆی دژایـەتی لەگـەڵ پرۆسـەی درێژکردنـەوەی مـاوەی گرێبەسـتەکە و کۆمپانیـای نـەوت دەستبەسەر کراون دەبێت ئازاد بکرێن.

٢- دەبێت مووچەی کرێکارەکان ئەوەنـدە بێت کە بەشی بـژیوی ژیانیان بکات.

٣-کرێکـاران دەبێـت لەسـالێکدا مانگێـک پـشوویان بێـت و مووچەکەشیان بۆ خەرج بکرێت.

٤- تەواوی ئەو غەرامانە کە پارەیە هەلبگیرێت.

٥- بـۆ تـەواوی کرێکارەکـان، زگـورت و خێزانـدار خـانوو دابـین بکرێت.

٦- سەیارە دابین بکرێت بۆ هاتووچووی کرێکارەکان.

٧- ئەوەی خواردنەوەی خاوێن بۆ هەموان دابین بکرێت.

٨- دەرکردنــی کرێکــار بــەهۆی هەوەســی ئینگلیزەکــان و بــەبێ هۆکاری دیکە قەدەغەیە.

٩- بابەتەی دەرکردنی هەتا هەتایی و پێرستی ڕەش نەمێنێت و کرێکار بچێتەوە سەر کار.

١٠- خەســتەخانەکە چــاك بکرێـــت و تــەواوی کرێکارەکــان و بنەماڵەکانیان بە بەلاش چارەسەر بکرێن

١١- لێدان و سووکایەتیکردن بەکرێکار دەبێ هەلبوەشێتەوە.

١٢- ئازادیی چالاکیی ڕێکخراوی کرێکاران بەفەرمی بناسرێت.

١٣- پارەیەك لەژێرناوی قەرەبوو بدرێتە ئەو کەسانەی کە لەسەر کار تووشی کارەسات هاتوون و نۆقسان بوون.

١٤- کرێکاران لەبەرامبەر کارەسات و پیری دا بیمە بکرێن.

١٥- لەوەرزی هاویندا کاتەکانی کارکردن بۆ حەوت کاتژمێر کەم بکرێتەوە.

١٦- تــەواوی خێزانــی کرێکارەکــان بەبــەلاش لــە نەخۆشــخانەی کۆمپانیا چارەسەریان بۆ بکرێت.

١٧- بۆ چارەسەرکردنی گرانیی بازاڕ و دابینکردنی پێداویستیی کرێکاران کۆمپانیا هاریکاریی کرێکاران بکات بەبەشداریی خۆیان و سەرمایەی کۆمپانیای نەوت دابمەزرێت.

کرێکارەکان ئاگادارکرانەوە کە جان کیدمەن کە بۆ گفتوگۆ لەسەر درێژکردنــەوەی مــاوەی گرێبەســتی دارســی هــاتبووە تــاران ئاگــاداری مانگرتنی گشتی بووە و بەفڕۆکە گەڕاوەتەوە لەندەن و گفتوگۆ لەو

بارمیەوە بۆ کاتێکی نادیار دواخراوە، هەر بۆیەش کرێکارەکان لەو بارەیەوە چەند پێشنیارێکیان دایە بەرپرسانی دەوڵەتیی شاری ئابادان.

بەهۆی ئەوەی لەئابادان سەربازگەی لێنەبوو هێزی پۆلیس و ئاسایشیشی کەمبوو لەماوەی کاتژمێرێکدا شاری ئابادان کەوتە ژێر کۆنترۆڵی کرێکارانەوە.

ئاسایش فەرمانڕەوای شاری ئابادان هەوڵی دا بەدرۆو تەفرەدان پێش بەو مانگرتنە بگرێت. یەکێك لە وەزش انان بەناوی مامۆستا حاجی وەهاب شەقەزلەیەکی لە فەرمانڕەوا دا کەبەدەوری خۆیدا سووڕایەوەو هەڵهات. ڕۆکنەدین موختاری چووە سەر کورسییەك و ویستی قسە بکات. کرێکارەکان کورسیەکەیان لەژێر قاچی ڕاکێشا، هاواریان دەکرد مەرگ و نەمان بۆ مووچەخۆرانی کۆمپانیای نەوت و ئەویان لەوێ دەرکرد. پۆلیسی ئابادان کە بۆ پێشگرتن لەکرێکاران ڕێگای هاتنە نێو شاریان گرتبوو کاتێك زانیان ناتوانن پێش بەپێشڕەویی کرێکاران بگرن چوونە نێ بنکەی پۆلیس و دەرگاکانیان داخست و لەسەربانەکان خۆیان حەشاردا. بینای پۆلیسیش لەلایەن کرێکارانەوە گەمارۆ درا. موختاری کە خۆی بە فیرعەون دەزانی، پەنای بردە بەر ڕێبەرانی کرێکاران و لێیان پاڕایەوە کە نەهێڵن کرێکارەکان بنکەی پۆلیس داگیر بکەن. کۆمپانیای نەوت بۆ بەلاڕێدابردنی ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییە بەلأت و خوێڕییەکانی شاری وت دووکانەکان تالان بکەن. بەڕێوەبەرانی مانگرتنەکە بەو بابەتەیان زانی و کۆمەڵێکی زۆر لەکرێکارەکانیان نارد بۆ پاراستنی دووکانەکان و

بانکی ئینگلیز. ئینگلیزەکان زانیان ئەو نەخشەیان ئاشکرا بووە بەپۆلیسی ئاگر کوژێنەوە فەرمانیان کرد بۆ سەرکوتکردنی کرێکارەکان بچن بۆ یارمەتیی پۆلیس. کۆمپانیای نەوت نەیدەزانی ئێرانی لەهەر جل و بەرگێکدا بێت دژبەو هەڵسوکەوتانەی ئەوانەو وایاندەزانی لەبۆ پاراستنی کۆمپانیای نەوت هەموو شتێك دەکەن.

بەهۆی ئەوەی زۆربەی پۆلیسەکانی ئاگرکوژێنەوە ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی کرێکارانیان ڕەچاو دەکرد چوونە ڕیزی خۆپیشاندەرانەوە.

تەواوی خەڵکی خووزستان پشتیوانی مانگرتووەکان بوون. ئینگلیزەکان لەترسی کرێکارەکان ئابادانیان بەجێهێشت، لەڕاستیدا شار لە بوونی ئەوان پاك کرابووەوە، بەس چەند کلاوێکی حەسیرییان لێ بەجێمابوو کە ئەویش ببوە هۆی ڕابواردنی کرێکارەکان و بەحەوادا فڕێیان دەدان و خۆشی و سەمایان دەکرد. لەخ ۆشی چوونەوەی جان کیدمەن بۆ ئینگلیز تەواوی خەڵکی خووزستان جگە لەچەند کەسێك کە سیخوڕی کۆمپانیای نەوت بوون خۆشحاڵ بوون و پیرۆزباییان لەیەکدی دەکرد.

## ژیانی کرێکار لەمانگرتنی ١٣٠٨ ی هەتاوی ( ١٩٢٩ ز)

لە پالأوگەو کارگەکانی دیکەی کۆمپانیای نەوتدا، ژنان کاریاندەکرد، هەر بەو هۆیەشەوە پێکهێنانی ڕێکخراوی ژنان بۆ ئێمە زۆر دژوار بوو، بۆ ئەوەی هێزی ژنان لەڕێکخستنەکاندا بەکار بێنین. فەرمانمان کرد بەئەندامەکان هەتاکوو لەگەڵ ژنان و کچانی نێو بنەماڵەکانیاندا قسە بکەن و لەگەڵ خەباتی چینایەتی ئاشنایان بکەن

و ولآمەکەمان بۆ بگێڕنەوە. کرێکارەکان فەرمانەکەیان بەجێهێنا، لەو پشکنینە دا دەستکەوتی باشمان هەبوو تەنانەت پۆلیس و رۆکنەدین موختاریش سەریان لەو بابەتە سووڕمابوو.

زۆربەی کرێکارەکان بنەماڵەکانیان بەو قەناعەتە گەیاندبوو کە دەهاتن و لەکۆبوونەوەکان دا بەشدارییان دەکرد. بەهۆی بانگەشەی درێژماوەو بەشداریی ژنان لەکۆبوونەوەکان دا ئاستی بیر کردنەوەی ژنان زۆر بەرز بووەوە، هەربۆیە لەکاتی مانگرتنەکاندا ئەوان لەژێر رێبەرایەتی خاتوو زەهرا موحەممەد سادق، هاتنە یارمەتیی کرێکاران و شانبەشانی ئەوان دەوری کارایان هەبوو. زەهرا لەکاتی وتار خوێندنەوەدا هاوکات لەگەڵ ئەوی کە دژی ئەو کارە چەوسێنەرانەی کۆمپانیای نەوت و هەڵسوکەوتی دژە نەتەوەیی پیاوەکانی دەوڵەت قسەی دەکرد سەرۆکی گشتی ئاسایشی خووزستانیشی بەتاوانبار لەقاو دا و لەپێش چاوی پۆلیس و کاربەدەستانی دەوڵەت و بەدەنگی بەرز وتی کە سەرۆکایەتی پۆلیس وئاسایش ناردەستی کۆمپانیای نەوتن و خیانەتیان بەخەڵکی ئێران کردووە. رۆکنەدین موختاری لەبەرامبەر قسە و باسەکانی خاتوو زەهرا نەیدەتوانی هیچ قسەیەك بکات و بێدەنگیی هەڵبژارد. خاتوو زەهرا هەموو کاتێك کرێکارانی هاندەدا بۆ خەبات دژی چەوسێنەران و بانگهێشتی دەکرد بۆ وەرگرتنی مافەکانی خۆیان. هەست و شەوقی خەباتی ژنان زۆرتر لەپیاوان بوو، بەهۆی ئەوەی بەپیاوەکان بەپێی یاسا و رێسای رێکخراوەکە هەڵسووکەوتیان دەکرد. ژنەکان بەپێچەوانەوەوە بە پێی هەستی خۆیان کاریاندەکرد، بە بەردەوام پیاوەکانیان هاندەدا بۆ داگیرکردنی ئاسایش و بەندیخانەکان.

ژنـــان زۆرتـــر بڕوایـــان بـــە بۆچـــوونی ئانارشیـــستی هـــەبوو بەنابـــەدڵ فەرمانەکانی ڕێکخراوەکەیان لەبەرچاو دەگرت. زۆرێك لـە پۆلیـسەکان بەدەستی ژنانەوە لێدانیان خواردبوو زۆر لێیان دەترسان.

ژنـــان بـــەنیازبوون بـــچن و پەیکـــەری دیکتـــاتۆری ســـەردەم تێـــك بشکێنن. حکومەت ئاگاداری ئەو بابەتەبوو، پاسەوانێکی زۆریان دانا بۆ پاراســـتنی پەیکەرەکـــە. لەلایـــەکی دیکەشـــەوە شـــاندی ڕێکخـــراوی مانگرتنەکـــە فـــەرمانیان کردبـــوو کـــە ئـــەوکارە نەکـــەن. هـــەروا کـــە باسمـــانکرد، لـــەو کاتـــەدا ئابـــادان ئینگلیـــزی لێنـــەمابوو. هـــەموویان چـووبووبن بـۆ گەڕەکەکـەی خۆیـان کـە نـاوی بـریم بـوو، کۆمـەڵێك سەربازیش بەچەکەوە پاسەوانییان لێدەکردن.

ئێـوارەی ئـەو ڕۆژە سـەرۆکی پـۆلیس پێـشنیاری بـەمانگرتووەکان کـــرد کـــە بـــۆ ماوەیـــەك مانگرتنەکـــە ڕابگـــرن بـــۆ ئـــەوەی لـــەبارەی خواســـتەکانیان گفتووگـــۆ بکرێـــت، بـــەڵام کرێکارەکـــان جـــەختیان لـەئازادکردنی بەنـدکراوەکان کـردەوە، هـەتا ئـەوان بگەڕێنـەوە سـەر کاروباری خۆیان. لەکۆتاییدا سەرۆکی پۆلیس کرێکارەکانی بەقەناعەت گەیانـــد هـــەتاکو بـــەیانی دەرفـــەتی پێبـــدەن بـــا لـــەو بارەیـــە لەگـــەڵ پارێزگاردا گفتوگۆ بکەن و هاوڕێکانیـان ئـازاد بکـەن. کرێکارەکـان ئـەو قسەی سەرۆکیان قبوڵکرد و شاریان سپاردەوە بەپۆلیس و چوونەوە بۆماڵەکانی خۆیان.

لەبەرئـەوەی نـەك شـەوانە بەنـدکراوەکان لـەئابادان بگوازنـەوە بەڕێوەبەرانی مانگرتنەکە چەندکەسێکیان لە بازگەکان دانا بۆ ئـەوەی سەیارەکان بپشکنن. بەداخـەوە ئینگلیزەکـانیش بۆخۆیـان ڕێگەیـەکیان

بوو بەناوی بریم کە لەو ڕێگایەوە جگە لەئینگلیزەکان و کەسانی جێگای متمانە بۆیان نەبوو هاتوچوو بکەن. لەو ڕێگایەوە بەندکراوەکانیان گواستەوە بۆ ئەهواز.

ڕۆژی چوار شەممە پازدەی گولانی ١٣٠٨ ی هەتاوی ( ١٩٢٩ ز) هەوالی هاتنی پاپۆرە شەرکەرەکانی ئینگلیز بۆ پێشگرتن بەمانگرتنەکە بلاوبووەوە. سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە پتر لە هەشتسەد پۆلیس و چەندهەزار سەرباز هاتنە ئابادان و دارایی کرێکارەکانیان گەمارۆداو سێسەد کەسیان دەستبەسەر کردو ئەوانی دیکەشیان بەزۆر ناردەوە سەر کارەکانیان. هەر لەو ڕۆژەدا چەند کەس لەبنەمالەی کرێکارەکانیان بۆ ئەهواز بەڕێ کرد کەبەهۆی گەرماوە دوومندالی شیرەخۆرە گیانیان لەدەست دا. دەولەتیش لە ترسی راپەڕینی جەماوەری لە ئەهواز ژنەکانی ئازاد کرد بەو مەرجەی نەگەڕێنەوە بۆ ئابادان. تەواوی کرێکارە دەستبەسەرکراوەکانیان نارد بۆ بەندیخانە ئەهواز. بەهۆی ئەوەی جێگای ئەو هەموو دەستبەسەرکراوە نەدەبووەوە بینای شارەوانیان چۆلکرد و بردیانن بۆ ئەوێ. هەر لەوڕۆژەدا چەند کەسێك لەکرێکارانی مەسجێد سۆلەیمانیشیان دەستبەسەرو بێ ئەوەی بیانبەن بۆ دادگا لەخووزستان تارێندران. چەند کەسێکیش لە بازرگانان کارمەندانی ئابادانیان دەستبەسەرو ڕەوانەی ئاسایشی ئەهووازیان کردن.

ئاسایش وایدەزانی دەستبەسەرکراوەکان ئەندامی یانەی کرێکاران یا خۆ ڕێکخراوی کرێکارین. لەحالێکدا ئەو بۆچوونە بەتەواوی هەلە بوو. ڕاستە یانەی کاوە بەدەستی کرێکارەکان پێکهاتبو و ڕێکخراوی

کرێکارانیش سەرپەرشتی دەکرد چەند کەسێکی بێلایەن لەوانە بەڕێز سەلەحشووری عەلی باشی و کەسانی دیکە کە فەرمانبەری دەوڵەت و یان کۆمپانیا بوون تیایدا ئەندام بوون و ئاگای لەبوونی ڕێکخراوی نهێنیی کرێکاران نەبوو. چەند ڕۆژ لەدوای ئەو دەستبەسەر کردنانە بەڕێز ئاسایش فەرمانڕەوای ئابادان ڕاگەیاندراوێکی بڵاوکردەوە کە کەسانی تێکدەر دەستبەسەرکراون و ئابادان لەبوونی ئەو کەسانە پاککراوەتەوە.

هەرچەندە کە بەرپرسانی کۆمپانیای نەوت دانیان بەوەدا دەنا کەماڤ کرێکارەکان پێشێلکراوە. بەڵام **ئاسایش** ئەو کرێکارە داماوانەی بەتێکدەر لەقاو دەدا. ڕۆژنامەکانی میسر خەباتی کرێکارانی ئێرانیان بەرز دەنرخاند و مانگرتنەکەیان بەلاوە یەکەم ڕاپەڕین دژی سەرمایەداری لەڕۆژهەڵات دەزانی. ڕۆژنامەی **حەبلولمەتین** چاپی هێندوستان ڕق و بێزاریی خۆی بەرامبەر بە هەڵوێستی **ئاسایش** دەربڕی و نووسیبووی کە کرێکارانی کۆمپانیای نەوت لەهەمبەر بارودۆخی نالەباری ژیانیان و گوشاری هێزە ئەمنیەکان دەستیان داوەتە مانگرتن. لەبەرئەوەی **ئاسایش** و کەسانی دیکەی وەك ئەو داردەستی کۆمپانیای نەوت بوون، لەبەر دڵی کۆمپانیای نەوت و بەرپرسەکانی ئەو کرێکارانەیان دەگرت و زینداینیان دەکردن و دەیانتاراندن.

ڕۆژنامەکانی عێراقیش پشتیوانیان لەکۆمپانیای نەوت و دەوڵەتی ئینگلیز دەکرد و دەیاننوسی کرێکارەکان بەنیاز بوون پاڵاوگەی ئابادان بسوتێنن. ڕۆژنامەکانی سۆڤیەتش پشتیوانیان لەکرێکارانی کۆمپانیای

نەوت دەگردو لەکۆبوونەوەی سەندیکای جیهانی، نوێنەرانی کرێکارانی ئێران و سۆڤیەت، ڕەخنەیان لە نوێنەرانی کرێکارانی ئینگلیز دەگرت لەبەرئەوەی پشتیوانیان لەمانگرتنەکەی کرێکارانی ئابادان نەکردوەو لەباتی ئەوەی دژ بەدەوڵەتی ئینگلیز بووەستنەوە بێدەنگ بوون.

دەستبەسەر کردنی کرێکاران و بەتایبەت ژنان ڕق و بێزارییەکی زۆری لەدڵی خەڵکدا دژ بە دەوڵەت دروستکردبوو. دەوڵەتیش لەبەرئەوەی کە خۆی وەکو بێلایەن نیشانبدات چەند کەسێك لە سیخوڕەکانی کۆمپانیای نەوت کەخەڵك دەیناسین گرتنی و لەخووزستان تاراندنی. موحەمەد کرێمانی کە بۆ پێنج سەدتمەن سیخوڕی لەسەر کرێکاران کردبوو ناردیان بۆ عێراق و دواتریش کەگەڕایەوە بۆ ئێران کارێکی باشتریان لەکۆمپانیا پێسپارد. ئەو کرێکارانەی کە پێش مانگرتنەکە دەستبەسەر کرابوون. ماوەی دوو مانگ لە ئاسایشی ئابادان لەژێر لێکۆڵینەوەدا بوون، لەژێر ئەو هەموو زەخت و گوشارەدا بەو پەڕی نەترسییەوە لە سەر مافەکانی خۆیان پێداگریان دەکرد و بەباسکردن لەسەر ئەو هەموو بەسەر هاتە ناخۆشانەی کەکۆمپانیای نەوت بەسەر کرێکارەکانی دا هێنابوو سەلماندیان کە مانگرتن ماف بێ ئەملا و ئەولای کرێکاران بووە و دەوڵەت نەدەبوو ئەوانی دەستبەسەر بکردایە.

لەدوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکان، تەواوی گیراوەکان جگە لەڕەحیم خووئینی و یووسف ئیفتیخاریان نارد بۆ بەندیخانەی خۆڕەمشەهر هەتا لەژێر چاودێری سیپەهبۆد ئەحمەدی کاری قوورسیان پێبکەن. ئەو کرێکارە بەجەرگانەی خووزستان بۆ ماوەیەك

لەوێ خەریکی کاری بێگاری بوون و لەخراپترینبارودۆخدا ژیانیان دەبردە سەر.

بەهۆی ئەوەی کە لە دەستبەسەر کردن و ئەشکەنجەدانی مانگرتوەکان دا پۆلیس و ئاسایش ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو کۆمپانیای نەوت بڕیاری دابوو بەهەر یەکێکیان دە تمەن و ڤاتێکی سەربازی وەکو دەستخۆشانە پێبدرێت. ئەوانیش کە ئەو هەواڵەیان بیستبوو زۆر بەوە دڵخۆش بوون. لەدوای ماوەیەك ئەو دڵخۆشییەیان ئەما لەبەرئەوەی بەرپرسەکانیان پارەی جلەکان و دەتمەنەکەیان وەرگرتبوو تەنها هەرکەسەو پێنج تمەنیان بۆ خەرج کردبوون. بەهەرحاڵ گیراوەکان لە بەندیخانەی خورەمشەهردا خەریکی بێگاری بوون. ڕۆژێکیان سێپەهبۆد ئەحمەدی بانگهێشتیانی کرد و فەرمانی کرد کە ئازاد بکرێن و بیانتارێنن.

دەقی دواندەرییەکەی ئەمیر ئەحمەدی

کرێکاران – من بەنیاز بووم سەرجەم ئەو کەسانەی کەلەمانگرتنەکەدا بەشدار بوون لەسێدارەیان بدەم. لەبەرئەوەی کارێکی واتانکردبوو نێوان دوو وڵاتی ئێران و ئینگلیز ببێت بەناخۆشی. بەڵام بەهۆی هۆشیاریی پۆلیسەوە کۆمپانیای نەوت خەساری بەر نەکەوت. بەو پێیەی کە جەنابی شا پیاوێکی بەبەزەیی و میهرەبانە، لەتەواوی هەڵەکانی ئێوە خۆش بووەو ئێوەی بەخشیوە. هەربۆیەش من فەرمانم کردووە ئێوە لەخۆرەمشەهر بتارێنن. ئەبێ ئێوەش بەڵێن بدەن نەگەڕێنەوە بۆ خووزستان. لەدوای تەواوبوونی

**قسەو باسەکانی ئەمیر ئەحمەدی، کرێکارەکانیان لەگرتوخانە ئازاد کرد و بەشێوازێکی ناشیرین بەگەلآبەیەکی سوپا بۆ شوێنەکانی دیکەی ئێران ناردیانن. بەشێك لەوکەسانە لەدوای ماوەیەك بێکاری لەناوەندو شارەکانی دیکە دەستیانکرد بەکارکردن.**

**سوودەکانی مانگرتن**

**١- جان کیدمەن سەرۆکی گشتی کۆمپانیای نەوت بەهۆی مانگرتنەکەوە ناچاربوو وتو وێژەکان ڕابوەستێنێ و بگەڕێتەوە بۆ لەندەن.**

**٢- مووچەی کرێکارەکان لەسەدا پازدە هەتا لەسەدا پەنجا زیادی کرد.**

**٣- تەواوی کرێکارە بێکارەکانی ئابادان چوونە سەرکار**

**٤- تەواوی ئەو کەسانەی بۆ هەتاهەتایی لەسەرکار دەرکرابوون چوونەوە سەر کار.**

**٥- تەواوی ئەوکەسانەی کە بەهۆی کۆمپانیای نەوتەوە تووشی زیانبوون و بەبێ قەرەبوو دەرکرابوون. بانگهێشتکران و بەبڕێك پارە قەرەبوو کرانەوە.**

**٦- دەستیانکرد بەدروستکردنی خانوو بۆ ئەو کرێکارانەی پێشینەیان زۆر بوو.**

**٧- لێدان و سوکایەتیکردن و دەرکردنی بێ بیانوو غەرامە لەسەر کرێکاران لابرا.**

**٨- لەلایەن بەرپرسانی کۆمپانیاوە بەتەواوی فەرمانگەکانیان**

ڕاگەیانـد کە دەبێـت بـەجوانی گوێ لـە شـکاتی کرێکارەکان ڕابگـرن و بەقەناعەتیان بگەیەنن.

٩- بەشێك لەو ئەندازیار و بەرپرسە ئینگلیزەکان کەکرێکارەکان ڕقیان لێیان بوو، لەسەر کار لابران.

١٠- ئـەو کەسـانەی کـە تارێنـدرابوون لەشـارەکانی دیکـەی ئێـران بەتایبەت مازنـدەران خـەریکی چالاکیی ڕێکخراوەیـی بـوون و سـوودی زۆریان بۆ ڕێکخراوی نهێنیی کرێکاران هەبوو.

١١- کرێکارەکـان بەخـەباتی خۆیـان هیـوادار ببـوون کـە دەتـوانن بژیوی ژیانیان بەو شێوەیە باشتر بکەن.

## زیانەکانی مانگرتن

١- بەشـێك لـەو کەسـانەی کەلەمانگرتنەکـەدا بەشـداریان کردبـوو ئێستایش بەهەژاری دەژین.

٢- بنەماڵـەی گیراوەکـان بەشـێوەیەك ژیانیـان شـێوا کـە بـۆ هـەتا هەتایە ژیانیان لە دۆخێکی خراپدا دەبێت.

٣- دوومنداڵی شیرە خـۆرە لـەکاتی تارانـدن ا لـەڕێگای ئابـادان بـۆ ئەهواز گیانیان لەدەست دا.

٤- دوو کەس لەڕێبەرانی ڕێکخراوەیی کرێکاران ( ڕەحیم خـوئی و یووسـف ئیفتیخـاری) بـۆ مـاوەی سـێزدە سـاڵ لەگرتوخانـەکانی ئێـران دەستبەسەر بوون و هەمووجۆرە زەختێکیان لەسەربوو.

لـەدوای گــرتن و تارانــدنی کرێکارەکـان، ڕێکخراوەکـەی ئابــادان بەتـــەواوەتی لـــەناو نەچـــووبوو، کرێکارەکـــان خـــەریکی چـــالاکیی

ڕێکخراوەی بوون و چەند کەسێکیش گەڕابوونەوە ئابادان و بەگۆڕینی ناوی خۆیان لە پالأوگە کاریانـدەکرد و لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا مابوونەوە. تەنها بەهۆی دوور کەوتنەوەی ڕێبەرەکانی وەکو پێوو چالاکی گرنگیان نەبوو لەدوای ماوەیەکیش دیسان لە کارگەی ئاسنی فنیشی و چەند شوێنێکی دیکە چەند مانگرتنێك ڕێکخرا کە لەبواری ڕێکخراوەییەوە زۆر گرنگ نەبوون. لەوانەیە بۆ خوێنەرانی بەڕێز جێگای سەرنج بێت کە بۆچی تائێستا باسێك لە خەباتی کرێکارانی ناوەند و شارەگەورە پیشەسازییەکانی دیکە نەکراوە. لەبەرئەوەی هەتا ساڵی ١٩٢٠ ناوەندی پیشەسازیی گەورە لەئێراندا زۆر کەم بوو، لەو سەردەمەدا گەورەترین ناوەندی کرێکاری لەئێران ئابادان و ناوچە نەوتییەکانی دیکەی خووزستان بوو بەهۆی بازرگانیی گەورە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەت، بەشێکی زۆر لەکۆڵبەران و دەریاوانەکان و کەسانی دیکە لە بەندەر پەهلەوی کۆبوونەوەو خۆیان ڕێکخستبوو. بەهۆی گرنگیی ناوچەکە و چالاکیی کرێکارەکان پێشتر سەرنجی خوێنەرەکانم بۆلای ئابادان و بەندەر پەهلەوی ڕاکێشا. ئێستا کە باسکردن لەسەر خەباتی کرێکارانی ئەو دوو شارە چکۆلە و کرێکارییە تەواو بوو، لەپێش دا کورتەباسێك لەسەر چۆنیەتی چالاکیی ڕێکخراوە کرێکارییەکانی ناوەند و شارەکانی دیکە دەکەم و دواتر خوێنەرە بەڕێزەکان لەگەڵ خەباتی کرێکارانی ئێران لەدوای خەرمانانی ١٣٢٠ ی هەتاوی (١٩٤١ ز) ئاشنا دەکەم.

# بەشی سێهەم

# چالاکییە کرێکارییەکان لەنێوان فەرمانی ساڵی ١٣٢٠ ی ھ ( ١٩٤١ ز)

## ١- تاران

لەساڵی ١٩٢٠ ( ١٩٤١) دا لە تاران کارگەی زۆر گەورەی لێنەبوو. کرێکارەکان لەنێو کارگە بچووکەکان وەك پینەچی، ئاسنگەری، دارتاشی، نانەوایی و هی دیکە خەریکی کاری دەستی بوون. بەشێکی کەم لەو کرێکارانە لەکارگەکانی وەك گڵۆپی کارەبای و گۆرەویدروون و دەستەوانەچنین و چاپخانە کاریان بە مەکینە دەکرد. هەر بۆیەش هەستی دژە سەرمایەداری لەواندا لاوازتر لەکرێکارانی پیشەیی کۆمپانیای نەوت بوو. کرێکاری ئەو کارگە بچوکانە بەگشتی لەگەڵ خاوەنکارەکەدا زۆر تێکەڵاوییان هەبوو تەنانەت پێکەوە نانیان دەخوارد. لەرواڵەتدا ژیانیان وەکو یەك وابوو هەندێ جاریش جگە لە پەیوەندیی کرێکارو خاوەنکار ئەوان پێکەوە دۆستایەتیشیان هەبوو. بەپێی ئەو شتانەی کەلەسەرەوە باسمان لێکرد چەند کەسێك لەکرێکارانی هەستیار و تێگەیشتوو وەك: عەتا ئارش فیتەر و رەزا قولی ئارش و حیجازی کرێکاری چاپخانە و مێهدی حەقیقەت کرێکاری پینەچی موحەمەد ئاخوند زادە سەرکەوتوو بوون و توانیان کرێکارەکانی تاران رێکبخەن و رۆژنامەی **حەقیقەت** کە داواکاریی مافی

چینی کرێکار بوو چاپ وبڵاو بکەنەوە. ئەو کەسانەی کە لەسەرەوە ناومان هێنان توانیان سەندیکایەك پێکبهێنن کەتیایدا زۆربەی کرێکارەکانی شارەوانی و پینەچی و چاپخانە و هیتر لەو سەندیکایەدا بوون بەئەندام. رێکخراوەکەی تاران هەتا ساڵی ١٣٠٦ ( ١٩٢٧) توانی خەریکی چالاکی بێت و جاری وابوو ئەو نوێنەرانەی کە بەواتایەك چەپ بوون لە پەرلەماندا بەهێزیان دەکردن و لەگەڵ سولەیمان میرزا ئەسکەندەری و کەسانی دیکە کە بەسۆسیالیست ناسرابوون پێوەندییان دەگرت. لە سەرەتای مانگی مایس ساڵی ١٣٠٥ ی هەتاوی (١٩٢٦ ز) بەرێز سولەیمان میرزا وەزیری زانست لەگەڵ بەرێز حێسابی یەکێك لەرێبەرانی کرێکاری وابرپاریان دا کە لە کرێکارەکانی تاران لەدەرەوەی شار بەو بۆنەیەوە کۆببنەوە و دواتر بە خۆپێشاندان بچن بۆ بەر یانەی سۆسیالیستەکان و بەرێز حێسابی لەلایەن کرێکارەکان و بەرێز سولەیمان میرزا لەلایەن سۆسیالیستەکانەوە لەسەر گرنگیی ئەوە رۆژە قسەو باسێك بکەن. بەداخەوە بەرێز سۆلەیمان میرزا پێش تەواو بوونی دواندەرییەکەی بەرێز حێسابی هەستا و کرێکارەکانی خستە مەترسیەوەو کۆبوونەوەکەی بەجێهێشت. سۆسیالیستەکان لێرەیشدا خیانەتیان بەکرێکارەکان کرد. پۆلیس چەند کەسێك لەو کرێکارە شۆرشگێرانەیان دەستبەسەر کرد بەلام نەیتوانی بەرێز حێسابی دەستبەسەر بکات. حێسابی تارانی جێهێشت و لەو رووەوە کرێکارەکان دژایەتی ئەو حیزبە بەرواڵەت چەپانەی کرد. لەو کاتەوە دەوڵەت لە گرنگیی رێکخراوی کرێکاران تێگەشت و کەوتە دوای رێبەرانی کرێکاری.

حێجازی کە یەکێکبوو لەڕێبەرانی کرێکارانی چاپخانە، دەستبەسەر کرا و لەبەندیخانە لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی بەختکرد. گیان لەدەستدانی حێجازی لەنێو ڕۆژنامەکانی ئەوروپادا دەنگی دایەوە و دەوڵەتی ئەو سەردەمە ناچاربوو فەرمانی بەسەرۆکی پۆلیس کرد کە ئەو جۆرە ئەشکەنجانەی کە دەبێتە هۆی مردن لەبەندیخانەکاندا لەدژی گیراوەکان و بەتایبەت چەپەکان و بەکاری نەهێنن.

هەتا سەرەتای ساڵی ١٣٠٦ ی هـ ( ١٩٢٧) ڕێکخراوی کرێکارانی تاران خەریکی چالاکیی بوو. هەر لەو ساڵەدا بەهۆی تاراندنی بەشێك لە ڕێبەرانی ئەو ڕێکخراوەیە بۆ سۆڤیەت و ناکۆکیی ناوخۆیدا هەڵوەشایەوە. هەڵبەت هەر لەو ساڵەدا ڕێکخراوگەلێکی دیکە وەك ڕێکخراوەی خوێندکاران و هی دیکە پێکهێنران بەڵام ڕێکخراوی کرێکاران چالاکییەکی ئەوتۆی نەمابوو.

## ڕێکخراوی کرێکارانی تەورێز

هەندێك لەکەسایەتییە شۆڕشگێڕەکانی تەورێز لەوانە بەڕێز جەعفەر کاویانی، حوسەین موعەلیم، حۆسێن ئێتێکا، ئارداشس ئاوانسیان و چەندانی دیکە توانیبوویان بەشێك لە کرێکارانی پینەچی و فەرشچنین ڕێکبخەن، بەڵام یەکەم ئەوەی کە ئەم کرێکارانە ئەوەندە کەم بوون کە شایەنی باسکردن نیە و بەلایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوەی کرێکارانی ناو براو هیچ پەیڕەو پرۆگرامێکیان نەبوو، بەس ئەندامەکان گوێڕیەڵییان لە کەسایەتییە شۆڕشگێڕەکان هەبوو. هەر بۆیەش لەو بوارەوە ئەدەکرا ناوی ڕێکخراوەی کرێکاریان لێبنێین. ئەو

ڕێکخراوەیە چالاکیەکی ئەوتۆی نەبوو جگە لە بڵاوکردنەوەی نووسراوە دژی دەوڵەت. لەساڵی ١٣١٠ ی ھ ( ١٩٣١ ی. ز) دا ڕێکخراوەکە لەلایەن پۆلیسەوە کەشف بوو ڕێبەرانی دەستبەسەر کران و ڕێکخراوەکە ھەڵوەشایەوە.

## ڕێکخراوی کرێکارانی ئیسفەھان

لەدوای ھەڵوەشانەوەی ڕێکخراوی کرێکارانی تاران، شۆڕشگێڕانی ئێران بەنیاز بوون لە سەرجەم شارە کرێکاریەکانی ئێران ڕێکخراوی نھێنی کرێکاران پێك بھێنن. ھەر بۆیەش بەڕێز سەید محەمەد تەنھا کامەران بوو پێکھێنانی ڕێکخراوی کرێکاران چوون بۆ ئیسفەھان. ئەوان توانیان لەماوەیەکی کورتدا بەشێك لەو کرێکارانە ڕێکبخەن. بەداخەوە زۆری پێنەچوو، بابەتەکە لەلایەن پۆلیسی ئیسفەھانەوە کەشف بوو ئەوانیش دەستبەسەر کران. ھەر بۆیەش لەساڵی ١٣١٠ ی ھ ( ١٩٣١ ی. ز) دا ئەو ڕێکخراوەیە ھەڵوەشایەوە. کامەران کە پۆلیس لە ئیسفەھانەوە دەیگواستەوە بۆ تاران، لەشاری ڕەی دا لەدەستی پۆلیسەکان ھەڵھات. سەید موحەمەدی تەنھایش لەپاش دوو ساڵ لەگرتوخانەی قەسر لەساڵی ١٣١١ ی. ھ (١٩٣٢ ی. ز) دا بەھۆی برسێتی و نەخۆشی گیانی لەدەست دا.

## ڕێکخراوی کرێکاران لە مەشھەد

مێھدی تەھماسبی بەھۆی ئەشکەنجەی پۆلیس لەگرتوخانەی مەشھەد گیانی لەدەست دا، لەمەشھەد کرێکارانی فەرشچنین

بەرێبەریی کەسێك بەناوی ئیسماعیل رێکەوتبوون. ئەو رێکخراوەیە کاروبارێکی واگرنگی نەکردبوو کەلەلایەن پۆلیسەوە کەشف بوو لەساڵی ١٣٠٩ ی. هـ ( ١٩٣٠ ی. ز) هەڵوەشایەوە.

لەدوای هەڵوەشانەوەی رێکخراوەکەی مەشهەد، بەرێز تەهماسبی کە یەکێك لە رێبەرانی بەئەزمونی کرێکاری بوو، بۆ پێکهێنانی رێکخراوی کرێکاری بەرەو مەشهەد بەرێکەوت. بەهۆی ئەوەی کە کامبەخش ( یەکێك لە٥٣ کەسی) ئاگاداری شوێنەکەی بوو پۆلیسیش بەدوایدا دەگەڕا، ناونیشانەکەی ئەوەی دا بە **جەوانشیر** سەرۆکی بەشی لێکۆڵینەوەی پۆلیسی سیاسی. ئاسایشی گشتی فەرمانیکرد بە ئاسایشی مەشهەد کە تەهماسبی بگرن و بەهەر شێوەیەك بووە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن. ئەویش هیچ قسەی نەکردو لەژێر ئەشکەنجەدا لەبەندیخانە گیانی لەدەست دا. لەسەردەمی دیکتاتۆریدا بەشێکی زۆر لەئازادیخوازان و کەسایەتییە شۆڕشگێڕییە کرێکارییەکان لەبەندیخانە و تاراوگەکاندا بەشێوەویەکی زۆر ناخۆش ژیانیان دەکرد. لەدوای خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ ی. هـ ( ١٩٤١ ی. ز) گیراوەکان ئازاد بوون و ئەوانەشی لە تاراوگەبوون بەرەو ناوەند گەڕانەوە. بەهۆی هاتنی هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئێران، بەرپرسانی وڵات وەها ترسابوون کەبەس تەنها بیریان لەهەڵهاتن دەکردەوەو هیچی دیکە. بەڵام بەهۆی بێئاگایی بەرپرسانی وڵاتەوە ئەو کەسانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆرو درێژ لەبەندیخانەکان بەسەختی ژیابوون لەدوای گەڕانەوەیان بۆ ناو کومەڵگە دیسان بێکار و پەرپووت دەبوونەوە.

کەسایەتییە چەوساوەکانی سەردەمی دیکتاتۆری لە دوو بەشی

دەوڵەمەندو هەژار پێکهاتبوون. ئەوانەی کەدەوڵەمەند و خاوەن مڵك بوون لەوە بەوشێوەیە کەڵکیان وەرگرت و ئەو شتانەی کەلەدەستیان چووبوو بەدەستیان هێنایەوە. بەڵام هەژارەکان دیسان تووشی هەژاری و داماوی هاتنەوە، بارودۆخی ژیانیان لەنێو بەندیخانە خراپتر بوو. هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت هەوڵیان دەدا لەئێران بێ دەنگیەکی وەها بێت کە بەدڵێکی ئەرخەیانەوە سەرقاڵی هێنان و بردنی چەك و تەقەمەنی بۆ مەیدانی شەڕبن. هەر بۆیەش دەستیانکرد بەهێنانەوەو لەسەر کار دانانی کەسایەتیە سیاسی و سەربازییەکان کە هەڵهاتبوون و یان لەسەر کار لابرابوون.

لەو حاڵەدا لەوانە بوو ئەو کەسانەی کە ماوەیەکی زۆر ناخۆشی و کوێرەوەرییان کێشابوو ئەوەندەی دیکە لەو بارودۆخەی کە هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت دروستیان کردبوو ناڕازی بن و بچنە نێو هێزی دوژمنەکانیانەوە. هەربۆیە لەبەر ڕاگرتنی دڵی ئەوانیش حیزبێکیان پێکهێنا لەژێر ناوی حیزبی توودە. وادیار بوو پیاوانی سیاسیی ئینگلیز هەرکە بەشێك لەئێران داگیر کرا بەو شتەیان زانیبوو تەنانەت ئەخشەی هاتنەسەرکاری قەواموڵسەڵتەنە و بەشداریی بەشێك لەرێبەرانی حیزبی توودە لەنێو حکومەتەکەی ئەویان پێشبینی کردبوو. بەڵگەی ئەوەی کە باسمانکرد بەو شێوەیە کە باسی دەکەین: موستەفا خان فاتێح و ئیرەج ئەسکەندەری و دکتۆر یەزدی، دەچن بۆ بەندیخانە بەڵام بەڕێز بۆزۆرگ عەلەوی کە هێشتا ئازاد نەکرابوو مزگێنی پێدەدەن کەلەزووترین کاتدا هەموو گیراوە سیاسییەکان ئازاد دەکرێن و قەواموڵسەڵتەنە دەبێت بەسەرۆك و

چەند کەسێك لە ئەندامانی حیزبی توودە لەحکومەتەکەیدا بەشداری دەکەن. لەپێوەندی فاتیح جێگری کۆمپانیای نەوتی رابردوو لەگەڵ عەلەوی و هەولّی سەرۆکایەتی قەوام و بەشداریی توودەییەکان لەنێو حکومەتدا وادەردەکەوێت کەئەو مەسەلەیە لەلایەن پیاوانی سیاسیی ئینگلیزەوە پێشتر پێشبینی کراوە. چۆن بوو کە ئەندامەکانی حیزبی توودە لە یەکەمین حوکومەتی دوای خەرمانانی قەوام بەشدارییان نەکرد دواتر دەردەکەوێت. عەلەوی بەدڵخۆشییەوە ئەو هەواڵە لەبەندیخانە دەدات بەهاورێکانی. بەڵام بەپێچەوانەی خواستی ناوبراو قسەکانی بوو بەهۆی رِق و بێزاریی گیراوە سیاسییەکان، ئەوان دژی کار کردن لەگەڵ قەوام دا بوون. لەکۆتاییدا لەبەرئەوەی لەگەڵ هەستی نەتەوەپەرستیدا شەڕ بکرێت و بەر بەو کەسانە بگیرێت کەدەیانهەوێت بچنە ئەو بەرەوە، حیزبی توودە دامەزرا و دامەزرێنەرەکانی فەرمانیان پێکرا کە تەواوی ئەو کەسانەی کە دژی ئەو حیزبەن وەکو ئەندام قبوڵیان بکەن.

ئەو حیزبە رِۆژنامەیەکیشی لەژێر ناوی رِۆژنامەی مەردوم لەچاپ دا. خاوەنی رِۆژنامەکەیش **سەفەر چەشنی** بوو کە بەیارمەتی مۆستەفاخان فاتێح ئەو مافەی پێدرابوو. ئەو رِۆژنامەیە لەسەرەتاوە بەسەرمایەی شەخسیی بەرِێز فاتێح چاپ و بڵاو دەکراوەو ئەویش دەستوەردانی راستەوخۆی لەرِۆژنامەکەدا هەبوو. بەرِێز سەفەر چەشنی پیاوێکی پیرو نەخۆش بوو کەلەبەرِێوەبردنی رِۆژنامەکەدا کەمترین نەخشی هەبوو. عەباس ئەراقی کەیەکێکبوو لە تاقمی٥٣ کەسی و فاتێح بڕوای تەواوی پێی هەبوو رِۆژنامەکەی بەرِێوە دەبرد.

ناوبراو نوێنەری خەڵکی کاشان بوو لەپەرلەمان دا.[1]

وابڕیار بوو ڕەزاشا لەڕێگای بەندەر عەباسەوە لەئێران بڕوات. هەر بۆیەش ئاسایشی بەندەر عەباس فەرمانی پێکرابوو کە هەتا ڕۆیشتنی رەزاشا ئێمە لە بەندیخانە بمێنینەوە. لەکۆتاییەکانی مانگی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٠ی. ه ( ١٩٤١ ی. ز) گیراوە سیاسییەکانی بەندەر عەباس ( بەڕێزان: حۆسەین موعەلیم، مۆحەمەد شورشیان، ڕەحیم هیمداد، ئارداشس ئاوانسیان و یووسف ئیفتیخاری) لەبەندیخانە ئازاد بوون. لەوانەبوو بەندەر عەباسیش بەدەستی هێزەکانی ئینگلیز داگیر بکرێت و لەو کاتیشدا دیسان لەوانە بوو بکەوینە دەستی ئینگلیزەکان. هەر بۆیەش من چاوەڕێی پێدانی خەرجیکێشان لەلایەن ئاسایشەوە نەبووم و لەکەسێك بەناوی عەلیزادە قەرزم کردو لەگەڵ ئەودا بەرەو تاران بەڕێکەوتم.

گەیشتینەتاران و لەمیوانخانەیەکی بچووکدا سێ ڕێیانی ئەمین حووزور ژورێکمان بەکرێ گرت. یەکەم کەسێك کە هات بۆ سەردانم ڕەزا روستا بوو. لە وتەکانی دا وادەردەکەوت کە هاوڕێیانی تاران لە ئازاد بوونی ئێمە زۆر نیگەران بوون و هەوڵی زۆریان داوە بۆ ئازادکردنی ئێمە. هەڵبەت لەهەوڵ و ماندووبوونی هاوڕێیان و بەتایبەت روستا و دیتنی زۆر دڵخۆش بووم. روستاش ئازادبوونی ئێمەی زۆر بەلاوە خۆش بوو. روستا قسەی دەکرد و من و عەلیزادەیش گوێمان بۆ دەگرت. ئەو لەناو قسەکانیدا زوو زوو دەیوت

---

[1] - عەباس ئنەڕاقی لەخولی پازدەهەمی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان دا بوو بەئەندامی پەرلەمان.

هاوڕێیان حیزبێکمان پێکهێنا و چیدی کاتی دانیشتن نیە و دەبێت چالاکی بکەین.

قسە پوچەکانی روستام بڕی و لەبارەی چۆنیەتی و بارودۆخی حیزبە تازەکەیان پرسیارم لێکرد.

وتی: حیزبێکمان بەناوی حیزبی توودەی ئێران پێکهێناوە. یەکێتی سۆڤیەت لەگەڵ شێوازی کار کردنی ئەم حیزبە هاوڕایە، هەر بۆیە سەرکەوتنی ئەم حیزبە مسۆگەرە. هاوڕێیانی ناوەندی چاوەڕێی ئێوە بوون. بڕیار وایە داوا لەتەواوی ئەو کەسانە بکرێت کەدژی ئێمەن ببن بەئەندامی حیزب لەنێستادا ئەوەیە لەگەڵ فاشیزم دا دژایەتی بکات بۆ بەهێز بوونی یەکێتی سۆڤیەت. هەروەها بەڕێز شازادە سولەیمان میرزا ئەسکەندەری سۆسیالیستی بەناو بانگ ڕێبەری حیزبی بە ئەستۆ گرتووە. روستا دەیگوت کە زۆربەی هاوڕێیانی دکتۆر ئەرانی بوون بەئەندامی حێزب. لەکۆتاییدا روستا لەزۆر بلێی هیلاك بوو وتی: هاوڕێیان بابچین بۆ لای حیزب کە بۆ کار و ژیانی ئێوەش بیرێکی لێبکەینەوە و ئێوەیش دەست بکەن بەکار و پارویەك نان بچین بۆ خزمەتی سولەیمان میرزای ئەکتەر.

چیدی نەدەبوو بێدەنگ بم و دەبوایە ئەم پیاوە بێ ئەقڵە بدەمە بەر ڕەخنە و تێی بگەیەنم کە تووشی چ هەڵەیەك بووە. پێموت ئێوە بەجوانی ئاگادارن کە چۆن بێشەرمانە هاوڕێکانی دکتۆر ئەرانی خیانەتیان پێکرد و لەبەر بەرژەوەندیی شەخسی خۆیان ئەو پیاوە شەریفەیان بەکوشت دا. خۆت لە بەندیخانە دەتوت ئەوان پڕۆکاتۆرن. تۆ خۆت پیاوێکی خوێندەواریت و دەزانی کەلەحیزبێکدا کە

سەرمایەدارو کرێکارو خاوەن زەوی و جووتیار کۆببنەوە، بەهۆی ئەوەی کەبەرژەوەندیەکانیان جیاوازە داهاتووی ئەو حیزبە ئەزانی چیە. تۆ سولەیمان میرزای سۆسیالیست دەناسی و دەزانی لەساڵی ۱۳۰۵ دا (۱۹۲٦ ی. ز) چ خیانەتێکی بە ئێمە کرد. لەجێگای ئەوەی کەسایەتیگەلێکی وەها خیانەتکار بەخەڵك بناسێنن لەگەڵیاندا ڕێك دەکەون و حیزبێك پێکدێنن کە لەو ڕێگایەوە تێگەشتووترین چینی چەوساوەو زەحمەتکێش بە لاڕێدا بەرن. لەبنەڕەتدا ئێوە بۆتان نەبوو پێش ئەوەی کەباشترین و شۆڕشگێڕترین ڕێبەرانی کرێکاری لەبەندیخانە و تاراوگەکاندا بوون و بێ پرسی ئەوان وەها حیزبێك پێکبهێنن.

دەبوو بڕیاردان لەسەر پێکهێنان و یان هەڵوەشاندنەوەی حیزب بەدەنگدانی زۆرینەی ئەو هاوڕێیانە بووایە کە پێش خەرمانانی ساڵی ۱۳۲۰ ی. هـ ( ۱۹٤۱ ی. ز) لەریزی ئێمەدا دژ بە ڕژێمی دیکتاتۆری خەباتیان کردبوو وتیشم هیچ کاتێك برسیەتی و بێکاری ناتوانێت من و هاوڕێیانم ناچار بکات کەلەگەڵ کەسایەتیگەلێکی وەها خائین و ناکەس بەچە هاوڕێ بین. ڕوستا کە بەڕواڵەت لەقسەکانی خۆی پەشیمان ببوەوە خەتاکەی خستە سەر شانی پیاوانی سیاسیی یەکێتی سۆڤیەت و وتی دڵنیا بن حیزبی توودە لە زووترین کاتدا هەڵدەوەشێتەوە بەڵام هێزە نەژاد پەرستەکانی ئاڵمان لەنێو خاکی سۆڤیەتدا زۆر پێشڕەوییان کردووەو هەتا سەر سنووری قەفقاز ڕۆشتوون. سولەیمان میرزایش لەو مەسەلەیە زۆر ترساوەو تەنانەت چەند ڕۆژێکیشە خۆی داوە لەنەخۆشی و نایەت بۆ حیزب و

هاوڕێکانیشی بەجوانی کار ناکەن. هەربۆیە بێ ئەوەی ئێمە هیچ هەنگاوێك بنێین حیزبی توودە هەڵدەوەشێتەوە، وابڕیار بوو لەدوای هەڵوەشانەوەی حیزبی توودە داوا لەهاوڕێیانی ناوەند بکەین لەبارەی دامەزراندنی ڕێکخراوە کرێکارییەکان باس و گفتووگۆ بکەین. بەڕێز عەلیزادەیش لەو بارەیەوە هاوڕای من بوو. هۆکاری دژایەتیکردنی پیاوانی سیاسیی سۆڤیەت لەگەڵ ڕێکخراوە سەربەخۆ کرێکارییەکان لەدوای ئەوەی کە گفتوگۆ کردن لەگەڵ روستا لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی حیزبی توودە ئاکامێك نەبوو، من و بەشێك لە هاوڕێیان ئەندامیەتی حیزبی توودەمان قەبوڵنەکردو ڕاستەوخۆ دژایەتیمان لەگەڵ کرد و دوای ئەوەی کە ئەندامانی حیزبی توودە بەتەواوی لە هاوکاریی ئێمە دڵسارد بوون، دەستیان کرد بە دەنگۆنانەوە دژی هاوڕێکانمان. ئەو بابەتەی کە ئەوان لەو سەردەمەدا هەڵیانبژاردبوو بۆ دەنگۆنانەوە دژی ئێمە شتێك نەبوو بەپیاوانی سیاسی و سەربازیی سۆڤیەت بڕوای پێ نەکەن. پڕوپاگەندەکەی حیزبی توودە بەو دێرەوە دەستی پێدەکرد:" تاقمی " ت " لەگرتوخانە ". چەند وتارێکی لەدوای یەك لەژێر ئەو ناوەدا لە ڕۆژنامەی مەردۆم بڵاوبووەوەو مەبەست لەتاقمی " ت " لەگرتوخانە گروپی ترۆتسکی وەزیری بەرگری پێشووی سۆڤیەتبوو. ئەو پیاوە لەساڵی ۱۳۰۷ ی. هـ ( ۱۹۲۸ ی. ز) لەخاکی سۆڤیەت دەرکرا بەهۆی دژایەتیکردن لەکۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت و ئەویش شوێنی چالاکی خۆی گواستەوە بۆ مەکزیك و بەتەواوی لەگەڵ ڕێبەرانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت دژایەتی دەکرد. حیزبی

کۆمۆنیستی سۆڤیەت و دەوڵەت، ترۆتسکی بەگەورەترین و مەترسیدارترین دوژمنی ڕژێمی سۆسیالیستی سۆڤیەت دەزانی. ترۆتسکیان لە مێکزیك کوشت و لەگەڵ هاوڕێ و لایەنگرانیدا لە سۆڤیەت و دەرەوەی سۆڤیەت دژایەتیان دەکرد. هەر بۆیەش ئەوان تۆمەتی دارو دەستەی ترۆتسکیان دەدایە پاڵ ئێمە. حیزبی توودە دەینووسی کە ئێمە لایەنگری ترۆتسکین واتە ئێمە دوژمنی سەرەکیی دەوڵەتی سۆسیالیستی سۆڤیەتین و ئەوەیان دەکرد بەمێشکی پیاوانی سیاسی و سەربازیی سۆڤیەتدا.

لەحاڵێکدا گیراوانی سیاسیی ئێران بەهۆی ئەوەی پەیوەندیان لەگەڵ دەرەوەی گرتوخانە بەتەواوەتی بچڕابوو لەبیرو بۆچوون و دژایەتی ترۆتسکی لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەت بە تەواوی بێئاگابوون. لەو حاڵەتەدا چۆن دەیانتوانی لایەنگری ترۆتسکی بن و لەگەڵ ستالیندا دژایەتی بکەن؟

پروپاگەندەکانی حیزبی توودە جێگای خۆی گرت. بەشێك لە پیاوانی سۆڤیەت دەستیانکرد بەدژایەتی کردنی ئێمە، تەنانەت دژ بەئێمە قسەیان دەکرد. بەهۆی ئەوەی کە ئێمە بەنیاز نەبووین لەگەڵ پیاوانی سیاسی ولاتانی بیانی پێوەندیمان هەبێت و لەبنەڕەتدا لەگەڵ ددەستوەردانی ولاتانی دیکە لەنێو کاروباری نێوخۆی ولاتدا نەبووین، بۆ هاوڕێیان هیچ گرفت نەبوو کە پیاوانی سۆڤیەت بەهۆی پروپاگەندەی حیزبی توودەوە دژایەتیمان بکەن. هاوڕێیان نەبەنیاز بوون ببن بەهاوپەیمانی روسەکان و نە ئەوندەش ترسنۆك بوون لەدژایەتیکردنی ئەوان بترسن و لەبەرامبەر درۆو دەلەسەکانی حیزبی

توودە هیچمان نەکرد. هەر ئەو مەسەلەیەش وایکرد پیاوانی سۆڤیەت لە ئێران زۆرتر بکەونە ژێر کاریگەری دەنگۆکانی حیزبی توودەو زۆرتر دژایەتیی ئێمە بکەن. بنەڕەتی دژایەتیکردنی پیاوانی سۆڤیەت لەگەڵ ئەو هاوڕێ چەوساوانەی ئێمە لێرەوە دەستی پێکرد کەدواتر گەیشت بەو ئاستەی کە لەرۆژنامەکانی **ایزۆستیا** و **دوستی ئێران** و رادیۆکانی سۆڤیەت دژ بەو کرێکارە ستەملێکراوانە بەتوندی قسە بکەن.

ئاگرەکانی شەڕی جیهانی کەم و زۆر جیهانی تووشی نەگبەتیی کردبوو. باندۆری وێرانکارییەکانی شەڕ لە ئێرانی بێلایەن بەهۆی نەبوونی رێکخراوی دڵسۆزو پیاوانی لێهاتوو لە وڵاتانێك کە لایەنێك لەشەڕەکە بوون زۆر بەرچاوتر بوو.

نرخی کاڵاو پێداویستیەکان بەشێوەیەکی سەر سوڕهێنەر بەرز بووبووەوە بەڵام مووچەی کرێکار هەر وەکو خۆی مابوو ز کرێکارانی ئێران لەدوای خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ ی. ه ( ١٩٤١ ی. ز) دووچاری نەهامەتیەك بوون کەتا ئەو کاتە بێوێنە بوو.

بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی ژیان و بەتایبەت ئەو نانە وشکە کە سایلۆکان دەیان دا بە چینی هەژار و بەتایبەت ئەو کرێکارانەی کە ناچار بوون لەبەیانیەوە هەتا شەو لەکارگەکاندا کار بکەن زۆر سەخت و هەندێجاریش نەدەکرا. کرێکارەکان، رێکخراوەیەکیان نەبوو هەتا بتوانن لەرێگای ئەوانەوە، لەگەڵ ئەو نەهامەتیانەدا کە دێتە سەر رێگایان بەرەنگار ببنەوە، ترسی سەردەمی دیکتاتۆری هێشتا لەدڵیاندا مابوو نەیاندەتوانی بەبێ رێنوێنی و یارمەتیی کەسانی دیکە

ڕێکخراوێکی کرێکاری پێکبهێنن. هیوای کرێکاران ببوو بەو حیزبە تازە دامەزراوەی توودە و ئەو کرێکارە خیانەتکارانەبوو کەتازە لەگرتوخانەکانی دیکتاتۆری ڕزگار ببوون. هەربۆیە کرێکارانی تاران هەموو ڕۆژێك دەچوون بۆلای ئەو کرێکارە بەندکراوانەی سەردەمی دیکتاتۆری حیزبی توودەو داوای یارمەتییان لێدەکردن.

حیزبی توودە دژی دامەزرانی ڕێکخراوی کرێکاری لە ئێران بوو هۆکارەکانیشی بۆ ئەو دژایەتیکردنە بەڕواڵەت شتێکی دروست و بەجێ بوو. ئەندامانی حیزبی توودە دەیانوت ئێستا نابێت ئەو ڕێکخراوانە پێکبهێنن، لەبەرئەوەی لەوانەیە نوێنەرانی سیاسی ئینگلیز و ئامریکا واهەست بکەن کە نوێنەرانی سۆڤیەت لەو ڕێکخراوانەدا دەستیان هەبێت. لەو حاڵەتەدا دەوڵەتانی ئینگلیز و ئامریکا لە سۆڤیەت کەهاوپەیمانیانە زویر دەبن و لەوانەیە چیدی یارمەتیی سۆڤیەت نەکەن. بەرامبەر بە هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی هێزەکانی ئەڵمانیا ئەوەندە پێویستیان بەیەکدی بوو کە لەسەر مەسەلەیەکی وەها بەوتەی خۆیان بچووك کە بەهێزبوونی کرێکار کە کاری بۆ ئەوان دەکرد ببێت هۆکارێك بۆ زویر بوونیان لە یەکدی. دووهەمیش ئەوەی کە ئەگەر هاوپەیمانان پێیان زانیبایە کە پیاوانی سۆڤیەت لەنێو کار و کارەکانی ناوخۆی ڕێکخراوەکەدا دەستوەردان ناکەن، هۆی چییە کە دامەزراندنی ڕێکخراوێك کەبەدەستی کرێکارانی ئێرانی کەلەسەردەمی دیکتاتۆریدا کە هێزەکانی سۆڤیەت لەئێران بوونیان نەبوو بەهێزترین خەباتیان دژ بە دواکەوتوان و بەتایبەت کۆمپانیای نەوت کرد بوو ئینگلیز و

ئامریکا لەدەوڵەتی سۆفیەت زویر ببن. ئێمە نەماندەتوانی لەبەرامبەر ئەو هەموو نەهامەتیەدا داواکاری ئەو کرێکارانە قەبووڵ نەکەین. هەر بۆیەش بەهۆی داواکاری و گوشاری زۆری کرێکاران دەستیان بە دامەزراندنی رێکخراوی کرێکاری کرد.

لە سەرەتای ساڵی ١٣٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) لەدارایی بەرێز سەید عیسا حۆسەینی لەشەقامی رەی کۆڵانی ئابشار رێکخراوی کرێکاریمان پێکهێنا. پەیرەوو پرۆگرامی رێکخراوەکەیش عەلی نەقی حەکەمی بەبیروڕای من نووسی.

لەکۆبونەوەیەکدا کەلەماڵەکەی بەرێز حوسەینی رێکخرا، زۆربەی کرێکارەکانی کارگەکانی تاران بەشدارییانکردبوو. لەو کۆبوونەوەدا پەیرەو پرۆگرامەکە خوێندرایەوەو پەسند کرا. نوێنەرەکان پەسندیان کرد کە ناوی رێکخراوەکە " رێکخراوی کرێکاران و وەرزێران " بیت هەتا بتوانین لەمافی وەرزێرەکانیش پشتیوانی بکەین. هەر لەو کۆبونەوەیەدا ئەم کەسانەی لای خوارەوە وەکو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی رێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران هەڵبژێردران.

١- رەزا خەیات
٢- ئەنصاری کرێکاری/ کارگەی تەقەمەنی
٣- سەید عیسا حۆسەینی /کرێکاری چاپخانە
٤- ئەندازیار عەتیقەچی
٥- یووسف ئیفتخاری/ کرێکاری پشووی کۆمپانیای نەوتی باشوور
٦- خەلیل ئینقلاب /حاکم
٧- عەباس حوسەینی

نوێنــەرەکان فــەرمانیانکرد لــە زووتــرین کاتــدا چــەند کەســێکی چالاك لـە ئەنـدامانی ڕێکخراوەکـە بنێـردرێن بـۆ شـارەکانی دیکـە بـۆ دامەزرانـدنی ڕێکخراوەکـە. کۆبووونەوەکـە لەبەیانیـەوە هـەتا ئێـوارە بەردەوام بوو. تەواوی نوێنەرەکان بەڵێنیان دا کە بۆ بەرەوپێشچوونی ئامانجەکانی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران گیانبازی بکەن.

## ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئازەربایجان و مازندەران

بـەپێی فەرمانەکـە و پەسـندکردنی لەلایـەن کۆمیتـەی ناوەنـدی خــەلیل ئیــنقلاب نێــردرا بــۆ ئازەربایجــان و یووســفی ئیفتیخــاریش ڕەوانەی مازندەران کران.

لــە مازندەرانــدا هــەتا ئــەو کاتــەیش حیزبــی تــوودە ڕێکخــراوی کرێکارییــان نــەبوو، هــەروا کــە پێــشتر باسمــان کــرد حیزبــی تــوودە لەبنەڕەتــدا دژی پێکهێنــانی ڕێکخــراوی کرێکــاری بــوو. هــەر بۆیــەش بەشێکی کەم لەکرێکاران ببوون بەئەندامی حیزبی توودە.

هــەروا کــە پێــشتر باسمــانکرد، کرێکارەکــان کــە هێــشتا ترســی ســەردەمی دیکتاتۆریــان لەدڵــدا مــابوو نەیانــدەوێرا نــاوی ڕێکخــراوی کرێکاران بهێنن و لەو باوەڕەدا نـەبوون کـە ئـەو سـەردەمە گۆڕاوە کـە خاوەنکار بتوانێت بە تەلەفۆنێك کرێکارێك کە داوای ماف خۆی دەکات بیخاتە بەندیخانەوە. هەر بەو شێوەیەی کـە کرێکارەکـان لـەخاوەنکارو پیــاوانی حکومــەت ترســابوون، پیــاوانی حکومــەت و خاوەنکارەکــانیش لەدوای ڕووداوی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ ی. ھ ( ١٩٤١ ی. ز) ورەی خۆیان لەدەستدابوو زۆر دەترسان.

کرێکـارانی رێگـای ئاسـنی مازنــدەران بــەهۆی ڕوودانــی شــەڕوو هاتووچوی چەك و تەقەمـەنی لەباشووررەوە بۆ باکور زۆر زیاتر بوو لەکرێکاری کارگەکان. لەلایـەکی دیکەشـەوە بەشێکی زۆر لـەکرێکارانی رشێگای ئاسن، بەتایبەت سایەقی ڤیتارەکان لەسۆڤیەت کرێکار بوون، لەگــەڵ کرێکــارانی روســیدا پێوەنــدیان هــەبوو. هــەر بۆیــەش لــە مەسەلەکانی رێکخراوەییدا لە کرێکارەکانی دیکە شارەزاتر بوون. هەر بۆیەش بڕیارم دا لەپێشدا کرێکارانی رێگای ئاسنی باکۆ ڕێکبخەم و دواتر بەیارمەتی و پشتیوانیی ئەوان کرێکارانی کارگە و کانەکان ڕێك بخەین.

بەهۆی خراپی باری گوزەران و دۆخی ژیان و زەخت و گوشاری پۆلیس و ئاسایشی بەجێماوە لەسەردەمی دیکتاتۆری، کرێکارەکان ئامادە بوون بۆ خەبات. تەنها پێویستبوو ئەو ترسە لە دڵیان لابەرێت. هــەر بۆیــەش بــەدانانی کۆبوونــەوەو خوێندنــەوەی وتــار و باسـکردن لەسەر چۆنیەتی بژیوی کرێکاران لەپێشدا کرێکارانی پۆل سفید و دواتـر کرێکارانی کارگـەکانی شاهی بـوون بەئەنـدامی رێکخراوەکـە و ئامادەبوون فەرمانـەکانی رێکخراوەکـە جێبـەجێ بکـەن، لەماوەیـەکی کەمدا کرێکارانی رێگای ئاسنی باشور ڕێککەوتن و لەتەواوی ڕێگاکان دا لافیتـەی رێکخـرا و یانـە کرێکـارانی ڕێگـای ئاسـن کەوتـە بـەر چـاوی رێبواران.

لەدوای ڕێکەوتنی کرێکارانی ڕێگای ئاسن، ڕێکخراوی کرێکاری لـە کانگەی خەڵوزی زێرئاب پێکهات و چالاکییەکانی رێکخراوەکە لەماوەی چەند مانگدا گەیشتە گۆرگان و گۆنبەد کاووس. هەرچەندە ڕێکخراوی

کرێکـاری بـەهێزتر بـوو، نوێنـەرانی دەوڵـەت و خاوەنکارەکـان زیـاتر دەترسان و لەبەرامبەر کرێکارەکاندا بەرەو دوا دەچوون. ئەم بەرەودوا چوونەی خاوەنکارەکان کرێکارەکانی زۆرتر هاندەدا. ڕێکخراو لەگەلێك لـە شـارەکاندا پێکهـاتبوو جگـە لەچـەند کەسـێکی ڕۆشـنبیر بەدەسـتی خودی کرێکارەکان بەڕێوە دەچوو. بۆ وێنە، ناوی بەشێك لە ڕێبـەرانی کرێکارانی مازنـدەران بریتی بوو لە:

لەگۆرگان بەڕێزان بابایی و عەلەویی پارێزەر لـەوەزارەتی داد. لـە **بەندەر شا** کرێکارەکان، لە ساری بەڕێزان دکتۆر **جاوید** دکتۆری ددان و نـــەورووزی. لـــە پـــۆل ســـفید سەفەرچـــی و حـــەکیمی شـــۆفێری شـەمەندەفەر. لـە **فیرووز کووه** بـەڕێزان حـەزرەت قـۆلی ئـازمموودە و ئەحمەد شۆفێری ڤیتار. لە بـەن کووه بـەڕێز حۆسـەینی. لـە بەشـێك لەشـــوێنەکانی دیکـــە و کارگەکانـــدا ڕێبـــەری بەدەســـتی خـــودی کرێکارەکانەوە بوو لێرەدا ناویان نەبراوە.

لە تەورێزیش خەلیل ئیینقلاب توانیبـووی سـەرکەوتن بەدەست بـێنێ و زۆربـەی کرێکارەکـانی ڕێکخـستبوو خـەریکی چـالاکی بـوو. پێـــشکەوتنی ڕێکخراوەکـــەی تـــەورێز پارێزگـــارو خاوەنکارەکـــان و بەتایبەت حیزبی تـوودەی زۆر ترسـاندبوو، ئـەوان دەیانویـست بەهـەر شـێوازێك بووبێـت پـێش بـەو پێـشکەوتنە بگـرن. پێـشکەوتنی لەڕادەبەدەری ڕێکخراوەکەی مازنـدەران و تـەورێز کەپێوەنـدی بـەهیچ کەسـایەتیەکی دەرەکـی و نـاوخۆی یـەوە نـەبوو، کۆمیتـەی ناوەنـدی حیزبی توودەی تۆقانـدبوو، وابڕیـار دەدەن بەدامەزرانـدنی ڕێکخـراوی کرێکـاری نـوێ کـە پێوەنـدی بـەحیزبی تـوودەوە هـەبێت لەگـەڵ

ڕێکخراوی کرێکارن دژایەتی بکەن. حیزبی توودە بۆ دژایـەتی کـردن و دووبەرەکی خستنە نـاو ڕیزەکـانی کرێکـاران لەکۆتاییـەکانی سـاڵی ١٣٢١ ی. ھ ( ١٩٤٢ ی. ز) ڕێکخراوەیـــــەکی لـــــەژێرناوی ئەنجومــــــەنی ڕێکخراوەکـانی کرێکـارانی پێکھێنـــا و بەکــەڵکومرگرتن لەنوسـراوەو بڵاوکراوە کرێکارانی بانگھێشت دەکرد بـۆ بوونەئەنـدام لـەو ڕێکخـراوە کەلـەژێر چاودێری حیزبی توودەدایـە بـۆ بەدەسـتھێنانی مافـەکانیان خەبات بکەن.

لەحاڵێکدا لەوکاتـەدا بەشـی ھـەرە زۆری کرێکارەکـانی کارگـەکانی ئێران ڕێککـەوتبوون و ھـەتا ئـەو ڕۆژە جگـە لـەرێکخراوی کرێکـاران و وەرزێرانـی ئێـران ڕێکخراوەیـەکی دیکـە پێکنـەھاتبوو. ھـەر بۆیـەش پێکھێنانی ڕێکخراوێکی نـوێ لەلایـەن حیزبـی تـوودە سـەرەتایەك بـوو کەحیزبی توودە لەژێرناوی حیزبێکی چەپ دووبەرەکی دەخـستە نێـو ڕیزی کرێکارانەوە. ئەم ڕاگەیاندنـە و ڕاگەیاندنـەکانی دیکـەی حیزبـی تــوودە، کــەمترین گومــان و دوودڵــی بــۆ کرێکارەکــانی مازنــدەران و ئازەربایجــان دروســت نــەدەکرد. بــەو پــەڕی فیــداکاری و بــڕواوە کاریاندەکرد بۆ پەرەپێدانی ڕێکخراوەکەی خۆیان. بەتایبـەت لـە دانـی یارمەتی دارایی بەڕێکخراوەکە زۆر چالاك و گیان فیدا بوون، ھەر بـەو ھۆیەشەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەباری مادیـەوە ڕێکخراوەکـە ڕوو لەگەشـە بوو. حیزبی توودە کە لە بڵاوکردنەوەی نووسراوە دژی ئێمە بێ ھیـوا ببوو دەیزانی ھیچی بۆ ناکرێ، پـەنای بـردە بـەر پیـاوانی سۆڤیـەت و وڵاتــانی دیکــە لەئێرانــدا. پیاوەکــانی ســۆڤیەتش نــەیان دەتــوانی لەگەرمــەی شــەڕدا وڵامــی داواکاریــەکانی حیزبــی تــوودە بدەنــەوەو

دژایەتی ئەو کرێکارانە بکەن کە چەك و تەقەمەنیان لەباشوورەوە بەرەو باکۆر بۆ دەگواستنەوە. بێتوو دژایەتی ئەو کرێکارانەیان بکردایە، لەوانەبوو لەگواستنەوەی ئەو چەك و تەقەمەنیانەدا تووشی گرفت بوونایە، هەر بۆیەش ولاّمی داواکارییەکانی حیزبی توودەیان نەدەداوە، بەلاّم ئەوان وازیان نەدەهێنا، لەشارەکان دا نوێنەرەکانی سۆڤیەتیان وەڕس کردبوو، بەبەردەوام داوایاندەکرد کە دەبێ ئەم ڕێکخراوە فاشیستیە! لەنێران دابخرێت بەداخەوە لەدەستپێکی ساڵی ١٣٢٢ ی. ه ( ١٩٤٣ ی. ز) ئەم هەواڵە لەتەورێزەوە هات: **********

" بەشێك لەخوێڕیەکان بەهۆی هاندانی پارێزگار هێرشیان کردوەتە سەر بینای ڕێکخراوەکەو خەلیل ئینقلابیان بریندار کردووە، تەواوی کەلوپەلکانیان تێك شکاندووە بەفەرمانی پارێزگار ئینقلاب تارێندراوە ". نووسراوەیەکی دیکەیش لەتارانەوە بەدەستم گەیشت کەپێ دەچوو لەناوەندیش لەنێوان هاوڕێیان دا ناکۆکی سەری هەڵداوە.

پێتوو نەچوومایە بۆ تاران لەوانە بوو ڕێکخراوەی ناوەند هەڵبوەشایەتەوە. ئەم نووسراو هەواڵە، کاتێك گەیشتە دەستی من کەڕێکخراوەکەی مازندەران زۆر بەهێز ببوو کرێکارەکان دەیانتوانی بەتەنیایی کار و کارەکانی ئەوێ ڕاپەڕێنن، هەر بۆیەش خێرا چووم بۆ تاران. چوونەوە بۆ ناوەند لەکاتێکی زۆر گونجاودا بوو، لەبەرئەوەی ناکۆکیەکی زۆر کەوتبووە نێ و ئەندامانی شلندی ناوەند بەشێك لەئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەستیان لەکار کێشابووەو چەند کەسێکیشیان لەبیانی ئەوەی شدکار بۆ ڕێکخراوەکە بکەن و ڕێنوێنی کرێکارەکان بکەن دژایەتی یەکدی یان دەکردو قسەی ناشیرینیان

بەیەك دەوت و خەریکی هاندانی ئەندامەکانی دیکەبوون بۆ دژایەتی کردنی قسەی بەرامبەر. هۆکارەکەیشی بەڕێز سەید عیسا حۆسەینی و خەلیل ئینقلاب بوون. کرێکار گەلێك کەلەدوای ماوەیەکی زۆر تازە هاتبوونە نێ و ئەو رشکخراوەیەو بەهیوای ئەوە بوون لەژێر کاریگەری رێبەری دروستی کۆمیتەی ناوەندی تەواوی مافە پێشێل کراوەکا یان بەدەست بهێننەوە بەهۆی ناکۆکی لەنێوان ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و قسەو قسەلۆکی بەڕێزان خەلیل ئینقلاب و سەید عیسا حۆسەینی و لەبەرچاو نەگرتنی قازانجەکانی چینی کرێکار، دیسان لەڕێکخراوەو کۆبوونەوەکان دڵسارد بوون و چوونەوە سوچیماڵەکانیان. ئۆفیسی ڕێکخراوەکە کە لە باب هۆمایون بوو بەتەواوەتی داخراو ماوەیەکیش کرێکەی دواکەوت، کرێکارەکان بەشداری کۆبوونەوەکان نەدەبوون و یارمەتی داراییشیان نەدەکردو لەڕاستیدا ڕێکخراوی ناوەند بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەچوو. حیزبی توودەیش لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرتوو لەتاران ڕێکخراوەکەی خۆی بەهێز کرد، بەشێکی زۆر لەکرێکارەکانیان لەڕێکخراوەکەی خۆیان کردبووە ئەندام. قەرەبوو کردنەوەی ئەو هەموو زیانەی کەکۆمیتەی ناوەندی لەکرێکارانی ناوەندی لەڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران یان دابوو شتێکی بەسیت بوو، بەڵام ئاشتکردنەوەی بەڕێزان حۆسەینی و ئینقلاب کارێکی زۆر دژوار بوو.

پێویست بوو سەرلەنوێ کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێرینەوەو دەبوو یەکێك لەوان بانگهێشت نەکرێن بۆ ئەو هەڵبژاردنە.

بەهۆی ئەوەی بەڕێز ئینقلاب لەپێك هێنانی ڕێکخراوی

کرێکارانی ئازەربایجان زۆر عەزیەتی کێشابوو توانی بووی بەشێکی زۆر لەو کرێکارانە ڕێکبخات. هەر بۆیەش هاوڕێیان پێیان باش بوو بەڕێز حۆسەینی بانگهێشت نەکەن. ئێستا کەدەمانهەوێت کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێرین ڕێکخراوی کرێکارانی مازندەران زۆر بەهێزە. ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجانیش وەها داهاتوویەك چاوەڕوانی دەکرد.

بەداخەوە لە ناوەنددا نەشوێنکمان هەیە کۆبوونەوەی تێ دا بکەین و پارەیشمان نیە شوێنێك

بەکرێ بگرین و بڕێکیش قەرزاری شوێنە کۆنەکەمانین. بەشێك لەهاوڕێیان پێشنیار دەکەن کەلەڕێکخراوەکەی مازندەران پارە بەقەرز وەرگیرن بەڵام من ڕام وایە کرێکارانی تاران دەبێ بۆ خۆیان خەرجیی ڕێکخراوەکەیان بکەن. لەبەرئەوەی داوای یارمەتی دارایی لە کرێکارانی مازنـدەران لەوانەیـە ببێتـە هـۆی بـێ هیـوای ئـەوان. هاوڕێیـان پێشنیارەکەی منیان قەبووڵ کردو وابڕیار بوو لەپێشدا کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێرین و دواتر لەبارەی بابەتی خەرجی قسەو باسێك دەکەین

هاوڕێیانمان بانگهێشت کرد بۆ هەڵبژاردنەکەو ئەم کەسانەی لای خوارەوە وەك و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران:

یووسف ئیفتیخاری سەرۆك و بەڕێوەبەری ڕێکخراوەکە، خەلیل ئینقلاب بەرپری ڕاگەیاندن، عەباس حۆسەینی بەرپرسی دارایی، ئەنساری و ئەندازیار عەتیقەچی وتەبێژ.

لەبەرئەوەی شوێنێکمان نەبوو بۆ کۆبوونەوە. هەر بۆیەش

لەرێگای پاسەوانی کۆمپانیای مۆعتەمێدی نزیك بانکی ناوەندی ئەو بینایەمان بەکار دەهێنا. بەپرسانی ئەو کۆمپانیایە ئاگاداری ئەو بابەتە نەبوون. لەکۆتایدا توانیمان لەدوای مانگێك ئەو کرێکارە پرش و بلاوانە کۆ بکەینەوە ( لەدوای مانگێك کۆبوونەوەی نهێنی)، ژوورێکمان لەبەرێز فەری پوور لەشەقامی لالەزار بەکرێ گرت، تابلۆی رێکخراوی ناوەندیمان لەمانگی رەشەمەی سالی ١٣٢١ ی. ه

( ١٩٤٢ ی. ز) لەنێو خۆشی و چەپلە لێدانی کرێکاران هەلواسی. ئەو شتانەی رێکخراوی ناوەندی لەکاتی هەلواسینی تابلۆکە بریتی بوو لە: تەپلەککێکی شکاو کەعەباسی حوسەینی پێی دابووین و شەش دانە کورسی کۆنە کەبە چل تمەن کڕیبوومان و تەرمۆزەیەك و پەرداخێك.

کۆمیتەی ناوەندی نوێ بەپرۆگرامێکی باشەو خەریکی پەرەپێدانی رێکخراوەکەی تاران بوون و

سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەدەستهێنابوو. دۆخی کارگەکانی تاران و هەلسوکەوتی خاوەنکارەکان لەگەل کرێکاران دا زۆر جیاوازبوو. لە کارگەکانی چەك و تەقەمەنی کە هەتا ئەوکاتە نییشیان بۆ هێزە هاوپەیمانەکان دەکرد لەگەل کرێکارەکان زۆر خراپ هەلسوکەوتیان دەکرد. لەراستیدا کارگەکان ببوون بە سەربازگە و کرێکارانیش وەکو دیلی شەر سەیر دەکران. لەوانەیە لە ولاتانی رۆژئاوادا لەگەل دیلەکانی شەریش دا وەها بەتوندی هەلسوکەوت نەکرێت. بەرپرسانی کارگە ناوبراوەکان بەبچووکترین بیانوو کرێکارەکانیان ئازار دەدا. بێتو لەلایەن ئەوانە بچووکترین نارەزاییەك بکرایە بەرامبەر بەخاوەنکارەکان، دەستبەجێ دەستبەسەریان دەکردن و دواتریش

لەسەرکار دەریاندەکردن. لەوانەیە جێگای بڕوا نەبێت بۆ خوێنەران کە تەنانەت کرێکارانیان لە ماف چوونە پێشاو چوون بێبەشکردبوو. کاتی دیاریکراویان دانابوو بۆ پێشاوی کرێکاران بۆیان نەبوو جگە لەو کاتانە کارەکەیان جێ بهێڵن و بچن بۆ پێشاو.

کاتێك کە ئیزنیان دەدان کە کرێکارەکان بچن بۆ پێشاو، بەهۆی ئەوەی ئەوان زۆر بوون و پێشاویش کەم بوو کاتەکەیش زۆر کەم بوو، هەر بۆیەش بەشێکی زۆریان نەیاندەتوانی کاری پێشاوەکەیان بکەن. کارەسات و توندو تیژی خاوەنکارەکان دەرهەق بە کرێکارەکان زۆر زیاتر لەو نموونانە بوو کە باسمانکرد.

لە بەشێك لەکارگەکان دا بەپێچەوانەوە هەڵسوکەوتی خاوەنکارەکان لەگەڵ کرێکارەکاندا تارادەیەك باشتر بوو هەتا ئەو ناستەی کە بۆیان دەکرا وڵامی داخوازییەکانیان دەدانەوە. توودەییەکان لەنێو هەندێ کارگە دزەیان کرد بوو کە بە بەراورد لەگەڵ بارودۆخی ژیانی کرێکارەکانی باشتر بوو. خاوەنکارەکانیش زۆر دژایەتیان نەدەکردن. حیزبی توودە کارگەی چیمەنتۆی بەناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی سەربەخۆ ناودێر کردبوو. لەوێدا کاریگەریی تەواوی هەبوو لە سایلۆیش دا توانیبووی بەشێك لە کرێکارەکان ڕێکبخات و کرێکارانی کارگەی جگەرەیشی بەتەواوی بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو.

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێرانی بڕیاری دابوو کە تەواوی هێزو توانای خۆی بخاتەگەڕ بۆ ڕێکخستنی کرێکارانی کارگەیەك و لەدوای ئەوەی کە ئەوانی بەتەواوی ڕێکخست

لەدوای ئەوە کار بۆ کرێکارانی کارگەیەکی دیکە بکات. لەو سەردەمەدا **سایلۆ** لەهەموو بابەتێکەوە بۆ ڕێکخراوی کرێکاران جێگای سەرنج بوو. یەکەم ئەوەی کە بەڕاکێشانی کرێکارەکانی **سایلۆ** بۆلای خۆی، ڕێکخراوەکە بەهێز دەبێت و حیزبی توودەیش لاوازو دووهەمیش گرنگترین ناوەندی پیشەسازیی تاران دەکەوێتە دەستی ڕێکخراوەکە کە کۆمیتەی ناوەندی دەیتوانی لەو سەردەمی قات و قڕییەدا، هەڕەشەی داخستن و مانگرتنی ئەو ناوەندە لەدەوڵەت بکات و پاشەکشێی پێبکات. لە **سایلۆ** توانیمان کە زۆربەی کرێکارەکان بۆ لای خۆمان ڕابکێشین و حیزبی توودە لەوێدا بوونە کەمینە. بۆ بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی باشووری تاران و کۆکردنەوەی کرێکارەکان بینایەکمان لەچوار ڕێیانی موختاری لە مەزهەری بەکرێ گرت و دامانە دەستی کرێکارەکان. بەشێك لە ئەکتەرەکانی ئازەربایجان لەبابەت بەکار هێنانی بیناکە لەکاتی پشوودا، دەهاتن و بە بەلاش شانۆگەریان دەکرد بۆ کرێکارەکان و بنەماڵەکانیان و دڵخۆشیان دەکردن. لەدوای ڕێکخستنی کرێکارەکانی **سایلۆ** ئەندامانی بەشی ڕێکخستن فەرمانیان پێکرا کە لە گارگەکانی چەك و تەقەمەنیی سوپادا کە کرێکارەکانی بەڕاستی لەژێر زەخت و گوشاردا بوون ڕێکخراوی کرێکاری پێکبهێنن. پێکهێنانی ڕێکخراوەی ئاشکرا لە کارگەکانی سوپادا زۆر ئاستەم بوو. دەبوو لەپێش بەشێوەی نهێنی چەند کەسێك لە کرێکارەکانیان فێر بکردایە و دواتر لەڕێگەی ئەوانەی سەرنجی کرێکارەکانی دیکە بۆ لای ڕێکخراوی کرێکاران ڕابکێشرایە. هەر بۆیەش لەکارگەی **تەخشایی** و دواتر لە کارگەی دروستکردنی چەك چەند کەسێك لەکرێکاران

لەرێگای بەرێز ئەنساری، حەسەن کەندی، ئاشووری، موحەممەد عەلی و چەند کەسێکی دیکە بەشێوەی نهێنی پەیوەست بوون بەرێکخراوەکەوە. هەرچەند کە زۆربەی کرێکارانی کارگە ناوبراوەکان ببوون بەئەندامی رێکخراوی کرێکاران، یارمەتیی دارایی رێکخراوەکەیان دەکرد و لەژێر رێبەرایەتیی کۆمیتەی ناوەندی ئەرکەکانیان بەباشی بەرێوە دەبرد. هێشتا بەرپرسانی بەشێك لەکارگەکان خەریکی چەوساندنەوە و سووکایەتی کردن و دەرکردنی کرێکاران بوون. هەڵسوکەوتی ئەو بەرپرسانە لەگەڵ کرێکاران دا بەهیچ شێوەیەك بۆ کۆمیتەی ناوەندی و چالاکانی رێکخراوەکە قبووڵ نەدەکرا. بۆ پێشگرتن بەو بابەتە پێویستبوو کرێکارەکان هانبدرێن بۆ مانگرتن. بەداخەوە لەو کاتەدا مانگرتن بەهیچ شێوەیەك بەسوودی رێکخراوەکە نەبوو، لەبەرئەوەی کارگەکانی چەك و تەقەمەنی لەو کاتەدا کاریان بۆ هێزە هاوپەیمانەکان دەکرد. هاتبا و مانگرتن رووی بدایە، لەسەدا سەد تۆمەتی پشتیوانیی لە نەژادپەرستییان دەدایە پاڵی کرێکارەکان. بەو حاڵەیشەوە کۆمیتەی ناوەندی رێکخراوی کرێکاران بریاریدا بەهەر شێوەیەك بووبێت، کرێکارانی کارگەی چەك و تەقەمەنی لەو بارودۆخە نەشیاوە رزگار بکات. هەر بۆیەش بەپێی فەرمانی کۆمیتەی ناوەندی رێکخراوەکە، کرێکارەکان مافی ئەوەیان هەبوو کە هەر خاوەنکارێك ئازاریان بدات، لەدەرەوەی کارگەکە بە توونـدترین شێواز سزای بدەن. یەکێك لە رێبەرانی رێکخراوەکە لەساڵی ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) ئەم بریارەی کۆمیتەی ناوەندی بەخاوەنکارەکان راگەیاند، هەروەها ناوی ئەندامانی شاندی بەرێوەری

رێکخراوی کرێکارانی ئەو کارگەیەی پێوتن، هەروەها فەرمانی پێکردن کەلەمەو دوا دەبێت لەگەڵ کرێکارەکان دا بەجوانی هەڵسوکەوت بکەن و بەبێ ئاگاداری شاندی بەرێوەبەرایەتی رێکخراوی کرێکارانی ئەو کارگەیە لەبارەی کرێکارەکان هیچ بریارێك نەدەن. لەو کاتەوە کرێکاران بەشێوەی ئاشکرا دەستیانکرد بەبانگەشە و لەماوەیەکی کورتدا، هاورێکانی دیکەیشیان بۆلای رێکخراوەکە راکێشا و کرێکارانی کارگگەکانی چەك و تەقەمەنی لەو رۆژەوە گەورەترین هێزی رێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران هەژمار دەکرا.

لەساڵی ١٣٢٢ ی. ھ ( ١٩٤٣ ی. ز) لەکارگەکانی دیکەی تاراندا رێکخراوەکە پێکهێنرا. رێکخراوەکە بۆ بەرپاکردنی کۆبوونەوەی گشتی پێویستیان بەشوێنێکی گەورەتر بوو، هەر بۆیەش ماڵەکەی بەرێز سوپاسالار شابەختی‌مان لەشەقامی ئێستەخر، کۆڵانی خاجو مانگانە بەبری چوارسەد تمەن بەناوی خەلیل ئینقلاب بەکرێ گرت، تابلۆی رۆژنامەی گیتی بلاوکراوەی رێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێرانمان لەسەر دەرگاکەی هەڵواسی و کۆبوونەوەکانمان لەو بینایە بەرێوە دەبرد.

لەسەرەتای ساڵی ١٣٢٢ ی. ھ ( ١٩٤٣ ی. ز) رێکخراوەگەلێك لەحیزبی توودە توانیبووی دای بمەزرێنێت بریتیبوون لە: ئەنجومەنی سەندیکاکانی زەیر ئاب و شاهی و بێه شەهر. لە بێه شەهر بەهۆی ئەوەی کە رێکخراوی کرێکاران و وەرزێران دانەمەزرابوو، تەواوی کرێکارەکانی ئەو ناوچەیە لەژێر کاریگەریی حیزبی توودەدا بوون. لە شاهی ئەندامانی حیزبی توودە زۆرینە بوون. لە زەیرئاب چەند

کەسێکی بەدناوی سەرسەری ببوون بە ئەندامی حیزبی توودە. کرێکارانی کانەکانی خەلۆز زۆر ڕقیان لەو پیاوانە دەبوویەوە. خەڵکی ئەوێ ئەوەندە لەوان ڕەشبین بوون، تەنانەت دزییەکیش بکرایە دەیانوت ئیشی ئەندامانی حیزبی توودەیە. چەند کەسێکیشیان دواتر دەستیاندایە تاوان و پیاو کوژی. بەهۆی ئەندامێتیی وەها کەس گەلێك، ئەو کرێکارە چاکانە ئامادە نەبوون ببن بەئەندامی حیزبی توودە. هەربۆیەش ئێمە لە بابەتی کرێکارانی **زەهیر ئاب** ئەرخەیان بووین، هەموو کاتێك چاوەڕێ بووین شتێك ڕوو بدات و کرێکارانی **شاهی** لەدەستی حیزبی توودە ڕزگار بکەین. ئەو ڕووداوە بەبێ ئەوەی ئێمە و هاوڕێیانمان هیچ ئامادەکارییەکی بۆ بکەین ڕووی دا و ئێمەیش ئەو دەرفەتەمان لەدەست نەدا و زۆربەی کرێکارانی **شاهی**مان هێنایە نێو ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی **شاهی**یەوە. ئەو پێشهاتەیە بریتیبوو لە سەما کردنی پاڵەوان **عەینوڵڵا** لە یەکێك لەڕۆژەکانی پرسە و وردەکارییەکەیشی وەها بوو: ڕۆژێك لەڕۆژانی پرسەوسەرەخۆشیی موسوڵمانان لەگەڵ جێژنێکی سۆفیەت هاوکات دەبن. پاڵەوان کە کرێکاری ڕستن و چنینی شاهی و نوێنەری حیزب و یەکێك لە ڕێبەرانی ڕێکخراوی کرێکاران سەربە حیزبی توودە بوو، هاوڕێیانی ئاگادار دەکاتەوە کە بۆ گوێگرتن لە دواندەری لەگۆڕەپانی **شاهی** کۆببنەوە. بەشێکی زۆر لەخەڵکانێك کە بێکار بوون دێن بۆ ئەوێ بۆ سەیر کردن. پاڵەوان لەسەر جێژن کورتە باسێك دەکات. بەشێك لەخەڵکەکە دەست دەکەن بەچەپڵە لێدان و پاڵەوانیش دەستی کچەکەی دەگرێت و دەست دەکا بەسەما کردن. ئەو کارە پاڵەوان و

کچەکەی چەپڵەلێدانی هەندێك کۆچبەر، نەك تەنها خەڵکی بەرامبەر بەحیزبی توودە تووشی ڕق و بێزاری کرد، تەنانەت خەڵکی مازندەرانی کرد بە دوژمنی هێزە سەربازییەکانی سۆڤیەت لەو ناوچەیە. لەبەرئەوەی پاڵەوان ڕۆژی چەندجار دەچوو سەردانی نوێنەرایەتیی سۆڤیەتی دەکرد لەگۆڕەپانی شاهی و دواتر بڵاویدەکردەوە کە هەرکارێك کە دەیکەم بە فەرمانی نوێنەرانی سۆڤیەتیە. لەڕۆژی سەمای پاڵەوانەوە، هاوڕێیانی ئێمە لە شاهی زۆرتر خۆشەویست بوون و بنەڕەتی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانیان لە شاهی زۆر بەهێز کرد. بەڵام خەڵکی ئەوێ دەستیانکرد بە دژایەتی و خەبات دژی حیزبی توودە و ئەندامانی ئەو حیزبە.

لەدوای تاراندنی خەلیل ئینقلاب لە تەورێز ڕێکخراوی کرێکارانی تەورێز بەفەرمانی پارێزگاری ئازەربایجان داخرا. بۆ ماوەی شەش مانگ کەس بۆی نەبوو تەنانەت بۆ سەردانیش بچێت بۆ ڕێکخراوەکە. لەدوای ئەو ماوەیە و بەهۆی گوشاری ڕێکخراوی ناوەند و کرێکارانی تەورێز پارێزگار ئێزنی ئەوەی دا کە دیسان ڕێکخراوەکە بکرێتەوە بەڵام بەو مەرجەی کەسێك بەناوی هێلال ناسری کەکتێبفرۆش بوو بکرێت بەبەرپرسی ئەو ڕێکخراوەیە. هەر چەند کرێکارەکان قەبوڵیان نەدەکرد، بە فەرمانی پارێزگار، هێلال ناسری ڕێکخراوەکە ددەکاتەوەو دەتوانێت چەند کەسێکی وەك خۆی بکاتە شاندی بەڕێوەبەری ڕێکخراوەکە و نوسراوەیەکیش دەنێرێت بۆ کۆمیتەی ناوەندی و داوا دەکات هەتا ئەو شاندە نوێیە بەفەرمی بناسرێت. لەو سەردەمەدا کرێکارەکان پێوەندیی خۆیان لەگەڵ کۆمیتەی ناوەندی نەپچڕاندبوو،

هــەموو کاتێــك ڕووداوەکانیــان بــۆ ناوەنــد باســدەکرد. کرێکارەکــان بەشێوازی سەربەخۆ و بەشێوەی گشتی دەیاننووسی بۆ ناوەند:

" ڕێکخراویەك کە هێلال ناسری پێکیهێنـاوە، بـەس تـەنها کـەلو پەلەکەی هینی ئێمەیە، ڕێکخراوەکە هی ئێمە نیە و ئێمە هاتووچووی ئـەوێ ناکـەین. هـێلال ناسـری داردەسـتی پارێزگـاری ئازەربایجانــە و بەفەرمانی ئەو دەیەوێت کرێکارەکان فریو بدات. " لەڕێکەوتی مـانگی گـولانی سـالی ١٣٢٢ ی. ھ ( ١٩٤٣ ی. ز) کۆمیتـەی ناوەنـدی کرێکـاران و وەرزێرانی ئێران بڕیاری دا کە یووسف ئیفتیخاری بنێرێت بۆ تـەورێز هەتا ڕێکخراوی کرێکاران لە دەستی هێلال و لیوا موقـەدەم پارێزگـاری ئازەربایجـان ڕزگـار بکـات. هەربۆیـەش ئـەو فەرمانانـەی لای خـوارەوە لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە دەرچوو:

" ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئازەربایجـان! بـەڕێز یووسـف ئیفتیخـاری سـەرۆکی ڕێکخـراوی ناوەنـدی کرێکـارانی ئێـران لەلایـەن کۆمیتـەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانـی ئێـران پێـی سـپێردراوە کـە ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان بـەجوانی بپشکنێت و ئەنجامەکـەی بگێڕێتەوە بۆ کۆمیتەی ناوەندی. تەواوی ڕێکخراوەکان دەبێ بەوپەڕی دڵسۆزییەوە یارمەتیی تەواو بکەن. "

**"ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران!**

**بەڕێز یووسف ئیفتیخاری سەرۆکی ڕێکخراوی ناوەندی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران ڕاسپێردراوە کە بەهاوکاری کرێکارانی ئازەربایجان ڕێکخراوەکـە لەشـاندی بەڕێوەبەرایـەتی ئێـستا وەربگرنـەوە، بیدەنـە دەسـتی شـاندی هەڵبـژێردرا و لەلایـەن کرێکارانـەوە. لەوبـەر ئـەوەی**

**ناوبراو نوێنەری کۆمیتەی ناوەندییە لە ئازەربایجان، تەواوی کرێکاران پێویستە لەژێر رێبەرایەتیی ئەودا کار و بارەکانیان راپەڕێنن. "**

مەبەست لەبڕیاری پشکنین ئەوە بوو کە کۆمیتەی ناوەندی پێشبینی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر هێلال ناسری هەست بەوە بکات کە رێکخراوەکە لەدەستی ئەودا نامێنێ، بۆی هەیە بەیارمەتی پارێزگار نەهێڵێت یووسف ئیفتیخاری کارەکانی بەجوانی راپەڕێنت، بەڵام ئەگەر واهەست بکات کە نوێنەری ناوەند بەس بۆ پشکنین هاتووەتە ئازەربایجان، لەوانەیە کەمتر کارشکێنی بکات و لەلایەکی دیکەیشەوە نوێنەری ناوەند کاتی ئەوەی لەبەر دەستدایە کە کرێکارەکان لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوەو بەیارمەتی ئەوان رێکخراوەکە لەژێر دەستی هێلال دەربێنن.

یووسف ئیفتیخاری بەرەو تەورێز بەڕێکەوت، نوسراوەکەی یەکەم کە بەپێی ئەوە مافی پشکنینی پێدرابوو دایە دەستی پارێزگارو هێلال ناسری. ناوبراوان وایانزانی لەدوای پشکنینەکە، نوێنەرە ساختەکەی رێکخراوەکە بەڕەسمی دەناسرێت، نوێنەرەکەی ناوەندیان بەرووخۆشییەوە وەرگرت و رێگایان پێدا هەتا پشکنینەکە بکات. هێلال ناسری و لیوا موقەدەم بەنیاز بوون رێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان لە رێکخراوی کرێکارانی ئێران جودا بکەنەوە. لیوا موقەدەم ئەم بابەتەی بەڕاشکاوی باس نەدەکرد، بەڵام هێلال ناسری بەئاشکرا دەیوت دەبێت رێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان سەربەخۆ کار بکات، بەڵام بەهۆی رق و بێزاریی کرێکاران لە شاندی بەڕێوەبەرایەتیی نوێ، ناچار بوون رازی ببن بەوەی کە نوێنەری

ڕێکخراوی ناوەند بەتەواوی پشکنین بکات و لێکۆڵینەوە بکات لەگەڵ ئەندامانی شاندی بەڕێوەبەرایەتیی نوێ. هێلال ناسری پێداگری دەکرد، ڕێکخراوی ناوەند، شاندی نوێی ڕێکخراوی تەوریز بەڕەسمی بناسێت و هەر بەو پێیەش کرێکارەکان هانبدات بۆ بەئەندامبوون لەو ڕێکخراوەیە و دەیویست ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان سەربەخۆ بکات.

پشکنینەکە دەستی پێکرد و بۆ چاودێری لە پشکنینەکەی شاندی بەڕێوەبەرایەتیی نوێ، چەند کەسێك لە نوێنەرانی کارگەکانیش بانگهێشتکرابوون.

پشکنینەکە بەهۆی ئاڵۆزی کارەکانی شاندە نوێکە چەند ڕۆژێکی خایاندو لەنێو شاندەکەدا تەنها موحەمەدخانیان کرێکار بوو، هەموویان کاسبکار و بەڵێندەر بوون. لە کەسێك کە کۆچبەر بوو جلی کرێکاری لەبەرکردبوو پرسیار کرا کە نوێنەری کام کارگەیت؟ وڵامیدایەوەو فەرش دەچنم و نوێنەری کرێکارانی کارگەی فەرش چنینم. میر مەجید حۆسەینی کە لە فەرشچنین دا شارەزایی تەواوی هەبوو لە تەوریز ناوبانگی تەواوی هەبوو نوێنەری کرێکارانی فەرشچنین بوو هاواری کرد وتی ئاغا ئێوە کرێکاری کام کارگەن؟ زانیمان کە ئەو پیاوە نە کرێکاری فەرشچنینە و نە تەنانەت کرێکاریشە. بابەتەکە هەرچەندە ڕاستیبوو بەڵام وەکو گاڵتەجاڕیی لێ هاتبوو. کرێکارەکان هاواریان دەکرد تۆ کرێکاری کام کارگەیت بۆ ئێمە ناتناسین؟

لەکۆتاییدا نوێنەری ساختەکراوی کرێکارانی فەرشچنین

بەشەرمەزارییەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە و چیدی نەمانبینیەوە. لەتەواوی ئەندامانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوە کرا.

هەروەها پرسیار کرا کە ئێوە پەیڕەو پڕۆگرامی ڕێکخراوی کرێکارن و وەرزێرانتان خوێندوەتەوەو ئەوەتان قەبوڵە یان نا؟ تەواویان بەتێکڕایی وتیان خوێندوومانەتەوەو هەموویمان قبولکردووە. هەر بەپێی ئەو پەیڕەو پڕۆگرامە شاندی بەڕێوەبەرایەتی نوێ بەهۆی ئەوەی کاسبکار و بەڵێندەر و دەلاڵ بوون، نەیاندەتوانی ئەندامی ڕێکخراوەکە بن. هاتنی ئەوجۆرە کەسانە بۆ ڕێکخراوەکە قەدەغەکرابوو. بەپێی ئەوەی پارێزگار پشتیوانی ڕێکخراوەکەی هێلال ناسری بوو پێدەچوو لەباری داراییشەوە یارمەتی کردبێتن، بەڵام لەلێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوت کە یارمەتیی نەکردوون. لە کاتێکەوە کە هێلال ناسری ئەو ڕێکخراوەی دامەزراندبوو، کرێی بیناکە، پارەی کارەبا و تەلەفۆن و هی دیکە نەدرا بوو. بەس بڕێک پارە خەرجکرابوو بۆ کڕینی تاجەگوڵینە بۆ جەنابی پارێزگار کە ئەویش لە پارەی شەخسیی هێلال ناسری درابوو.

لەدەفتەری ژمێریاریی سەردەمی خەلیل ئینقلابیش هیچ دەرنەدەکەوت. خەلیل ئینقلاب وادیار بوو لەو ماوەیەدا بڕی سێ هەزار تمەنی بۆ ڕێکخراوەکە خەرجکردبوو، بەداخەوە سەرچاوە و هۆی خەرجکردنی ئەو پارەیە نادیار بوو. ئەو کرێکارانەی کە پارەیان دابوو بۆ یارمەتیکردنی ڕێکخراوەکە، پسوولەیان پێنەدرابوو. بارودۆخی ڕێکخراوەکە زۆر نالەبار بوو. بەهۆی ئەوەی شاندی بەڕێوەبەرایەتیەکە ماف بوون بەئەندامیشیان نەبوو، هەر بۆیەش

کرێکارەکـان هاتووچـووی ڕێکخراوەکـەیان نـەدەکرد. لـەو حاڵەتەشـدا یارمـــەتی دارایـیــان نـــەدەدا بەڕێکخراوەکـــە و ڕێکخراوەکـــەیش هــیـچ داهاتێکی نەبوو. ماوەی هەشت مانگ بـوو کرێـی بیناکە و شـتی دیکـە نــەدرا بـوو، خـاوەن خانووەکــە بیــستبووی نوێنــەرێك لــە ناوەنــدەوە هــاتووە، وایــدەزانی بڕێکـی زۆر پــارەی لەگــەڵ خــۆی هێنــاوە هــەموو ڕۆژێك دەهات بـۆلای مـن و داوای کـرێ خانووەکـەی دەکـرد. لەهـەموو خـراپتر پـارەی خەرجەکەیـشم بنـی کێـشا. لەحاڵێکـدا دۆخەکـە وەهـا خراپ بوو چەند مانگ کاتی دەویست بۆ ئاساییکردنەوەی.

گـرفتی دەرەوە کـەمتر نـەبوو لەکێـشەی نـاوخۆی ڕێکخراوەکـە. پارێزگـار پـشتیوانی لـە هـێلال ناسـری دەکـرد و بـەو پێیـەش هـێلال ناسـری ئامادەنـەبوو هـەروا بەسـووك و ئاسـانی ڕێکخراوەکـە رادەسـتی نوێنــەرانی ڕاسـتەقینەی کرێکـاران بکـات. حیزبـی تـوودەی تـەورێز و ڕێکخراوی بەناو دژی نەژادپەرستی بەدەستی چەند کەسێکی کۆچـبەر و بەرپرسانی حکومی تا ئەو جێگایەی دەکـرا گێرەشـێوێنییان دەکـرد. تەنیا هیوای ئێمە، کرێکـارانی کارگـەکان بـوون کـە دەبـوو لەماوەیـەکی کەمـدا کۆیـان بکەینــەوە، بــەهێزی ئــەوان ڕێکخراوەکــە لــەژێر دەسـتی هـێلال و هاوڕێکـانی دەربکـەین. لـەماوەی لێکۆڵینەوەکـەدا توانیمـان سـەرنجی نوێنــەرانی کرێکــارانی تــەواوی کارگــەکانی تــەورێز لەگــەڵ بەشێك لەکرێکارانی پێداگر بەرەو ڕێکخراوەکە ڕابکێشین.

نوێنەرەکان هەموو ڕۆژێـك کاتـژمێر شەشـی دوای نیـوەڕۆ دەهـات بۆ ڕێکخراوەکە و چاودێریی پشکنینەکەیان دەکرد. ئەم کرێکارانە بەو پــەڕی دڵــسۆزی و گیانفیدایـیــەوە گــوێگری فەرمانــەکانی نوێنـــەری

ڕێکخـراوی ناوەنـدییان دەکـرد. گـەرمو گـوڕی کرێکـاران لـەدەرهێنانی ڕێکخراوەکـە لەدەسـتی داگیرکـەران جێگـای ڕێـزو هیـواداری بـوو. هـەر چەندە کـە لـە ئازەربایجـان لـەدوای خـەرمانانی سـاڵی ١٣٢٠ ی. هـ ( ١٩٤١ ی. ز) ڕێکخراوی بەڕواڵەت چـەپ زۆر بـوو، خۆشـبەختانە کرێکارەکـان زۆر سـەرنجی ئـەوانیان نـەدەدا. بـەس تـەنها بیریـان لـەڕزگار کردنـی ڕێکخراوەکە دەکردەوە کە لەڕێگای نووسراوەو دوانـدەری و شـتی دیکـە کرێکـاران بەنگهێـشتدەکران بـۆ ڕێکخـراوە بـەناو چـەپەکان، بـەڵام کرێکـــاران بـــە ڕق و بێزارییـــەوە بانگهێـــشتکردنەکانی ئـــەوانیان وڵامدەدایەوە. یـەکێك لـەو ڕێکخـراوە بـەناو چەپانە " ڕێکخـراوی دژە نەژاد پەرستی " بوو. بەڕێوەبەرانی ئەو ڕێکخراوەیە هەموو کارێکیـان دەکرد بۆ هاندانی کرێکاران دژی ڕێکخراوی کرێکاران. ئەم ڕێکخراوەیە وەهای لێهاتبوو کە نەدەکرا دژایەتی بکەیت. لەبەرئەوەی هەر کەسێك دژی ئەو ڕێکخراوەیە بوەستایەتەوە بەتاوانی نەژادپەرستی ماوەیـەکی زۆر دەبـوو لـە گرتوخانـەکانی گـیلان و ئـەراك بووایـە. سـەرۆکی ئـەو ڕێکخراوەیە ڕەحیم ولایی بوو، ڕەحیم لەسۆڤیەت ئەندامی ڕێککەوتنی گەنجانی کۆمۆنیست بوو. بەهۆی ئەوەی بیرو بـڕوای ترۆتـسکی هـەبوو لـەوێ ماوەیـەك لەگرتوخانـە بـوو لـەدوای ئـەو ماوەیـە ناردیانـەوە بـۆ ئێـران، لـەئێرانیش بـەهۆی ئـەوەی کـە ئەنـدامی ڕێککـەوتنی گـەنجانی کۆمۆنیست بوو، ماوەیەك لەبەندیخانە بوو. پۆلیس کاری بـەوە نـەبوو کـە ڕەحـیم لایـەنگری ترۆتـسکی بـووە یـاخود لیـنین. بـەهۆی ئـەوەی بیروبـڕوای کۆمۆنیـستی هـەبوو، دەبـوو دەستبەسـەر بکرایـە. ڕەحـیم ولاییم کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەتی بەهۆکاری ئـەو هـەموو ئەهامەتیـەی

خۆی دەزانی. هەربۆیەش کۆمۆنیستەکەی دوێنێ بوو بە دوژمنی کۆمۆنیستەکانی فەرمان و ناوی لینینی نابوو **لوولەهێنە**. ئێستا کە هێزەکانی سۆڤیەت هاتبوونە ئێران، دۆخەکە گۆڕابوو، دژە کۆمۆنیستەکەی دوێنێ لەسەدا سەد خۆی کردبوو بەکۆمۆنیست و ڕێکخراوێکی دژە نەژادپەرستی بەڕێوە دەبرد. ئایا دەکرا لەگەڵ ڕێبەری ڕێکخراوی دژە نەژادپەرستی ئازەربایجان دوژمنایەتی بکەیت؟

ئەم نەزرگەیە لەپەنای بینای ڕێکخراوی کرێکاران دا بوو لەلایەن ئەو ڕێکخراوەوە هەموو کارێك دەکرا دژ بەڕێکخراوی کرێکاران. لەو بارو دۆخەدا کەئێمەی تێدا بووین بەشەڕهاتن لەگەڵ ئەو ڕێکخراوەیە زۆر ئاستەم بوو. بەتایبەت ڕێکخراوی لەسەداسەد حیزبی توودەی ئازەربایجانیش بەبەردەوام دژایەتی ئێمەی دەکرد.

ئەم ڕێکخراوەیە بەپارەی زۆرو تەواوی ئێمکاناتەوە کەلەژێر دەستیدا بوو لەژێر کۆمەڵێك لەوانە بەڕێزان عەلی ئەمیر خیزی و ئارداشس ئاوانسیان و بی ڕیا و کۆچەرەکان و هی دیکە بەڕێوە دەچوو. ئەمانە بەجێگای ئەوەی کاری باش بکەن هەموو کاتێك خەریکی داڕشتنی نەخشەیەك بوون بۆ لەناو بردنی ڕێکخراوی کرێکاران. ئێمەیش هەرچەندە خەریکی ڕزگارکردنی ڕێکخراوەکە بووین وا بڕیارمان دا لەدوای ئەوەی لەبابەتی هێلال ناسری و چاوشی نەرخەیان بووین ولامێکی باش بدەینەوە بەدوژمنانی ڕێکخراوەکە.

خەبات دژی پیاوانی ڕیسواو خراپ زۆر ئاسان بوو. سەرۆکی ئەمانە بەڕێز عەلی ئەمیر خیزی بوو ئەو کەسە بەتۆمەتی سیخوڕی لەگەڵ مەلا تۆفیق عەرەب و عەلی تورك لەساڵی ١٣١٠ ی. ھ ( ١٩٣١ ی.

ز) لەبەندیخانەدا بووە. مەلا تۆفیق عەرەب و عەلی تۆرك لەلێکۆڵینەوەکاندا دانیان بەوەدا نا کە عەلی ئەمیر خیزی کاری سیخوڕی بۆ پەیدا کردوون. لەو سەردەمەدا سیخوڕەکانیان لەسێدارە دەدا. بەتایبەت بێتوو بەڵگەی تەواویان لەسەر بێت. هەر بۆیەش ئەگەری ئیعدامکردنی ئەمیر خیزی زۆر زۆر بوو. بەڵام لیوا ئایرام سەرۆکی ئاسایشی ئەو کاتە بەڵێنی پێدابوو کە ئەگەر بێتوو نهێنیەکانی ئەو ڕێکخراوەیەی کەکاری بۆ کردووە بیدرکێنێت و بەڵێنبدات لەدەرەوە کار بۆ دەزگای هەولگری بکات ئەوە لە باتی سێدارە دەینێرێتەوە ماڵەوەو هەموو بژیویەکی بۆ دابین دەکات. بەڕای تەواوی گیراوانی سیاسی ئەمیر خیزی پێشنیارەکەی بەڕێز ئایرامی قەبووڵکردبوو بۆیە لەسێدارە ڕزگار ببوو. هەر بۆیەش خەبات دژی سیخووڕی دوێنێ و پۆلیسی ئەمڕۆ زۆر ئاسان بوو. بەڵام ئێمە چاوەڕوانی کاتی گونجاو بووین. ڕێبەرانی حیزبی توودە لەوانە ئارداشس و عەلی ئەمیر خیزی و بی ریا ڕابردویەکی زۆر خراپ و ڕیسوایان هەبوو کە زۆربەی خەڵکی تەورێزو ئازادیخوازانی ڕاستەقینە بەجوانی ئەوانیان دەناسی و هەر بەو هۆیەشەوە خەبات دژی ئەو جۆرە مرۆڤە فێڵبازو درۆزن و دزانە کارێکی ئاستەم نەبوو. بەڵام ئێمە ناچار بووین لەپێشدا ڕێکخراوەکەیان لەدەست دەربێنین، دواتر ئەو بەناو ئازادیخوازانە ڕیسوا بکەین. لەبیرم ناچێت کاتێك کە نارەزاییم دەربڕی بەرامبەر بەگیراوێکی سیاسی و لێمپرسی بۆچی بوویت بەسیخووڕی ئاسایش؟ وتی: ڕاستە کە من ڕقم لە سیخوڕییە بەڵام هیچ چارەیەکم نەبوو، لەبەرئەوەی کچێکم خۆشدەوێت بڕیارم داوە

هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم، هەر بۆیەش پێشنیارەکەی ئابرامم قبوڵکردووەو دژی هاوڕێیان سیخوڕی دەکەم. لەڕاستیشدا هەروا بوو. ئەمانەی کە بەتۆمەتی کۆمۆنیستی گیرابوون، زۆربەیان کەسانی بێ ئیرادەو بێ پرەنسیپ بوون و لەهەزارلاوە کەم و کووڕییان هەبوو. پۆلیسیش ئەوەی بەکار دەهێنا بۆ ئازاردانی کەسانی دیکە. بۆ نموونە هەر ئەو ئارداشسە کە زۆر قسەیدەکرد لەبارەی بەرابەری و ئازادیخوازی. عاشقی کچە مامەکەی خۆی ببوو ئەو بڕە پارەیە کە درا بووە دەستی ئەو، هەمووی خەرجکرد بۆ خۆش رابواردنی و سەفەر لەگەڵ کچە مامەکەی. هەر بۆیەش بەشێکی زۆر لەبەندکراوان لەناوچوون و لەو پارەیە هیچیان بۆ خەرج نەکرا. هەر کاتێکیش رەخنەیان لەئارداشس دەگرت دەیوت:

" بێتوو ئێوە ئەو چاوانەی کچە مامەکەی منتان بدیبایە جگە لەپارە گیانی خۆشتان بۆ فیدا دەکرد ". ئەمە، شێوازی بیرکردنەوەی رێبەرانی حیزبی توودە بوو هەر کامەیان بەشێوازێك خۆی بەدەستەوە دابوو، دژی یەکدی سیخوڕییان کردبوو لێدان و گوشاری سیخوڕییەکەی ئەوان وەئەستۆی ئێمەیش دەکەوت، تەواوی رێبەرانی حیزبی توودە لەو تاقمە بوون.

بی ڕیا کە لەسەردەمی سەرۆکایەتیی پیشەوەریدا بوو بە وەزیری رۆشنبیری، بەو کارە ئەوانەی کە خۆیان بەرۆشنبیرو ئازادیخواز دەزانی مانای ڕاستەقینەی گۆڕانکاری شۆڕشیان! بەخەڵکی ئازەربایجان ناساند. بی ڕیا کەسێکی سەماکەر بوو کە ئێواران لە باخی گوڵستان خەریکی سەماکردن بوو لەخەرمانانیساڵی ١٣٢٠ ی. ه ( ١٩٤١ ی. ز) بەمانگی

۱۲۰ قەران بووبوو بەپۆستەچیی شارەوانی و جاری وایش بوو سەرپەرشتی کەناسەکانی شارەوانیی دەکرد. مەبەست لەباسکردنی ئەو رابردوانە ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا دوژمنەکانی ئێمە کەسانی پێشکەوتنخواز و زانا نەبوون و لەبارەی کار و بارەکانی ڕێکخراوی کرێکارییەوە هیچ شارەزاییەکیان نەبوو، بەڵکو رابردوویەکی زۆر خراپ و ڕیسوایان هەبوو کە لەکەس شاراوە نەبوو.

بەڵام سیاسەتی سەردەم و کەسانی بیانی ئەم کەسە ڕیسواو هیچ نەزانەیان کردبوو بە ئەکتەر و حیزبی توودەیان پێدەگەڕاند. لەدوای هاتنی سوپای سوور بۆ ئێران بێ ڕیا کرا بەسەرۆکی ڕێکخراوی " دژە نەژاد پەرستی " و دواتر بوو بەسەرۆکی " ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران و لەدژی نەژاد پەرستی شیعری دەوت و ستایشی ستالین و لینینی دەکرد. زۆربەی لایەنگرانی حیزبی توودە و داربەدەستانی ئەمیر خیزی و بی ڕەیا و هی دی، بەشێکی زۆر لەکۆچبەرەکان بوون.

ئەوانەی کە لەسەردەمی شای پێشوو لەسۆڤیەتەوە تارێندرابوون بۆ ئێران، بەهۆی پەروەردە و رەوشتی خراپیانەوە، لەڕۆژی هاتنیانەوە. خەریکی دزی و سیخوڕی و کاری خراپ بوون و هەر کە سوپای سوور هاتنە ئێرانەوە هەر یەکەو لەتێك قوماشی سوریان بەسەر باڵیان و خەڵکی ماقوڵ و بەبیرو بڕوای ئەو شارەیان دەترسان و ئازاریان دەدان، هەڵبەت لەنێو کۆچبەرەکاندا، کەسانی باشیان تێدا بوو کە خەریکی کارو کاسبی بوون و دژ بە هەڵسوکەوتی ئەو تاقمە نارەزاییان دەردەبڕی بەڵام بەداخەوە زۆربەیان کەسانی خراپ و شەرئەنگێز بوون و ئەوەندە کاری خراپیان کردبوو کە لەڕووی

ناچارییەوە پیاوانی سۆفیەت پێشیان پێدەگرتن. لەهەرحاڵدا ئەوانەی کە دژایەتی ئێمەیان دەکرد ئەو جۆرە مرۆڤانە بوون و بەداخەوە لە لایەن هەندێك لە بەرپرسانی ناوخۆیشەوە پشتگیری دەکران.

بەپێی پەیڕەو و پرۆگرامی ناوخۆی ڕێکخراوی کرێکاران ئەو کەسانەی کە لیوا موقەدەم دایناببوون شیاوی ئەوە نەبوون ئەندامی ڕێکخراوەکەبن. شاندی بەڕێوەبەرایەتی دانیان بەوەدا نابوو کەلەگەڵ نوێنەری چینی دەستەلاّتدار ( پارێزگار) پێوەندیان هەبووەو گوێڕایەڵی ئەو بوون. جگە لەو شتانەی لای سەرەوە باسمانکرد، شاندی بەڕێوەبەرایەتی ئەندامیان نەبوو، کرێکارەکان پێوەندیان لەگەڵیان نەبوو ئەوانیان بەلاوە شیاو نەبوو.

نوێنەری ڕێکخراوی ناوەندی فەرمانی کرد بە هێلال ناسری کەڕێکخراوەکە بداتە دەستی نوێنەرانی کرێکارانی کارگەکان هەتاکوو کۆبوونەوەی گشتی دەکرێت لەژێر چاودێریی نوێنەری ڕێکخراوی ناوەندی خەریکی ڕاپەڕانی کاروو باری ڕێکخراوەکە بن. هێلال ڕێکخراوەکەی بەدەستەوە نەدەدا و دەیوت لەبەرئەوەی کە جەنابی پارێزگار ڕێکخراوەکەی بەمن سپاردووە، ناتوانم بەبێ ئیزنی ئەو ڕێکخراوەکە رادەستی ئێوە بکەم. بیانوەکەشی ئەوەبوو کەلەوانەیە لە کەلوپەلی ڕێکخراوەکە شتێك کەم ببێتەوە خەتاکە بکەوێتە سەر ئەستۆی پارێزگار، بەلاّم کرێکاران بڕیاریاندابوو بەهەر شێوازێك بووبێت هەر لەو کۆبوونەوەدا ڕێکخراوەکە وەربگرنەوە. لەبەرئەوەی کە پارێزگار بخەنە ناو کارێکەوە کە کراوە، کرێکارەکان دەرگای ڕێکخراوەکەیان داخست و شاندی بەڕێوەبەرایەتی هێلال ناسرییان

ناچار کرد کە رێکخراوەکە ڕادەست بکەنەوە و ڕاپۆرتە فەرمییەکە واژۆ بکەن. لەکۆتاییدا هێلال ناسری لەبەرامبەر تووڕەیی و ڕەقی کرێکارەکان لەهەمبەر ڕادەستکردنەوەی ڕێکخراوەکە، نەیتوانی بەرگە بگرێت و لەبەرئەوەی نەکەوێتە ژێر لێپرسینەوەی پارێزگار کلیلەکانی ڕێکخراوەکەی خستە نێو چەکمەجەی مێزەکەو وتی من ڕێکخراوەکە ڕادەستی ئێوە ناکەمەوە هەر کەس دەوێرێت بۆخۆی کلیلەکان هەڵبگرێت.

چیدی لەمپەرێك لەسەر ڕێگای هێلال و هاوڕێکانی نەبوو بۆچوونە دەرەوە. نوێنەرانی کرێکاران بەچەپڵەلێدان و قریوەوە داگیرکەرانی ڕێکخراوەکەیان بەرێکرد. بۆ بەیانیەکەی پارێزگار نوێنەری ڕێکخراوی ناوەندی بانگهێشتکرد و وتی من نامەوێت لەمەسەلەکانی ناو خۆی کرێکاران دا دەستوەردان بکەم. مەبەستی من ڕاگرتنی ئارامی و ڕێك و پێکی یە. تا کاتێك کرێکاران دژی ڕێك و پێکی نەبن، من پشتگیری لەڕێکخراوەکەیان دەکەم. نوێنەری ڕێکخراوی ناوەندی لەدوای دەستخۆشی لە پارێزگار وتی:

" چینی کرێکارو وەرزێر ڕێکترین چینی نێو کۆمەڵگان. ئەو کاتەی کە بەرژەوەندییەکانیان نەکەوێتە مەترسییەوەو نەکەونە بەر دەستدرێژی و چەوساندنەوەی چینی دەستەڵاتدار هیچ کاتێك تووشی شەڕو ئاژاوەنانەوە نابن. " نوێنەرانی کارگەکانی تەوریز لەدوای ڕاوەدوونانی داگیرکەرانی ڕێکخراوەکە، دەستیانکرد بەچالاکی. چ لەنێو چە لە دەرەوەی کارگەکاندا کاتی بێکاری خەریکی بانگەشە و ڕێکخستنی کرێکارەکان دەبوو.

لەبڕێك لەكارگەكاندا دزەكردنمان زۆر ئەستەم بوو، لەبەرئەوەی بەهۆی كەمترین چالاكییەوە كرێكارەكان دەكەوتنە ژێر گوشاری خاوەنكارەكان. لەوانەیش كارگەی پەشمینە كەبەڕێوەبەرەكەی جورابچی بوو، زەختی دەخستە سەر كرێكارەكان و بێتوو هەستی بەوە بكردایە كە یەكێك لە كرێكارەكان بووەتە ئەندامی ڕێكخراوەیەكی كرێكاری یان لەگەڵیاندا پێوەندیی هەیە لەزووترین كاتدا لەكارگەكە دەری دەكرد. لەو سەردەمەدا هیچكەس نەیدەتوانی كرێكار لەسەركاردەركرا و بخاتەوە سەر كارەكە.

بەتایبەت كە جوورابچی لەگەڵ روسەكاندا گرێبەستی بازرگانی هەبوو كەلوپەلی دەدا بەو دەوڵەتە. هەر بۆیەش كرێكارێك بیویستایە داوای مافی خۆی بكات، بەتایبەت ناتۆرەی بیرو باوەڕی نەژاد پەرستی! پێوە دەنا. بەڕێز جورابچیش ئەم دەرفەتەی بەگونجاو دەزانی و بەو پەری بێڕەحمیەوە كرێكارانی دەچەوساندەوە. هەڵسوكەوتی كەلكەتەچی لەگەڵ كرێكارەكاندا لەجورابچیش خراپتر بوو. ناوبراو ئەو كرێكارە تێگەیشتووانەی پێش ئەوەی كە داوای مافی خۆیان بكەن لەسەر كار لادەبرد و لەدەرەوەی كارگەدا مانگی چەند تمەنێكی پێدەدان بۆ بێدەنگ كردنیان.

كارگەی ڕێسەمانیی نێران كە بەرپرسەكەی حاجی یووسف قەزوێنی بوو هەر چەندە كە ناوبراو خێرخواز بوو جارجارەیش دەهات بۆ ڕێكخراوەكە و داخوازییە ڕەواكانی كرێكارانی بەبێ كێشە وڵام دەدایەوە، چەند كەسێكی لەسەر كار لابردبوو ئامادەیش بوو هەروا بەئاسانی بیانباتەوە سەر كار و كارەكانیان. بەرپرسانی كارگەی

شقارتەی مۆمتاز لەگەڵ کرێکارەکانـدا باشـتر هەڵسوکەوتیان دەکـرد و دژی ئەوە نەبوون کەکرێکارەکان ببنـە ئەنـدامی ڕێکخـراوی کرێکـاران. بـەڵام بەدزییـەوە بەشـدارییان دەکـرد لـەو کۆبوونەوانـە کـە لـەدژی ڕێکخراوی کرێکاران دەکرا. بەس تەنها کارگەی چنینی شەمس لەگەڵ کرێکارەکانیـدا بـەجوانی هەڵسوکەوتی دەکـرد. کارگـەی چـەرم سازی ئێران کە کـاری روسـەکانی دەکـرد و جگـە لەمـەوادی چـەرمی پـێڵاوی ئامادەیـشی بـۆ دەنـاردن. هەرچـەندە بـەهۆی پارێزگـاریکردن لـە رووسـەکان مانگانـە پارەیـەکی چـاکیان دەسـتدەکەوت، بافتـەیی کـە بەڕێوەبـەری ئـەو کارگەیـە بـوو، ئامـادە نـەبوو بـچووکترین داخـوازی ڕەوای کرێکـاران قـەبوڵ بکـات. کارگـەی چـەرم سـازیی خوسـرەویش خـەریکی دەمـە قاڵـەی لەگـەڵ چـەند کەسـێکی کۆچـبەردا بـوو هـەر بۆیەش ئێمە لەبارەی بەڕێوەبەرانی ئەوێوە ئەرخەیان بووین. بـەهۆی ئـەو ئاسـتەنگانەی کەلەسـەرەوە باسمـان لێکـرد لـەبرێك لەکارگـەکانی تەورێز ڕێکخستنی کرێکاران بەشێوەیەکی ئاشـکرا کـارێکی زۆر سـەخت و هـەتا ڕادەیـەکیش ئاسـتەم بـوو. لەبەرئـەوەی هاتبـا و خاوەنکارەکان بیانزانیبایە کە کرێکارەکانیان بوونەتە ئەندام لە ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران، دەستبەجێ ئەو کرێکارەیـان لەسـەرکار دەردەکـرد. کەسانی لەسەرکار دەرکرا و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوو لە زیادبوون بوو ئـەو بێکارانە لەبەیانییەوە هەتاکوو ئێوارە، کـاتی ڕێبـەرانیان دەگـرت، هـەر بۆیەش هەوڵماندەدا هەتا ئەو کاتەی ڕێکخراوەکە نەگاتە ئاستی هێـزو توانایـەکی تـەواو. کەسـێك لـەژێر نـاوی ئەنـدامی ڕێکخـراوە لەسـەرکار دەرنـەکرێت. لەبەرئـەوەی کـە کرێکارێـك بـەبێ هـۆ لەسـەرکار دەر

نەگرێت و ئاوارە نەبێت ناچار بووین لەتەورێز و بەوتەی خیابانی لە ناوەنـــدی ئـــازادی ڕێکخـــراوی نهـــێنی پێکبهێـــنین. هـــەر بۆیـــەش لەکارگـــەکانی پەشمینـــە و کەڵکەتەچـــی و شـــقارتەی تـــەوەکۆلی، ڕێکخراوی کرێکاری شێوەی نهێنی پێکهێنـرا و لـەدوای ئـەوەی زۆربـەی کرێکـارانی کارگـەناوبراوەکان بوونـە ئەنـدامی ڕێکخـراوی کرێکـاران، ڕێکخراوەکە بەشێوەی ئاشکرا دەستیکرد بە چالاکی.

لـەدوای ماوەیـەکی کـورت کرێکـارانی کارگـەکان بەیارمـەتیی ڕێکخراوی کرێکاران توانیان هاوڕێ لەسەر کارلادراوەکانیـان بهێننـەوە ســـەرکارەکانی خۆیـــان، قـــەرەبووی مـــاوەی بێکاریەکەشـــیان لەخاوەنکارەکان وەرگرت.

بەهۆی هەوڵ و چالاکی بـەردەوام و بـەکارهێنانی خراپـی بـژێوی ژیـانی کرێکـاران و گوشـاری تاقـەتپڕوکێنی خاوەنکارەکـان بەسـەر کرێکارەکانـدا: توانیمـان تـەواوی کرێکـارانی کارگـەکان و شـارەوانی و هێڵی ئاسن و هی دیکە بیکەینە ئەندامی ڕێکخراوەکە.

حیزبی توودە لە پێشکەوتنی ڕێکخـراوی کرێکاری زۆر ترسـابوو، خەریکی پێکهێنانی ڕێکخراوی کرێکاری بـوو. کەسێك بـەناوی بـی ڕیـا ڕاسپێردرا بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوەکە. لەپاش ماوەیەکی کورت بـی ریـا و هاوڕێیانی تێگەیشتن کە لـە پێکهێنـانی ڕێکخراوەکـەدا تووشـی هەڵـە بوون. لەبەرئەوەی کرێکارەکان ئامادە نەبوون هاوکاری حیزبـی تـوودە بکەن و هەروەها ئامادە بوون کە هەموو شێوازێك دژایەتی ئەو دوژمنـە بەڕواڵـەت دووسـتەدا بکـەن. ئەنـدامی ڕێکخـراوی پەیوەنـدی دار بەحیزبی تـوودە بـریتی بـوو لـە بـەڕێزان بێ ڕیـا و پادگـان و ڕەحـیم

ولایـی کـە شـاندی بەڕێوەبەرایـەتیان پێکهێنـابوو چـەند کەسـێك لەکرێکارانی کارگەی چەرمی خۆسرەوی و بەشێکی کەم لـەکرێکارانی ڕێگای ئاسن و حـەوت هەشت کەسێك لـە کۆڵبـەرانی کۆچبەر. هـەر چەند ئەندامانی ڕێکخراوەکە زۆر کەمبوون، حیزبی توودە لە شەقامی سەتارخان بینایـەکی خۆشی بـەکرێ گـرت بـوو تابلۆیـەکی گەورەشـی بەسەر دەرگاکەی دا هەڵواسیبوو.

بـەهۆی ڕق و بێـزاری کرێکـاران لـەو ڕێکخراوەیـە ئـەوان نـەیان دەتوانی ڕکەبەرایەتی ڕێکخراوی کرێکـاران و وەرزێرانـی ئێـران بکـەن. هەر بۆیە هاوڕێیان لەو بابەتەوە ئەرخەیانبوون.

ئێمـە زۆرتـر پەشـیمانی هەلومـەرجی نالـەباری ژیـانی کرێکـاران بووین. بـارودوخی ژیـانی کرێکارانی ئازەربایجان لەسـاڵی ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) بـــەقۆناغێکی زۆر خراپــدا تێدەپــەڕی. بـــەهۆی دەســـت پێکردنـــی شـــەڕی جیهـــانی و داگـــیر کردنـــی ئێـــران لەلایـــەن هیـــچی هاوپەیمانان، نرخی کەلوپەل و پێداویستییەکانی خـەڵك بەشێوازێکی سەرسوڕهێنەر بەرز ببـوەوە بـەڵام مووچـەی کرێکـاران لەئاستی پـێش شـەڕوگرانیدا مـابووەوە. زۆربـەی کرێکـاران بەفرۆشـتی کەلوپـەلی نـاو ماڵەکـەیان ئـەو ژیانـە نالـەبارەیان دەبردەسـتەر. گـرفتی کرێکـارانی ئازەربایجـان بەتـەنها مووچـەی کـەم نـەبوو. ئـەم چەوسـاوانە ئەگـەر پارەیەکیشیان لەڕێگای فرۆشـتنی کەلوپـەلی ماڵـەکانیان پەیـدا دەکـرد، نەیانـدەتوانی نانـە وشکیەکەشـی پێبکـڕن. لەبەرئـەوەی کاتێـك ئـەوان دەستیان لـەکار دەکێشایەوە کـە نـان تـەواو دەبـوو دووکـانی نانـەواکان دادەخران. زۆربەی کاتەکانی کرێکارەکان هەر چەندە پارەشیان پەیـدا

کردبوو نەیان دەتوانی نانی پێویستی ڕشۆژانەی خۆیان پەیدا بکەن، هەر بۆیەش شەو بەبرسیەتی سەریان دەنایەوە.

خاوەن کارگەکانی تەورێز لەپێشهاتی شەڕ کەڵکیان وەردەگرت و لە فرۆشتنی بەرهەمەکانیان لەسەداسەد سودیان دەکرد. بەو حاڵەشەوە نامادە نەبوون مووچەی کرێکارەکان زیاد بکەن. هەربۆیەش ئێمە ناچار بووین بۆ باشتر بوونی ژیان و گوزەرانی کرێکاران، توندترین خەبات بکەین دژ بەخاوەنکارکان.

بەداخەوە هەنگاوی جیددی بۆ باشتر کردنی ژیانی چینی بەرهەمهێنەر کەخۆی بێبەری بوو لەتەواوی خۆشییەکانی ژیان زۆر کارێکی خەتیر بوو. حیزبی توودە کە لەپێك هێنانی ڕێکخراوی کرێکاری تووشی شکست هات بوو دەستی دابوویە بوختانکردن دژ بە کرێکاران و چالاکییەکی ئەوانی بە نەژادپەرستی ناو لێدەبرد. هەڵبەت لەو ڕۆژەدا ئەو بوختانە هەم ترسناك بوو هەم قەبوڵدەکرا. خەڵکی ئێران کە ساڵانێکی دوورودرێژ لەژێر چەوساندنەوەی پیاوانی ئینگلیز و بەتایبەت کۆمپانیای نەوتدا بوون و هەموو کاتێك چاوەڕێی دەرفەتێك بوون بۆ تۆڵە سەندنەوە، لە پێشڕەوی هێزەکانی ئەڵمانیا خۆشحاڵبوون و لەژێر چاودێری توندی دەوڵەت و پیاوانی بیانی دارو دیواری شارەکانیان پڕکردبوو لە هێمای خاچی شکا و کە هێمای حیزبی نەژادپەرست بوو. کرێکارەکان لایەنگری حیزبی نەژادپەرست نەبوون، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە حیزبی نەژاد پەرست لەگەڵ ئینگلیزەکان لەحاڵی شەڕدا بوون، هەر بۆیەش فاشیستەکانیان بەهێز دەکرد. لە وەها هەلومەرجێکدا ئەگەر کرێکاران بۆ باشترکردنی دۆخی

ژیانیان دەستیان داوەتە مانگرتن، بەتایبەت لەو کارگانەی کە کاری بۆ حیزەکانی سۆڤیەت دەکرد، ئەگەر کرێکارێك تۆمەتی بوونی باوەڕی نەژادپەرستی بدرایەتە پاڵی، لەو حاڵەتەدا هەرگیز نەماندەتوانی پیاوانی رووسیا بەو قەناعەتە بگەیەنین، هەرچەندە ئەو بزاڤەی کرێکاران چالاکییەکی نەژاد پەرستانە نەبوو، بەڵکو کرێکاران بۆ مانەوەی خۆیان لەگەڵ خاوەنکارەکاندا دژایەتی دەکەن. بەتایبەت کە ئەندامانی حیزبی توودە نەیانتوانیبوو کە نووسەری ئەم کتێبە وەکو لایەنگری ترۆتسکی بناسێنن و بەتەمابوون تۆمەتی نەژاد پەرستی بدەنە پاڵم.

تەنانەت بەپێی ئەو شتانەیش کە باسمانکرد، دۆخی ژیانی کرێکارەکان وەها نەبوو کە بکرێت بێدەنگ بین. ئێمە ناچاربووین بۆ باشترکردنی ژیانی کرێکارانی ئازەربایجان دژ بە خاوەنکارەکان خەبات بکەین. هەر بۆ ئەو مەبەستەیش نوێنەری کرێکارانی کارگەکانی تەورێز وا بڕیاریان دا کە لە زووترین کاتدا کۆنگرەی گشتی بگیرێت و شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەڵبژێردرێت کە لەدوای چوونەوەی من رێکخراوەکە بەڕێوە بەرن و هەنگاوی کردەکی بۆ ئەو مەبەستە بنێن. لە هاوینی ساڵی ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) بەپێی بڕیاری نوێنەرانی کرێکارانی تەورێز و قەبولکردنی لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی رێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران، یەکەمین کۆنگرەی رێکخراوی کرێکارانی ئێران بۆ ماوەی سێ رۆژ بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا لەبارەی زۆر یەك لە بابەتانی کرێکار باس و گفتوگۆ کرا. نوێنەری رێکخراوی ناوەند باسێکی تێروتەسەلی لەبارەی کار و کارەکانی رێکخراوەکە و

پێـــشکەوتنی کارەکـــان و تەگـــەرە و بەربەســـتەکانی ســـەر ڕێگـــای ڕێکخراوەکەی بۆ بەشداربوانی کۆنگرەکە کرد. گەورەترین باسێك کە هێمای بە نوێنەران بوو، مسۆگەربوونی خەبات بۆ باشترکردنی ژیانی کرێکاران. نوێنەران داواکارییان لە شاندی بەڕێوەبەرایەتی نوێ ئەوە بوو کە بەهەر شێوازێك بووبێت پێش بە برسێتی و چەوساندنەوەی کرێکـاران بەدەســتی خاوەنکارەکـان بگیرێـت. نوێنـــەرانی کرێکـاران ئاماژەیان بەوەدا کە ئەگەر بێت و ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئازەربایجـان هـەنگاوێکی کردەکـی نـەنێت بـۆ باشـتربوونی ژیـان و گوزەرانی کرێکاران، پێدەچێت کرێکارەکان بەهۆی بێهیواییـەوە لـەڕێگا لابـدەن و کەونـە داوی بانگەشـەکانی نـەژاد پەرستی. لـەدوای سێ ڕۆژ بـــاس و لێکۆڵینـــەوە ئـــەم کەســـانەی لای خـــوارەوە وەك شـــاندی بەڕێوەبەرایەتی هەڵبژێردران:

١ـ بـەڕێز مـیر مـەجیـد حۆسـەینی کرێکـاری فەرشچنین ٢ـ بیـوك شـۆتۆربانی فەرمانبـەری ڕێکخـراوی کرێکـاران ٣ ـ حەسـەن زەفـیری کریچکاری چاپخانە ٤ـ موحەمەد تەجەدۆد کرێکاری ڕسـتن و چـنینی شـەمس ٥ـ بەڕازنـدە ٦ـ ئاخوونـدزادە ٧ـ مۆتـەلێب قـەفقازی کرێکـاری کارگەی ڕستنی ئێـران ٨ ـ جەمـشید ئـەیاز کرێکاری شارەوانی تـەورێز ٩ـ مەجیـد خامێنـەیان کرێکـاری کـێش چـنین١٠ـ کـازیم نیکـوو فیکـر کرێکاری ڕستن ١١ـ قەلەم قاش کرێکاری چەرم سازی خۆسرەوی.

لـــەدوای هەڵبـــژاردنی شـــاندی بەڕێوەبـــەرو دابەشـــکردنی کـــار و کارەکان لەنێوانیانـدا دەستبەجێ لـەڕێگای نامـە و تەلـەفۆن، سـەرۆکی حکومـــەتی ئـــەو کاتـــەمان لـــەبارو دۆخـــی خراپـــی ژیـــانی کرێکـــاران

ئاگاداركردەوە و هـەروەها پێمانڕاگەیانـد ئەگـەر لەلایـەن دەوڵەتـەوە هـەنگاو نـەنرێت بـۆ گرێبەسـت لـەنێوان كرێكـاران و خاوەنكارەكانـدا، كرێكـارانی تـەورێز بڕیاریـان داوە لەسـەرجەم كارگەكانـدا مـانگرتنی گشتی ڕابگەیـەنن. لـە مـاوەی چـەندڕۆژێكدا لەلایـەن ئۆفیـسی سـەرۆك وەزیرانـەوە نامەیـەكمان پێگەیـشت كـە لـەزووترین كاتـدا شـاندێك بـۆ ئاگـاداربوون لەچـۆنیەتی ژیـانی كرێكـاران نەگاتـە تـەورێز. بـەڵام دیارنەبوو كە ئەو شاندەكەی دەگات و چەندیش دەستەڵاتی هەیە.

هـاتنی ئـەو نامەیـە شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی دڵخۆشـنەكرد و بەتایبـەت ئاشـنایەتییان هـەبوو لەگـەڵ بەڵێنـەكانی بەرپرسـانی حكومـەت و دەیـانزانی تـاران ناتوانێـت هەسـت بـە گرنگـی مەسـەلەكە بكات و بەتایبەت پڕوپاگەندەیەكی كەلەچەندلاوە لەلایەن داردەستانی بیانی لەشوێنی كرێكارەكـان دەكـرا بـەم بەڵێنـە پڕوپووچانە نـەدەكرا پێش بەنارەزایی و بێكاری ببگیرێت. هەر بەو پێیەو بەبڕیاری شاندی بەڕێوەبەرایـەتی ڕێكخـراوی كرێكـاران و وەرزێرانـی ئازەربایجـان، ئیفتیخاری بـۆ دانیـشتن و گفتوگـۆی رووبـەروو پەلـە كـردن لـەناردنی شاندی تـاران بـارە و ناوەنـد وەڕێكـەوت و لـەدوای قسەوباسێكی زۆر و گێـرە و كێـشە تـوانی كـە سـۆهەیلی سـەرۆك وەزیرانـی ئـەوكات ڕازی بكات كە نووسراوێكی ڕەسمی بنێرێت بۆ وەزارەتی كار كـە لـەزووترین كاتدا شـاندێك بـۆ بـەدوادا چـوونی بـارودۆخی ژیـانی كرێكاران بـەرەو تـەورێز بنێرێـت. لـە وەزارەتـی كـارەوە بـەڕێزان دكتـۆر شـێخ، ئەبولفۆتووح عەلەوی و كاویانی بۆ بەدواداچوون لە چۆنیەتی ژیـان و گـوزەرانی كرێكـاران بـەرەو تـەورێز وەڕێكـەوتن. نێردراوانـی ناوەنـد

**لەدوای بەدوادا چوونی ورد لە هەلومەرجی ژیانی کرێکاران و بینینی پێوەندی نێوان کرێکارو خاوەنکار سووربوون لەسەر ئەوەی کە پێشنیارەکە شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێران قەبوڵبکەن و بەهاوکاری یەکدی نەخشەیەك دابڕێژن و لەدەوڵەت داوا بکەن کە ئەو پێشنیارەیان بۆ جێ بەجێ بکات**

[2]

[2] – بیرەوەریەکانی یوسفی ئیفتخاری لێرەدا کۆتایی پێدێت . ئەم نووسراوەیە بە ڕواڵەت ناتەواوە ، بەڵام بەهۆی داخستنی ڕۆژنامە ئیرادەی ئازەر بایجان ، بلاو کردنەوەی بەشەکەی دیکەی نەکراو لەدوای کرانەوەی ڕۆژنامەکەیش چیدی بەردەوام نەبوو .

# پاری سێیەم
# بەڵگە نامەکان

**١- هەواڵە بروسکەیەکان لە ئابادانەوە، ١٢بۆ ١٨ گوڵانی ١٣٠٨ ی. ه (١٩٢٩ ی.ز) [1] خۆپیشاندانەکانی مانگی مەی بەهۆی هاندانی ڕووسەکانەوە**

**بروسکەکان**

**لە ئابادانەوە ٢ ی مەی ١٩٢٩ ( ١٢ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. ه)**

**بەداخەوە هەواڵێك گەیشتووە کەهاندانی بەلشەفیکی بەربلاو لەنێو کرێکارەکانی ئێرانی ئێمە ڕووی داوە و لەئابادانیش بەشێوەیەکی بەرچاو ڕووی داوە. بەپێی ئەو زانیاریانەی کە بەدەستمهێناوە، لە ئابادان ڕێکخراوێکی کرێکاری بەربلاو لەوپەڕی نهێنی کاری دا پێکهاتووە. بەڕای من لە ناوچەکانی کاری لەو ناوچە سەرەکییەکانی نەوتیشدا ڕێکخراوێك پێکهێنراوە، بەڵام تائێستا نەمتوانیوە لەم شوێنانەدا هاندەران یان تێکدەرەکان بناسمەوە. شتەکانم بۆ قائیمقام باسکردووە و داوکاریی هاوکاری ئەوەم.**

---

[1] - F.0.371 , 13783 ff . 59 – 64 , mag 1929 –

( نوسراوەی خوسرەو شاکێری ، جێگای چینی کرێکار لەئێران لاپەرە ٢١ – ٢١٩

بەرپرسانی ئێرانی دەزانن بارودۆخەکە چۆنە و خەریکی دارشتنی نەخشەیەکن کە دەبێ بە هاوکاری لەگەڵ ئێمە پێش بەو گرژی و ئاڵۆزییە بگرن. ئەو کرێکارانە کە زۆربەیان وەرزێرن بەو ئاستە ڕێکخراو نین کە بتوانن هەروا کەخۆیان هەرەشەیان کردووە بەمانگرتن داواکار یەکانی خۆیان باس بکەن. **ئێوە ئاگادارتان دەکەمەوە. هەواڵەکە لەرێگا پۆستەوە دەگاتە دەستان** [2]

لەدوای هاوناهەنگی زۆرتر لەگەڵ قایمقامدا، تاران ئاگادار دەکەمەوە. لەئابادانەوە ٤ی مانگی مەی ١٩٢٩ (١٤ ی گولانی ١٣٠٨ ی. ھ) قایمقام چل و پێنج کەس لەرێبەرانی کرێکاری دەستبەسەر کرد. زۆرینەیان فەرمانبەری ئێمەن. بەپێی بەڵگە و زانیاری بەربلاو کە ئێستا لەبەر دەستماندایە، بوونی پلانێکی گەورەی بەلشەفیکی بۆ زیاتر ئاڵۆز کردنی باردۆخەکە کە زۆربەی ناوچە کرێکارەییەکانی کۆمپانیا، ڕوون و ئاشکرایە. ئەم پیلانە یەکەم هەنگاوە بۆ یاخیبوون لە خوزستان و تەواوی باشوری ئێران. ئێستا ئاگادار بووینەتەوە کەبۆ دەست پێکردنی ئەو چالاکییە بەر بلاوە، بەهۆی مانگرتنی خێراو کتوپڕ، دامەزراوەکانی کۆمپانیای بەدەستەوە گرتووەو هەتا کاتێك کە داخوازیەکانیان لەلایەن کۆمپانیاوە قەبوڵنەکرێت، لەبەرامبەری دەوڵەت دا ڕادەوەستن، ئێستا بارو دۆخی ئێرە ئارامە و هیوامان وایە حکومەت نەهێڵێت شتی لەو چەشنە و گەرەتر ڕوو بدات. لەناوچە گەورە نەتەوەییەکان دا. جم وجۆڵێکی لاواز بینراوە کە دڵنیام هیچی وا ڕوونادات و ناوچەکانی دیکە ئارامە. لەئابادانەوە، ٦ی مانگی مەی

---

[2] – لەوانەیە مەبەستی بەڵگەنامەی ژمارە ٤ بێت .

١٩٢٩ ( ١٦ ی گولانی ١٣٠٨ ی. ه) نۆرەکاری کاتژمێر سێی دوا نیوەڕۆ کرێکارانی ئێرانی نەهاتونەتە سەر کارەکانیان، نۆرە کاری شەو کرێکارەکان هاتونەتە سەر کار و ڕازین، کارگەلێك زۆر باشمانکردووە بۆ بەهێز کردنی نۆرەکارەکان هەتا لەکاتی هەرەپێویستدا بۆ شەو کرێکاری تەوامان لەبەشەکان دا هەبێت. کاری وەبەر هێنان هەروا بەردەوامە. تەواوی نیشانەکان باس لەوە دەکەن کەکرێکارانی ئێران ڕۆژ بەڕۆژ زۆرتر حەز بەکار کردن دەکەن، بەڵام هەتا ئەوکاتەی بۆمان دەردەکەوێت کە تەواوی هاندەران دەستبەسەرکراون، ئیزنی ئەوە نادەین کە بگەڕێنەوە بۆ سەرکارەکانیان. هێشتا بارو دۆخەکە زۆر ئاڵۆزە. بەڵام هیوامان زۆر بەوەیە کە دەوڵەت دەتوانێت بەو هێزانەی کە لە ئابادان داینـاون و ئەو هێزەی کە وەك هێزی یارمەتیدەر لەئەهوازەوە هاتوون، بارودۆخەکە هێور دەکاتەوە.

لەئابادانەوە، ٦ ی مانگی مەی ١٩٢٩ ( ١٦ ی گولانی ١٣٠٨ ی. ه)

هیچ داواکارییەك ڕاستەوخۆ باسنەکراوە. بەڵام لەڕێگای چەند کەسێك لەو سیخوڕانەی کە لەنێو کرێکاران دا دامانناوە ئاگادار کراوینەتەوە کە داخوازیگەلێك وەك ٦ کاتژمێر کاری ڕۆژانە، لانی کەمی مووچەی مانگانە بۆ هەر کرێکارێك چل و پێنج ڕوپیە بێت، هەبوونی نوێنەرانی کرێکاران لەئاستی بەڕێوە بەرایەتیدا، لەنێوان ئێرانییەکان و هیندیەکاندا هیچ جیاوازییەك نەمێنێت. بەڕای من ئەم داواکارییانە بۆ شاردنەوەی هەوڵە ڕاستەقینە بەلشەفیکەکان باسکراوەو سەرکەوتوش نابێت. زۆربەی کرێکارەکان نازانن بابەتەکە چیە و تەنها بەهۆی گوشاری ڕێبەرانیانەوە بووە کە وردە وردە

لەلایەن دەوڵەتەوە دەستبەسەر دەکرێن.

**لەسەرۆکایەتیەوە بۆ تاران، ٧ ی مانگی مەی ١٩٢٩ ( ١٧ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. ھ)** ڕۆژنامەی (( دەیلی نێکس پرێس)) ئەورۆ ھەواڵێکی ھەڵەی لەژێر ناوی (( شۆڕشەکانی پاڵاوگەی نەوت و ناردنی پاپۆڕی شەڕکەری ئینگلیز بۆ بەھاناچونیانەوە)) لەلایەن ھەواڵگریی خۆی لەبەسرادا بڵاوکردەوە. بەرەچاو کردنی ھەواڵەکانی قائمقام و تەواوی بەرپرسە ئێرانییەکان بە وەزیری ناوخۆ بڵێن کە بە لەبەرچاو گرتنی ئەو شتانەی لای سەرەوە، ئێستا کاتێکی گونجاوە بۆ ئاگادارکردنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، نوسراوەیەکی ڕەسمی بڵاو بکرێتەوە. شیکردنەوەی ئێمە لەم بارودۆخە بەپێی زانیارییەکان بەشێوەی لای خوارەوەیە:

لەژێر ناوی بەشێك لە خۆپێشاندانە کۆمۆنیستییەکانی ڕۆژی یەکەمی مانگی مەی لەسەرتاسەری جیھان دا، ئاڵۆزییەك لە ئێران رووی دا کە بەرەنجامەکەی دژی دەوڵەتی ئێران و دامەزراوە پیشەییەکانی خوزستان بوو، بەھۆی دەستبەکار بوونی خێرای پارێزگاری خوزستان، دەوڵەتی ئێران ڕێبەرانی شۆڕشەکەیان دەستبەسەر کرد و بارودۆخەکەیان بەدەستەوە گرت، لە بەرھەمهێنانی پاڵاوگەی ئابادانـدا ھیچ ڕاوەستانێك نەبووە. ( کۆتایی ھەواڵ) بەلەبەرچاو گرتنی ئەو ھەواڵە ناڕاستانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی ئێراندا نایەتەوە من بەو پێیە وڵامی پرسیاری ڕۆژنامەکان دەدەمەوە. پێشنیاربکەن بەوەزیری ناوخۆ کە ئەویش لەتاران وەھا ئاگادارییەك بڵاو بکاتەوە.

**لەئابادانەوە ٧ ی مانگی مەی ١٩٢٩ ( ١٧ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. ھ)**

ئاگادار بووینـەوە کـە هـەولگری (( تـایمزی بەسـرە)) هەرچـەندە کەبەڵێنی دابوو کە بەبێ ئاگاداریی ئێمـە هـیچ هـەواڵێك لـەبارەی ئـەم بارودۆخـەی ئێـستا ڕۆژنامـەکانی بـەریتانیا بڵاونەکاتـەوە، هـەواڵێکی هەڵـەی بـۆ (( دەیلـی تێلگـراف)) بـەرێ کـردووە [3]. ئـەم هەواڵـە چوار خاڵی ناخۆشی لەخۆ گرتـووە کـەبریتین لـە: یەکـەم پۆلیـسی تایبـەتی کۆمپانیـا نـەیتوانیوە بارودۆخەکـە هێـور بکاتـەوە. دووهـەم، پـاپۆڕی شـەرکەر ((سـایکێلمەن)) ڕۆیـشتووە بـۆ ئابـادان، سـێهەمیش پۆلیـسی ئێران لێهاتوو نیە، چوارەم زیانێکی زۆری مادی بەر کۆمپانیا کەوتووە.

پاپۆڕی شـەرکەری (( سـایکێلمەن)) نێزیکـی ئابـادان نەبووەتـەوە، بـەڵکو لـە موحەمـمـەرە و ئاوەکـانی عێـراق بـەرەو ئـەم لاوە نـەهاتووە، زیانێکی وەهاش لە کۆمپانیای نەوت نەکەوتووە، پۆلیـسی ئێـرانیش لـە بەرئـەوەی هێـزی زۆر کـەمی بـوو داوای یارمـەتی لـە سـۆپا کـردووە. داوامان لە سەرنووسـەری ڕۆژنامـەی ((تـایمزی بەسـرە)) کـرد کـە ئـەو هەواڵـە پوچـەڵ بکاتـەوەو لـەجێگای ئـەوە ئـەم هەواڵـە کـورت و ڕاستەقینەیە بەرێ بکات:

(( بەشـێك لـە کرێکـاران کـە لەلایـەن کەسـانێك کـە پێوەنـدییان بەکۆمپانیاوە نەبووە هاندراون.

سەرلەبەیانی ڕۆژی دووشەمە لەدەرەوەی پالآوگە ئاژاوە گـەلێکیان دروستکردووە. ئەوان هەوڵیاندەدا کە نەهێڵن کرێکارەکانی دیکە بێنـە سەر کارەکانیان و هـەتا ئاسـتێکیش توانیـان ئـەوە بکـەن. ئاژاوەگـەلێك ڕوویـان دا، بـەلآم بەشـێوەیەکی بـاش لەلایـەن پۆلیـسی ئێرانـەوە

---

[3] – بەڵگەی ژمارە ٢

لەشوێنێك لەدەرەوەی پالأوگە ئابلۆقە دراو بەو هۆیەشەوە، زیانێکی بەرچاومان پێنەگەیشت. بەرپرسانی ئێرانی کە دەترسان بارو دۆخەکە، ئالۆزتر بێت، لەبەر ئەوە پێش بەو مەسەلەیە بگرن، هێزەکانی سوپایان لە موحەمەرەوە بانگهێشت کرد کە بلاوە بەو تێکدەرانە بکەن. لەهیچکام لەو قۆناخانەدا ڕەوتی وەبەرهێنان تووشی کێشە نەبوو بارودۆخەکە وەك جاران ئاسایی بووەتەوە))

**لەسەرۆکایەتیەوە بۆ ئابادان، ٨ ی مانگی مەی ١٩٢٩ ( ١٨ ی گولانی ١٣٠٨ ی. ھ)** ڕۆژنامەی (( تایمز)) هەواڵێکی کورتی لە هەولگری خۆی لەتاران پێگەیشتووە لەبارەی ئەو بارودۆخە. ئەوان پێوەندیيان پێوە کردین و ئێمەش زانیاریی پێویستمان پێدان. ئەوان بەشێك لەو زانیارییانەی ئێمەیان لەژێر ناوی (( هاندانی هاندەرانی سور لە ئێران)) لە ڕۆژنامەی سەر لەبەیانی فەرمانۆ بلاوکردۆتەوەو تیایدا هەواڵێکی باشیان لەهەواڵە دەستبەجێکانی پارێزگار باسکردووە [4].

ئەم نوسراوە تەواو و ڕاستە دەتوانێت کاریگەریی بلاوکراوەکەی دوێنێی ڕۆژنامەی (( دەیلی ئێکسپرێس)) کە گرنگیەکی زۆریشی پێنەدرا. بەتەواوی لابەرێت.

[4] - بەلگەی ژمارە ٣

**٢- ( هەواڵی ڕۆژنامەی دەیلی ئێکسپرێس، ١٧ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. هـ (١٩٢٩ ی. ز)** [5]

**پاپۆڕی شەڕکەری بەریتانیا دەچێت بۆ ڕزگار کردن.**

**شۆڕش لەئێران و کەوتنە مەترسیی ئینگلیزەکان**

**شۆڕش لە پاڵاوگە**

**هەولگریی (( دەیلی ئێکسپرێس)) بەسرە، دوو شەممە، ٦ ی مەی ١٩٢٩ / ١٦ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. هـ پاپۆڕی شەڕکەری ئینگلیزی سایکێلمەن** [6] **بەرەبەیانی فەرمانۆ لەناکاو بۆ پارێزگاریکردن لەهاوڵاتیانی خۆی لەئابادان لەبەسرەو بەڕێ کەوت. فەرمانۆ لە ئابادان شۆڕش گەلێك گەورە ڕوویان داوە. بەردیان گرتۆتە کۆمپانیای نەوتی ئێران و ئینگلیز و لەنێو شاردا بڵاوکراوەیان بڵاو کردووەتەوە. بەڕای پۆلیس ئەم بڵاوکراوانە نیشانەی ئەوەیە کە لە دەرەوەی وڵاتەوە بانگەشەی کۆمۆنیستی بووەتە هۆی ئەم ئاژاوەیە. پۆلیس نەیتوانیوە ئاژاوەکە کۆنترۆڵ بکات هەر بۆیە داوای یارمەتی لەسوپا کردووە. پاپۆڕی شەڕکەری (( سایکێلمەن)) پاپۆڕێکی ١٢٥٩ تەنی یە کەدوو تۆپی چوار ئینجی و چوار تۆپی سێ پۆندی لەسەر بوو. بەڕێوەبەرەکەمی کەسێك بوو بەناوی دەبلیوو. ئێس. کارسۆن** [7]**. ئابادان دوورگەیەکی گەورەیە لە شەتوالعەرەب دا. پاڵاوگەی نەوتی ئینگلیز و ئێران لەو دورگەیەدا**

---

[5] – ڕۆژنامەی دەیلی ئیپرێس ، سێ شەممە ٧ی مەی ١٩٢٩ ، لاپەڕە ١ ( بەوتەی شاکری ، لەپێشدا ، لا پەڕە ٢١٢ ) .

[6] – cyclamen

[7] – w.s.carson

بوو کەرێگای بۆڕییەوە پەیوەست بوو بەناوچە نەوتییەکانی دیکەی خوزستان کە لەولای ئەهواز بوو. ولاتی بەریتانیا خاوەنی بەشێکی زۆر لە پشکەکانی کۆمپانیای نەوت بوو.

## ۲- هەواڵی ڕۆژنامەی تایمز، ۱۸ ی گولانی ۱۳۰۸ ی. ه ( ۱۹۲۹ ی. ز ) [8]

هاندانی سوور لەئێران

چەند ڕۆژ بەر لەئێستا بەشێك لەکرێکارانی ئەرمەنیی پالاوگەی کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز و ئێران لەئابادان دەستیانکرد بە هەڵخراندن. وادیارە لەو هاندانەدا ڕووسەکان دەستیان هەبووە. بەرپرسانی ئێرانی زۆر زوو توانیان بەڕێوەبەرانی ئەو کارە دەستبەسەر بکەن. هێزگەلێکیش لە ئەهوازەوە نێردران بۆ ئابادان و ئاژاوە گێڕەکانی دیکەیش سەرکوت کران. هیچ زیانێك بەر کۆمپانیا نەکەوت و ئاستی وەبەرهێنانیش هیچ دابەزینێکی بەخۆیەوە نەبینی.

ئەو هەوالانەی کە لەئێرانەوە بەدەستمان گەیشتون لەلایەن کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز و ئێران ئەو هەواڵەی ئێمە پژڕاس دەکاتەوە. وادیارە لەڕۆژی ۲ ی مەی ( ۱۲ ی گولان) دا هاندان و بانگەشەیەکی بەلشەفیکی زۆر گەورە لەنێو کرێکارانی ئێرانی پالاوگەی نەوتی ئابادان ڕوویاندابێت. ئەوان دەستیان لەکارەکانیان هەلگرت و دەستیانکرد بەئاژاوەنانەوە. لەسەرەتاوە دیاربوو کە بۆ وەها ئاژاوەیەکی گەورە ڕێکخستنێکی نهێنی لەنێو کرێکارەکاندا لەئارادا

---

[8] - ڕۆژنامەی تایمز ، ۸ ی مەی ۱۹۲۹ ، لاپەڕە ۱٦ ( بەوتەی شاکری ، پێشووتر ، لاپەڕە ۲۱٤ ) .

بـووه. هـەتا ڕۆژی ٤ ی مـەی ( ١٤ ی گـولان) چـل و پێـنج كـەس لەرێبـەرانی ئـەو مانگرتنـە دەستبەسـەركران. بـەپێی ئـەو بەلگانـەی كەبەردەست كەوتون پلانێكی بەربلاوی بەلشەفیكی لەتـەواوی ناوچە نەوتییـەكانی خووزسـتاندایه. وابڕیـار بـووه كـەمانگرتنێكی تونـدو لەناكاو، ڕێگا خۆشكەر بێت بۆ پەیڕەوێكی شۆڕشگێڕانە لەخوزسـتان و سەرجەم باشوری ئێران. دوو ڕۆژ دواتر تـاقمێكی چـل كەسی لـەئاژاوە گێڕەكان كەچەقۆو داریـان بەدەسـتەوە بـوو لەولامدانـەوە بەسـەركوت كردنەكـەی پارێزگـار، وابڕیاریـان دا كەنـەهێلن كرێكارەكـان بـچنە سـەركار وبارەكانیـان. بەمەبەسـتی بلاوەپێكـردن بـەو ئـاژاوە گێڕانـە، هێزێـك لەموحمـەرەوە ( خۆڕەمـشەهر) نێـردران. بەتـەواوی ئـەو باسانەوە وادیار بوو كەكرێكارانی ئێرانی حەز دەكەن بچنەوە سەر كار و بارەكانیان، بـەلام بـاری نائاسایی هـەتا دەستبەسـەركردنی سـەرجەم تێكـدەران بـەردەوامبوو. ئابـادان لـەژێر چـاودێریی تـەواوی هێـزە ئەمنیەكاندا بوو.

**هانـدەران ڕاسـتەوخۆ هـیچ داواكاریـەكییان نـەبوو بـەلام بـەنیاز بوون داواكاریگەلی وەك:**

ڕۆژانە شەش كاتـژمێر كاركردن، لانیكـەم مووچـەی مانگانـەی ٤٥ ڕووپیـە بـۆ كرێكارەكـان، بـوونی نوێنـەرانی كرێكـاران لەئاسـتی بەڕێوەبەرایەتیداو یەكسانیی تەواو لەنێوان كرێكارانی ئێرانـی هێنـدی باس بكەن. زۆربەی كرێكارەكان نەیاندەزانی ئەم ئاژاوەو هاندانـە بـەچ مەبەسـتێكەو دیـارە كەئـەم داواكارییانـە بـۆ شـاردنەوەی ڕووی ڕاسـتەقینەی شۆڕشـەكەبوو. دوێنـە پالاوگـە بەشـێوەی ئاسایی كـار و

بارەکانی خۆی دەکرد. ئەو بارە نائاساییە ئەمنیە هەروا بەردەوامە، پۆلیسیش سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو دەستبەسەرکردنە.

### ٤- ( هەواڵی مانگرتنەکە) [9]

### مانگرتنی کرێکاران لەئابادان و داخوازیەکان

١م. عزیز ئابادان ٢ ی مەی ١٩٢٧ ( ١٢ ی گوڵانی ١٣٠٦ ی. ﻫ) بۆ زانیاری لەبارەی سەردەمێك کەبە ١٥ ی دێسامبری ١٩٢٨ ( ٢٤ ی سەرماوەز ١٣٠٧ ی. ﻫ) دەبەسرێتەوە، داواکارین سەیری نامەی ژمارە ١ م. ١ ی. ٢٤ بەرێکەوتی ٢١ ی مارسی ١٩٢٩ ( یەکەمی خەکەلێوەی ١٣٠٨ ی. ﻫ) خۆتان و هەواڵی ژمارە ١٩ ی ئێمە – بەتایبەت بەندی سێهەم – بکەن.

لەدوای هەوڵێکی بێئاکام کە بۆ دامەزراندنی یانەی کرێکاران لەئابادان و موحەمەرەو ئاهواز کرا، هیواداربووین کە چیدی لەو شێوە رێکخستنی کرێکارانە رزگارمان بووبێت. بەڵام بەداخەوە ئەوە روویندا و بەپێی ئەو هەواڵانەی کە بەدەستمان گەیشتوون وادەردەکەوێت کە بەرپرسانی رێکخستنی کرێکاران لەدوای ئەوەی کە لە دامەزراندنی یانەکان دڵسارد بوونەتەوە، زۆر زوو بیریان لەشێوازگەلی دیکە کردووەتەوە.

بەپێی ئەو زانیاریانەی کە ئێستا لەبەر دەستماندان و بەتەنها لەم رۆژانەی دوایدا و لە دوای گێرەوکێشەی زۆر بەدەستمان هێناوە، وادەر دەکەوێت کە رێکخستنی شۆرشی کرێکاریی ئابادان بەپێکهێنانی

---

9 - f.0.371 / 13783ff . 130 – 34, May 1929 ( بەوتەی شاکری پێشووتر ، لاپەرەی ٢١٥ – ٢١٨ )

ڕێکخراوە گەلێك لەژێر ناوی ناوەندە کرێکارییەکان لەنێ و کرێکارانی کۆمپانیای نەوتدا دەستی بەچالاکی کردووەو ئەوەشیان زۆر بەنهێنی کردووە، لەبەر ئەوەی ئەبەرپرسانی ناوچەکەو ئەئێمەیش هەستمان بەو چالاکییە نەکردووە کەلەمانگی ژانویەوە دەستی پێ کردووە ( هەردوولاشمان بەهۆی ئەو هەولانەی کە بۆ پێکهێنانی یانەی کرێکاران کرابوو هەموو جموجۆڵێکی کرێکارانمان خستبووە ژێرچاودێرییەوە).

فەرمانۆ کە بارودۆخەکە وای لێهاتووە کەبەس بەتەنها لەئاباداان سی ناوەندی کرێکاری لێیە کە بەدەستی کرێکارانی لێهاتوو کرێکارانی بەناوبانگ بەڕێوە دەبرێت. ( ئەم کرێکارە لێهاتووانەو بەناو بانگانە) لەنێو ئەو ڕێکخراوەیەدا وەك سەرۆك هەڵسوکەوت دەکەن. دەوترێت هەر یەك لەو سەرۆکانە پتر لەسەد کرێکاریان لەبەر دەستدایە. بەڕای ئێمە ئەم ژمارانە زیاد کراوە، لەبەرئەوەی کە یەکەم ئێمە ئەم هەموو کرێکارەمان لەبەردەست دا نیە و دووهەمیش لە تەواوی کۆبوونەوە کرێکارییەکاندا کە سیخوڕی ئێمەی لێیە، هیچ کاتێك زۆرتر لە ١٥ بۆ ٢٠ کەس بەشداری ئەو کۆبوونەوانە نەبوون.

هەتاکو ئێستا نەمانتوانیوە نەژادپەرستی بەڕێوەبەرایەتی ئەو بزاڤە بناسین. دەوترێت کە ئەو شانەدە بریتین لە ٧ کەسی ڕووسی، ٤ کەسی تەورێزی و ٤ کەسی ئێسفەهانی. هەروەها ئاگادارین کەچەند کەس لە بازرگانان و کەسانی بەوبانگی پارێزگا، لەوانە میرزا حوسەین مۆوەقەر، کە پێشتر بە میرزا حۆسەین ژێرمەنی دەناسراو ڕابردوویەکی باشی نەبووە لەشەڕی یەکەمی جیهانی و ئێستاش نوێنەری خەڵکی ئابادان و موحەمەرە ( خۆرەم شەهر) ە

لەپەرلەماندا[10] و کوڕەکەی کە ناوی عەبدولەجیدە [11] ئێستا ئەگەر نەڵێین خۆیان بەشداری ئەو کارە بوون بەڵام لایەنگرییان لێکردووە. هەروەها بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لەبەردەستدان، دوو ناوەندی کرێکاری لە مەسجێدسولەیمان، دوو ناوەند لەئەهوازو حەوت ناوەندیش لە موحەمەرە بوونیان هەیە.

هەر بۆیەش تێدەگەین کە ئەم بزافە بەتەنها دژی کۆمپانیای نەوت نییە، بەڵکو بەشێکی دیاریکراوە لە پرۆگرامێکی شۆڕشگێڕانە کە بۆ تەواوی باشوری ئێران دارێژراوە.

پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات کە ڕێکخراوەکەی ئێمە بۆ بەدواداچوونی ئەو جۆرە پێشهاتانە بۆ یەکەمجار کە قسەوقسەلۆکێکی بیست، بەتەواوی هێزەوە کەوتە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی تەواو بۆ ئەو پێشهاتەیە ئێستاش ناچاربووم جەنابی سەرۆك لەو بارودۆخە ئاگادار بکەمەوەو کە ئەگەر هاتوو نەمانتوانی پێش بەو گرژی و ئاڵۆزییە بگرین، هەلومەرجەکە زۆر مەترسیدارتر دەبێت.

یەکێك لەو شتە گرنگانە کەجێگای ئاماژەیە ئەومیە کە هەتاوەکو ئەم کاتە هیچ کام لە کرێکارەکان نەبوونەتە ئەندامی ئەو ڕێکخراوانە و بەتەنها بەس فەرمانبەرەکان، سەرکرێکارەکان و پیشەوەرەکان (کە هەموویان ئێرانین) لەو ڕێکخراوەدا ئەندامن.

لەئێستادا هەتا ئەو جێگەی کەئێمە ئاگادار بین، ئەم ڕێکخراوەیە

---

[10] – میرزا حوسەین خان مۆوەقەر : ئەندامی خولەکانی شەشەم هەتا نۆیەمی لەخۆ رەم شەهرەوە لەپەرلەمانی ئێراندا .

[11] – عبدالمجید مۆوەقەر : بەڕێوەبەرو دەمەزرێنەری گۆڤارو ڕۆژنامەی مێهر ، گۆڤاری چاپەمەنی مێهر ئێران .

بەنیازە هەتا کاتێك کەدەتوانێت لەبەرامبەر کۆمپانیاو دەولەتدا بوەستێتەوە، سەرقالی کۆکردنەوەی ئەندامی زۆرترو بەهێز کردنی لایەنی مادی خۆیەتی. ئاگادار کراوینەتەوە، ئەوان کاتێك کەبگەنە ئاستی پێویست ئەم داواکارییانەی لای خوارەوە رادەگەیەنن:

١- ماف هەبوونی نوێنەر لە فەرمانگەی کارو بەشی دەرمانی، بەتایبەت لەبواری وەرگرتن و دەرکردنی کرێکاردا زانیاریی تەواویان هەبێت.

٢- زیادبوونی مووچەی کرێکاران هەتا ئاستی مانگانە ٤٥ رووپیە لەمانگدا کەپێشتر لە سالی ١٩٣٣ دا وەها مووچەیەکیان وەرگرتووە.[12]

٣- بەرایی ( مۆلەت) بە مووچەوە.

٤- شەش کاتژمێر کارکردن لەرۆژێکدا.[13]

٥- دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی شیاو بۆ سەرجەم کرێکارەکان لەلایەن کۆمپانیاوە.

٦- نەمانی رووخاندنی خانووی کرێکاران لە ئابادان و شوێنەکانی دیکە.[14]

---

[12] – دەربارەی بەشێك لەو خالانەی کەلەم بەلگەیەدایە پرسیار گەلێکمان ئاراستەی ئاغای ئێفتخاری کرد کەوەلامەکانی ئەومان لێرەدا باسکردووە .

ئەوان لەو بارەیەوە وتیان : (( ئێمە داواکاری زیادکردنی مووچەمان بووە بەرێژەی لەسەدا پەنجا . دواتر مووچەکان بەرێژەی لەسەدا بیست و پێنج زیادی کرد . ))

[13] – (( ئێمە رۆژانە ٨ کاتژمێر ئیش کردنمان قەبوولبوو بەلام بەو شەرتەی کەبەبێ هۆ کرێکارەکان لەسەر ئیشەکانیان دەر نەکرێن . ئەوان کرێکارەکانیان بەهەتا هەتایی دەر دەکرد . )) ( ئێفتخاری )

[14] – (( ئێمە داواکاریمان ئەوە بوو کەخانووی خەلك ئاگر نەدەن . )) ( ئێفتخاری )

٧- پیشەوەرانی ئێران لەبەستنی گرێبەستدا لەمافی هاوشێوەی گرێبەستەکانی هێندێکیان بێبەش نەکرێن.

٨- تەواوی شکاتەکان لەلایەن پۆلیسی ئێرانەوە بەدواداچوونی بۆ بکرێت.[15]

٩- فەرمانبەرانی ئێرانی لەگەڵ فەرمانبەرانی هێندیدا مووچەکانیان هاوتا بکرێت.

١٠- ناکۆکیی نێوان ئێرانیەکان و ئەوروپیەکاندا و کۆمپانیا و ئێرانییەکان لەشوێنە دادوەرییەکانی ئێراندا چارەسەر بکرێت.[16]

١١- پێدانی خانەنشینی لەباتی دەستخۆشانە لەدوای کۆتاییهاتنی خزمەتی درێژماوە یان لەسەر کار لابردنی بەهۆی نەبوونی پێویستی و درێژەپێدانی ئەو خانەنشینی لەدوای مردنیشی دا.[17]

هەفتەی جارێك کۆبوونەوەیەك دەکرا و کاتێك بانگەشەی ڕووسی دەگەیشت، تەواوی ڕێبەران بۆ باس و وتووێژ لەو بارەیەوە کۆدەبوونەوە. ئاگادار بووینەتەوە کە لەم دوابانگەشەدا باس لەوە کراوە کە ئەگەر بێتوو ئەم هەواڵانە کرێکارانی ئابادان بەئاکام بگات، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مووچەکانیان هەتا ئاستێکی بەرچاو بەرز ببێتەوە. لەباری بژیوی چیانیشەوە بێتوو لەژێر چاودێریی

---

[15] – باس کردنی وەها داخواز یەك لەلایەن ئاغای ئێلفتخاریەوە پەسندکرا .

[16] – (( ئەم مانگرتنە دوو لا یەنی هەبوو . لایەنێکی کرێکاری کەبەتەواوی پێوەندی بەکرێکارەوە هەبوو لایەنێکی نەتەوایەتیش ئەمەیش بەشێکە لەلایەنە نەتەوەیەکەی )) . ( ئێلفتخاری )

[17] – (( نا ، ئێمە داوا ی بیمەمان کردبوو . هەڵبەت بیمەیش هەمووی ئەو خاڵانە لەخۆ دەگرێت . کرێکارەکان بیمەیان نەبوو . )) ( ئێلفتخاری )

ڕووسەکاندابن، بارو دۆخەکەیان زۆر باشتر لەوەیە کە لەژێر دەستی ئینگلیزەکاندابن.

لەم هەواڵەدا ناوی ڕێبەرانی ناوەندە کرێکارییەکانیشمان هێناوە.

لەبەرچاو گرتنی ئەو شتانەی کەباسم کرد بێتوو نەمان هەوێت پێش بەو ڕووداوانە بگرین، دەبێت هەنگاوی زۆر پێش گیرانە بنێین. ئاگادار بوینەتەوە کەلەدوای تەواو بوونی ئەم بشێوەیە، کرێکاران بێنە نێو پالأوگە، دەرگاکان دابخەن و داواکار یەکانیان لەنێو کارگەدا بەسەر بەرپرسانی کۆمپانیا و دەوڵەتدا داسەپێنن. ڕوونە کەرێبەرانی ئەم ڕێکخراوەیە بەجوانی بیریان لەهەموو شتێك کردووەتەوە. لەبەرئەوەی ئەگەر کرێکارانی مانگرتوو لەدەرەوەی کۆمپانیادا بوونایە، دەمانتوانی بەو کرێکارانەی دیکە کاروبارەکانمان ڕاپەڕێنین. کرێکاران هیوادارن هەموو شتێك بۆ مانگی موحەرەمی ئەمساڵ کە لە٧ ی ژۆئن دەستپێدەکات [18] و لە ٧ ی ژوئیەدا تەواو دەبێت ئامادەبێت. هەروا کە دەزانن مانگی موحەرەم مانگێکە کەتیایدا ئێرانییەکان بەتەواوی هەستیان دەبزوێت و بەڕای من لەوە کاتێکی باشتریان بەردەستنەدەکەوت. من لەگەڵ بەرپرسانی ئابادان و پارێزگاردا لەو بارەیەوە پێوەندیی نزیکم هەیە و ئەوانیش بەجوانی دەزانن کە بارودۆخەکە مەترسیدارە و چاوەڕوانم کە پارێزگار من ئاگادار بکاتەوە کە بەنیازە چی بکات و چوون دەیەوێت ئێمە هاوکاریی بکەین.

بەرگێك لە بروسکەی ژمارەی ٩٩ ی خۆمم بۆ بەڕێوەبەری

---

[18] – یەکەمی موحەرەمی ساڵی ١٣٤٨ ی . کۆچی هاوکات بوو لەگەڵ ١٩ ی جۆزەردانی ساڵی ١٣٠٨ ی . هـ و ٩ ی ژوئنی ساڵی ١٩٢٩ ی . ز .

کۆمپانیای نەوت ناردووە و کە بەپێی خاڵەکانی دەیبینن کە هەتاکوو ئێستا لەناردنی ئەم هەواڵە لەرێگای (( گەرین هاوس)) ە وە [19] بۆ دەوڵەتی ناوەندی خۆمم پاراستووە هەتاکو پارێزگاری خوزستان کە جێگای بڕوای خۆمە،

لەسەر ناردنی ئەم هەواڵە ڕەزامەندی نیشانبدات.

جێگای سەرنجە کەهاوکات لەگەڵ پێکهێنانی یانە کرێکاران و ئەم پێشهاتانە، پاپۆڕەکانی سۆڤیەت لەژێر ناوی (( کۆمۆنیست)) ( میخایل فرۆنزە) لەخور ەمشەهردا ماونەتەوە گومانی ئەوەم هەیە کە چەکو تەقەمەنییان بەتاڵکردبێت. بەرپرسانی ئێرانی ئاگاداری ئەو گومانە هەن و بەوپەڕی پێداگرییەوە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە لەبابەتەکەن.

دڵسۆزی ئێوە.

ناوی رێبەرانی ناوەندە کرێکاریەکان

میرزا عەلی تەنگسیری [20] سەرکرێکاری کارەبا، بەشی کارەبا

ڕەمەزان [21] بەرپرسی کلیل، وێستگە

سەید خەلیل [22] فیتەری دەریایی تەنکی

میرزا جەعفەر بەپرسی سەرکرێکارەکان، بووارده

میرزا عەلی پێشتر فەرمانگەی کار، ئێستا میشان

---

[19] – Green House نۆفیسی شەریکەی نەوت لە لەندەن .

[20] – دەربارەی ئەم ناوانەیش چەند پرسیارێکمان لەئاغای ئێفتخاری کردو ئەویش هەتا ئەو جێگای کەلەیادی مابوو ، لەو با رەیەوە پێی وتین : (( دواتر ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ عەلی دێژبان . )) ( ئێفتخاری )

[21] – (( هەر ئەو ڕەمەزان کاوەیە )) ( ئێفتخاری )

[22] – (( سەید خەلیل پەیغەمبەر زادە )) ( ئێفتخاری )

میرزا حەسەن عەلی [23] بەرپرسی سلێنگ

میرزا مەحمود [24] پێشتر فەرمانبەری فەرمانگەی کار، ئێستا فەرمانگەی دەستەبەر

میرزا ئەحمەد کارگەی سەهۆڵ

عەلی نەژاد بەرپرسی سلێنگ

خورشید سەرکرێکار، بووارده

عەلی سەرکرێکار، بارهەندازی ژمارەی ٤

حۆسەین سەرکرێکار، بەشی مەخزەن و هەنارده

ئەحمەد هاوکاری سەرکرێکار، دینەمۆی ژمارە ١٠

میرزا حەسەن عەلی دارتاش

غولام حوسەین خان بەرپرسی فەرمانبەرانی ئێران

غولام [25] بەشی ئەندازیاری

گوڵ نەزەر سەرکرێکار، بوارده

میرزا ئەحمەد فەرمانبەری ئیداری

سەید موحەمەد سەعاتسازی نێو بازاڕ

موحەمەد سامی بەرپرسی کۆگا، بەشی کارمبا

وەستا حاجی [26] دارتاش

---

[23] – (( حەسەن عەلی سابتی یەکێك بوو لەڕابەران کەلەم دووایانەدا مردووە . )) ( ئێلفتخاری )

[24] – (( میرزا مەحمود کرێکار نەبوو . فەرمانب ەری شەریکە بوو ئاگاداری ڕێکخراوەکەی ئێمە نەبوو . بەشێك لەوان یان لەڕووی گومانەوە دەسبەسەر کردبوو . )) ( ئێلفتخاری )

[25] – (( غوڵام لەڕابەران نەبوو )) . ( ئێلفتخاری )

کای شاهباز　　نوسینگەی دراو، ناوبازاڕ

میرزا یووسف خان ئەردەبیلی [27]　　نەناسراو

ئێبراهیم ئەفەندی　　سەر کرێکاری کارگە

میرزا ساحێب　　کارگەی بۆیەکردن

حەیدەر　　فەرمانبەری بەشی ئەندازیاریی بیناسازی

بەڕێز یووسف　　نەناسراو

ئاغا نەجەفی [28]　　نەناسراو

میرزا محەمەد تەنگێستانی [29]　　فەرمانبەری لەسەرکاردەرکراو

**٥- هەواڵی دەریاوانیی بەرتانیا، ١٧ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. ھ ( ١٩٢٩ ی. ز ) [30]**

نهێنی، دۆزینەوەی ڕەمز، بروسکەی ژمارە ٨٩١

لە: وەزارەتی دەریاوانی

بە: بەبەڕێوە بەرایەتی گشتی، ڕۆژئاوای هێند

ڕێکەوت: ٧ / ٥ / ١٩٢٩ ( ١٧ ی گوڵانی ١٣٠٨ ی. ھ)

بەپێی ژمارەی ٧٩٤ ی ئێوە. کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز و ئێران، لەندەن، ئێستا هەواڵی داوە کە هێزە سەربازییەکانی ئێران کەلەژێر

---

[26] – (( خەڵکی ئیسفەهان بوو . )) ( ئێفتخاری )

[27] – مەبەستیان یوسف ئێفتخاری یە .

[28] – لەوانەیە عەباس عەلی نەجەفی بێت

[29] – (( برای عەلی دژبان ( ئەفەری یەکەمی ئەم پێرستەیە ) . لەتاقمی نەتەوە پەرستەکان بوو کرێکار نەبوو . لەلایەن ئینگلیزکانەوە چارو بارە ئازار دەدران . ئەوانیان زووتر دەناسی بەڵام ئێمەیان نەدەناسی . )) ( ئێفتخاری )

[30] – F.O . 371 / 13783 f . 122 ( بەوتەی شاکێری ٢٢٢ )

فەرمانی پارێزگاری ئابادان کاریکردووە توانیویانـە بـە شێوەیەکی زۆر باش لەگەڵ پشێویەکانی ئابادان دا ڕوو بـەڕووی ببنـەوەو کەسانێکی زۆریان دەستبەسەر کردووە. چاوەڕێ ناکرێت ئاژاوەیـەکی زۆرتـر ڕوو بـدات و هـەتا ئـەو کاتـەی کەدەوڵـەتی ئێـران دەتوانێـت لەگـەڵ وەهـا هەلومەرجێکدا ڕوو بەڕوو ببێتەوە، کەلەهەرحاڵدا دەبێت بەو هۆیەوە هانبدرێت. بەو پێیەی پاپۆڕە شەڕکەرەکانی جـەنابی سـەرۆك دەبێـت ئەو مەسەلەیە لەبەرچاو بگرن ٧ / ١٨٠٣

بەرگ گەلێك بۆ ئەم لایەنانەی لای خوارەوە نێردراوە:

وەزارەتی دەرەوە

وەزارەتی بەڕێوەبەری وڵاتە داگیرکراوەکان

وەزارەتی کاروبارەکانی هیند

٦- ( ڕاگەیەندراوی ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان، ١٦ / ٦ / ٢١ ی. ه ( ١٩٤٢ ی. ز) [31]

کرێکار – وەرزێر، ڕاگەیاندنی ژمارە ( ١) ڕێکەوت ١٦ / ٦ / ٢١ ی. ه ( ١٩٤٢ ی. ز)

کەسایەتییە بەرچاوەکان کە ناوی ئەوان لـەدنیادا بـەهۆی خـەبات دژی دیکتـاتۆری لـەژێر تـرس و تۆقانـدن و تـیرۆردا دەنگـی داوەتـەوەو هەموو کاتێك لـەڕێگای وەدیهاتنی خـەون و هیواکـانی چـینی کرێکـارو زەحمـــەتکێش خـــەباتیانکردووە فەرمانۆکانـــە لـــەبۆ ڕێکـــەوتنی

[31] – ڕێکخراوی بەڵگەی نەتەوەیی ئێران ( لەمەو دوا (( بەڵگەی نەتەوەیی )) ) نهێنیی سەرۆك وەزیران ( لەمەو دوا (( ن )) ) ژمارە ١٠٩٠٠٢

ڕاستەقینەی سەرجەم کرێکاران و وەرزێران و چینی چەوساوە هەستاونەتەسەر پێ، بۆ باشترکردنی ژیان و گوزەرانی ئەوان دەستیان داوەتە دامەزراندنی (( ڕێکخراوی گشتیی کرێکارانی ئێران)).

(( کۆمیتەی ناوەندی)) ڕێکخراوەکە لەدەستپێکی سالّی ١٣٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) لەتاران دامەزراوەو نوێنەرانی جێگای متمانەی بەمەبەستی ڕێکخستنی کرێکارانی پارێزگاکانی دیکەی ولآت ڕەوانەی شوێنەکانی دیکەی ئێران کردووە – ئەم کۆمیتەی ناوەندییە کەلەلایەن پێکهێنەرانەوە هەلّبژێردراون هەتا بەستنی (( کۆنگرەی گشتی)) کە بەبەشداری تەواوی نوێنەرانی کرێکاران و وەرزێران دەبەسترێت ڕێگای پێدراوە کە ئەو ڕێکخراوەیە بەڕێوە ببات.

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکاران بەمەبەستی دابینکردنی بارودۆخی مادی و ساخلەمی و کوولتوریی زەحمەتکێشانی ئازەربایجان و پاراستنی مافەکانی ئەوان لەڕێکەوتی ١٦ / ٥ / ٢١ ی.هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) بەپێی فەرمانی تایبەت کەلێرەدا وەك و خۆی بۆ ئاگاداری گشتی بلآوی دەکەینەوە:

کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکاران، تاران لەڕێکەوتی ١٦ / ٥ / ٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز)

(( هەلگری ئەم بڕوانامەیە خەلیل ئینقلاب ئازەر لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی پێی سپێردراوە کە لەئازەربایجاندا ڕێکخراوی کرێکاران پێکبهێنێت و پەیوەستی بکات بەناوەندەوە. داوا لە تەواوی کرێکاران و هاوڕێیان دەکەین لەو بارەیەوە یارمەتیی تەواوی ناوبراو بکەن).)

(( واژوو و مۆری سەرۆك)) بەو كەسەی كەلای خوارەوە واژووی كردووە رێگا دەدات كە ئەو كارە جێگای رێزە بۆ پێكهێنانی رێكخراوە بەئەنجام بگەیەنێت.

من لەدوای گەیشتنم بەشوێنی كارەكەم، لەپێشدا لەگەڵ كرێكارەكان و نوێنەرەكانیان گفتوگۆم كردو لەدوای ئەوەی كەكارە سەرەتاییەكانم تەواو كرد لەسەرەتای مانگی خەرماناندا، بۆ یەكەمجار كۆبوونەوەی گشتیم بۆ پێكهێنانی رێكخراوەكە سازكردو لەلایەن بەشداربوانەوە كەبەگشتی لەچینی چەوساوە بوون پێشوازییەكی گەرمی لێكرا و رێكخراوەكە بەشێوەیەكی فەرمی دامەزرا.

لەكاتی بەرێوەبردنی كارەكاندا زانیمان كە چەند كەسێك لە چەند مانگ پێشترەوە بەو ناوەوە رێكخراوێكیان پێكهێناوە هەربۆیەش لەبەرئەوەی مەبەستەكانمان یەك شت بوو ئەوانیش تێكەڵی رێكخراوەكەی ئێمە بوون و پێكەوە دەستمان كرد بەچالاكی.

هەر لەو ماوەیەشدا رەزامەندیی پارێزگار راستەوخۆ لەنامەی ژمارە ١٣١٢٤ بەرێكەوتی ١٣ / ١ / ٢١

( ١٩٤٢ ز) بەدەستمان گەیشت كە ئەوەیش بۆ تەواوكردنی راگەیاندنەكە لێرەدا وەك خۆی باسیدەكەین: وەزارەتی ناوخۆ پارێزگاری سێهەم (( بەرێز خەلیل ئینقلاب ئازەر: بەهۆی ئەوەی كە لەلایەن كۆمیتەی ناوەندی رێكخراوی كرێكارانی ئێران رێگەتان پێدراوە، ئێمەیش رەزامەندین لە بۆ پێكهێنانی رێكخراوی كرێكارانی ئازەربایجان و ئاگادارتان دەكەینەوە كە مەبەستی سەرەكی دابینكردنی بژیوی ژیانی كرێكاران لە بوارەكانی مادی و ساخلەمی و هی دیكەیە و

ڕێکخستنی نێوان کرێکارو خاوەنکار بەمەبەستی بەرێوەپێشچوونی کەرتی پیشەسازی و هەمووجۆرە هاوکارییەك لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ ئێوە دەکرێت.

ڕوونە کە ئەم ڕێکخراوەیە بەهیچ شێوازێك ماق دەستوەردانی نیە لەنێو کاروباری سیاسی و پێوەندیی لەگەڵ ئەو جۆرە گروپانە بەتەواوی قەدەغەیە. ی – پارێزگاری سێهەم).) ئێستا لەدوای ڕاگەیاندنەکەی لای سەرەوە ئاگادارتان دەکەینەوە کە پەیڕەو و پرۆگرامی ڕێکخراوی کرێکاران چاپ کراوە و لەبەردەستی ئەو کەسانەیە کە دێن و سەردانمان دەکەن[32] و ئاشکرایە کەسەرجەم کرێکاران، وەرزێران، فەرمانبەران و چینی ڕۆشنبیری زەحمەتکێش و بەتایبەت مامۆستایان بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان دێن و دەبن بەئەندام لەم ڕێکخراوەیەدا و ئۆفیسی ڕێکخراوەکەیش کە لەشەقامی پەروەردە بەرامبەر کۆڵانی کەرباسچییە.

**ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان – خەلیل ئێنقلاب**

**تەورێز**

**٧- ( دەقی کۆبوونەوەکەی خەلیل ئێنقلاب، ٢٠ / ٦ / ٢١ ( ١٩٤٢ ی. ز)**[33]

کرێکار – وەرزێر، ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان، دەقی

---

[32] – دوو دانە پەیڕەو پرۆگرام لە لایەن ڕێکخراوەکەوە لە ساڵەکانی ١٣٢٢ ( ١٩٤٣ ی . ز ) و ١٣٢٥ ( ١٩٤٦ ی . ز ) بلاّو کراوەتەوە کەدەقی هەردووکیان لەکۆتایی بەڵگەنامەکان دا هاتووە .

[33] – بەڵگەی نەتەوەیی . زنجیرەی ن . ژمارە ١٠٩٠٠٣

کۆبوونەوەکەی بەڕێز خەلیل ئینقلاب ڕۆژی سێیەمی مانگی ڕەزبەری ۱۳۲۱ ی. ھ ( ۱۹٤۲ ی. ز) لەھۆڵی شێرو خوورشید، نرخ ٥٠ دینار یەکەم یادی ئەو کەسانەی کە لەڕێگای ئازادی و دێموکراسی دا لەسیاچاڵەکاندا گیانی خۆیان بەختکرد، یان لەگۆڕەپانی شەڕدا گیانیان فیدا کرد، سی چرکە بێدەنگی ڕادەگرین، دواتر قسەکانمان بەناوی چینی چەوساوەی ئێرانەوە دەست پێدەکەین. هەڵبەت ئەم کۆبوونەوەیەی ئێمە باسێکی بەتەنها ئابورییە. لەدوای پێشەکییەکی کورت قسەکانم دەست پێدەکەم. هەر کاتێك ئێمە سەیری کتێبە ئابورییەکان دەکەین، دەزانین کەمرۆڤ لەسەرەتادا هیچ شتێکی نەبووە. نە خواردن و نە جلوبەرگ و نە یاسا و نە ئازادی. بەلام لەپشتی ئەو هەموو نەهامەتی و نەبوونیەدا، هەندێك یاسا هەبوون کە بۆ یەکەمجار زانایانی جیهان پێیانزانی و بەشێوەیەکی گۆڕانە گەیشتووەتە ئەم ئاستەی ئێستا. هەڵبەت لەو سەردەمەدا من و تۆ یەك نەبوو، بەلام ئێستا کە مرۆڤ گەیشتووەتە ئاستێکی وەها بەرز، واتە سەرمایەدار کە هەموو شتێکی هەیە و کرێکار لەهەموو شتەکان بێبەشە. کرێکاریش بەدوو بەش دابەش دەکرێت. یەکەم ئەو کرێکارانەی کە هەموو کاتەکانیان لەنێو کارگەکاندا و بەزەبری هێزو توانای خۆیان کار دەکەن و ئەگەر بێت و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەسەر کارەکەی دەربکرێت، چیدی بۆ دابینکردنی بژیوی ژیانی خۆی هیچ ئامرازێکی دیکەی بەدەستەوە نیە. کرێکاری ڕاستەقینە بریتین لەم بەشە، بەشی دووهەم ئەو کرێکارانە لەخۆ دەگرێت کە ئەگەر هاتووڕۆژێك لەسەر کارەکەیان دەرکران، دەتوانن بەشێوازگەلی دیکە

بـژیوی خۆیـان دابـین بکـەن. ئـەم بەشـە لـەزمانی زانـستی دا پیـان دەوترێـت (( هۆمبێـل پرۆلێتێـر)) واتـە کرێکـاری سـپڵەو ڕوونـە کـە لـەنێوان دووچـینەی نـاوبراو ( سـەرمایەدارو کرێکـار) هـیچ جـۆرە پێوەندییـەك نیـە، بـەڵکو ناکۆکییـەکی بەرچـاو لەنێوانیاندایـەو هـەتاوەکو ئـەو ناکۆکییـە لـەناو نەچـێت، ئـەم شـەڕو خەباتـە هـەر بەردەوام دەبێت و هەرکاتێك ئەو ناکۆکیە بوو بەهاوپەیمانی، ئەوکاتـە خـەبات دژی سرووشـت وەك لافـاو، نەخۆشـی و وشـکە سـاڵی ( کـە بـۆ مرۆڤ باشن) دەستپێدەکات.

نـاوی ڕێکخراوەکـەی ئێمـە ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێرانـە، بۆچـی ناومان نەناوە ڕێکخراوی خەڵکی ئێران؟ هۆکارەکەی دیارە. وەرزێرانـی ئێـران وەکـو سـەردەمانی کـۆن بـە گـا و کاسـن جـووت دەکـەن و هـەروا زۆربـەی پیـشەکانی ئێمـە. لەوانـە پیـشە دەسـتییەکان ئـەم ژیانـە زەحمەتە، کرێکارو وەرزێر پاڵ دەنێن بەرەو مەرگ و نەمان و ژیان بۆ ئـەوان وەك پـەتی سـێدارەی لێهـاتووە کـەڕۆژ بـەڕۆژ زۆرتـر قورگیـان دەگوشێت.

مەبەسـتی سـەرەکی ئێمـە لەدامەزرانـدنی ڕێکخـراوی کرێکـاران، نەهێـشتنی نـاکۆکی لـەنێوان کرێکـارو خاوەنکـارو یەکخـستنی ئەوانـە، لەبەرئـەوەی سـەرمایەدارو کرێکـار هـەموویان ئێـرانین و خـەڵکی ئـەم ئاووخاکەن.

ئەم ناکۆکییەی نێوانیـان دەبـێ نـەمێنێت و سـەرمایەدارو کرێکـار هـەموویان لەیـەك ڕیـزدابن. ئـەم ڕێکخـراوەی ئێمـە جیـاواز لـەو ڕێکخراوانەی دیکە کاری سیاسی ناکات و هـەر بـەو هۆیەشـەوە ناومـان

ناوە ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران و مەبەستی ئەم ڕێکخراوەیە لەدوو وشەدا ڕووندەکەمەوە: یەکەم زیادکردنی مووچەی کرێکار، دووهەم دامەزراندنی بێکاران لەبەر ئەوەی بێکار ناتوانێت بێتە ئەندام لەم ڕێکخراوەیەدا، هەربۆیەش ئەم ڕێکخراوەیە لەپێشدا کار بۆ بێکارەکان دەدۆزێتەوە و دواتر دەیانکاتە ئەندام لەڕێکخراوەکەدا. لەئێستادا کۆبوونەوەکەی ئێمە لەسەر کرێکارەو بزانین کرێکار چی دەدات بەکۆمەڵگا؟ دەرگاو دیوارو مێزو کورسی و هەموو کەلوپەلکان چ ئەوەی دەجولێت و چ ئەوەی ناجولێت، بەهۆی ڕەنج و زەحمەتی کرێکارەوە پەیدا دەبێت. تەنانەت کە دەڕۆین بەڕێگادا ئەو قیرتاو و شۆستانە هەمووی کاری دەستی کرێکارە. لەم سەردەمەدا لەیۆنان واتە لەو وڵاتەی کە سۆقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆی پێشکەشی زانستی فەلسەفەی کردووە، برسیەتی و وشکەساڵی بەسەریدا زاڵە. دەزانن هۆکاری ئەو نەهامەتییە چیە؟ هۆکارەکەی ئەوەیە چیدی پەیوەندی لەنێوان وەرزێرو کۆمەڵگادا نەماوەو وەرزێر ناتوانێت ئەو بەرو بوومەی کە پەیدای دەکات بیداتە کۆمەڵگا. تاقمێکی خوێن مژ کەناوی خۆیان ناوە ناسیۆنال سۆسیالیست، دنیایان لەخۆیاندا خنکاندووەو هەموو ڕۆژێك دەست کەوتی ملیۆنەها کرێکار بەبۆمب و تۆپی وێرانکەر لەناو دەبەن.

ئێمە لایەنگری کرێکارین لەبەرئەوەی هەموو شتێکمان لەئەوەوەیە. وابیر مەکەنەوە کە کرێکار هیچ نازانێت، بەڵکو هەر لەو چینەوە، مامۆستا و ئەندازیار و دکتۆر دروست دەبێت.

پیاوانێکی گەورە دەناسین کەلەو چین و توێژەن: ئابراهام

لینکۆڵن قارەمانی ناوداری فەرمانیکی دارتاش بووە، هەندێرسۆن وەزیری دارای ئینگلیز کرێکاری کارگەی ئاسن بوو، ماکدۆناڵد سەرۆک وەزیرانی پێشووی ئینگلیز ڕاوچی بوو، ئابرێت سەرۆک کۆماری پێشووی ئەڵمانیا کورتان دوور بووەو کەسانی دیکەی لەو چەشنە زۆربوون.

کرێکار چییە؟ کرێکار ئێرانییە، سێ ملیۆن کرێکارو پێنج ملیۆن وەرزێر هەموویان ئێرانین. هەروا کە دەزانن لەبیست ساڵی ڕابردوودا تەواوی یاساکان دژی کرێکارو وەرزێر بووەو هەر بەو هۆیەشەوە ژیانی کرێکارو وەرزێر لەیاد چووەتەوە، بەڵام هیواداریین کە دەوڵەت زۆرتر بایەخ بەچۆنیەتی ژیانی کرێکار بدات و لە پەرلەماندا یاساو ڕێسای وەها پەسند بکەن کە بەسودی چینی کرێکار بێت. ئەمە داواکاریی ئێمەیە لە دەوڵەت و پەرلەمان. لەنێوان حیزب و ڕێکخراوی کرێکاراندا جیاوازی هەیە، ڕێکخراوی کرێکاران هەروا کە پێشتر باسمانکرد لایەنی سیاسی نیە و بابەتاتی ئابوری بەهاوکاریی دەوڵەت و خاوەنکارگەکان و مرۆڤە کۆمۆنیستەکان بەسودی چینی کرێکار دەکەوێتە بەر باس و چارەسەر دەکرێت ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان) هەر بۆیەش بۆ هیچ توێژێك جێگای مەترسی نیە. ڕێکخراوەکەی ئێمە وەك و حیزبەکانی دیکە نیە.

تەمەنی ڕێکخراوەکەی ئێمە کەمتر لە مانگێکە و هیچ چەشنە پێوەندییەکیشی لەگەڵ ئەو حیزبانەی دیکەدا نیە. دروشمی ئێمە چیە؟ هەر کەسێك کەدێتە نێو ئەم ڕێکخراوەیە بەهیچ شێوازێك مافی مانگرتنی نیە و نەگەر بێت و لەنێو کارگەکان دا وەها بزافێك ڕوو

بدات ئێمە لێی بەرپرسیار نین و بۆ زیادکردنی مووچەی کرێکار کاری بنــەڕەتی دەکرێــت و دوا بــەدوای ئــەوەی کەئێمــە ئەوداواکارییانــەمان تاوتویّ کرد دەیخەینە بەردەستی خاوەنکارەکان. دەبێت ئەوە بزانن کە ئەگەر مووچەی کرێکار زیادبکرێت، هیچ کاتێك ئەو مووچەیە ناخاتــە بانقەوە، بەڵکو خەرجیدەکات و ئەگەر بێت و بەبیّ ئاگاداری ئێمە ئەو بڕە مووچەیە زیادبکرێت ئـەوە ئێمـە بەخیانـەتی دەزانـین و بەچاوی خیانــەتکارەوە ســەیری ئــەو کرێکــارە دەکــەین ( چــەپڵە لێــدانی نامـادەبوان). چـەند برگەیـەك لـەو داخوازیانـە لێـرەدا دەخوێنمـەوە: یەکـەم زیـادکردنی مووچـەی کرێکـار. سـەرمایەدارەکان نابێـت لـەو داواکاریە بترسن. ئێمە پێیان دەستەلمێنین زیادکردنی مووچە بەسودی ئەوانیشە. لەسەدا نەوەدو پێنجی ئەم کۆمەڵگایـە کرێکارو وەرزێـرن و لەبنەڕەتـدا جگـە لـەوان کـیّ کەلوپـەلی بازرگانـەکان دەکرێـت؟ ئەگـەر بێــت و توانـــای کــڕینی کرێکــار زیادبکــات بازرگــانیش دەتوانێــت کەلوپەلەکانی زووترو بەگرانتر بفرۆشێت. ئێوەی سەرمایەدار ئەگـەر بێت و بـۆ نموونـە مووچـەی کرێکارێـك لـە پێـنج قەرانـەوە بکەنـە دە قەران، لەولایشەوە دەتوانن نرخی کەلوپەلەکانتـدا دووقـات زیادبکـەن. دیتمـان کـە مووچـەی کرێکـار دووقـات زیـادی کـرد نرخـی کەلوپـەل چوارقات بەرزبووەوە. لەبنەڕەتدا کرێکار ئـابڕووی ئێوەیـە، مەکینـەی ئێوەیــە. مــاوەی کــارکردنی کرێکــاریش دەبێــت ڕوونبکرێتــەوە. لەسەردەمانی کۆندا کاتێك کـە هێشتا کاتـژمێر نـەبوو، کرێکـار کاتێـك کە خۆر هەڵدەهات کاریدەکرد هەتاوەکو خۆر دادەچوو، ئێـستا سـەدەی بیــستەمەوە ئــەوە بەکــەس قــەبوڵناکرێت. کرێکــار پــشوی پێویــستە، دەبێـت مووچـەی پـشووی نەخۆشـین بـۆ کرێکـار حیـساب بکرێـت و

هەروەها دەبێت بارودۆخی ژنانی کرێکاری نێو کارگەکانیش لەبەرچاو بگیرێت. واتە کاتی دووگیانی بۆ لەبەرچاو بگیرێت. دەبێت یارمەتی بکرێت. لانیکەم دەبێت مووچەی دووگیانی بۆ ئەژمار بکرێت هەتا وەکو منداڵی لەشساخ بداتە کۆمەڵگا و ئەو منداڵانەش کرێکاری داهاتوون. ئەگەر بێت و کرێکارێك مەکینەیەك خراپ بکات. دەستبەجێ غەرامەی دەکەن. ئەمە یاسایەکی باشە. ئەگەر کرێکارەکەیش هەژماری مەکینەی بۆ بکەین. لەکاتی کار کردن دا لەوانەیە بەشێك لەجەستەی لەدەست بدات، دەستی دەشکێ، غەرامەی ئەو دەست و قاچە چوار پێنج قەرانی مووچەی ئەو ڕۆژە نیە. کرێکار لەوانەیە گیانی خۆی لەدەست بدات. پارەی خوێنی ئەو کرێکارە مووچەی ڕۆژی مردنەکەی نیە ! بەڵام هەر ڕێکخراوەیەك دەبێت مافێکی یاسایی هەبێت. بۆ نموونە هەر کۆمپانیاو نوسینگەو وەزارەت و دەوڵەت مافێکی یاسایی هەیە. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك قەرزارداری کۆمپانیایەك بێت ئەوە مەحکەمە دەتوانێت بەناوی ئەو کۆمپانیاوە شکات تۆمار بکات. ئەم مافە یاساییە ئەبێت بۆ ئەم ڕێکخراوەیە دەستەبەر بێت. ئەم ڕێکخراوەیە فەرمییە، قسە دەکات و قسەیش دەبیسێت، ڕێگە نادات بەخاوەنکارەکان بەبێ هیچ بیانویەك کرێکار لەسەر کار دەربکات.

فەرمانبەرانی حوکومی بەبێ هۆ لەسەر کارەکانیان دوور ناخرێنەوە. هۆکاری چیە کرێکار ئەو مافەی نیە؟ هەر کاتێك پێیان خۆش بێت کرێکار دەردەکەن. ئەم ڕێکخراوەیە ئەم بێ مافیانە تاوتوێ دەکات.

چ کەسانێك دەتوانن بێنە نێو ئەم ڕێکخراوەیە یەکەم کرێکاران.

ئێمــە هــەموو ئــەو کەســانەی کەبەدەســت یــان بەمێــشك کــار دەکــەن هــەژماری کرێکاریــان بــۆ دەکــەین بــەس ئــەو کەسانەی کەســەرمایەیان بەدەستەوە نیە لەم ڕێکخراوەیە بێبەرین. دووهەم دەبێ پارەیـەك کـە بڕەکــەی لەســەدا یــەکی مووچــەکەیەتی وەك و یارمــەتی بیداتــە ڕێکخراوەکــە. ئــەو کارانــەی کەئێمــە لــەم چــەند ڕۆژەدا کردوومانــە بــریتین لــە: چــەند کۆبوونەوەیــەکمان کــردووەو ئەگــەر لــەو کۆبوونەوانــەدا غەڵەتێکیــشمان کــردووە داوای لێبــوردن دەکــەین، نوێنــەری هــەموو کارگــەو توێــژەکان دەستنیــشان کــراون کــە پــردی پێوەنـدی نێـوان ڕێکخراوەکـەو کرێکارانـە. مەبەستێکی دیکـەی ئێمـە پێدانی کارە بەبێکارەکان. ئێستا بەرەو زستانێکی سـەخت دەچـین. بـۆ نەهێـشتنی بێکـاری دەبێـت هـەنگاوی بەپەلـە بنـێین. لـەڕێکخراوی کرێکارانــدا لەدەفتەرێکــدا نــاوی بێکارەکــان دەنوســرێت و لــەدوای تەواوبوونی ناونوسییەکە حکومـەت ئاگادار دەکەینـەوە کـەبۆ نموونـە پێنـج هەزار بێکار لەگەڵ بیست هەزار کەس لەبنەماڵەکانیان داوای کار دەکەن و ئەگەر دەوڵەت توانی کارێکیان بۆ بکات ئەوە چاکتر ئەگەر نـا ئــەوە ئێمــە بەیارمــەتی دەوڵــەت و ســەرمایەدارەکان هــەنگاوی ڕاســتەقینەو قــورس دەنــێین بــۆ نەهێــشتنی بێکــاری لــەئازەربایجان تەنانــەت تــەواوی ئێــران دا ( چــەپڵە لێــدانی ئامــادەبوان). لــەدوای داخستنی دەفتــەرەکان چیدی کــەس قەبوڵناکـەین و مـن بـەڵێنی ئـەوە دەدەم کــە لەڕێگایــەوە لــەماوەی یــەك حەفتــەدا بێکــاری ڕیــشەکێش دەکەین ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

ژووری دارایی: دارایی ئەم ڕێکخراوەیـە بـۆ دزیـن نیـە. هـەرکاتێك

کرێکاران دەتوانن دارایی ئەم ڕێکخراوەیە چاودێری بکەن. بەزۆر پارە لەکەس وەرناگرین. ئامادەبوانی خۆشەویست من ئامادەم گیانی خۆم لەپێناوی ئەو ژوورەدا بەخت بکەم ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان). پێش ئەوەی ئەم سندووقە پێکبهێنین، پارەیەك کۆدەکەینەوە بۆ دامەزراندنی رادیۆ ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان). هەر کرێکارێك بەپێی توانای خۆی پارمەتی دەکات و پسوولە وەردەگرێت. لەدوای کۆکردنەوەی هەژمارکردنی ئەو پارمەتییە و بەچاودێریی نوێنەرەکانتان لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا رادیۆکە دادەمەزرێنین. بژی ئەو کرێکارانەی کە بۆ ئەو بابەتی پارمەتیمان دەدەن. بەردەوام بێت ئەو دەنگەی کەلەو ئیزاعەوە بلاو دەبێتەوە ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

خەبات: لەیەکەم ساتەکانەوە خەبات دەست پێدەکات. بۆ نموونە ئەگەر بێت و منداڵ لە یەکەم ساتەکانەوە کە لەسکی دایکی دایە دژی وایرۆسەکان خەبات نەکات دەمرێت. تەنانەت ئەو تەرمەی کە دەیبەن بۆ گۆڕستان و ئەو کەسانەی کەتەرمەکە هەڵدەگرن و ماندوو دەبن ئەوە خەباتی مردووەکەیە. هەر بۆیەش خەباتکردن بۆ هەموو کەسێك و کۆمەڵگا و ڕێکخراوەیەك پێویستە و بەلام چ کەسانێك دژمان دەوەستنەوە؟

١- ئەژادپەرستە خوێنمژەکان و داردەستەکانیان کە ئێمە دەتوانین دژیان بوەستینەوە ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

٢- کۆنەپەرستەکان واتە ئەو کاسانەی کەدەیانهەوێت برسیەتی و نەهامەتی و دزی وەك خۆی بمێنێتەوە.

٣- ئازادیخوازە ساختەکان کەکارێکیان نیە جگە لە بەرتیل وەرگرتن، سێزدە مانگە کە ئەوان خەریکی ئەو کارانەن، بەلام بابزانن

ئەوان چیان بۆ خەڵك كردووە؟ ئەگەر كردوویانە با پێمان بڵێن بەڵام جگە لەهاوكاریكردنی دزەكان، بێ ئابڕو كردنی خەڵك و فرۆشتنی ئازادیخوازە ڕاستەقینەكان هیچی دیكەیان نەكردووە. ئەوانەش لەدوو بەش پێكدێن، یان لەڕاستیدا ئازادیخوازن بەڵام نەیانتوانیوە هیچ بۆ خەڵك بكەن و یان دزی سیاسین و ئەوانەیش دوژمنانی ناوخۆیین و دەبێت سزا بدرێن بەڵام ئەو بەشەی یەكەم با بێدەنگ بن و هاوكاریی ئەو دزە سیاسییانە نەكەن.

دوێنێ لەپێشچاوی كەسێكی بەرپرسدا، كرێكارێك ویستی گڵۆپی كارەباكە هەڵبكات بەڵام نەیتوانی. ئەم داماوە نەتەنها كارەبای بەكار نەهێناوە، بەڵكو نازانێت چۆن بەكاریشی بهێنێت. ئەمە لایەنگری ئەو توێژەین. خیانەت بەم توێژە، لەناومان دەبات. ئەگەر خاوەنی هەر ئایین و بیرو باوەڕێكین دەبێت لایەنگری هەژاران بین ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان). ئەو كەسانەی كە لە شەوی تاریكدا چەك دەبەست بوون. دەیانەویت بێوەژنەكان ڕووت بكەنەوە، لەم ڕێكخراوەیەدا هیچ جێگایەكیان نیە. ئەوانەی كە جلی ئازادیخوازییان لەبەركردووەو خەریكی ڕاوڕووتن دەبێت لەناو بچن، خیانەتكارەكان دەبێت لەم ڕێكخراوەیە دوور بكرێنەوە هیچ توێژێك لایەنگری ئەوان نیە. ئێمە دەبێت لەدووبەرەكی خۆمان بپارێزین. دووبەرەكی و ململانێ بەزیانی كرێكارە و یەكڕیزیی ئەوان لەناو دەبات. هەر كەسێك بیەوێت دوو بەرەكی دروست بكات ئەوە ئێمە ئەندامیەتیەكەی لێوەردەگرینەوەو دەری دەكەین. باوكانی ئێمە لەكۆنەوە وتویانە: (( بیر لەنان بكەوە)) ئەمە وتەیە كەئێمەی بەرەو ئەهامەتی پاڵ ناوە. ئەوانەی گوێیان لەو

قسانە گرتووە ئێستا هیچیان نیە، تەنانەت نانیشیان نیە. ئەگەر بێت و بەس بەدووی ناندا بگەڕێن، لەگەڵ ئاژەڵدا چ جیاوازیەکمان هەیە؟ مرۆڤ دەبێت ڕێکخراوی هەبێت. کۆمەڵگا بەبێ ڕێکخراوە وەك و گۆڕستان وایە، هەر بەپێی ئەو بنەڕەتە ئێمە ئەم ڕێکخراوەیەمان پێکهێناوە ( چەپڵەلێدانی ئامادەبوان). ڕێکخراوە، زانکۆی خەڵکە و داخستنی ئەو زانکۆیە دوژمنییە لەگەڵ خەڵکدا. ڕووی قسەکانم بەرامبەر بەو کەسانەیە کە خاوەنی هیچ بیرو بڕوایەك نین و دژ بەئێمە بانگەشە دەکەن و تۆمەتی نابەجێمان لێدەدەن، تۆمەت مەخەنە پاڵ کەس لەبەرئەوەی تۆمەت چەکی دەستی نەژاد پەرستەکانە. پێویستە ئەوەیش بڵێم کە ئازادیخوازە ساختەکان لەتۆمەت لێدان دا زۆر شارەزان، بۆ هەموو قسەیەك پێویستە بەڵگەمان هەبێت. دادوەربن، تۆمەت لێدان مانای چیە؟ بزانن کەچینی کرێکار بەگوێی ئێوە ناکات. بەجوانی دەتانناسن. لەکۆتاییدا چەند قسەیەکیش بەرامبەر بە ڕۆشنبیرەکان دەکەم. چینی کرێکار چینێکی چەوساوەیە. ئەوان چاوەڕێی یارمەتیی ئێوەن.

ئەم کرێکارانە دزو درۆزن نین. ئەمانە زەحمەتکێش و بەنابڕون. ئەمانە بەو جسم و دەستانەی خۆیان مەکتەب و قەڵەم و قاقەزیان بۆ ئێوە دروست کردووە. ئاگاداربن کە هیچ کەسێك کرێکار یارمەتیەکانی ئێوە لەیاد ناکات ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان). پێویستە بەبوێریەوە بێنە پێشەوە. کرێکارو وەرزێر مانای چیە؟ واتە ۹ ملیۆن ئێرانی. لێرەدا نابێت دەستەوەستان دابنیشن، نابێت بترسن. لێرەدا یادێك دەکەین لە ( دانتۆن) مامۆستای شۆڕشی فەرەنسا کەدەڵێت: (( بوێری،

دیسان بـوژێری، هـەموو کاتێـك بـوژێری)). لێـرەدا کۆتـایی دێـنم بـە بەقـسەکانم. دژی ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران. ( چـەپڵە لێـدانی ئامـادەبوان) بـۆی ئـەو کەسـانەی هاوکـاریی ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئازەربایجانن. ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان) بـۆی ئەوکەسانەی نـاتوانن ببنـــە ئەنـــدامی ئـــەم ڕێکخراوەیـــە، بـــەڵام دڵخـــۆش و شـــادمانن بەچالاکییەکانی ئێمە.( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان) بـۆی ئێـران، چینی چەوساوەی ئێران ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

لەو کاتەدا منداڵێکی ١٠ ساڵان کە کرێکاری چاپخانە بـوو هـاتوو چەپکە گوڵێکی پێشکەشی ئینقلاب کرد و لەلایەن سەرجەم کرێکارانی ئازەر بایجان دەستخۆشیی لێکرد. بـەڕێز ئینقلابـیش لـە وەڵامـدا وتـی: بژی کرێکار. بەردەوام بێت ڕێکخراوی کرێکـاران، هەربـژی ! دیـسانەوە بژی ! هەموو کاتێك هەر بژی (چـەپڵەی بـەردەوامی ئامـادەبوان) ئـەم کۆبوونەوەیـە ڕۆژی هـەینی لـە هـۆڵی شـێرو خـۆری سـوور لـە تـەورێز کاتـژمێر سـێ و نیـوی دوای نیـوەڕۆ دەسـتی پێکـردو کاتـژمێر پێـنج و چارەك کۆتایی پێهات.

خەلیل ئینقلاب

٨- ( دەقی وتەکانی خەلیل ئینقلاب، ٧/٣٠ / ١٣٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) [34]

کرێکـار — وەرزێـر، ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئازەربایجـان، دەقـی وتـەکانی بـەڕێز خـەلیل ئیـنقلاب ڕۆژی سـی مـانگی ڕەزبـەر لـەهۆڵی

---

[34] – (( بەڵگە نامەی نەتەوەیی )) . زنجیرەی ن . ژمارە ١٠٩٠٠٢

شێروخۆری سوور.

لەپێشدا بەناوی سەرجەم گیانبەختکردوانی رێگای ئازادی و تەواوی ئەو کەسانەی کەلە بەندیخانەکان و گۆڕەپانی شەڕ بۆ دابینکردنی ئازادی و دیموکراسی و پشتیوانی لەچینی چەوساوەی جیهان گیانیان بەختکردووەو دەیکەن، سێ چرکە بێدەنگی رادەگرین...

دواتر بەناوی چینی چەوساوەی ئێران قسەکانم دەست پێدەکەم. هەڵبەت لەگەڵ ئەوەداهەن کەلە وڵاتێکدا کە یەکگرتوو نەبێت وشەی (( ئێمە)) مانای نیە. بۆ دروستکردنی ئەو یەکگرتوویە ماوەی ٥٠ رۆژە بەدامەزراندنی رێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان ویستومانە بۆ باشترکردنی ژیانی نالەباری کرێکاران هەنگاوی بەپەلە بنێین. لەو ماوە کەمەدا وەها کارمان کردووە کە دڵی دۆستانمان خۆشکردووە و بووینەتە هۆی ترس و دڵەراوکێی دوژمنەکانمان. ئەمە ریزبەندی چالاکییەکانی ئێمەیە:

١- نوسراوەو بڵاوکراوە گەلێك کەلەچەند ژمارەدا چاپ کراون و نێردراوە بۆ چینی رۆشنبیرو بەرپرسە باڵاکان و رۆژنامەکان لەسەرتاسەری وڵاتدا و لەچەند رۆژی رابردوودا، رۆژنامە جۆراوجۆرەکان بەبێ پارە دەگاتە دەستی رێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان.

٢- لەم چەند رۆژەدا لەلایەن رێکخراوەکەوە، چەند کۆبوونەوەیەك کراوە کە بەگشتی جێگای رەزامەندی بوونە، ئێمە سپاسی هەستی پاکی ئەو خەڵکە دەکەین. ( چەپڵە لێدانی

ئامادەبوان).

٣- لەگـەڵ بـوونی نـەهاتی و قـەیرانی ئـابووری، بەیارمـەتی کرێکارانی تەورێز توانیومانە پارە کۆبکەینەوە بۆ دامەزراندنی رادیـۆ و لەزووترین کاتدا لەنۆفیسی سەرەکی رێکخراوەکە دایدەمـەزرێنین و لەو رێگایەوە کرێکاران ئاگایان لە هەواڵەکان و گۆڕانکارییەکانی جیهان دەبێت.

٤- لـەم ماوەکەمـەدا توانیومانـە شـاندی ئـاکتۆراڵ بـۆ رێکخراوەکە دابـین بکـەین و هیـواداریـن بتـوانین لـەو هونـەرە جوانـەدا سـەرکەوتن بەدەستبهێنین.

٥- بەچـەند کۆبوونـەوەو چـالاکیی جـوان توانیومانـە متمانـەی چینی کرێکار بەدەست بهێنین. ئـەو حیزبانـەی کەلـە ١٣ مـانگ پـێش ئێستاوە دامەزراون، خەڵکیان بێزار کرد و ڕاویان نـان، بـەڵام پێویـستە بزانن رێکخراوەکەی ئێمـە وەك ئـەو حیزبانـەی دیکە نیـە. لـە مـاوەی ئەم ٥٠ ڕۆژەدا، پێشکەوتنی بەرچاوی هەبووە. نوێنـەرانی چـل هـەزار کرێکار بەشداریی کۆبوونـەوەکان دەکـەن و بـەدڵ و بـەگیان شـەوو ڕۆژ سەقاڵی چالاکین. پیرۆزبـایی لـە چـینی کرێکاری ئازەربایجـان دەکـەم و بەئاواتی سەرکەوتنی زۆرتری ئەوانم. ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

بارودۆخی کرێکار لەنێو کۆمەڵگادا

کرێکار لەنێو کۆمەڵگادا چی دەدات و چی وەردەگرێت؟

کرێکـار ژیـانی هـەموو مرۆڤـەکان دابـین دەکـات. هـەموو شـتێك بەهۆی زەحمەتی ئەوەوە پێکهاتووە. ئەوان بەتەواوی هێزو توانایانەوە سەرقاڵی خزمەتکردنی هاوچەشنەکانی خۆیانن. بەشێکیان بەدەست و

جەستە کار دەکەن و بەشێکی دیکەیان بەمێشك. بەو حاڵەیشەوە، بارودۆخی ژیانیان زۆر نالەبار و ناشیرینە. نەهامەتی گەیشتووەتە ئەوپەڕی خۆی. جگە لە برسیەتی و ڕووتی هیچ دەستکەوتێکی دیکەیان نیە. فەرمانۆژە کرێکار لەبەرامبەری برسیەتی دا ناچارە سەر دابنەوێنێت و لەم قەیرانە ئابوورییەدا بەرەو لەناوچوون دەڕوات.

بەپێی هەواڵەکان بەداخەوە بەهۆی برسیەتیەوە کەسێك لەگەڕەکی باغ میشە گیانی لەدەست داوە. لەو پێشهاتە سەرتان سووڕ نەمێنێت.ڕۆژی هەزار منداڵی هەژار لەکۆڵانەکان دا بەچاوی خۆتان دەبینن کەچۆن ژیان دەبەنە سەر. ئەوان بەبێ ئامرازی تەندروستی لەکارگەکاندا کار دەکەن. لەکارگەی شقارتەدا بەهۆی مادەی کیمیاییەوە تووشی هەزاران نەخۆشی دەبن. ئەم ڕێکخراوەیە بەنیازە ئەو منداڵانە لەو شێوە ژیانە ڕزگار بکات ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

کرێی چی دەست دەکەوێت؟

جێگای سەرسوڕمانە کرێکارێك کە خۆی هەموو پێداویستییەکانی ژیان پێکدەهێنێت خۆی لەهەموو شتێك بێ بەرییە.

### چواردە ماف سەرەکی کرێکار لەنێو کۆمەڵگادا

١- مافی کارکردن: بۆ کرێکار کارکردن وەك هەناسەکێشان پێویستە. ئەوانەی کە ئامادەن بۆ کارکردن، دەبێ بەهەر شێوازێك بووە کاریان پێبدرێت و ئەوانەشی کە نایانەوێت کار بکەن دەبێ لەکۆمەڵگا دوور بخرێنەوە.

٢- مافی دیاریکردنی مووچە: کرێکار بۆ دیاریکردنی مووچە دەبێ

مـــافی هـــەبێ. مووچـــە واتـــای ئـــەوەی کـــە کرێکـــار هەقدەســـتەکەی وەربگرێـت. دەبێـت لـەنێوان کرێکـارو خاوەنکـاردا ڕێککـەوتنی لەسـەر بکرێت. دەبێ هەردوو لایەن بەو بڕە مووچەیە ڕەزامەندبن.

٣- مـــافی دیـــاریکردنی مـــاوەی کـــارکردن: لـــەولاتانی پێـــشکەوتوودا ماوەی کارکردنی کرێکار دیـاریکراوە و هـەر کرێکارێکیش لـەو ماوەیـە زۆرتـر کار بکـات مووچـەکەی دووقـات دەبێـت، بـەلام کرێکـارانی ئێمـە وەکو سەردەمانی کۆن لەوکاتەوە کە ڕۆژ هەڵدێت هەتا ڕۆژ ئاوا دەبێت کار دەکـەن. دەبێـت ئـەو دیـاردە ناشـیرینە نـەمێنێت.( چـەپڵە لێـدانی ئامادەبوان)

٤- مـافی پـشوو: کرێکـار بـەهۆی ئیـشکردنی بەردەوامـەوە مانـدوو دەبێـت و پێویـستی بـە پـشووە، دەبێـت مووچـەی کـاتی پـشوویان بـۆ هەژمار بکرێت.

٥- مـافی بەشـداریکردن لەحکومەتـدا: لەڕاسـتیدا هێـزی حکومـەت لەدەســـتی کرێکاردایـــە. ئـــەو باجـــە ناڕاســـتەوخۆیە کـــە دەدرێـــت بەحکومـەت، لەسـەدانەوەدی بـەهۆی کـار و مەینـەتی کرێکارەوەیـە و تـــەنها لەســـەدا دەی لەلایـــەن ســـەرمایەدارەوە دەچـــێتە گیرفـــانی حکومەتەوە. هەر بۆیەش کرێکاران دەبێ مافی بەشداریکردنیان لـەدامو دەزگا حکومییەکاندا هەبێت.

٦- مـــافی خوێنـــدن و بارهێنـــان: کەســـانێك دەڵـــێن ئـــەوە مـــافی سەرەتاییی هەموو مرۆڤێکە، بەلام لەڕاستیدا وانیە. ئەو یاسایانەی کە هەن دەرگای قوتابخانەکانی بەسەر منداڵانی هەژاردا داخستووەو بـەس بەتـەنها بـەڕووی منـداڵی دەوڵەمەنـدەکانـدا کراوەتـەوە. دەبێـت ئـەو

دەرگایانــە بـۆ منـداڵی هـەژار و نـەداریش بکرێتـەوە. (چـەپڵە لێـدانی ئامادەبوان).

٧ – ماف قەرەبووکردنەوە: ئەگەر کرێکارێك مەکینەیـەك خـراپ بکـات ئـەوە لەمووچـەکەی دەگێڕنـەوە بـۆ قـەرەبوو کردنـەوە، ئەگـەر بێتوو کرێکارێکیش وەکو مەکینـە سـەیر بکـەین کەلـەکاتی کارکردنـدا تووشــی نووقــسانی دەبێــت، دەبــێ لەلایــەن خاوەنکــارەوە قــەرەبوو بکرێتەوە.

٨- نــەبوونی جیــاوازی لــەنێوان مافــەکانی ژن و پیــاو: دەبــێ بارودۆخی جەستەی ئـەو کرێکاری ژنانـەی کـە لـەنێو کارگەکانـدا کـار دەکەن لەبەرچاو بگرێت. واتە مووچەی ژن و پیاو دەبێ هاوتا بکرێت. نابێ بەهیچ شێوازێك مووچەی ژن و پیاو جیاوازی هەبێت.

٩- مـاف قسەکردن و کۆبوونـەوە: دەبـێ کرێکـاریش وەکـوو بـاقی توێـژەکانی دیکـە مـاف کۆبوونــەوەو قـسەکردنی هـەبێت هـەتا لـەو ڕێگایـەوە مەشـاکیلی خـۆی بەخـەڵك ڕابگـەیێنێت. ئێمـە توانیومانـە لەماوەی ئەم ٥٠ ڕۆژەدا بەدەستەبەرکردنی ئەو مافـە، گیروگرفتـی ئـەم چینە هەزارە بەگوێی خەڵك بگەیێنن. (چەپڵە لێدانی ئامادەبوان)

١٠- مـاف خانەنـشینخوازی: مـاوەی پەککەوتـەیی و خانەنـشینیی کرێکـار نـەبێ ڕەچـاو بکرێـت. هـەروا کـە بـۆ فەرمانبـەرانی حکومـەت ئــەوە دەکرێــت واتــە ( ســەندوقی خانەنــشینی). ســەردەمانی بەساڵاچــوونی کرێکــاریش دەبێــت لەبەرچــاو بگرێــت. ئێــستا بەپێچەوانەی ئەوەیە و هەر کاتێك خاوەنکار بزانێت کرێکار تووانـای کارکردنی نیە لەسەرکار دەری دەکات. ئـەو کرێکـارەیش ناچـار دەبێـت

سوالّ بکات. دەبێت ئەم بارودۆخە نالەبارە کۆتایی پێبێت. ( چەپڵەلێدانی ئامادەبوان).

١١- مافی بەکارهێنانی پشوو بۆ ژنانی دووگیان: لەبەرئەوەی ژنان بتوانن منداڵی تەندروست پێشکەشی کۆمەڵگا بکەن، دەبێت مافی ئەوەیان هەبێت پشووبدەن، دەبێ ماوەی پشووەکەیان لەنەوەد ڕۆژ کەمتر نەبێت و مووچەکەشیان بەتەواوی بۆ هەژمار بکرێت.

١٢- مافی بەکارهێنانی ئامرازەکانی تەندروستی: کرێکار هەروا کە لەکۆبوونەوەکەی پێشتریشدا باسمان لێکرد دەبێ مافی بەکارهێنانی ئامرازی تەندروستی هەبێت، سەرجەم کتێب و کورسییەکانی زانکۆکان و هەروەها ئامرازە تەندروستییەکان بەدەستی کرێکار پێکهاتووە. لە ولاّمدانەوە بەو هەموو زەحمەتانەدا دەبێ منداڵەکانیان چارەسەر بکرێن و لەزووترین کاتدا ڕێکخراوی دکتۆرەکانیش دابمەزرێنرێت (چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

١٣- مافی هەبوونی شوێنی نیشتەجێبوونی شیاو: دەبێ خانووی گونجاو بۆ کرێکاران دابین بکرێت. بەهۆی ئەوەی کە زۆربەی کرێکاران لە خانووی نەشیاو و خراپدان. جەستەیان لاواز و ڕەنگی ڕوخساریان زەرد بووە. ئێمە ڕاستییەکان باسدەکەین و لەهیچ شتێکیش ناترسێین. ( چەپڵەلێدانی ئامادەبوان).

١٤- مافی مانگرتن و خۆپێشاندان: کرێکار لەکاتی پێویستدا و بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی خۆی مان دەگرێت. لەهەموو جیهاندا ئەو مافە بوونی هەیە. کەسانێك بەغەلەت بیر دەکەنەوە، وابزانن مانگرتن مانای دزی بەتالاّنبردنە کە لەڕاستیدا وانیە. مانگرتن واتە بزافەکی

ڕێکوپێـك کـە لەکاتێـدا دەسـت پێـدەکات و لـە کـاتێکی دیاریکراویـشدا کۆتایی پێدێت. کرێکار بەتـەنهایی ناتوانێـت ئـەو کـارە بکـات. بەتـەنها ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئازەربایجانـە کـە ئـەو مافـە ١٤ خاڵییـە لـەکاتی خۆیدا بۆ کرێکاران دەستەبەر دەکات.

هـەر بـژی ڕێکخـراوی کرێکـاران و لایـەنگرانی. ( چـەپڵەلێدانی ئامادەبوان).

## سەرچاوەی نەهاتی و هەژاریی کرێکار

سەرچـاوەی نـەهاتی و هـەژاری کرێکـار ئـەم دوو خاڵـەی لای خوارەوەیە:

١- پشێویی ئابوری کەسەرچاوەکەی تەماحی لەڕادەبـەدەری چـینی سەرمایەدارە. سەرمایەدار بەهۆی تەماحی زۆرەوە گوێ ناداتە دەوڵـەت و خـەڵك و دەسـت دەداتـەکار گـەلێك کـە دەبێتـە هـۆی دامـاوی و لەناوچـونی چـینی داهێنـەری وڵات و بـۆ ئـەوەی بتـوانن چـالاکییە خراپەکانی خۆیان بەکار بهێنن، دەستدەداتە شانۆگەری و بـۆ نموونـە هەوڵی درۆی وەها بڵاودەکاتەوە کە نرخـی کەلوپەلـەکانی خـۆی بباتـە سـەرێ و بیداتـە چـینی کرێکـار. لـەو کاتـەدا، دەسـتدەکات بـە کەڵەکـەکردنی کەلوپەلـەکانی. لەنێو گەنجینـە پـیس و تاریکـەکان کـە وەکـو دڵـی خـۆی وایـە پێداویـستیەکانی ژیـانی خـەڵك دەشارێتەوە و بەنیازە بە نرخی بەرز بیانفرۆشێتەوە. یەکێك لە هۆکارەکانی نەهاتی چـینی چەوسـاوە، کـارە بێبـەزەییـەکانی ئەوانـە. هەڵبـەت دەوڵـەتیش بەپێی یاسا بـەریان پێـدەگرێت. ئێستا هـەموومان دەڵێین لـەناو بـچن

ئـەو کەسـانەی کـە گـەنم دەشـارنەوەو بـەنرخێکی گونجـاو نایدەنـە هاووڵاتیـەکانیان. ( چـەپڵەلێدانی ئامـادەبوان) ئەگـەر بێتـوو دەوڵـەت پـێش بـەو خراپەکارییانـەیان نـەگرێ بێگومـان خـەڵك لـەناو دەبـەن. رێکخراوەکـە بـەگوێرەی هێـزو توانـای خـۆی یارمەتیـدەر دەبێـت لەجێبەجێکردنی یاسای دژی پاوانکردن بۆ باشترکردنی بـژیوی ژیـانی خەڵکی هەژار و کەمداهات، بژی یاسای بەرەنگار بوونەوەی پاوانخوازی و جێبەجێکارە دڵسۆزەکانی ئەو یاسایە.( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان)

٢- سەرچاوەیەکی دیکەی ئەهاتیی کرێکار دەستەی ناپاکی نەتـەوە پەرستن. ئەم بەشە جگە لە ئێمە تەواوی جیهان قەبوڵیانە و لەسـەری کـۆکن. فـەرمانۆ کـە دوو ملیـار مـرۆڤ لەجیهانـدا تـف و نـەفرەت لـە نەژادپەرسـتی و رێبـەرانی دەکـەن. تـەنها ئـەو کەسـە هـیچ نـەزان و نەخوێندەوارانـە، بـەهۆی بانگەشـەی نـەژاد پەرسـتییەوەو بـەبێ هـیچ بەڵگەیـەك لەبیـستنی نـاوی هیتلـەر و قـسەکانی لەوانــە ( ئـەڵمانیا لەســەروی هەموانەوەیــە) دڵخــۆش دەبــن، مــن لــە ئێــوە دەپرسـم: دادپەروەرانە وەڵامی بدەنەوە، فاشیزم بۆ کوێ چووە کـە ئەهامـەتی و هـەژاری رووی تێنـەکردووەو لـەکوێی جیهانـدا خـوێن و مردنـی بڵاو نەکردووەتـەوە؟ فـەرمانۆ کـە هـەموو جیهـان و کۆشـکەکانی بـەرلین و مۆنیخیش تف و نەحلەتی هیتلەرو هیتلەریزم دەکەن.

ئێستاش کرێکارە دیلەکانی فەرەنسا و نەمسا و نەرویج و بـەلجیکا و هێندسـتان و دانیمـارك و یۆنـان و چـێك و مەجارسـتان(پۆڵەنـدا) و رۆمـــانی بولغاریـــا لەترســـی پیـــاوکوژانی نەژادپەرســـت هێـــزی هەناسەکێشانیشیان نیە و چاوەڕوانن بزانن کەی لەدەستی ئەوان رزگار

دەبن. گوێ لە هاواری دیلان و دەستبەسەرکراوەکانی هیتلەر بگرن کە تەنانەت کاتێکیش کە بەکۆمەڵ گوللەباران دەکرێن، چۆن سرودی ئازادی دەڵێنەوە. واتە یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی نەهامەتیی جیهان و بەتایبەت چینی کرێکار، دەستەی ناپاکی نەژادپەرستن و من بەوە خۆشحاڵم کە تەنانەت دوژمنەکانیشمان لەسەر ئەوە لەگەڵ ئێمەدا هاوڕان. کەسانێکی بیرکورت هەن کە دژی ڕای ئێمەن، بەڵام دواتر مێژوو ئەو قسانەی ئێمەیان بۆ ڕووندەکاتەوە.

ئێستا بەبیرێکی کراوەوە دەڵێم مەرگ و نەمان بۆ نەژادپەرستی ! ( چەپڵەلێدانی ئامادەبوان) ئێوە ئەی کرێکاران و وەرزێران و ڕۆشنبیرانی زەحمەتکێش و ئەی چینی چەوساوە هەتا ئەو جێگایە دەتوانن یارمەتیی ئەم ڕێکخراوەیە بدەن و پێشوازی لەڕێکخراوی کرێکاران بکەن تا ئەو پێشوازی لەئێوە بکات. (چەپڵە لێدانی ئامادەبوان).

هەروا کە لەکۆبوونەوەکەی پێشتردا باسمانکرد، هاتنە نێو ئەم ڕێکخراوەیە بەدەست خۆتان نیە و هەر کەسێك ناسنامەی ئەندامیەتی نەبێت بۆی نیە کار بکات. ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان) هیچ هێزێك نیە بتوانێت ئەم ڕێکخراوەیە لەناو ببات. فەرمانۆ ٧٥ کەس نوێنەرایەتی ٤٠٠٠٠ کرێکار دەکەن کە لەڕێگە و کارە جیاوازەکان هەڵبژێردراون، شەوڕۆژ بەڕاستی زەحمەت دەکێشن و بەدڵ و بەگیان یارمەتیی ئەم ڕێکخراوەیە دەدەن. ئاژاوەگێڕەکان و ئەوانەی کە ڕقیان لێمانە، ئەوانەی کە کێشەمان بۆ دروستدەکەن، ئاگاداربن کەلەناو دەچن و نامێنن. ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان) لەزووترین کاتدا لەژێر

ئـالای ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران کۆدەبینـەوەو دەسـتی یـەکگرتووی یەکـدی دەگوشـین و ڕێکخـراوی کرێکـاران بەباوەشـی کـراوەوە ئێـوە بانگهێشت دەکات بـۆ وەها بـیرو بۆچـونێکی پـیرۆز. ( چـەپڵە لێـدانی ئامادەبوان)

بژی ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان ( چەپڵەلێدانی ئامادەبوان)

بـژی دۆسـتان و لایـەنگرانی ئـەو ڕێکخراوەیـە ( چـەپڵە لێـدانی ئامادەبوان)

بژی ئێران وچینی چەوساوە ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان)

**ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان**

ئەم کۆبوونەوەیە لەڕۆژی دووشەممە لـەهۆڵی شـێروخۆری سوری شاری تەورێز لە کاتژمێر ٧ی ئێوارە دەستی پێکرد لەکاتژمێر ٨ی شـەو تەواو بوو.

– ٣٠ / ٧ / ١٣٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) –

## ٩- ( سـەروتاری یەکـەمین ژمـارەی گیتـی ڕۆژنامـەی فـەرمی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران) [35]

گیتی بۆ ئیوەیە ئەی کرێکاری چەوساوەو ئـەی وەرزێـری هـەژار، بـۆ ئێـوە دەنوسـرێت. بـۆ ئێـوە کـە هـەموو شـتێك پێکـدێنن و ژیـانی کۆمەڵگا دابیندەکەن، بەڵام لەدەستکردەی خۆتان بێبەشن. بۆ ئێوە کە بـە کـەڵکترین و هـەژارترین چـینی کۆمـەڵگان. بـۆ ئێـوە ئـەی ڕووت و قووتەکان، ئـەی برسـییەکان، ئـەی خـەڵکانی زەحمەتکێـشی چەوساوە.

---

35

لەو کۆمەڵگایەی کە ژیانی پڕلەنەهامەتیی ئێوە نابینێت، لەو کۆمەڵگایەی کە هاوارو گریانی منداڵەکانتان و خۆتان نابینێت، **گیتی** باس لە نەهامەتییەکانی ژیانی ئێوە دەکات و هاوارەکانی ئێوە دەگەیەنێتە گوێی خەڵکی. لە وڵاتێکدا کە هێشتا وەرزێر نۆکەری خاوەنزەوییە و کرێکار دیلی دەستی سەرمایەدارە، لە وڵاتێکدا کە چینی زەحمەتکێش تەواوی نەهامەتییەکانی ژیان بەرۆکی گرتووەو لەتەواوی خۆشییەکانی ژیان بێبەشە، لە وڵاتێکدا کە رۆشنبیری، تەندروستی و سەرجەم دەستکەوتەکانی پێشکەوتوی، تایبەتە بەچینی دەسەڵاتدار و زۆرینەی خەڵکەکەی لەنێو زەلکاوی نەخوێندەواری، هەژاری و نەخۆشیدا دەست و پێ لیدەدەن، لە وەها وڵاتێکدا **گیتی** بۆ پشتیوانیکردنی چینی چەوساوە بڵاودەبێتەوە. **گیتی** دەستکردی ئەو پیویستیانەیە و جیاوازیی زۆر بەرچاوی چینایەتیە. **گیتی** نوسەرو بڵاوکەرەوەی بیروبۆچوونی زەحمەتکێشی ئێرانە. **گیتی** باس لە چۆنیەتیی ژیانی چەوساوەکان و پێداویستییەکانی ژیانیان دەکات. **گیتی** مافەکانی زەحمەتکێشان دەخاتە بەرچاو فێریان دەکات مافەکانیان چین و چۆن دەبێت خەباتی بۆ بکەن. **گیتی** سەرجەم کرێکاران بانگهێشت دەکات بۆ کاری رێکخراوەی و داوا دەکات لە تەواوی وەرزێران لەگەڵ کرێکاراندا یەك بگرن. **گیتی** ئامرازی پێوەندیی نێوان رۆشنبیران و کرێکارانی ئێرانە و بەتایبەتی داوا لە رۆشنبیران دەکات هاوکارو پشتیوانی چینی چەوساوە بن و لەرێگای رێکخراوی کرێکارانەوە یارمەتییان بکەن. زەحمەتکێشان کە چینی داهێنەرو یارمەتیدەری وڵاتن، داواکاری ئێرانێکی ئازاد و ئاوەدانن.

ئێرانێك كەتیادا بەلاشخۆری نەمێنێت و هەموو كەسێك ئابووریی ولآت بەپێی پێویست بەكاربێنێت. ئێرانێك كە تیایدا ژیانی ئابوری و مرۆیی و مرۆڤەكان دابین بكرێت، هەموو كەسێك بەخۆشییەوە ژیان بەسەر بەرێت. ئێرانێك كە تیایدا زنجیرەكانی دیلیەتیی ئابوریی و سیاسی تاكەكانی ببچرێت و ئازادیی كۆمەڵگا و تاكەكەسەكان تیایدا دەستەبەر بكرێت. ئێرانی نوێ. ئازاد و خۆشبەخت. زەحمەتكێشانی ئێران بەچاوی ڕق و بێزارییەوە سەیری دوژمنان و پیاوكوژانی سەردەمانی شەڕ كە ئەوڕۆكەش لەژێر سێبەری حكومەتی پەرلەمانی حكومەتیان بەدەستەوە گرتووە دەكەن و لەو بڕوایەدان كە دوژمنانی خەڵك لە ژێر هەرناوێكدا بن، چ لەدەوڵەتدا بن و چ لەپەرلەمان و فەرمانگەكاندا دەبێ لەسەر دەسەڵات لابرێن.

ئەوان تەنها حكومەتێكیان قەبووڵە كە نان و كار و ئازادییان بۆ دەستەبەر بكات، بەلآم بەجوانی دەزانن كە ئەو كارە تەنها بەحكومەتێك دەكرێت كە بەدەستی كرێكاران و زەحمەتكێشان پێكهاتبێت و هەر بۆیەش داوا لەتەواوی زەحمەتكێشانی ئێران دەكەین كە بە یارمەتی ڕۆشنبیرانی ئازادیخواز چارەنوسی خۆیان بەدەستەوە بگرن.

***ڕۆژنامەی گیتی نیشانەی ئەم بیرو بۆچوون و هەست و خەباتانەیە.***

ڕۆژنامەی گیتی سەر بەرێكخراوی كرێكارانی ئێرانە و لەژێرچاودێری شاندێكی تایبەتیدا بەڕێوەدەچێت. ئەم ڕۆژنامە هەروا كە سەر بەچین و توێژێكی تایبەتیە، چۆنیەتی نوسینی تایبەتە

بەسەرجەم ڕووداوە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی سەر بەو چین و توێژەو بەو بیرو بۆچوونەوە ڕووداوەکان شیدەکاتەوە.

گیتی بەدەستی کەسانی چالاك و خاوەن بڕوایەك دەنوسرێت کە ساڵانێکی دوورو درێژ ئازاریان چەشتووە. خەڵکانێك لەبەرزی و نزمیی ژیاندا چەرمەسەری زۆریان بینیوەو بە ڕووسووری و پاکییەوە ژیاون. خەڵکانێك کە هەموو تەمەنیان سەرقاڵی خەبات دژی دوژمنانی ئازادی و زەحمەتکێشان بوون. ئەشکەنجە، زیندان و تاراندنی زۆریان بەسەرهاتووە و ئێستاش خەبات دەکەن، کەسانێك کە هەست بە ئازاری هەژاران دەکەن، ئاگاداری ئازارو هێزی کرێکارانن. ئەو کەسانەی گیتی دەنوسن. گیتی زمانی کرێکاران و وەرزێرانە و مووئەنگێوی ڕاستییەکانی کۆمەڵگایە. زەحمەتکێشان، گیتی هی ئێومیە.

**١٠- ( وتەکانی یووسف ئیفتیخاری لەڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران پووشپەڕی ١٣٢٢ ی. ه**

( ١٩٤٣ ی. ز) [36] لەمەراسیمێکدا کەهۆڵی شێرو خۆردا و بۆ ڕێکخراوی کرێکاران سازدرا، یووسف ئیفتخاری ئەم قسەو باسانەی لای خوارەوەی پێشکەشکرد.

**ئامادەبوانی بەڕێز**

**بەو پێیەی کەدەتانزانی ئەم مەراسیمە بۆ ڕێکخراوی کرێکاران سازدراوە، ئامادە بوون و بەخۆشحاڵییەوە بەشداریتان کردووە. هاتوون**

---

[36] – ڕۆژنامەی گیتی ژمارە ٢٢ بەرواری ٣٠ / ٤ / ١٣٢٢ ی. ه ( ١٩٤٣ ی. ز )

هەتاوەکو پارمەتی دەری پاکترین رێکخراوی ئێران واتا رێکخراوی کرێکاران بن. ئامادەبوون لەم مەراسیمەدا، نیشاندەری هەستی پاکی ئێوەیە. هەربۆیە من لێرەدا لەلایەن کرێکارانی ئێرانەوە سپاسی هەستی بەتینتان دەکەم. هۆکاری ئەوەی کە من چەندچرکەیەك لە کاتتان دەگرم، بانگەشە گەلێکی ناراستە کە لەلایەن دوژمنانی کرێکارانەوە خراوەتە پاڵی ئەم رێکخراوەیە. من لێرەدا دەمەوێت درۆکانی ئەوان ئاشکرا بکەم و شێوازی خەباتی رێکخراوی کرێکارانتان بۆ روون بکەمەوە. دوژمنانی ئێمە واتا حیزبە ئێرانییەکان. دوژمنانی ئێمە واتە حیزبە دۆڕاوەکان و ئازادیخوازە ساختەکان لەنێو کەسانی ساویلکەدا وەها بانگەشە دەکەن کە پێکهێنەری رێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان واتە بەرێز خەلیل ئینقلاب لەگەڵ فەهیمیدا پێوەندیی هەیە، هەر بۆیەش ئەم رێکخراوەیە بەدەستی کۆنەپەرستان پێکهاتووە. وابیر دەکەنەوە کە بەو بانگەشە و تۆمەت خستنە پاڵی ئێمە دەتوانن دۆڕاندنەکانی خۆیان چارەسەر بکەن. یەکەم ئەوەی کە بەرێز خەلیل ئینقلاب لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە فەرمانی پێکراوە کە لە ئازەر بایجاندا رێکخراوی کرێکاران پێکبهێنێت و لەو بابەتەشەوە لەلایەن کۆنترین و خۆش ناوترین کەسانی خەباتگێڕەوە ئەو ئیزنەی پێدراوەو بەرێز ئینقلابیش بە باشترین شێوە ئەرکەکانی خۆی راپەڕاندووە. بەڵام ئەوەی کە دەڵێن لەگەڵ پارێزگاردا پێوەندیی هەیە، یەکەم ئەوەی کە بەرێز ئینقلاب خۆی دادوەر بووە، پێویستە لەگەڵ پارێزگاردا پێوەندیی هەبێت و دووهەمیش پارێزگارو یان قایمەقام نوێنەری دەوڵەتن. نوێنەری رێکخراوەکە بۆ باشتربوونی

بـژیویی ژیـانی کرێکـاران پێویـستە لەگـەڵ نوێنـەری خاوەنکارەکـان و نوێنـەرانی دەوڵەتـدا پێوەنـدیی بـەردەوامی هـەبێت و هـەر کەسـێکی دیکـەیش کـە لـە جێگـای بـەرێز ئیـنقلاب بێـت ناچـارە بـۆ قـسەکردن لەسەر چۆنیەتی ژیانی کرێکاران لەگەڵ پارێزگار یان قایمـمـەقام واتـە نوێنـەرانی دەوڵـەت کۆببێتـەوە. دوژمنـانی ئێمـە بـەهۆی ڕکەبـەری لەگـەڵ ئێمـەدا ئـەو قـسانە دەکـەن. هـەر بۆیـەش مـن هـەمووی ئـەو تۆمەتانەیان ڕەتدەکەمەوە. دوژمنانی ئێمە بۆ تۆقاندنی خاوەنکارەکان وەها بانگەشە دەکەن کە ڕێکخراوی کرێکاران، ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕە و لەزووترین کاتدا شۆڕشێك هەڵدەگیرسێنێت و دەست دەگرێت بەسەر هـەموو داراییـەکانی ئـەودا. وادەر کـەوتووە کـە ڕێبـەرانی ڕێکخـراوی کرێکاری کەسانێکی زۆر شۆڕشگێڕ و بەئەزموونن و بـەجوانی دەزانـن لـەم کاتـەدا شۆڕشـکردن بەسـوودی کۆنەپەرسـتانی جیهانـە و دژی بەرژەوەندیـەکانی چینی کرێکارە. هـەر بۆیـەش بەتـەواوی سـەرجەم دەنگۆکانی ئەوان ڕەتدەکەمـەوەو دەڵێم ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران نیـازی ئـەوەی نیـە گـرژی و ئـاڵۆزی دروسـتبکات. لەکۆنـەوە وتویانـە کەسی درۆزن شتی لەیاد نامێنێت. لەکاتێکـدا دەڵـێن ئـەم ڕێکخراوەیـە شۆڕشگێڕە، لەلای کەسانی کۆچبەرو ساویلکە دەڵێن کە بەرێز ئینقلاب هەستی نـەژاد پەرسـتیی هەیـە. یەکـەم ئـەوەی کـە هـەمووی خـەڵکی ئێران دەزانن کـە نـەژادپەرسـت تێکـدەرە، بووەتـە هۆکـاری نەهامـەتی ئەورووپا، بومتـەهۆی ئـەم قەیرانـە ئابوریيـە کـە ئێـستا داوێـنی چینی هەژاری کۆمـەڵگای ئێمەشـی گرتۆتـەوە، هەربۆیـەش بێـزارن لـە نـاوی نەژادپەرستی. هـیچ ئێرانییـەکی ڕاسـتەقینە هەسـتی نـەژاد پەرسـتی

تێدانیە. دووهەمیش خەلیل ئینقلاب کە یەکەم پۆستەکەی دواتر هەموو دارایییەکەی، دواتریش گیانی خستۆتە پێناوی ئازادی چینی زەحمەتکێش و بەس مەمرە و مەژی دەژی، چۆن دەکرێت بە کەسێکی وەها بوترێت نەژادپەرست. هەرچەندە دووژمنانی ئێمە بێئەوەی بەخۆیان بزانن وتەکانی خۆیان ڕەتدەکەنەوە.

منیش لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە سەرجەم ئەو تۆمەتە بێ بنەمایانە ڕەتدەکەمەوە. هەرکەسەو لەسەر ئێمە بۆچوونی جیاوازی هەیە. ڕێبەرانی حیزبە شکستخواردوەکان دەڵێن بەهۆی ئەوەی کە ئێمە حیزبی سیاسی پێکناهێنین خاووخلیچن. سەرمایەدارەکان پێمان دەڵێن بەهۆی ئەوەی کە ئەم ڕێکخراوەیە زۆر بەتوندی دژایەتیمان دەکەن ڕادیکاڵن. هەردوو لایەنیان هەڵە دەکەن. ڕێکخراوی کرێکاران ڕاسترین و باشترین ڕێگای هەڵبژاردووە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سەرکەوتنی زیاتر بەدەستدەهێنێ. بەهۆی ئەو ڕێگا ڕاست و دروستەی فەرمانۆکە لەسەرتاسەری ئێراندا ڕێکخراوی کرێکاران پێکهاتووە، ئەندامەکانی سەرقاڵی چالاکی و سەرکوتکردنی دوژمنانی کرێکارانن. دەستکەوتەکانی دەستبەجێی ئەم ڕێکخراوەیە، دوژمنانی ناچار کردووە تۆمەتمان بۆ هەڵبەستن. ڕێکخراو یان حیزبی بەهێزو ڕاستەقینە هیچ کاتێک نابێت تۆمەت بخاتە پاڵی ئێمەوە. دوژمنەکانمان بەهۆی ئەوەی کەخۆیان کەموکووڕی زۆریان هەیە ناچارن دژ بەئێمە بانگەشەی بێبنەما بکەن. ئێمە هەتاکو ئێستا هیچ کۆبوونەوەیەکمان نەبووەو بەس بە پەڕاوێك وڵامان داونەتەوە و لەمەو بەدواش هەروا وڵامیان دەدەینەوە. هیچ کاتێکی بەنرخی خۆمان بۆ وڵامدانەوە بەوان خەرج ناکەین. ڕێکخراوەکە چی دەوێت؟

ژیان بۆ کرێکاران، تەندروستی باش، خواردنی باش، خوێندەواریی باش. دەبێ منداڵی زەحمەتکێشانیش فێری زانست بن. ببنە دکتۆرو ئەندازیار و مامۆستا. کرێکاران نابێت پتر لە هەشت کاتژمێر کار بکەن. برێك لەکارگەکانی تەورێز بەبیانوی جۆراو جۆر ڕۆژی دوازدە کاتژمێر کار دەکەن. ئێمە دژی ئەو جۆرە کارە دژە یاسا و مرۆییەین. لەکارگەکانــدا بنکــەی تەندروســتی لێیــە بــەڵام نــەدەرمانی لێیــە و نــەدکتۆر. لەکارگــەی پەشمینــەدا، کرێکارێــك دەســتی لــەنێو مەکینــەدا گیری کرد دوو سەعات و نیو کەس نەبوو یارمەتیی بدات. ئێمە دژی ئەو بنەمایانە خەبات دەکەین. ( چەپڵە لێدانی ئامادەبوان) بەڕێز جورابچی مردنـی کرێکـارێکی بـەبڕی هەشـتا تمـەن چارەسـەر کـرد. لەبەرئەوەی ئێوەی بەڕێز هاتون لێرەدا کاتێکی خۆش بەسەر بەرن نامــەوێت بــەو ڕووداوە دڵتەزێنانــە کەشــەکەتان لــێ تێکبــدەم. ئێمــە دەمانەوێت کرێکاران و وەرزێران و هەژاران لە تەواوی خۆشییەکانی نێـو کۆمــەڵگادا بەشــدارییان هــەبێت. بــەبێ هــۆ لەســەر کارەکانیــان دەرنەکرێن، ئەو یاسایانەی کە بەسودی ئەوان پەسند کراون بخرێنـە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەو کەسانەی کە لـەنێو کارگەکانـدا گیانیـان لەدەست دەدەن، نوێنەری فەرمانگەی کارو کاروباری کۆمەڵایـەتی لـە مردنیـان بێئاگایـە. لـەدوای تێپـەڕبوونی سـێ مـانگ دێـن و لـە ئێمـە دەپرسـن ڕووداوەکــە چــۆن بــووە؟ نــاوی کەســە مردووەکــە لەئێمــە دەپرسن. ئێمە دەمانەوێت ئەم نوێنەرانە ئەرکەکانی خۆیان بەجوانی بزانن. ڕێکخراوەکە هەوڵدەدات بەجۆرێك یەکسانی لەنێو کۆمەڵگادا دەستەبەر بکات. نابێت ئەو جیاوازییە ئەوەندە بێت کە منداڵی سەرمایەدارەکە هەر ڕۆژەو سەیارەیەکی پێبێت. بەو هۆیەی کە ئەم

سەبارەیە مۆدێلی نەماوەو ژنەکان پێیان جوان نیە. کرێکارانیش لەنێو خانووی ڕووخاودا بژین. کرێکاران دەبێت لەساڵێکدا یەك مانگ پشوویان هەبێت لەسەر حسێبی سەرمایەدارەکان.

لە هاویندا بچن بۆ سەفەرو ماندوێتی ئەو یازدە مانگەی کەکاریان بۆ سەرمایەدار کردووە نەختێك لە لەشیان دەربچێت.

کرێکاران دەبێ لەسەر حسێبی دەوڵەت و سەرمایەدارەکان بیمە بکرێن. جلی هاوینە و زستانەیان هەبێت. ئامادەبوانی بەرێز بەهۆی کەمیی کاتەوە، لەکۆتاییدا چەند وتەیەکی دیکەتان پێشکەش دەکەم. بەڕێزان، ئێمە دوژمنمان زۆرە، خاوەن ملکەکان دژی ئێمەن. لەبەرئەوەی کە ئێمە وەرزێران ئاگادار دەکەینەوە و لایەنگری ئەوەین زیادەی بەروبوومەکان بدرێتە خەڵکی هەژار و کەمدااهات. سەرمایەدارەکان دژمانن. لەبەرئەوەی ئێمە لایەنگر و داکۆکیکارین لە ماف کرێکارانێك کە بەدەستی سەرمایەداران دەچەوسێنەوە. حیزبەکان دژی ئێمەن، لەبەرئەوەی کەرێکخراوەکە نابێت داردەستی ئەوان و دژایەتی دوژمنانی بەرواڵەت دۆستی کرێکاران و وەرزێران دەکات. هەروا کە بۆ خۆتان دەزانن بەخۆشییەوە لەتەورێزدا ئێمە دۆست و لایەنگرمان زۆرترن لە دوژمنەکانمان. ئێمە بەیارمەتیی ئێوەی خۆشەویست سەردەکەوین بەسەر دوژمناندا. دوژمنەکانی ئێمە پەرێشانن و دژایەتیی یەکدی دەکەن، بەڵام دۆستانمان یەکڕیز و تەبان. بژی یەکڕیزی و یەکگرتوویی زەحمەتکێشان. ( چەپڵەلێدانی ئامادەبوان).

**١١- ( نوسراوی کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکاران بۆ سەرۆک وەزیران ( عەلی سۆهەیلی)، ١٢ ی گەلاوێژی ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز)** [37]

**کۆمیتــەی ناوەنــدی ڕێکخــراوی کرێکــارانی ئێــران، ژمــارە ١٧٦، ڕێکەوتی ١٢ ی گەلاوێژی ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی).**

جەنابی سەرۆک وەزیران. ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران بەپێویستی دەزانێــت کــە جــەنابت و دەوڵــەت ئاگــادار بکاتــەوە کــەکرێکاران و وەرزێرانــی ئێــران بــەهۆی داخــستنی ڕۆژنامــەی **گیتی** کــە نیــشاندەرو گوتەبێــژی پێویــستییەکانی ژیانیانــە نارەزایــەتی دەردەبــڕن و ئــەو کــارەش بەدژایــەتیکردنی ڕاســتەوخۆی دەوڵــەت دەزانــن لەگــەڵ چــینی کرێکاردا.

ئێمە نارەزایی خۆمان و چینی زەحمەتکێشی ئێران لـەم ڕێگایـەوە دەردەبڕین و چاوەڕوانین بەزووترین کات ئیزنی کارکردنی ڕۆژنامەکە بدەنەوە.

کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران.

هێمــداد،( مــۆرو واژووی) کۆمیتــەی ناوەنــدی کرێکــارانی ئێــران، تاران.

---

[37] – بەڵگەی نەتەوەیی . زنجیرەی ن . ژمارە ١٠٩٠٠٣

**١٢- ( هەواڵی ئاسایش سەبارەت بە یەکگرتنەوەی خەلیل ئینقلاب لەگەڵ حیزبی توودە، ٤ ی ڕەزبەری ١٣٢٢ ی. ھ ( ١٩٤٣ ی. ز) [38]**

**هەواڵ**

چەند کەسێك لە ئەندامانی حیزبی ڕێکخراوی کرێکاران کە خەلیل ئینقلاب ئازەر ڕێبەرایەتی دەکات، چوونەتەنێو حیزبی توودەوەو لەگەڵ ئەواندا یەکیان گرتووە.

شەکیبی و پاپازیانیش لەڕێبەرانی حیزبی توودە دوێنێ کۆبوونەوەیەکیان سازداوەو وتارگەلێکیشیان لەبارەی بانگەشەی هەڵبژاردن پێشکەش کردو هەروەها فەرمانیان پێکراوە کە کرێکاران کۆبکەنەوەو بیانکەنە ئەندام لەو حیزبەدا.

خەیرخاهیش یەکێکی دیکە لەڕابەرانی حیزبی توودە وتارێکی پێشکەش کردووەو تیایدا باسی لەخەباتی حیزبەکەی کردووەو وتویەتی کە ئەوان لەژێر کاریگەریی هیچ وڵاتێکدا نین و بەتەنیا کرێکاران و وەرزێران یارمەتیدەریانن.

بەشێوەیەکی نهێنی پرسیارمان لە ئیرەج ئەسکەندەری کرد. بوون بەئەندامی خەلیل ئینقلابی پشڕاسکردەوە.

---

[38] – بەڵگەی نەتەوەیی . هەواڵەکانی پۆلیس نهێنی – ٤ ی ڕەزبەری ١٣٢٢ ی . ھ ( ١٩٤٣ ی . ز )

**١٣- ( لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێرانەوە بۆ سەرۆك وەزیران ( عەلی سۆهەیلی)، لەرێکەوتی ١١ ی ڕەزبەری ١٣٢٢ ی. ھ ( ١٩٤٣ ی. ز)** [39]

ڕێکخراوی ناوەندی کرێکارانی ئێران، تاران، ژمارە ٢٥٨، رێکەوتی ١١ / ٧ / ١٣٢٢ ی. ھ ( ١٩٤٣ ی. ز) جەنابی سەرۆك وەزیران. ماوەیەکە ڕۆژنامەی **گیتی** ڕۆژنامەی فەرمی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران بەبێ هیچ هۆیەکەوە لەلایەن پارێزگاری سەربازییەوە داخراوە. بەو هۆیەشەوە کرێکارانی ئێران زۆر دڵگران بوون. لەم ڕێگەیەشەوە ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران لەجەنابتان داوادەکات فەرمان بکەیت بەکردنەوەی ڕۆژنامەکەمان. هەروەها داواکارین لەجەنابتان بەو بەرپرسەی کە بووەتە هۆکاری داخستنی ڕۆژنامەی گیتی بڵێیت لەدژایەتیکردنی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران کە تاکە ڕێکخراوی ڕاستەقینەی چینی هەژارە دەست هەڵبگرێت.

کۆمیتەی ناوەندی. ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران.

واژووی ئیفتخاری

---

[39] – بەڵگەی نەتەوەیی . زنجیرەی ن ، ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

**١٤- ( لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران بۆ سەرۆك وەزیران ( عەلی سۆهەیلی)، ١٢ای ڕەزبەری ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)**

ڕێکخراوی ناوەندیی کرێکارانی ئێران، تاران: ڕێکەوتی ١٢ / ٧ / ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)

جەنابی سەرۆك وەزیران

بارودۆخی نالەباری ژیانی کرێکاران و بەرز بوونەوەی لەڕادەبەدەری نرخی شت و مەك وەهایە کە قەڵەم ناتوانێت باسی بکات. بەتایبەت کرێکارانی **سایلۆ** کە زۆر بەسەختی دەتوانن بژیویی ژیانیان دابینبکەن و لەبەشێك لەکارگەکانیشدا کرێکاران ناچارن ڕۆژانی هەینیش کار بکەن ئەگینا مووچەکانیان پێنادرێت.

ڕێکخراوی کرێکاران داوا لەجەنابتان دەکات کە بۆ ئەو مەسەلەیە ڕێگاچارەیەك بدۆزنەوە و بۆ باشترکردنی ئاستی ژیانی کرێکاران، بڕیاری پێویست دەربکەن و بیگەیەننە بەرپرسان بۆ ئەوەی ئەو بارە قورسەی سەرشانی کرێکاران تاڕادەیەك سووك بکرێت و بەپێچەوانەوە بەشێکی زۆر لەکرێکاران چیدی ناتوانن کار بکەن.

**کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران**

**ئیفتیخاری**

**( لەژێر نامەکەوە) فەرمانکراوە بۆ پاراستن و هەڵگرتنی ١٨ / ٧ / ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)**

## ١٥- ( ڕاگەیاندنی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران) [40]

لەم سەردەمە سەخت و دژوارەدا کەبرسیەتی و نەهامەتی و مردن بەسەختی بەرۆکی چینی هەژاری ئێرانی گرتووە کرێکارانی ئێران لە هەموو کەس زۆرتر کەوتونەتە بەر شالاوی برسیەتی و نەهامەتی.

وەرزێران و فەرمانبەرانی دەوڵەتیش تووشی ئەو نەهامەتییە بوون بەڵام کرێکارانی ڕۆژانە کە جگە لەو چەند قەرانەی کە کاری ڕۆژانە دەستیان دەکەوێت هیچ چەشنە داهاتێکی دیکەیان نیە و لەهەموو کەس هەژارترن. کرێکاری ئێرانی لەژێر خانویەکی ڕووخاودا دەژی، جلی کۆنەو دڕاو لەبەر دەکات، نانە وشکە دەخوات، هەموو نەخۆشینێك بەرۆکی دەگرێت و دکتۆرو دەرمانیشی لەبەردەستدا نییە، هاوسەرو منداڵەکانی بەرەو نەمان و مردن دەچن.

لە هیچ شوێنێکی جیهاندا چینی کرێکار ئەوەندە هەژارو داماو نیە، لەولاتانی دیکەدا کرێکار بیمە دەکرێت، کاتێك کە نەخۆش دەکەوێت چارەسەری دەکەن، ئەگەر بەشێك لەجەستەی لەناو بچێت قەرەبووی دەکەنەوەو ئەگەر بێتوو گیانی لەدەستبدات، بژیویی ژیانی هاوسەرو منداڵەکانی دابیندەکەن. بەڵام لەولاتی ئێمەدا، نەك لەو مافانە بێبەشە، نەك تەنها بیمەش ناکرێت و ئەگەر بێتو بشمرێت بنەماڵەکەی لەناو دەچن، بەڵکو لەو بڕە کەمە مووچەیشی دەدزن و

---

[40] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) زنجیرەی وەزارەتی ناوخۆ ( لەمە بەدواوە : ك ) ئەلبومی ٣٥٨ پاکەتی ٠٦٢٠٢ خودی بەڵگە نامەکە دڕاویی تێدایە و لەجێگای بڕێك لە وشەکان ( ٠٠٠ ) دانراوە

بەتەواوی مووچەکەی پێنادەن، تەنانەت شتومەك و جلەکانیشی لێ دەدزن. کرێکاری داماو هەرچەند هاوار دەکات کەس بەهانایەوە ناچێت، خاوەنکارەکان و سەرمایەدارەکان لەگەڵ کرێکاراندا دوژمنایەتی دەکەن و دەوڵەتیش پشتیوانی لەوان دەکات. ئەو کۆشك و تەلارە گەورانەی سەرمایەدارەکان بەدەستی کرێکار دروستدەکرێت، ئەو کرێکارانەی کە بۆ خۆیان لەناو خانووی ڕووخاو و چایخانەکاندا ژیان بەسەر دەبەن.

کۆگای برنجی خاوەن زەوییەکان بەدەستی وەرزێرەکان پڕدەبێت، وەرزێرێك کەخۆی نانی وشکیشی نیە و لەبرسان دەمرێت.

هەموو جۆرە بەرهەمێك، هەزاران تۆپ قوماش و سەدان هەزار جووت پێڵاو هەموو شتێکی دیکە بەدەستی کرێکار سازدەکرێت و سودەکەی دەچێتە گیرفانی خاوەنکارەوە، ئەو کرێکارە ڕووت و هەژارانەی کە خۆیان خاوەنی هیچ شتێك نین. دەوڵەت، ڕۆژنامەی گیتی کە باسی نەهامەتییەکانی چینی کرێکاری دەکرد داخست و دەنگی کرێکارو هەژاری کپ کرد. ئێستا ئێمە لەم ڕێگایەوە باسی نەهامەتییەکانی ژیانی هەژاران دەکەین و دەیگەیەنینە گوێی هەمووان. بەڕێزانی وەزیر، بەڕێزانی بەرپرس، ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران سەدان شکاتی کرێکاران کە بەهۆی داخستنی ڕۆژنامەی گیتی یەوە نەگەیشتووەتە گوێی ئێوە پێتانی ڕادەگەیەنێت، هیوادارن گوێ لەو شکاتانە بگرن و چارەسەری بکەن:

١- کرێکارانی **سایلۆ** شکات دەکەن کە یەکەم لەهەر نانێك کە پێیان دەدرێت سێزدە شایی پارەی زیادەیان لێوەردەگرن، لەبەرئەوەی هەر

نانێك بۆ سایلۆ دوو قەران و حەوت شایی یە و سێزدە شاییش بۆ کرێی هێنانەکەیەتی بۆ شار و هەر نانێکیش دەدەن بە سێ قەران. لەبەرئەوەی کرێکارانی سایلۆ هەر لەوێ نانەکە وەردەگرن ئەوە نابێت کرێیان لێوەربگیردرێت، دەبێت هەر نانێکیان بەدوو قەران و حەوت شایی پێبفرۆشن. دووهەمیش کرێکارانی سایلۆ پێویستییان بە پاکوخاوێنییە، دەبێت سابوون و پێداویستییەکانی دیکەیان بۆ دابین بکرێت. سێهەم لە مانگێك پێش ئێستاوە پێیان ڕاگەیاندون کەلەسەدا بیست مووچەکەیان زیادیکردووە، ئێستا دەڵێن ئەو زیادکردنە بۆ کاتێکی نادیار دواخراوە. داواکاری کرێکارانی سایلۆ ئەوەیە کە ئەو زیادکردنە لەزووترین کاتدا جێبەجێ بکرێت.

٢- کرێکارانی کارگەی چەك و تەقەمەنی شکات دەکەن: کرێکارانی گرێبەست کە پتر لە سەدو پەنجا کەس نین و سەرجەمیشیان کرێکارانی کۆن و بەئەزموونن، مووچەکەیان زۆر کەمە و یەك لەسەر سێی کرێکارانی دیکەیە و خاوەنکارەکانیش بەبیانوگەلێکی بێبنەما لە زیادکردنی مووچەکانیان بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران خۆدەبوێرن.

٣- کرێکارانی شارەوانی شکات دەکەن کە هاوین تەواو دەبێت بەڵام ئەوان هێشتا جلەهاوینەکان کە بۆیان دیارکراوە وەریاننەگرتوون و هەمووجارێك مووچەی مانگانەکەیان بیست ڕۆژ لە وادەی دیاریکراوی خۆی دوادەکەوێت.

٤- کرێکارانی کارگەی ئاوجۆ(بیرە)ی **مەجیدیە** شکات دەکەن کە: یەکەم ئەوەی کەخاوەنکار ماوەی کار کردنەکەیانی لە ٨ کاتژمێرەوە

درێژ کردووەتەوە بۆ ١٠ کاتژمێر بەڵام مووچەکەیان هەروەك خۆی وایە. دووهەم بەبیانوگەلی جیاوازو بێبنەما کرێکارەکان غەرامە دەکەن و لە مووچەکەیان کەمی دەکەن. کرێکارەکان داواکارن ئەو مافخوراوییە چارەسەر بکرێت.

٥- مووچەی سەرجەم کرێکاری ئەو کارگانەی کەناویان هێنرا زۆر کەمە و بەشی بژیویی ژیانیان ناکات و داواکارن کە دەوڵەت و خاوەنکاران پێداویستییە سەرەکییەکانیان لەوانە نان، برنج و رۆن و خەڵووزیان بە نرخێکی هەرزانتر بۆ دابین بکات.

٦- رێکخراوی کرێکارانی ئێران داوا لەدەوڵەت دەکات لەزووترین کاتدا یاسای بیمەی کرێکاران لە پەرلەماندا تاوتوێ بکرێت و پەسندبکرێت.

بەرێزانی بەرپرس، بارودۆخی ژیانی کرێکاران لە مەترسیدایە. بژیویی ژیانیان دابین بکەن، گوێ لەنازارەکانیان بگرن و لەرق و تورەییان بترسن.

کرێکاران بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانتان و بۆ رزگارکردنی خۆتان و بنەماڵەکانتان لە مردن و نەمان یەکبگرن. رێکخراوی کرێکارانی ئێران پشتیوانی و یارمەتیدەرتانە. لەدەوری رێکخراوی کرێکارانی ئێران کۆببنەوە. بژی یەکگرتوویی کرێکاران. رێکخراوی کرێکارانی ئێران.

**١٦- ( لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێرانـەوە بۆ سـەرۆك وەزیـران ( عـەلی سوهەیلی)، ١٣ ی ڕەزبـەری ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)** [41]

وەزارەتـی گەیانـدن و گواسـتنەوە، بروسکە، لەتارانـەوە بـۆ تـاران، ژمارەی بروسکە ٤٢، ڕێکەوتی ناردن ١٣ ی ڕەزبەر، ڕێکەوتی گەیشتن ١٣ ی ڕەزبەری ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)

جـەنابی سـەرۆك وەزیـران، وێنـە بـۆ وەزیـری نـاوخۆ، وێنـە بـۆ سەرۆکی ئاسایشی گشتی

له مردنی محەمەد حسێن کرێکار، پیلانگێڕیـەکانی **پـاوەر زیـایی** ســـەرۆکی ئاسایـــشی تـــەورێز، پارێزگـــار ئەحمـــەدی بەهانـــدانی خاوەنکارەکـان و هێرشـی کەسـانێکی زۆر لەچـەقۆ بەدەسـتان بـۆ سـەر کرێکـارانی تـەورێز ئاگـادارن. ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئازەربایجـان دەتوانێت پێش بەو پلانگێڕانە و ئاژاوانـە بگرێـت. لەپێشدا کۆمیتـەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران له جەنابتان داوادەکات:

١- بڕیـار بـدەن و گرێبەسـتەکەی بـەڕێز دکتـۆر شـێخ جێبـەجێ بکەن.

٢- بـە لەسـەرکار لادانـی پارێزگـار ئەحمـەدی، زیـایی سـەرۆکی ئاسـایش و بانگهێـشتی ئـامیر لیـوا موقـەدەم کۆتـایی بـەم ئـاژاوەی ئازەبایجان بێنن.

کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران. ئیفتیخاری

ناونیشانی ئۆفیس: تاران ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران

---

[41] - ( بەلگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

**١٧- ( هەواڵی ئاسایش بۆ وەزارەتی ناوخۆ سەبارەت بە بڵاوکراوەکەی یووسف ئیفتخاری لە تەورێز لەڕێکەوتی ٢٦ / ٧ / ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) و دەقی نوسراوەکەی ناوبراو [42]**

وەزارەتی ناوخۆ

ئۆفیسی دووهەمی بەڵگەنامە نهێنیەکانی وەزارەتی ناوخۆ

ڕێکەوتی ٢٦ / ٧ / ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) ئاسایشی گشتی ژمارە: م ١٧٥. یەك کۆپی ژمارە ١,٩٥١١ ڕێکەوتی ٢٦ / ٧ / ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی.ز)

پێتانی ڕادەگەیەنین، لەڕێکەوتی ٢٦ / ٧ / ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) نوسراوەیەك لەلایەن ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران و بەدەستی یووسف ئیفتخاری لەسەر پیاوانی ئاسایشی تەورێز لەنێو شاردا بڵاوکرایەوەو دواتر بەدەستی پیاوانی پۆلیس کۆکرایەوە، پێشتریش لەسەر مەسەلەی یووسف ئیفتخاری بە نوسراوی ژمار ٩٨٩٠,٨٨٥٠ ئاگادار کراوەتەوە. کۆپیەك لەنوسراوەکەتانم لەگەڵ ئەم هەواڵەدا بۆ ناردن.

ئاسایشی گشتی – سەیف ( واژوو)

تەورێز

نوسراوەی ڕێکخراوی کرێکارانی ئازەربایجان ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ سەرجەم چین و توێژە هەژارەکانی ئێران – ئاگادار کردنەوەی داواکاری گشتییە – فیشەك لەجێگای نان – سەرەڕم لەباتی نان – تاوانی ئاسایشی تەورێز – جموجۆڵی هەزارانەی کرێکاران – پیاوانی

---

[42] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) . زنجیرەی ك . ئەلبومی ٣٥٨ . خودی بەڵگەکە دەڕاوی تێدایە و بەشێك لە وشەکانی نەماون و لێرەدا بە ( ... ) نوسراوە .

ئاسایش بەفەرمانی شازادە یاوەر زیایی کرێکاری بەساڵاچوو موحەمەد حسێنیان بەچەقۆ کوشت !

ڕۆژی چوارشــــەممە ٦ / ٧ / ١٣٢٢ ی. ھ ڕێکـــەوت لەگـــەڵ ٢٩ی سێپتەمبەری ١٩٤٢ ی. ز کاتـژمێر ١٢ ی نیـوەڕۆ کرێکـارانی بەجـەرگی ئازەربایجـان بـۆ یەکـەمجار کرێکـارانی ئێـران کەوتنـە بـەر پـەلاماری پـۆلیس، پـشتیوانی ڕاستەقینەی دواکـەوتوویی. ڕووداوەکـە بەشـێوەی کورتکراوە بۆ ئاگاداریی سەرجەم خەڵکی چەوساوە باسدەکەین:

هەموو خەڵکی جیهان دەزانن کە سەرمایەداران و خاوەنکارگـەکان و خوێنمـژانی ئێـران زۆر بێبەزەییانــە و بـەزەبری سـەرەڕم و ئـاگر، چـینی چەوسـاوەو هـەژاریان لـەژیان بێبـەش کـردووەو تەرمـەکانیان ئەشکەنجە دەدەن.

هەموو جیهان دەزانن کە کرێکاری ئێرانی نان، خانوو، جلوبـەرگ، پێڵاو، قوتابخانە، دکتۆر، پارێزەر و هیـچی دیکـەیان نیـە. هـەموو دنیـا دەزانێ هێزی یاسا ئەوی داماو کردووە و هێزی دادوەریـش پـشتیوانیی لێناکـات و هێـزی جێبــەجێکاریش لــەناوی دەبــات. خــەڵکی جیهــان ئاگادارن کە دەسەڵاتدارانی ئێران چینی هەژارو چەوسـاوەیان لـەئازادی بێبەش کردووەو بێ بەزەییانە لەژێر پێدا وردو خاشیان دەکەن.

بـۆ قسەکانیـشم بەڵگەیـەك لـە تـاوانی ئاسایـشی تـەورێزم لەبـەر دەسـتدایە. لـەو ڕێکەوتــەدا کرێکـارانی کارگــەکانی تــەورێز بــەهۆی برسـێتی و جێبەجێنــەکردنی گرێبەسـتەکە ( گرێبەسـتێك کـە لـەم دواییانەدا بەهۆی چالاکییەکانی ڕێکخراوەکـە و بڕیـاری وەزارەتـی کـار لەلایەن بەڕێز دکتۆر شێخ لەگەڵ سەرمایەدارەکانی تەورێزدا بەسـترا).

و دەستبەسەرکردنی یووسف ئیفتخاری لە ئاسایش ( بەپێی تەواوی پرۆگرامەکانی رێکخراوەیی جیهان) ڕوو لەحکومەت دەکەن و داوای مافە پێشێلکراوەکانیان دەکەن. کرێکارەکان هێشتا لە بنکەی پۆلیس نزیک نەبوونەوە کە بە فەرمانی زیایی هێرشیان کردە سەریان. محەمەد حسێن کرێکاری بەساڵا چووی برسی بەهۆی سەرەرمەکانی ئەوانەوە خەڵتانی خوێن بوو. بەهۆی هێرشی کۆنە پەرستانە خەڵکی بێ گوناه هەموو لەشیان کون کون بوو (..). بەخوێنی ئەوان جادەکان سوور بوون. بەوشێوەیە (..). داردەستانی کۆنەپەرستی نواندیان کە جگە لە مردن و شەرمەزاری کارێکی (..). دیکتاتۆریەت دەیانەوێت بەزەبری سەرە ڕم و کوشتن (..). بخنکێنێت. ئاگاداری ئەوە نیە کەهەر ئەو دیکتاتۆریەتە (..). بەدەستی کرێکار پێهاتووە. هەر بۆیەش چینی کرێکار هیچ کاتێك بەدەستکردی خۆی لەناو ناچێت. (..). هەتا دوا هەناسە لەمافەکانی خۆیان داکۆکی دەکەن و کۆشکەکانی کۆنە پەرستی و دیکتاتۆریەت بەیەکگرتووی وێران دەکەن و لەناویان دەبەن.

ئێمە کرێکارانی ئازەربایجان لەنێوە منداڵە برسیەکانی کرێکاری گیان بەخت کرد و محەمەد حسێن و بەنێوە کرێکارانی ستەملێکراوی ئێران سەرەخۆشی دەکەین و خۆمان بەهاوخەمتان دەزانین. پێویستە سەرجەم کرێکارانی ئێران لەم خەمەدا هاوبەش بن و یەك خولەك بێدەنگی ڕابگرن. بەڵێ، وەلامی چاکە خراپەیە. ئێمەی کرێکار بەشەوو ڕۆژ سەرقاڵی ئامادەکردنی پێویستییەکانی کۆمەڵگاین. ئێمەی کرێکار بەبەردەوام سەرقاڵی دابینکردنی چەك و تەقەمەنی

هاوپەیمانەکانی خۆمانین. ئێمەی کرێکار بەدڵ و بە گیان دژ بەنەژادپەرستە خوێنمژەکان خەبات دەکەین. ئێمەی کرێکار لەباتی خواردنی باش و جلوبەرگی ڕێکوپێك، ڕووتی و برسیەتی دەچێژین. ئێمەی کرێکار لەجێی" ی گەنم قوڕ دەخۆین. بەو حاڵەشەوە دلگرانین کە ئاسایش لەجێگای ڕێزگرتن لەو هەموو گیانفیدایییە، بە فیشەك و سەرەڕم وڵاممان دەداتەوە. ئەو هەموو زەخت و کوشتنە، ڕیزی یەکگرتوی ئێمەتێك نادات. بەڵکو ئێمە لەو ڕێگایەدا شێلگرتر دەکات و هاوڕێیەتیمان بەهێزتر دەبێت. ئێمەی کرێکار لەلای داواکاری گشتی شکاتمان تۆمار کردوە و داواکاری گشتیش (..). پێویستە بەدواداچوونی بۆ بکات. بەڵام دڵنیاین کە (..). ئەوە ناکات و گوێ لە هاواری ستەملێکراوان ناگرێت (..). هەر بۆیە ئێمەی کرێکار جگەلەوەی کە گوشار (..).

**١٨- ( کورتکراوەی وتارەکەی یووسف ئیفتخاری لەکۆبوونەوەی ٩ / ١٠ / ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) کرێکارانی کارگەی چەك و تەقەمەنی لەئۆفیسی ڕۆژنامەی گیتی)** [43]

کاتژمێر ٤ و ٢٠ خولەك دەستی پێکرد کۆبوونەوەکە لەلایەن بەڕێز یانەم ئەنساری بەڕێوەبەری کۆبوونەوەکە بەفەرمی ڕگەیەندراو بەڕێز ئیفتخاری سەرۆکی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران بارودۆخی نالەباری کەناسەکانی شارەوانی و بەتایبەت ئازەربایجانی خستەبەرچاو

---

[43] – ڕۆژنامەی گیتی ژمارە ٧٨ ( ١٠ / ١٠ ١٣٢٢ ی . هـ ( ١٩٤٣ ی . ز ) لەلاپەڕەکانی ١ و ٢ کورت کراوەی وتارەکە لەنێو ڕۆژنامەکەدا هاتووەو ئەم نوسراوەیە وەك و ئەو باسکراوە .

و ڕوونیکردەوە کە ماوەی چەند ڕۆژێکە کەناسەکانی تەورێز بەهۆی زەختی لەڕادەبەدەری بژێویی ژیانەوە، بەبێ ئاگاداری ڕێکخراوەکە ناچار بوون مانبگرن و پێشنیاریشی کرد کە لەلایەن کرێکارانی شارەوانیی تارانەوە، بروسکەیەکیان بۆ بنێرن و هیوای سەرکەوتنیان بۆ بخوازن. بەدەنگی هەمووان پەسندکرا. دواتر لەبارەی ڕێگاکانی مانگرتن و ئەوەی کەنەگەر کرێکار بەبێ پلان و ئامادەکاری دەست بداتە مانگرتن، ئەوە تووشی شکست دەبێت و بەشێك لە باسە سەرەکییەکانی لێرەدا هاتووە:

**هەلومەرجی مانگرتن:**

یەکەم ئەوەی مانگرتن نابێت بەهۆی تورەیی کاتییەوە بێت، بەڵکو دەبێت فشاری لەڕادەبەدەر بووبێتە هۆکاری مانگرتنەکە. ئەگەر بێت و مانگرتنەکە لەڕووی تورەیی کاتییەوە ڕووبدات ئەوە لەدوای ئەوەی کەکەسەکان هێور بوونەوە، ملنگرتنەکە لەناو دەچێت. مانگرتن دەبێت بەهۆی بێزاری سەرجەم کرێکارەکان ڕوو بدات و هەستی مانگرەکان هەتا ئەو ڕادەیە بەهێز بکرێت کە دواتر ڕایان نەگۆڕن و لەمانگرتنەکە پاشگەز نەبنەوە. ئەگەر بێتو لەنێوان کرێکارەکاندا ناکۆکی هەبێت یاخۆ هەستی ئەوان ئامادە نەکرابێت، مانگرتنەکە دەبێت هۆی شکستی کرێکارەکان. لەدوای ئامادەکردنی کرێکار لەڕووی دەروونییەوەو لەناوبردنی جیاوازی بیروڕا دەبێت سندوقێك دابمەزرێت لەژێرناوی سەندوقی مانگرتن و ئەو سندوقە دەبێت ماوەیەك پێش مانگرتنەکە دابمەزرێت کە لەماوەی مانگرتنەکەدا بەشێوەی قەرز یارمەتی کرێکارەکان بدات هەتاوەکو

کرێکـار لـەڕووی برسـیەتیەوە ناچـار نـەبێت خـۆی تەسـلیم بکـات و مانگرتنەکە لەناو بچێت. لەدوای ئـەو ئامادەکارییانەشـەوە هێشتا ئـەو مانگرتنە کەمو کووڕی دەبێت، دەبێت لەنێوان کرێکارەکانـدا، شـاندێك پێکبهێــنن بــۆ بــەڕێوەبردنی مانگرتنەکــە هــەتا وەکــو ســوکانی مانگرتنەکە بەدەستەوە بگـرن و هـەروەها ئـەوان پەیوەنـدییان لەگـەڵ خاوەنکارەکانــدا هــەبێت نــەك هــەموو کرێکارەکــان. ئەگــەر شــاندی بەڕێوەبـەر نـەبێت، لەوانەیـە لـەنێوان کرێکارەکانـدا جیـاوازیی بیرورِا هــەبێت و ببێتــە هــۆی لەناوچــوونی مانگرتنەکــە. ئــەرکی شــاندی بەڕێوەبەری مانگرتنەکە یەکەم رێبـەریکردنی مانگرتووەکـان و دواتـر دانوسـتانە لەگـەڵ خاوەنکارەکـان و دەبـێ لەهـەموو کاتەکانـدا خـۆی لەپێـشەوە بێـت و کرێکارەکـانیش لـە بڕیارەکانیـان پـەیڕەوی بکـەن. شاندی بەڕێوەبەر دەبێ داخوازییەکانی کرێکارەکان کە بۆ ئەوە مانیان گرتووە بگەیەنێتە گوێی خاوەنکارەکان و پێیـان ڕابگەیـەنێنن کـە لـەو مـاوە دیـارکراوەدا ئــەو داخوازییانــە جێبــەجێ بکــەن، ئــەگینا لــە مانگرتنەکـە بـەردەوام دەبـن. جـاری واهەیـە کـە پـێش مانگرتنەکـە داواکـاریی کرێکـاران جێبـەجێ دەبێـت و پێویـست بـەمانگرتن ناکـات. ئەگەر ئەو هەلە ڕەخسا، ئیدی کاتی مانگرتنە.

**شێوەی مانگرتن:**

بەوپەڕی هێمنی و ڕێکوپێکیـەوە، هـەموو کرێکارێـك دەبـێ ئاگـای لەو ئامێرە بێت کەکاری پێدەکات لەبەر ئـەوەی تووشـی زیـان نـەبێت. کرێکارەکــان پێویــستە لەچــواردەوری کارگەکــە پاســەوان دابنــێن لەبەرئەوەی نەك لەلایەن خاوەنکارەکانەوەکارگەکە تووشـی زیـان بێـت

و دواتر بەسەر کرێکارەکاندا بشکێتەوە. لەڕاستیدا لەکاتی مانگرتندا، کارگە وەك سەنگەرێکی لێدێت بۆ کرێکار و نابێت هیچ کاتێك ئەو سەنگەرە چۆڵ بکات و لەکارگەکە بچێتە دەرەوە، ئەگەر هاتوو خاوەنکار یان کەسێك لەلایەن ئەوەوە هاتە نێو کارگەکە، کرێکارەکان بۆیان نیە لێی کۆببنەوەو بیکەنە قەرەباڵغی. بەڵکو دەبێ پێیان بڵێن پێویستە لەگەڵ شاندی بەڕێوەبەردا قسە بکەن لەبەرئەوەی بەپێی بڕیارەکان لەگەڵیان ڕێکبکەون. ئەگەر کەسێك بەنیاز بوو لەگەڵ کرێکاردا دانوستان بکات، کرێکارەکە نابێت شوێنی کارەکەی خۆی جێبهێڵێت، بەڵکو ئەو کەسە پێویستە بچێتە شوێنی کارەکەی و لەگەڵیدا کۆببێتەوە. هەرکاتێك کەخاوەنکار لەگەڵ شاندی بەڕێوەبەردا کۆبوونەوەو ڕێککەوتن، شاندی بەڕێوەبەر ڕایدەگەیەنێت و کرێکارەکانیش دەستبەجێ دەست دەکەنەوە بەکارەکانیان.

ئەمە کورتەیەك بوو لە شێوازی مانگرتن. هەڵبەت قسەوباس لەسەر مانگرتن کە کاراترین ئامرازی دەستی کرێکارە بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی لەم کورتە باسەدا جێگای نابێتەوە. بەڵکو کرێکاران دەبێ لەکاتی مانگرتندا ڕێگاکانی بەجوانی بناسن.

**١٩- ( لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێرانەوە بۆ سەرۆك وەزیران ( عەلی سۆهەیلی)، ١٤ی بەفرانباری ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)** [44]

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران، ژمارە ٤٠٩،ڕێکەوتی ١٤ / ١٠ / ١٣٢٢ ی. ﻫ

( ١٩٤٣ ی. ز) جەنابی سەرۆك وەزیران: هەواڵەکانی دوێنێی ڕۆژنامەکان بریتیبوون لەپێکهێنانی شاندێك بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی ژیانی کرێکاران، بەبەشداریی نوێنەری ژووری بازرگانی، سەرۆکی گشتیی کۆمپانیای جگەرە، نوێنەری فەرمانگەی گشتیی ڕاگرتنی نرخەکان. لەبەرئەوەی کە بابەتەکە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەڕێکخراوی کرێکارانەوە هەیە واتە تاوتوێکردنی بارودۆخی ژیانی کرێکارانە لەڕاستیدا هەبوونی نوێنەری ئەوان ( ڕێکخراوی کرێکاران) و نوێنەری وەزارەتی کار، پێویستە و زەرورە کە فەرمان بکەن نوێنەرێکی ڕێکخراوی کرێکاران و نوێنەرێکی وەزارەتی کار لەو شاندەدابن هەتا وەکو دەستکەوتێکی باشتری هەبێت.

سەرۆکی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران، ئیفتخاری

( واژوو) ئیفتخاری ( مۆر) ڕێکخراوی ناوەندیی کرێکارانی ئێران.

---

[44] - ( بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

**٢٠- ( هەواڵی ئاسایش لەمەڕ ڕابردووی چالاکییەکانی ئێستای خەلیل ئینقلاب و یووسف ئیفتخاری»**

١ ی ڕێبەندانی ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز)

وەزارەتی ناوخۆ، ئاسایشی گشتی، ژمارە ٧٣,١٤١٧٥

نهێنی، ڕاستەوخۆ، خێرا

هەواڵ

لەگەڵ ڕێزمدا پێتانی ڕادەگەیەنم. بەپێی ئەو فایلەی کە لامانە، خەلیل ئینقلاب نازەر کوڕی عەلی ئەکبەر خەڵکی تەورێز کە لەساڵی ١٣١٦ی. هـ ( ١٩٣٧ ی. ز) بەگومانی هەبوونی بیرو باوەڕی کۆمۆنیستی و هاوکاری لەگەڵ دکتۆر ئەرانی داوای دەستبەسەر کرانی بۆ کرا و لەدوای لێکۆڵینەوەو بردنی بۆ بەردەمی دادوەری یاسایی بەبێگوناه ناسرا، بەڵام بەهۆی بێڕێزی بەرامبەر بەپیاوی حکومەت لەکاتی کارکردندا بۆ ماوەی یەك ساڵ حوکم درا و لەڕێکەوتی ٢٨ / ٢ / ١٣٢٠ ی. هـ ( ١٩٤١ ی. ز) ئازاد کرا و لەلایەن وەزارەتی دادەوە وەکو لێکۆڵەری خانەی دادی تەورێز دامەزرا و بەهۆی ئەوەی لەدوای ڕووداوی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ ی. هـ ( ١٩٤١ ی. ز) لەتەورێز چەند جار لەگەڵ کارمەندانی ئاسایشی ئەوێ بەشەڕ هاتووەو قسەو قسەلۆکی ناشیرینی پێوتوون، ئاسایش بابەتەکەی بەخانەی داد ڕاگەیاند و ئەوانیش، ناوبراویان لەڕێکەوتی ٢٨ / ٢ / ١٣٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) بۆ ناوەند بانگهێشتکرد و خستیانە ژێر چاودێریی وردەوەو دواتر دیسان لەمانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢١ ی. هـ ( ١٩٤٢ ی. ز) وەکو جێگری داواکاری گشتی تەورێز دەستی کردەوە بەکارکردن و بەپێی ئەو زانیاریانەی

دەستی پۆلیس کەوتوون دەستیکرد بەهاوکاریکردنی ئەو کەسانەی کە پێشینەی کۆمۆنیستییان هەبووەو چەندجاریش دەستبەسەرکراون، زۆربەی کاتەکان لەخانوەکەی خۆیدا کۆبوونەوەی سازکرد و لەوێدا هەندێك قسەو باسیان دەکرد، ئەو مەسەلەیەش لەلایەن ئاسایشەوە ب ەپارێزگار ڕاگەیەندرا و هەروەها ناوبراو بەپێی ڕاسپاردەی کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوی کرێکاران لە تەورێز لە جەنابی پارێزگار داوای مۆڵەتی یاساییکرد و لەلایەن جەنابی پارێزگارەوە بەو مەرجەی کە لەکاروباری سیاسیدا دەستوەردان نەکەن ئەو مۆڵەتەیان پێدراو ناوبراو لەشەقامی پەروەردە چەند شوقەیەکی بەکرێ گرت و ئۆفیسی ڕێکخراوەکەی لەوێ دامەزراند و چەندجار کۆبوونەوەی سازکرد و دواندەری(سخنرانی) دا و ڕاگەیاندن و پەیڕەو پرۆگرامی بلاوکردوەتەوە.

لەڕێکەوتی خەزەڵوەری ساڵی ۱۳۲۱ ی. ھ ( ۱۹٤۲ ی. ز) کاتژمێر ۳ی پاش نیوەڕۆ لە شوێنی ئۆفیسی ڕێکخراوەکە، **ئەبولقاسم جەوان** کە خاوەن کارگەی فەرشچنینە لەگەڵ خەلیل ئینقلاب بەشەڕهاتووەو بەو هۆیەوەقەنەفە و جامەکانی ئۆفیسەکە دەشکێت. ڕووداوەکە لەلایەن ئاسایشەوە بە جەنابی پارێزگار ڕادەگەیەنرێت و بەفەرمانی جەنابی پارێزگار ئەو دوو ناوبراوەش بانگهێشت دەکرێن و لەبنکەی پۆلیس دەست بەسەر دەکرێن و ئۆفیسی ڕێکخراوەکەش دادەخرێت و تابلۆکەیشی دادەگیرێت. هەروەها پۆلیس ڕای وابوو کە دەستبەسەر کردنی خەلیل ئینقلاب لە تەورێزدا باش نیە. ئەگەر ئێوە ڕەزامەندی

بفەرموون با ببینێرین بۆ تاران. ڕووداوەکەمان چەند جار بەئاگاداری وەزارەتی ناوخۆ گەیاند و ڕۆژی ۳۰ / ۸ ۱۳۲۱ ی. هـ ( ۱۹٤۲ ی. ز) بەپێی فەرمانی پارێزگار پۆلیس خەلیل ئینقلابی ڕادەستی خانەی دادی تەورێز کرد و ئەبولقاسم جەوانیش بەدانانی بارمتە ئازادکرا. لەدوای دوو ڕۆژ بەفەرمانی دادوەر ئەبولقاسم دیسان دەستبەسەر دەگرێتەوە و بابەتەکە لێکۆڵینەوەی بۆ دەکرێت، شەوی سێهەمی مانگی سەرماوەز نوسراوەیەك ڕوو بەکرێکاران کە یەکبگرن بەناوی ( **ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی ئازەربایجان**) لەنێو شاردا بڵاوکرایەوە کە بۆ بەیانیەکەی کرێکارانی کارگەکانی نێران، **کەڵکەتەچی، قەزوینی، شقارتە** مانیان گرت و سەرۆکی ئاسایش چوو بۆ کارگەی **کەڵکەتەچی** کە نزیك حەوسەد کرێکاری هەیە و لێیانی پرسی کە هۆکاری مانگرتنەکەیان چیە و کرێکارەکانیش لەوڵامدا ئەم سێ داواکارییەی لای خوارەوەیان خستە بەرچاو.

۱- ئەو کەسەی کە لەگەڵ سەرۆکی ڕێکخراوەکە ( خەلیل ئینقلاب ئازەر) بەشەڕ هاتووە لەگەڵ هاندەرەکەی سزا بدرێن.

۲- ئەو زیانەی کە بەر ئۆفیسی ڕێکخراوەکە کەوتووە لەباری ماددییەوە قەرەبوو بکرێتەوە.

۳- دەبێ ئۆفیسی ڕێکخراوەکە بکرێتەوە و تابلۆکەیشی هەڵبواسرێتەوە.

سەرۆکی ئاسایش لەگەڵ کرێکارانی کارگەکانی دیکەیشدا کە هەر ئەو داواکارییانەیان بوو قسەوباسێکی تێرو تەسەل دەکات و ڕازییان دەکات کە بچنەوە سەر کار و کارەکانیان و ئەوانیش دەستدەکەنەوە

بەکار کردن بەڵام لەدوای کاتژمێرێك دیسان مان دەگرن و داوا دەکەن کە ڕێکخراوی کرێکاران بکرێتەوەو سەرۆکی ڕێکخراوەکە بچێتەوە سەر شوێنی کارەکەی خۆی و شەو سەرجەم کرێکارەکان دەگەڕێنەوە ماڵەکانی خۆیان. ئەو هەواڵە بەپارێزگا و سەرۆکایەتیی سوپاو دادوەر ڕادەگەیەنرێت و پۆلیسیش لە چواردەوری کارگەکان و شوێنە پێویستەکان پاسەوان دادەنێن. ڕۆژی پێنجەمی سەرماوەز کە زۆربەی کرێکاران لەحاڵی مانگرتندابوون، بروسکەگەلێ سەبارەت بەوەی کە لەناوەندەوە نوێنەرانێك بێن و گوێ لە داواکارییەکانی کرێکاران بگرن، دەنێردرێت بۆ تاران و ڕۆژی شەشی سەرماوەز لەلایەن پارێزگارو سەرۆکایەتیی سوپاوە فەرمان دەکرێت بەئاسایش کە بەڕێز خەلیل ئینقلاب دەستبەسەر بکەن و بینێرن بۆ تاران و هەر لەوڕۆژەدا ناکۆکی دەکەوێتە نێوان کرێکارانی کارگەی شقارتە و کارگەی ڕستندا، بەشێکیان ئامادەبوون بۆ کارکردن و بەشێکیشیان دژی ئەو بڕیارە بوون. دواجار لەسەر ئەوە کۆك دەبن کە بچنەوە سەر کارەکانیان بەڵام کرێکارانی کارگەکانی دیکە هەروا لەمانگرتنەکە بەردەوام بوون. بروسکەیەك گەیشتە ئاسایشی تەورێز، بەشێوەیەك کە لەلایەن جەنابی پارێزگار و سەرۆکایەتیی سوپاوە ئەمە کرابوو کە بەشێوەیەکی شیاو خەلیل ئینقلاب بگوێزرێتەوە بۆ تاران و کاری پێویست بکەن بۆ تەواوکردنی مانگرتنی کرێکاران. لەو سەروبەندەدا ئاسایشی تەورێز هەواڵی دا، لەلایەن جەنابی سەرۆك وەزیرانەوە بەخانەی دادی تەورێز فەرمان کراوە کە خەلیل ئینقلاب ڕادەستی وەزارەتی داد بکەن لە ناوەند ئاوبراویش داوای ٥٠٠٠ قەران پارەی

کـردوەو سـەرۆکی خانـەی دادیـش بەبروسـکەیەك ئـەو داواکارییـەی ناوبراوی گەیاندووەتـە ناوەنـد، هـەروەها خـەلیل ئیـنقلاب بـەبیانوی ڕادەسـتکردنەوەی کەلوپەلـەکانی نێـو ئۆفیـسی ڕێکخراوەکـە لەگـەڵ هاوڕێیانی کۆبووەتـەوە و ئـەوەی کـە پێـی پێویـست بـووە پێـی وتـووە، داوایکـردووە هـەتاوەکو دەرگـای ئۆفیـسی ڕێکخراوەکـەی بـۆ بکەنـەوەو بـەپێی فـەرمانی پارێزگـارو بـەئامادەبوونی نوێنـەری وەزارەتـی داد لــەڕۆژی ٩ ی بــەرماوەرزی ســاڵی ١٣٢١ ی. ه ( ١٩٤٢ ی. ز) دەرگــای ڕێکخراوەکـە کرایـەوە و سـەرجەم کەلوپەلـەکان ڕادەسـتی نـاوبراو کرایەوەو وابڕیار بوو دوانیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە کەلوپەلەکان ڕادەستی نوێنەرانی کرێکاران بکاتەوە. ناوبراو بەو شێوەیە دەرگای ڕێکخراوەکە دەکاتـەوەو کرێکـاران بانگهێـشت دەکـات و قـسەیان بـۆ دەکـات لەمـەڕ بــەهێزکردنی ڕێکخراوەکــە و تــابلۆی ڕێکخراوەکــە هەڵدەواســنەوەو کرێکارەکان بەڵێندەدەن کە نەهێڵن ئەو بەرن بۆ تاران و ئەگەر بێت و ئەو تووشی گرفت بێت ئەوە شاری تـەورێز کـاول دەکـەن. بـەو پێیـەی کەکرێکارەکان ئامادە نەبوون بچنەوە سەر کار و کارەکانیان، ڕۆژی ٩ ی سـەرماوەز سـەرۆکی ئاسـایش دەچـێت بـۆ سـەردانی کارگـەی ڕسـتنی کەلکەتەچـی، سـەیر دەکـات خـەلیل ئینقلابـیش لەوێیـە، کاتەکـە بـەگونجاو دەزانێـت و لەگـەڵ نـاوبراودا وتووێـژ دەکـات و ئـەویش بەڵێندەدات کە مانگرتنەکە کۆتایی پێبێنێت. سەرۆکی ئاسایش خەلیل ناچـار دەکـات لەگـەڵ کرێکارەکانـدا قـسە بکـات و بیاننێرێتـەوە سـەر کارەکانیان و ناوبراویش جگە لەو کارگەیە لەگەڵ کرێکارانی ئەو چوار کارگــە مانگرتووەکــەی دیکــەیش قــسە دەکــات و بەقەناعــەتیان

دەگەیەنێت بچنەوە سەرکارەکانیان و لەکارگەی شقارتەیشدا باڵوێزی سۆڤیەت کە بەرێکەوت لەوێ دەبێت لەگەڵ سەرۆکی ئاسایشدا کۆدەبێتەوەو پێی دەڵێت بوونی خەلیل ئینقلاب لە تەورێزدا باش نیە و دەبێت لەماوەی ٤٨ کاتژمێری داهاتودا لە تەورێز نەمێنێت. هەر بۆیەش کاتژمێر ٨ ی شەوی ١٠ ی سەرماوەزی ١٣٢١ ی. ھ (١٩٤٢ ی. ز) بەپێی ئەو فەرمانەی کە پێشتر لەلایەن پارێزگار و سەرۆکی سوپاوە بەئاسایشی تەورێز کرابوو بروسکەی ناوەند خەلیل ئینقلاب ئازەر دەستبەسەر دەکرێت، دەمانچەیەك و برێك پارەو چەند نوسراوەیەکی پێدەبێت کە ئەوانەی لێوەردەگرن و خۆیان ڕادەستی ئاسایش کرد و هەواڵی دەستبەسەر کردنەکەیشی درا بەپارێزگار و سەرۆکی سوپا و بەپێدانی خەرجی سەفەرەکەی لەلایەن سەرۆکی سوپاوە لەگەڵ چەند سەربازێك و پۆلیسێکدا بەرەو ناوەند بەرێدەکەون و فەرمانیان پێدەکرێت کە ناوبراو ڕادەستی وەزارەتی بەرگری بکەن.

ڕۆژی ١٢ ی سەرماوەز لەلایەن وەزارەتی بەرگرییەوە ناوبراو ڕادەستی ئاسایشی گشتی دەکرێت و نامەیەکی لەگەڵدا دەنێرن کە ناوبراو بەپێی فەرمانی سەرۆك وەزیران لەتەورێزەوە نێردراوە بۆ تاران. ئاسایشیش ئەم هەواڵەی لەرێگای تەلەفۆنەوە بەبەڕێز ئەمینی جێگری سەرۆك وەزیران ڕاگەیاندو ئەویش لەوڵامدا وتی لەئێستادا ئازادی بکەن بەڵام بیخەنە ژێر چاودێریی وردەوە، ناوبراو لەرێکەوتی هاتینەوە هەتاوەکو ئێستا لەنێو کرێکارانی کارگەی تەخشائی و کارگەی جگەرەو کارگەکانی دیکە سەرقاڵی بانگەشەی زیانبەخشە و هەروەها مافی دامەزراندنی ڕۆژنامەی گیتی وەرگرتووەو

ڕێکخراوەیەکی پێکهێناوە لەژێرناوی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران و لەڕێگای ئەو ئەو ڕۆژنامەوە کرێکارانی بانگهێشت کردووە بۆ کۆبوونەوەو لەوێدا وتاری خوێندووەتەوە لەمەڕ خەبات دژی سەرمایەداران و خاوەنزەوییەکان و هانیداون بۆ مانگرتن و زۆربەی کاتەکان لەنێو مانگرتن و خۆپێشاندانەکاندا دژ بەبەرپرسانی حکومی قسەی ناشیرینی کردووەو تۆمەتی داوەتە پاڵیان. زۆربەی کاتەکانیش یووسف ئیفتخاری کە ئەوش لەمانگرتنەکانی تەورێزدا دەستی هەبووە بەشداریدەکات و یارمەتیی دەدات.

٢- یووسف ئیفتخاری کوڕی حسێن تەمەن ٤٠ساڵان خەڵکی ئەردەبیل ژمارەی پێناس ١٢١٦٣ ی بەندەر پەهلەوی کە خۆی دەڵێت سەرۆکی ڕێکخراوی کرێکارانە. لەساڵی ١٣٠٨ی. هـ ( ١٩٢٩ ی. ز) بەهۆی بەشداری و هاندان لە مانگرتنی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی ئێران و ئینگلیز دەستبەسەرکراو بۆ ماوەی دە ساڵ حوکم درا و تارێندرا بۆ بەندەر عەباس، لەڕێکەوتی ٥ / ٨ / ١٣٢٠ ی. هـ ( ١٩٤١ ی. ز) ئازادکرا، بەپێی ڕاپۆرتی ژمارە ١٨٦٨ — ٧ / ٧ / ١٣٢٢ ی. هـ ( ١٩٤٣ ی. ز) ئاسایشی تەورێز چووەتە ئەوێ و کرێکارانی تەورێزی چەندجار هانداوە بۆ مانگرتن و بەپێی فەرمانی پارێزگاری تەورێز دەستبەسەرکراوەو پێی ڕاگەیاندراوە کە لەماوەی ٤٨ کاتژمێردا لەوشارە بچێتە دەرەوە. ڕۆژی ٦ / ٧ / ١٣٢٢ ی.هـ ( ١٩٤٣ ز) کرێکاران لەبەردەرگای ئاسایشی تەورێز کۆ دەبنەوە و داوای ئازادکردنی ناوبراو دەکەن و لەبەرئەوەی بەقسەی خۆش ڕازی نابن کە ئەوێ چۆڵ بکەن و پەلاماری پاسەوانەکە دەدەن کە چەکی بکەن، لەڕووی ناچارییەوە چەند فیشەك بەرەو ئاسمان

دەتــەقێنن بــۆ ئــەوەی بلاوەیــان پێبکــەن. لــەو نــاوەدا یــەکێك لــە پۆلیسەکان سـەرەرمێك دەکـات بەقاچـی کرێکارێـك بـەناوی حـسێن دا کەلەڕێگای خەستەخانەدا مـردووە. یووسـف ئیفتخـاری دەگوێزرێتـەوە بۆ ناوەند بۆ لێکۆڵینـەوەی زۆرتـر کـە لەوێـدا نـاوبراو دەڵێـت: بـەهۆی ئەوەی کەبارو دۆخی ژیانی کرێکارانی ئازەربایجان و بەتایبەت تەورێز لــەدۆخێکی زۆرخراپــدا بــوو ئــەوان نەیانــدەتوانی چــیدی درێــژە بــەکارکردن بــدەن لەلایــەن ڕێکخـراوی کرێکارانــەوە لەگــەڵ جــەنابی سـەرۆك وەزیـران گفتوگـۆ کـرا، لەئاکامـدا بـەڕێز دکتـۆر شـێخ لەگـەڵ چـەند کەسـێکی دیکـەوە لەلایـەن وەزارەتـی کـارەوە بـۆ باشـترکردنی دۆخـی ژیـانی کرێکـاران چـوون بـۆ تـەورێز لەگـەڵ خاوەنکارەکانــدا گرێبەستێکیان واژوو کرد کە بەپێی ئـەو گرێبەسـتە دۆخـی ئـابووریی کرێکاران باشتربێت. لەبـەر ئـەوەی لـەکاتی گەڕانـەوەمان لەتـەورێزەوە ئاسایش خـەلیل ئینقلابـی دەستبەسـەر کردبـوو دەیویـست بیهێـنن بـۆ تاران هەمووەمان پێکـەوە هـاتین و هاوسـەفەر بووین. لەبـەر نـەبوونی ئێمــە خاوەنکارەکــان وایانــدەزانی کەخــەلیل ئیــنقلاب هــەڵهاتووە، بەدەســتی عــەلی ئــەمیر خیــزی ســەرۆکی حیزبــی تــوودەی تــەورێز دەیانــەوێت ڕێکخـراوی کرێکـارانی تـەورێز لـەوانیش بـەرگری دەکـەن، لەنێوانیانــدا دەبێــت بەشــەڕو لەئاکامــدا ئەنــدامانی حیزبــی تــوودە دووچاری شکست دێن و هەڵدێن.

لەبەرئەوەی خاوەنکارەکان ئامادەنـەبوون گرێبەسـتەکە جێبـەجێ بکــەن مــن بــۆ خــۆم گەڕامــەوە تــەورێز و داوام لێکــردن پابەنــدبن بەگرێبەسـتەکەوە، جگـە لەکارگـەی چـەرم کارگـەکانی دیکـە ئامـادە

نەبوون ئەوە بکەن و هەر بۆیەش مانگرتنەکان دەستی پێکردو لەو کاتەدا ئاسایش منی بانگهێشتکردو ناردمیان بۆ تاران. بەو شێوەیە کەلەسەرەوە باسمکرد. ناوبراو لە تارانیشدا بە هاوکاریی خەلیل ئینقلاب سەرقاڵی هاندانی کرێکاران بۆ مانگرتن و ئاژاوە گێڕی بوو. ئێستا بەپێشکەشکردنی ٢٢ لاپەڕە لە هەواڵ و زانیارییەکان کە بەدەستمان گەیشتووە ئاگادارتان دەکەینەوە بەپێی نامەی ژمارە ٧٤٠١٩، ١٤٣٨٦ لە رێکەوتی ٢٧ / ١٠ / ١٣٢٢ ی. ﻫ (١٩٤٣ ی. ز) نێردراوبۆ پارێزگای تاران بۆ ئەوەی هەرچۆن نێوە ئەمە دەکەن ئێمە جێبەجێی بکەین.

سەرۆکی فەرمانگەی زانیاری

( واژوو)

**٢١- ( لەلایەن شاندی رێکخراوی کرێکارانی پۆل سفید بۆ سەرۆك وەزیران ( عەلی سۆهەیلی)، ١٣ ی رێبەندانی ١٣٢٢ ی. ﻫ ( ١٩٤٣ ی. ز)** [45]

شاندی پارێزگای رێکخراوی کرێکارانی مازندەران، ژمارە ٨٢، رێکەوتی ١٣ / ١١ / ١٣٢٢ ی. ﻫ

( ١٩٤٣ ی. ز) جەنابی سەرۆك وەزیران. بەداخەوە دەبێت پێتانی رابگەیەنین:

رۆژنامەی گیتی کەرۆژنامەی فەرمیی رێکخراوەکەی ئێمەیە بەهۆکارێکی نادیارەوە داخراوەو بەو شێوەی کە خۆتان ئاگادارن بەتەنها لەو رۆژنامەوە کرێکاران دەتوانن دەنگی ستەملێکراوی خۆیان

---

[45] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ن . ژمارە ١٠٩٠٠٢

و ئـەو کارەسـاتانەی کـە لەلایـەن خاوەنکارەکانـەوە بەسـەریاندا دێـت بیگەیەننە گوێی بەرپرسانی وڵات.

ئێمـە کرێکـارانی مازنـدەران بەتـەواوی هێـزی خۆمانـەوە هـاوار دەکـەین کـە دەوڵـەت بەداخـستنی ڕۆژنامـەی **گیتـی** دەمـی کرێکـارانی بەستووەو نایهەوێت گوێ لەهاواری چینی کرێکارو چەوساوە بگرێـت و داواکارییـەکانیان جێبـەجێ بکـات. ڕێکخـراوی کرێکـارانی پـۆل سـفید نارەزایی خۆی دەردەبرێت بەرامبەر بە داخـستنی نایاسایی ڕۆژنامـەی **گیتـی** و داوا لـە بـەڕێزتان دەکات لەمـەڕ کردنـەوەی ڕۆژنامـەی **گیتـی** یارمەتیمان بدەیت.

شاندی ڕێکخراوی کرێکارانی پۆل سفید. حەکیمی

( واژوو) حەکیمی

جێگری شەعبانی ( واژوو)

**٢٢- ( نامـەی کۆمیتـەی ناوەنـدیی کرێکـارانی ئێـران بـۆ سـەرۆك وەزیران ( موحەممەد ساعید)، ١٦ ی گولانی ١٣٢٣ ی. ھ ( ١٩٤٤ ی. ز)** [46]

ڕێکخراوی ناوەندیی کرێکارانی ئێران، ژمارە ٥٠٦، ڕێکەوتی ١٦ / ٢ / ١٣٢٣ ی. ھ ( ١٩٤٤ ی. ز) جـەنابی سـەرۆك وەزیـران، بـەڕێزەوە ئاگادارتان دەکەینەوە: ماوەی ٧٥ ڕۆژە کەفەرمانگەی قوماش مووچـەی کرێکارەکان کە ڕۆژانە ٥٠ قەران بووە بو ٣٤ قەران کـەمی کردووەتـەوە و کرێکـارانی ئـەو فەرمانگەیـەش بـەهۆی ئـەو سـتەمەی لێیـانکراوە ماوەی چەند ڕۆژێکە مانیانگرتووە. تەنانەت فەرمانۆیش بەنیاز بـوون

---

[46] – بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ن . ژمارە ١١٦٠٠٧٠١٤

هـەموویان بێنـە خزمـەت جـەنابتان. ئێـستا کـە هـاتوون و داوای مافـەکانیان لـە ڕێکخـراوی کرێکـاران دەکـەن، بـەم شـێوەیە ئاگادارتـان دەکەینەوە کە کرێکارەکان ڕۆژانە ۱۲ کاتـژمێر کاریـان کـردووە و ڕۆژی ۱٦ قـەران بـۆ مـاوەی دوو مـانگ و نیـو لـە مووچـەکانیان پێنـەدراوە. داواکارین ئەمە بکەن کە فەرمانگەی قوماش مووچەکانیان پێبدات.

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران. ئیفتیخاری

( واژوو) ئیفتخـاری، ( مـۆر) کۆمیتـەی ناوەنـدیی ڕێکخـراوی کرێکارانی ئێران

**۲۳- ( لەسـەرۆك وەزیرانـەوە بـۆ سـەرۆکی گـشتی دارایـی، ۱۸ ی گولانی ۱۳۲۳ ی. ھ ( ۱۹٤٤ ی. ز)** نۆفیسی سەرۆك وەزیران، ژمـارە ۲۷۸٥، ڕێکـەوتی ۱۸ / ۲ / ۱۳۲۳ ی. ھ ( ۱۹٤٤ ی. ز) بـەڕێز دکتـۆر میلێـسپۆ سەرۆکی گشتی دارایی، کرێکارانی ڕۆژانەی فەرمانگەی قوماش شکاتیان کردووە کە ماوەی ۷٥ ڕۆژە مووچەکەیان لە ٥۰ قەرانـەوە بـۆ ۳٤ قـەران کەمکراوەتـەوەو لـەبری ئـەوەیش ڕۆژ ۱۲ کاتـژمێر کاریـانکردوە و لـەماوەی دوو مـانگ و نیـودا ڕۆژی ۱٦ قـەران لـە مووچـەکەیان بـڕاوە. بەلەبەرچاوگرتنی دۆخی نالەباری کرێکاران کە بەھۆی کەمکردنـەوەی مووچـەکەیانەوە سـەرقاڵی مـانگرتنن پێویـستە ئەمـە بکـەن لەمـەڕ باشترکردنی بژیویی ژیانیان. سەرۆك وەزیران. ( واژوو) ساعید.

**٢٤- ( ڕاگەیانـدراوی هاوبەشـی ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران و ئەنجومەنی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران) [47].**

ئێمـە واژووکـەرانی لای خـوارەوە لەلایـەن کۆمیتـەی ناوەنـدیی ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران و ئەنجومـەنی ناوەنـدیی ڕێکخـراوی کرێکارانی ئێرانەوە بۆ پێکهێنـانی ڕێکخراوێکـی بـەهێزی کرێکـاری بـۆ خەبات دژ بە کۆنەپەرستی و سـەرەڕۆیی لەرێکـەوتی ١١ / ٢ ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز) لەگـــــەڵ ئـــــەو بڕیـــــارە ١٨ خاڵییـــــە کـــــە لەخوارەوەگرنگترینەکانی نوسراوە کۆك بووین.

**کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران**

ئیـبراهیم عـەلی زادە – خـەلیل ئیـنقلاب ( بەرپرسـی بەشـی ڕاگەیاندن) ئەندازیار کەریم مومتەحین – نادر ئەنساری ( کرێکاری کارگـەی چـەك و تەقەمـەنی) – حـەبیب جـەلیل ( کرێکـاری سـایلۆ) ئەسەدوڵلا قودرەتی ( کرێکاری سایلۆ).

**ئەنجومەنی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران**

ئیـبراهیم ئـەحزەری ( سـەرۆکی ئەنجومـەن – کرێکـاری کارگـەی چـیمەنتۆ) – حـسێن جـەهانی ( دارتـاش – وتەبێـژی ئەنجومـەن) – مێهـدی کـەی مـەرام ( پینەچـی – ڕێکخـەری ئەنجومـەن) – ئەسـلان کازمنەژاد (کرێکاری کارگەی چیمەنتۆ) – عەلی موحەمەد ناتـەوانی ( کرێکـاری کارگـەی ناسـن) – عـەلی کێبـاری (ئەنـدامی ڕاوێـژکاری ئەنجومەن) – زیا ئەلەمـەتی ( ئەنـدامی ڕاوێـژکاری ئەنجومـەن) خاڵـە گرنگـەکانی ڕێککـەوتنی دوو ڕێکخراوەکـە کـە بـەهۆی مـانگی مـەی

---

[47] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ك . ئەلبۆمی ٢٦٣ فایلی ٦٣٠٣

جـەژنی گـشتیی کرێکـارانی جیهـان. بـۆ یـەکڕیزیی چـینی کرێکـار و وەرزێری ئێران کۆك بووین لەسەر ئـەم ڕێککەوتنـە و دەسـتبەجێ لـە دوای واژووکردنی شاندی یەکگرتوو، جێبەجێ دەکرێت.

١- لایەنـەکان کـۆکن لـە شـاندی ناوەنـدیی ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران. ( واتـا سـەرجەم ئەنـدامانی ڕازیـن لەگـەڵ ئـەو پرۆژەیـەدا) بەشـێوەی هاوبـەش و ژمـارەی یەکـسان لـە کرێکـارانی ئەنجومـەنی ناوەنـدیی ڕێکخـراوی کرێکـاران شـاندێکی هاوبەشـی ڕەسمـی ڕێکخـراوە نوێکە هەڵدەبژێرین.

٢- ڕاگەیاندنەکە لەمەڕ یەکڕیزیی کرێکاران لەپێشدا لەلایـەن دوو شـاندەکەوەو دواتـر لەلایـەن شـاندی یـەکگرتووەوە چـاپ و بـڵاو دەبێتەوە.

خاڵی شەشەم دەڵێت:

٦- ڕێکخراوی نوێی کرێکاران سەربەخۆ دەبێت.

٨ – مۆری تایبـەت بـۆ ڕێکخـراوە تازەکـە بـەڕای زۆرینـەی شـاندە هاوبەشەکە دروستدەکرێت.

٩- شـاندەکانی ئەنجومـەنی ناوەنـدیی کرێکـاران و ڕێکخـراوی ناوەنـدیی کرێکـارانی ئێـران دەسـبەجێ لـەدوای پێکهـاتنی شـاندی هاوبەش هەڵدەوەشێتەوە.

١٤- بە شاندە هاوبەشـەکە کەسـێکی دیکـە کـە لایـەنگری کرێکـاران بێت وەك حەکەمی یان خەلیل مەلەکی زیاد دەکرێت.

١٦- لەلایـەن شـاندی هاوبەشـەوە لیژنەیـەك دیـاری دەکـرێ ـ بـۆ ئامادەکردنی پەیڕەوی پرۆگرامی نێو ڕێکخراوەکە.

**٢٥- ( لەلایـەن ڕێکخـراوی ناوەنـدیی کرێکـارانی ئێرانـەوە بـۆ پەرلەمان، ٢٧ ی جۆزەردانی ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ی. ز ) [48]**

بەڕێز سەرۆکی پەرلـەمان. نێـردراو بـۆ سـەرۆك وەزیـران، بـەڕێز دکتۆر شەفەق، وەزیری ناوخۆ، سەرۆکایەتیی ئاسایشی گشتی.

ماوەیەکە لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتەوە کێشە ساز دەکرێت بۆ ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران. ئێمـە ئـەو گێرەوکێـشەیەمان هـەتاوەکو فەرمانۆ لەبۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت تەحەمول کـردووە. بـۆ نموونـە مـاوەی شـەش مانگـە بەبیانووگـەلێکی جۆراوجـۆر بـەڕێز یووسف ئیفتخارییان لەتەورێز تاراندووە. لـە ماوەیـەك پـێش ئێـستاوە دەسـتیانکردوە بـەئازارو ئەشـکەنجەی فـەرهاد فەلاحـەتی ئەنـدامی ڕێکخـراوی ئابـادان، بـەهۆی قەدەغـەکردنی هاموشـۆ لـەئابادان، ناوبراویان دەستبەسەر کردوەو ناردویانە بۆ گرتوخانەی ئەهواز، لەوێ نـەخۆش کـەتووەو ئێمـەیش لـەڕووی ناچـارییەوە پێمـانوتووە نەگەڕێتـەوە ئابـادان تـا دۆخەکـە هێـور دەبێتـەوە. بـەڵام بەداخـەوە ئاسـایش بەرەچـاونەکردنی بـارودۆخی جەسـتەیی و دۆخـی ژیـانی بنەماڵەکـەی سـەر لـەنوێ نـاوبراوی دەستبەسـەر کردوەتـەوە، هـەر ئـەوەیش بوەتـە هۆکـار بـۆ ئـەوەی ئێمـە نـاڕازی بـین ئـەو کـارە نایاساییانەی پیاوانی دەوڵەت، بەئێوە ڕابگەیەنن کـەخۆتان بەخزمـەت کارو پشتیوانی خەڵك دەزانن و داواکارین کەئێوەی نوێنەر کە دەوڵـەت ڕابسپێرن واز لـەم ئـاژاوەگێری و ئـازارو ئەشـکەنجەی خـەڵکی هـەژارو

---

[48] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) . زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

نـەدار بهێـنن کـە هەسـتی خـەڵکانی زەحمـەتکێش و کرێکـار برینـدار دەکات و هانیان دەدات ڕێگاچارەی مەترسیدار هەڵبژێرن. ئەگـەر بێـتو ئێوە ڕێگا چارەیەك نەدۆزنەوە، ڕێکخراوی کرێکاران ناچار دەبێت ئـەم کارە نایاسایانەی پیاوانی حکومەت ڕاستەوخۆ بگەیەنێتە گوێی خـەڵك و داوا لەخەڵك دەکات ڕێگاچارەیەك بدۆزنەوە بۆ ئەم بابەتە.

بەرپرسی ڕاگەیاندنی ڕێکخراو. ئیفتیخاری ( واژوو)

سەرۆکی شاندی ناوەنـدیی ڕێکخـراوی کرێکـارانی ئێـران. پـەروین (واژوو)

( مۆر) ڕێکخراوی ناوەندیی کرێکارانی ئێران

**٢٦- ( هـەواڵی پـۆلیس لەچـالاکیەکانی حـسێن ئێتکـای و ڕەحـیم ئیفتیخاری لەئازەربایجان، ٢١ ی گەلاوێژی ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز)** [49]

وەزارەتی نـاوخۆ ویـڕای ڕێـز هـەواڵی ژمـارە ١٣٢٣ / ٤١٨ — ٨ / ٥ / ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز) ئاسایشی تـەورێز سـەبارەت بەحـسێن ئێتکـا و ڕەحـیم ئیفتیخـاری کەبـەنیاز بـوون لقـی ڕێکخـراوی کرێکـاران لـە ئەردەبیل بکەنەوەو باڵوێزی سۆڤیەت بانگەشەی ئەوانی بەهۆی بڕێـك درۆو دەلەسە کـە دەبێتـە هـۆی تێکـدانی ڕای گـشتی و گـرژی و ئـاڵۆزی دژی سیاسەت دەزانێت بۆ زانیاریی زۆرتر بۆ جەنابتان دەنێرین.

جێگری ئاسایشی گشتی — سەیف

---

[49] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ك . بەلبومی ١٣٠ فیلی ٢٥٤٣

## ئاسایشی گشتی

ئاسایشی ئـەردەبیل ئاگاداری کردوینەتـەوە کەلەلایـەن پارێزگـای ئەردەبیلەوە بەپێی داواکاریی سۆڤیەت دووکـەس بـە ناوەکـانی حـسێن ئێتکـا و رەحـیم ئیفتخـاری لەتارانـەوە هاتوونەتـە ئـەردەبیل و بەبلاوکردنـەوەی درۆو دەلەسـە دژ بەدەوڵـەت مێـشکی خـەڵك تێـك دەدەن – هەربۆیـەش ناوبراوانمـان بانگهێـشت کـرد و لێپرسینەوەمان لەگەڵیاندا کرد و لەولامدا پێیان وتـین بـەپێی نوسـراوەی ژمـارە ١٠٤ ی ئەنجومـەنی رێکخـراوە کرێکارییـەکان هـاتوون بـۆ دامەزرانـدنی رێکخـراوی کرێکـارانی ئـەردەبیل و لەمـەڕ درۆو دەلەسـەیش رەتیـانکردەوەو وتیـان بـەهۆی ئـەوەی کـە حیزبـی تـوودە لـەوێ دژایـەتیکردون لـەپێکهێنانی رێکخراوەکـە پاشـگەز بوونەتـەوەو لەئەردەبیل رۆشتوون – ئەو دوو نـاوبراوە لـە تاوانبـارە سیاسـییەکانی پێشووی ئاستاران کە لەدوای پشێوییەکانی خـەرمانانی سـاڵی ١٣٢٠ی. هـ ( ١٩٤١ ی. ز) چوونەتە تاران و ڕابردوویان سڕاوەتەوە.

ئەم نوسراوەیە دەقی نوسراوە ڕەسەنەکەیە.

**٢٧- ( هەواڵی ئاسایش بۆ سەرۆك وەزیران ( موحەممەد ساعید). لە وتارەکەی یووسف ئیفتخاری، ١٨ ی گەلاوێژی ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز)** [50]

وەزارەتی ناوخۆ، ئاسایشی گشتی، ژمارە ١٨، ٥ / ٦٢٧٥، رێکـەوتی ١٨ / ٥ / ١٣٢٣ ی. هـ

( ١٩٤٤ ی. ز)

نهێنی

[50] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

جەنابی سەرۆك وەزیران وێڕای ڕێز پێتانی ڕادەگەیەنین. بەپێی ئەو هەواڵەی بەدەستمان گەیشتووە کاتژمێر ٦ ی ئێوارەی ١٤ / ٥ / ١٣٢٣ ی. ه ( ١٩٤٤ ی. ز) لە کۆبوونەوەی شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوی کرێکارانی ناوەندا یووسف ئیفتخاری لەمەڕ زیادکردنی مووچەی کرێکارانی فەرمانگەی قوماش و ئەوەی کە نوسراوەی فەرمی کە لەلایەن ڕێکخراوەکەوە بۆ جەنابتان و پەرلەمان و پارێزگار نێردراوەو بەلام هیچ وەڵامێکیان وەرنەگرتوەتەوە قسەی کردوەو هەروەها وتوشیەتی دیسان ئەو داواکارییە دووپات دەکاتەوەو ئەگەر بێتو لەماوەی ٤٨ ی کاتژمێردا وڵامیان نەدرێتەوە ئەوە لەسەرجەم شارەکاندا مانگرتنی گشتی ڕادەگەیەنن هەتاوەکو لەو ڕێگەیەوە داوای مافەکانیان بکەن و لەو بارەیشەوە بۆ سەرجەم لقەکانی ئەو ڕێکخراوەیە لەشارەکانی دیکەدا ئەمە نێردراوەو پێیان ڕاگەیاندون هەرکە لە ناوەندەوە بروسکەتان پێکەیشت دەست لەکار هەڵبگرن و مانبگرن.

جێگری سەرۆکی ئاسایشی گشتی – سەیف

**٢٨- ( لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ سەرۆك وەزیران ( محەمەد ساعێد)، ٢٩ ی خەرمانانی ١٣٢٣ ی. ه**

( ١٩٤٤ ی. ز) وەزارەتی ناوخۆ، فەرمانگەی پارێزگاریی سەربازی، ژمارە ٣٤٨٢، ڕێکەوتی ٢٩ / ٦ / ١٣٢٣ ی. ه ( ١٩٤٤ ی. ز) جەنابی بەڕێز سەرۆك وەزیران وێڕای ڕێز بەپێی نامەی ژمارە ( ١٠٤٥ ڕێکەوتی ٢٨ / ٥ / ١٣٢٣) ئاگادارتان دەکەینەوە کە یووسف ئیفتخاری لە پارێزگاری سەربازیی تاران ئامادە بوو ڕەتیکردەوە کە کرێکارانی هان دابێت بۆ مانگرتنی گشتی و بەڵێنیشی دا کەچی دیکە دژ بە ئاسایش و ئۆقرەیی

وڵات دوانـــدەری نـــەدات. هـــەروەها کۆپییـــەك لـــە بەڵێننامەکـــەی ناوبراومـان لەگـەڵ ئـەم هەواڵـەدا بـۆ جـەنابتان نـاردووە. پارێزگـاری سەربازیی تاران – حیجازی

**سەرۆکاتی پارێزگاری سەربازیی تاران**

ئـەوەی کـە باسـکراوە کەگوایـە مـن وتبێـتم ئەگـەر بێتـو وڵامـی داواکارییـەکانی کرێکـارانی فەرمانگـەی قومـاش نەدرێتـەوە مـانگرتنی گـشتی لەوڵاتـدا سـاز دەبێـت، دوورە لەڕاسـتیەوە و مـن وەکـو خـۆم ڕەتیدەکەمەوە. لەمەڕ کرێکارانی فەرمانگەی قوماش نوسـراوە هەیـە کە لە بەڵگەنامەکانی پارێزگادا ماوەتەوە.

**ئیفتخاری**

لـەبارەی پـشێوی و ئـاژاوە لـەنێو شـاردا مـن لەلایـەن ڕێکخـراوی ناوەندەوە بەڵێنـدەدەم کـە ئـەم ڕێکخراوەیـە هـەموو کاتێـك لایـەنگری نارامی و ئۆقرەیی بووەو بـەهیچ شـێوازێك پـشێوی و ئـاژاوە لەنێمـەوە ڕوونادات.

( مۆری ڕێکخراوەکە و واژووی ئیفتخاری)

**٢٩- ( لەکۆمیتـەی ناوەنـدی ڕێکخـراوی کرێکـاران و وەرزێرانـی ئێرانەوە بۆ وەزیـری نـاوخۆ لەرێکـەوتی ١٨ ی خـەرمانانی ١٣٢٣ ی. ھ (١٩٤٤ ی. ز)**

ڕێکخراوی ناوەندیی کرێکارانی ئێران ژمـارە ٧٨٢ لەرێکـەوتی ١٨ / ٦ / ١٣٢٣ ی. ھ ( ١٩٤٤ ی. ز) ڕێـــزدار وەزیـــری نـــاوخۆ، نێـــردراو بـــۆ پەرلەمان، جەنابی سەرۆك وەزیران، بەڕێز سەرتیپ زادە [51]،

---

[51] عـەلی ئەسـغەر سـەرتیپ زادەنوێنـەر یخولـەکانی ١٤ ، ١٦ ، ٢٠ ی پەرلـەمان

بەڕێز دکتۆر شەفەق [52]، دوابەدوای نامەی ژمارە ٧٧٦ — ١٢ / ٦ / ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز) ئاگادارتان دەکەینەوە: کازم نیکوفەر و حسێن عەلی خورشیدی لەلایەن پارێزگاری تەورێزەوە بەنایاسایی و بەبێ گوناح بەهۆی هاندانی حیزبی توودەوە لە تەورێز تارێندراون و بنەماڵەکانیشیان ئاوارە بوون. ئەم کارە نایاسایەی جەنابی پارێزگار، دژی بەرژەوەندیەکانی وڵاتە و دەبێتە هۆی هاندانی کرێکاران. داواکارین فەرمان بکەن، ئەو ئابراوانەی لای سەرەوە بگەڕێندرێنەوە بۆ تەورێز.

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران، ئیفتخاری ( مۆرو واژوو)

**٣٠- ( لە کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێرانەوە بۆ ئاسایشی گشتی، ٢ ی ڕەزبەری ١٣٢٣ ی. هـ (١٩٤٤ ی. ز)** [53]

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران، ژمارە ٧٨٩، لەگەڵ دەقی بروسکەکە، ڕێکەوتی

٦ / ٧ / ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز)

ڕێزدار سەرۆکی ئاسایشی گشتی. نێردراو بۆ جەنابی سەرۆک وەزیران، وەزارەتی ناوخۆ، پەرلەمان، بروسکەی ژمارە ٣٦٨٨١ لەتەورێزەوە باس لەوە دەکات کەکۆلۆنێل ( سەرهەنگ) مووەسەقی

---

لەتەورێزەوە .

[52] – دکتۆر سادیق ڕەزا زادە شەفەق نوێنەری خولەکانی ١٤ و ١٥ ی پەرلەمان لەتارانەوە .

[53] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ — ١١٦٠٠٧

لەگەڵ کەسێك بەناوی دێهناد ٣٤ کاتژمێر لەدوای هەڵبژاردنی ڕێکخاروی کرێکارانی ئێرانبەهێزی سەرەرم و چەکدار هێرش دەکەن سەر ڕێکخراوەکە و کرێکاران لەوێ دەر دەکەن و کەسێك بەناوی بێ ڕیا کە ئەندامی حیزبی توودەیە لەوێ دادەنێن و ڕێکخراوەکە تەسلیمی ئەو دەکەن.ئەم کردەوەیە، بوەتە هۆی ڕق و بێزاریی کرێکارانی تەورێز و لەوانەیە ئاژاوەیەك لەو شارەدا ڕووبدات.

هەربۆیە ڕێکخراوی کرێکاران داواکارە بەزووترین کات ئەو کەسانە دەستبەسەر بکات و فەرمان بکەن بەوەی کە ڕێکخراوەکە رادەستی کرێکاران بکرێتەوە.

لەکۆتاییدا ئەگەر بێتو ئەو مەسەلەیە چارەسەر نەکەن، ڕێکخراوی کرێکاران ناچار زنجیرە خۆپیشاندانێك لە تێکڕای شارەکانی ئێراندا سازبکات و ئەو کەسانەی کە لەو کارەدا دەستیان هەبووە لەلای تەوای خەڵکی ئێران شەرمەزار بکات.

کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران – ئیفتخاری

**٣١- ( لەڕێکخراوی ناوەندیی کرێکارانی ئێرانەوە بۆ سەرۆك وەزیران ( مورتەزا قولی بەیات)، ١٨ ی سەرماوەزی ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٤ ی. ز)**[54]

ڕێکخراوی ناوەندی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران، ژمارە ٨٢٨، ڕێکەوتی ١٨ / ٩ / ١٣٢٣ ی. هـ

( ١٩٤٤ ی. ز) جەنابی بەڕێز سەرۆك وەزیران. داواکارین لە جەنابتان لەکاتێکی گونجاودا کە ڕێگە نەبێت لەبەردەم

---

[54] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) زنجیرەی ن . ژمارە ٢ و ١٠٩٠٠٢

کاروکارەکانتانــدا، نوێنــەری ڕێکخــراوی کرێکــارانی ئێــران ( یووســف ئیفتخاری) بانگهێشت بکەن کە لەگەڵ جەنابتانــدا سەبارەت بـەبڕێك پێشهاتی سیاسی و بارودۆخی کرێکارەکانی کارگەکاندا قسە و باسێکتان بۆ بکات. لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیی ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران.

( واژوو) ئیفتخاری، ( مۆر) ڕێکخراوی ناوەندی کرێکارانی ئێران

( لـەلای خـوارەوە نوسـراوە) وڵام بدرێتـەوە کـە ڕۆژی دووشـەممە سەعات یازدەی پێش نیوەڕۆ بێت بۆ گفتوگۆ.

بەڕێز ئیفتیخاری هات بۆ چاوپێکەوتنەکە. ئەرشیف بکرێت.

**٣٢- ( لە وەزارەتی دارایی و پیشەسازی ( ئەبۆلقاسم نـەجم) ە وە بۆ سەرۆك وەزیران، ١ی ڕەزبەری ١٣٢٣ ی. هـ ( ١٩٤٥ ی. ز)** [55]

وەزارەتی دارایی و پیـشەسازی، ژمـارە ١٧٢ / ١١٧٦٤، ڕێکـەوتی ١ / ٧ / ١٣٢٤ ی. هـ ( ١٩٤٥ ی. ز)

جەنابی بەڕێز سەرۆك وەزیران:

لە وڵامی نوسراوی ژمـارە ١٠٢٨٨ لەڕێکـەوتی ٣٠ / ٥ / ١٣٢٤ ی. هـ ( ١٩٤٥ ی. ز) شـاندی نوێنەرایـەتی ئێـران لەبیـست و حەوتـەمین خـولی کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی کاردا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت.

١- نوێنــەرانی دەوڵـەت: ئـەغای ئەبولحەسـەن حـەکیمی – بـەڕێز نەفیسی بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی کار

ڕاوێژکاران: بەڕێز جەمال زادە – بەڕێز دکتۆر ڕەزەوی

سکرتێر: بەڕێز عزیز فیرووز

---

[55] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) ، زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

نوێنەری ڕۆژنامەوانان: بەڕێز حسێن فاتمی

٢- نوێنەری خاوەنکار: بەڕێز ئەندازیار مەسعوود غەیوور

ڕاوێژکارەکان

١- بەڕێز ئێعزاز نیک پەی

٢- بەڕێز شەهاب خوسرەوانی

٣- بەڕێز محەمەد جەعفەر کازرونی

٤- بەڕێز موحەمەد عەلی کازرونی

٥- بەڕێز سەفا ئیمامی

٦- بەڕێز مەحموود دهدەشتی

٧- بەڕێز حسێن قولی دەهێش

٨- بەڕێز سێراج ئیمامی

٣- نوێنەرانی کرێکاران بەڕێزان: شەمس سەدری –عەتیقەچی – محەمەد – حسێن تاجبەخش

ڕاوێژکاران: بەڕێزان یووسف ئیفتخاری –ئەمیر کەیوان –مەهدی دەوڵەتئابادی.

وەزیری دارایی و پیشەسازی

( لای خوارەوەی نامەکە): لەلای کۆمپانیای بیمەوە، بەڕێز دکتۆر ڕەزەوی و ماجێدی وەك نوێنەر نێردراون.

٣٣- ( لەئاسایشی گشتیەوە بۆ سەرۆك وەزیران ( ئەحمەد قەوام)، ٢١ ی ڕەشەمێ ١٣٢٤ ی. ﻫ ( ١٩٤٥ ی. ز)

وەزارەتی ناوخۆ، ئاسایشی گشتی فەرمانگەی پۆلیس، ژمارە ٨٦٥٧ ڕێکەوتی ٢١ / ١٢ / ١٣٢٤ ی. ﻫ ( ١٩٤٥ ی. ز)

**جەنابی سەرۆك وەزیران. لەگەڵ ڕێزماندا، هەواڵی ژمارە ٥٧٩ ی بنکەی پۆلیسی ٣ مان بۆ ناردوون کە ئەمە دەقەکەیەتی:**

کاتژمێر ٥ی نیوی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠ی ئەم مانگە پۆلیسێکمان بەناوی فەرماندەی بنکە ئاگادار کردووەتەوە: (( چەند کەس لە ئەندامانی ڕێکخراوی کرێکارانی حیزبی توودە کەسێك بەناوی یووسف ئیفتخارییان لە شەقامی لالەزار، قەیسەریی بەهرامی، ڕێکخراوێکی هەیە لەژێر ناوی ڕێکخراوی وەرزێران، لەگەڵ دووکەس لە هاوڕێیانی بردووە بۆ ڕێکخراوی کرێکاران لە شەقامی فیردەوسی و هەروەها سەرجەم کەلوپەلەکانی ئەو ڕێکخراوەشیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە. لەدوای ئەو هەواڵە، کاتژمێر ٨ ی شەو چاومان کەوت بە بەڕێز محەمەد یەزدی لە ڕێکخراوی کرێکاران و لەو بارەیەوەلەگەڵیدا گفتوگۆمان کرد،

ئەو پێیوتین: هەتا دە خولەکی دیکە وڵامتان پێدەدەمەوە. کاتژمێر ٨ و ٢٠ خولەکی شەو بەڕێز ڕەزا ڕوستا بەرپرسی ڕۆژنامەی زەفەر لەڕێگای تەلەفۆنەوە ئێشکگری بنکەی پۆلیسی ( شەفیعی) ئاگادار کردەوە کە وەها کەسانێکیان بۆ ئێرە نەهێناوەو لێرە نین.

**سەرۆکی ئاسایشی گشتی – زەڕابی ( واژوو)**

**٣٤- ( لەڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێرانی ئێرانەوە بۆ بەرپرسان و ڕاگەیاندنەکانی وڵات، ٢١ ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ی. هـ ( ١٩٤٥ ی. ز)**

بۆ خزمەتی جەنابی شا، نێردراو بۆ جەنابی سەرۆك وەزیران، پارێزگاری سەربازی، ئاسایشی گشتی، ڕۆژنامەکانی خاوەر، باختەر.

ڕۆژی دوو شەممە کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ نزیك دووسەد

کەس لەئەندامانی حیزبی توودە و ئەنجومەنی یەکگرتووی سەر بەو حیزبە بەدارو بەرد و چەقۆ و بەهۆی نەبوونی پۆلیسەوە هەڵیانکوتایە سەر ڕێکخراوی کرێکاران و وەرزێران لە شەقامی لالەزار و یووسف ئیفتخاری سەرۆکی ڕێکخراوەکە و پێنج شەش کەس لەکرێکارەکانیان بریندارکردووە و لەگەڵ خۆیان بردوویانن بۆ شوێنێکی نادیار و تەواوی کەلوپەلەکانی نێو ڕێکخراوەکەیان بەتاڵانبردوەو بەو هۆیەی کە هەتاوەکو ئەم کاتە هەواڵی ئەو بریندارو ڕفێندراوانە نازانین لەوانەیە گیانیان لەمەترسیدابێت، هەربۆیە بەباشمان زانی کە لەم ڕێگایەوە ڕووداوەکەتان پێ ڕابگەیەنین بۆ ئەوەی بەزووترین کات بۆ ڕزگارکردنی ڕفێندراوەکان و گەڕانەوەی کەلوپەلەکانی ڕێکخراوەکە و گرتن و سزادانی ئەو کەسانەی کە دەستیان هەبووە لەو دەستدرێژییەدا فەرمانی پێویست بدەن. لەکۆتاییدا دەڵێم ئەگەر مانای ئازادی ئەمەیە، قوڕ بەسەر ئازادی.

بەهۆی بەتاڵانبردنی ڕفێنەرانی ئازادیخواز !؟ کە پەڕاوی ڕەسمی و مۆرەکەی ڕێکخراوەکەیان بردووە لەم پەڕاوە ئاساییەدا دا ئەم هەواڵەمان نوسیوە.

سەرقەڵەمی ڕێکخراوە، عەمید. ٢١ / ١٢ / ١٣٢٤ ی. ھ ( ١٩٤٥ ی. ز)

**٣٥- ( لە یووسف ئیفتخارییەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ٢٤ ی خاکەلێوەی ١٣٢٥ ی. ھ ( ١٩٤٦ی. ز)** جەنابی سەرۆك وەزیران. لەدرێژەی ڕاگەیاندن و داواکارییەکانی پێشوو لەمەڕ هێرشی دووسەد کەس لە ئەندامانی حیزبی توودەو ئەنجومەنی یەکگرتوو بۆ سەر ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران، لەڕۆژی ڕووندا بەدارو بەرد و چەقۆ و

بریندار کردنی پێنج کەس لەئەندامان و دەستبەسەرکردنیان بۆ ماوەی دوو شەو و ڕۆژ لە یانەی ئەنجومەنی یەکگرتوو و بەتالآنبردنی کەلوپەلەکانی ئەو ڕێکخراوەیە کە پێشتر ئاگادارمان کردوونەتەوە بەهۆی ئەوەی کە هەتا ئەم کاتە لەلایەن کاربەدەستان و ئاسایشی گشتی و وەزارەتی دادو بەرپرسانی دیکەی ئەمنی بۆ دەستبەسەر کردنی تاوانباران و گەڕاندنەوەی کەلوپەلەکانی ڕێکخراوەکە هیچ هەنگاوێك هەڵنەگیراوە، بوومتە هۆی ئەوەی کە بەنەرخەیانی بێن و بەزەبری هێز ئۆفیسی ڕێکخراوەکە داگیر بکەن، لەم ڕێگەیەوە ڕووداوەکەمان پێڕاگەیاندن و داواکارین کە فەرمان بفەرموون بۆ دەستبەسەرکردن و سزادانی ئەو کەسانەی کە لەم ڕووداوەدا دەستیان هەبووە.

یووسف ئیفخاری

٣٦- ( لەباڵوێزی بەریتانیاوە بۆ وەزاراتی دەرەوەی بەریتانیا، ١٩ ی گەلاوێژی ١٣٢٥ ی. ھ ( ١٩٤٦ ی. ز ) [56]

ڕیدەر بۆلارد

ژمارە ٨٢٩، ١٠ ی نوتی ١٩٤٦ ی. ز ( ١٩ ی گەلاوێژی ١٣٢٥ ی. ھ)

لەکاتی سەفەری شاندی ڕێکخراوە کرێکارییەکانی سۆڤیەت بۆ ئێران گفتوگۆگەلێکی زۆر کرا لەمەڕ ئامادەبوونی نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی حیزبی توودە لەکۆبوونەوەی نێونەتەوەیی داهاتوو لە پاریس ئەمەش ڕێکخراوەکانی دیکەی خستە جموجۆڵ:

---

[56] – لەبۆلاردەوە بۆ لەندەن f.o. ٣١٧ / ٤٥٤٣٢ بەوتەی شاکیری ، باروودۆخی چینی کرێکار لەئێران . p. ٢٣٧

١- یووسف ئیفتخاری کە دەڵێن نوێنەری کۆنترین ڕێکخراوی کرێکاریی ئێرانە ( کرێکاران و وەرزێران) ە، بروسکەیەکی ناردووە بۆ سکرتێری گشتیی کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی لە پاریس و داوای کردووە کە نوێنەرێکیش لەلایەن ڕێکخراوەکەی ئەوانەوە بانگهێشت بکرێت.

٢- ئاگادار کراوینەتەوە کە ڕێکخراوی کرێکاری دژی حیزبی توودە لە ئێسفەهان کە زۆربەی کرێکارەکانی کارگەکانی ئێسفەهان لایەنگری ئەون بەنیازن بەناردنی بروسکەیەك بۆ پاریس داواکاریی ئەوە بکەن کە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدارییان هەبێت.

٣- یووسف ئیفتخاری کەسایەتیەکی کۆمۆنیستە کە لەسەردەمی ڕەزا شا دا بەهۆی بیرو باوەڕی سیاسییەوە ساڵانێکی دوورودرێژ لە بەندیخانەدا بووە. ئەو زۆر بەتوندی دژی حیزبی توودەیە و لەسەر داواکاریی سۆڤیەتییەکان لەتەوریز دەرکراوە. بەڵام لەبەرچاو گرتنی بەڵگەنامەگەلێك کە ئێستا لەبەردەستماندایە لەنێوان ئەو و ڕێبەرانی حیزبی توودەدا جگە لەپلەو پایە هیچ گرفتێکی دیکە نیە.

٤- لەچالاکییەکانی شاندی ڕێکخراوە کرێکارییەکانی سۆڤیەت هیچ ئاگاداریەکمان نیە، بەڵام وادیارە گەڕاونەتەوە بۆ سۆڤیەت. ئەگەر بێتو ئەوان پێش ئەوەی ئێسفەهان کە گەورەترین ناوەندی پیشەسازی ئێرانە گەڕابێتن، چووبێتنەوە ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی لاوازبوونی حیزبی توودە لەکۆبوونەوەکەی پاریس. هەڵبەت ئەوان دەتوانن بڵێن کە حیزبی توودە لە ئێسفەهان بەهۆی بوونی دەوڵەتێکی دیکتاتۆر کەوتوونەتە بەر ئازارو ئەشکەنجەوە بەڵام نابێت چاوەڕوانی ئەوەبن

که جیهان بڕوایان پێبکات که ئەو هەموو چالاکییەی ڕێکخراوەکانی کرێکاری لە ناوچەکە کە پڕە لە هێزی سەربازیی سۆڤیەت بەبێ پشتیوانیی ئەو وڵاتە بوو بێت.

**وەزارەتی دەرەوە داواکارم کە وەکو بروسکەی ژمارە ٢١٠ ی من، بنێردرێت بۆ هیند.**

**( کۆپییەکی بنێردرێت بۆ وەزارەتی کاروباری هیندستان).**

**٣٧- ( لە نوێنەری بەرتانیا لەئەهواز بۆ باڵوێزی بەریتانیا لەتاران، ٧ ی ڕێبەندانی ١٣٢٥ ی. هـ ( ١٩٤٧ ی. ز )**[57]

نوێنەرایەتیی بەریتانیا، خۆرەم شەهر، نهێنی، ژمارە ١٤ / ت، ٢٧ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٧ ی. ز ( ٧ی ڕێبەندانی ١٣٢٥ ی. هـ)

١- وێڕای ڕێزم بەلەبەرچاو گرتنی بەشی دووهەمی بروسکەی ژمارە ١٤ ی ڕێکەوتی ٢٢ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٧ ی. ز ( ٢ ی ڕێبەندانی ١٣٢٥ ی. هـ) خۆم و بەناردنی دەقی خودی ڕاگەیاندنێك کەلەلایەن (ڕێکخراوی کرێکارانی نەوت) ەوە بلاو راوەتەوە لەگەڵ وەرگێڕدراوەکەی بەزمانی ئینگلیزی بەجەنابتان ڕادەگەیەنم.

٢- یەکەم کەسێك کە ئەو ڕاگەیاندراوەی واژوو کرد یووسف ئیفتخاری ڕێبەری مانگرتنی ١٩٢٩ ی. ز (١٣٠٨ ی. هـ) ئاباداﻥ بوو کە خۆی کرێکاری کۆمپانیای ( نەوتی ئینگلیز و ئێران) نەبوو. ئەو کەسانەی دیکە کە واژوویان کردبوو هەموویان کرێکاری ئەو کۆمپانیایە و هاوڕێی ناوبراو بوون. دەوترێت ئەمیر قولی محەمەدی

---

[57] – ١٩٤٧ و ١٩٣٣ / ٣٧١ f.o بەوتەی شاکێری ، بارودۆخی چینی کرێکار لەئێران p . ٢٩٢ .

موستەفا باغبە و حەسەن عەلی سابتی کەسانێکن کەجێگای متمانە نین.

٣- من ئەم گۆڕانکارییانەم لەگەڵ بەڕێز ئەلینکتۆن [58] کە لەم دوایانەدا هاتۆتە ئابادان باسکردوە و قسەو باسێکی تێرو تەسەلمان لەوبارەوە کردوەو هەردووکمان لەو بڕوایەداین ئەگەر بێتو ئەو بزافە سەرکەوتوو بێت ئەوە دەستکەوتی چاکی دەبێت. هەردوولامان لەسەر ئەوە کۆکین لەئێستادا و هەتا ئەوکاتەی ئەو ڕێکخراوەیە بەڕەسمی نەناسرێت، نابێت بە هیچ شێوازێك پشتیوانیی بەرچاوی لێبکەین. هەر هاوکاریکردنێك لە ئێستادا دەبێتە هۆی لاوازکردنی. لەئێستادا کرێکارەکان بەو ڕێکخراوەیە زۆر دڵخۆش نین و لەو بڕوایەدان کە دەوڵەت یان کۆمپانیای نەوت پێکی هێناوە.

٤- لەم ناوەشدا کۆمپانیا بەنیازە یەك دوو دانە لەو پلانانەی کە لە مێشکیاندایە، بەدەستیانەوەبێت هەتا کاتی گونجاو کاتێك کە لەلایەن ڕێکخراوەکەوە هەنگاوێك نرا، ئەو پلانانەی بەکردەوە دەر بێنن و بڵێن کە ئەوە ( دەستکەوتی ڕاستەوخۆی) هەوڵ و داواکاریی ڕێکخراوەکە لە کۆمپانیا بووە.

٥- کۆپییەك لەم نامەیە و پەیوەستەکانی دەنێرم بۆ نوێنەری جەنابی شا ( بەریتانیا) لە ئەهواز.

( واژوو) و. دەبلیوو. دی. ویلابی [59]

نوێنەری بەریتانیا لە خورەم شەهر

---

Elkinton - [58]

v . w . d . willayby - [59]

**٣٨- ( ڕاگەیاندراوی شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکانی کرێکارانی نەوت، ڕێبەندانی ١٣٢٥ ی. هـ ( ١٩٤٧ ی. ز )** [60]

**وەزارەتی ناوخۆ، پارێزگای شەشەم، ژمارە ١١٤٧، ڕێکەوتی ٩ / ١١ / ١٣٢٥ ی. هـ ( ١٩٤٧ ی. ز )**

جەنابی ئەشرەف سەرۆك وەزیران. ڕاگەیاندراوێك کە لەلایەن ڕێکخراوی کرێکارانی نەوت لەئابادان بلاو بووەتەوە بۆ ئاگاداریتان دەنێرم.

پارێزگای شەشەم – مێسباح فاتمی.

هاوکارانی خۆشەویست – کرێکاران – زەحمەتکێشان

ماوەی ساڵ و نیوێکە کە ڕێکخراوی کرێکارانی پیشەیی نەوت لەئێراندا دامەزراوە و لەم ماوەیەدا ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی ڕێکخراوی کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران، ڕێگە نیشاندەرو یارمەتیدەری ئەم ڕێکخراوەی ئێمە بووە. ئێمە کرێکارانی پیشەیی نەوتی ئێران خۆمان دایە دەستی ئەنجومەنی ناوبراو کە بژیویی ژیانی ئێمەباشتر بێت بەلاّم بەداخەوە ئەم ڕووداوانەی دواتر بۆمانیڕوون کردەوە کە بە پێچەوانەی ئەوەی کەخۆی باسیدەکات ڕێکخراوێکی سیاسییە کە لە حیزبی توودە جیابووەتەوەو کە بەئاژاوە گێڕی و خیانەتەکەیان فەرمانۆ بۆ خەڵکی ئێران ئاشکرا بووە. ڕێکخراوەکەی ئێمە بۆ ئەوە پێکهات کە بەتەنها ڕێکخراوێکی پیشەیی کرێکاران بێت و بەهیچ شێوازێك دەست وەرنەداتە نێو کاروباری سیاسییەوەو هێزی خۆی بەتەنها بۆ یەکڕیزی و دابینکردنی ژیانێکی شیاو بۆ کرێکاران

---

[60] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

بخاتە گەڕ. بەداخەوە ئێمەیان کردە داردەست و گەمەی سیاسی و بێگانەپەرستیی خۆیان و پارەیەکی زۆریان لای ئێمە کۆکردەوەو بردیان بۆ تاران و ئێستاش کە داوای دەکەینەوە وڵامان نادەنەوە.

ئەم کەسانەی لای خوارەوە واژوومان کردووە شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوی کرێکارانی نەوتمان پێکهێناوەو بەهۆی خزمەتەکانمان لە ڕابردوودا متمانەی کرێکارانمان بەدەستهێناوە، لەدوای بیرکردنەوە و خوێندنەوەیەکی زۆر بەو قەناعەتە گەشتوین کە پێویستە ڕێکخراوەیەکی بەتەواوی سەربەخۆمان هەبێت کە بەڕاستی پشتیوانی چینی کرێکار بێت و هەر بۆیەش ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بۆ ئاگاداری سەرجەم کرێکاران بڵاو دەکەینەوە:

١- لەم ڕێکەوتە بەدواوە ناوی ڕێکخراوەکەمان دەبێت بە ( ڕێکخراوەکانی کرێکارانی نەوت) کە بەتەواوی سەربەخۆ دەبێت و سەر بەهیچ ڕێکخرا و حیزبێك نابێت.

٢- ڕێکخراوەکانی کرێکارانی نەوت، سەر بەهیچ لایەنێکی سیاسی نین و چالاکییەکانی ئەو لەدەرەوەی یاساکانی وڵاتی ئێراندا دەبێت و بەتەنها بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی کرێکارانە.

٣- شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکانی ئێمە لە کەسانێك پێکهاتووە کە یان خۆیان کرێکار بوون یان پێشینەی کرێکارییان هەیە لە پیشەسازیی نەوتی ئێراندا و بەو هۆیەوە لەچۆنیەتی ژیانی کرێکاران و پێویستییەکانیان بەجوانی ئاگادارن و پشتیوانی و لایەنگری لەچینی کرێکار ناکەنە ئامانج بۆ گەیشتنیان بەبەرژەوەندیی سیاسیی خۆیان.

٤- شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی ڕێکخراوەکـانی کرێکـارانی نـەوت بەشـێوەی یاسـایی دەبێـت سـەرجەم چـالاکییەکانی پیـشەیی ڕێکخراوەکانی کرێکارانی نـەوت سەرپەرشـتی دەکات. بەڕێوەبەرایـەتی ئێـستا کـاتی دەبێـت و لـەدوای ئامـادەبوونی ڕێکخـراوە نوێیەکـە، ڕێکخراوەکان بـەپێی یاسای کار ئەندامـەکانی بـەپێی یاسـاو ڕێـساکانی دیموکراسی و زۆرینەی دەنگ سەرلەنوێ هەڵدەبژێردرێنەوە.

٥- تەواوی ئەو پارانەی کە بەشێوەی نایاسـایی لێیـان بـردووین و ناردوویانە بۆ تاران لەڕێگای یاساوە وەردەگیرێتەوەو لەداهاتویشدا هەر سێ مانگ جارێك تەواوی داهاتوو خەرجییەکانی ئـەم ڕێکخراوەیـە بـۆ ئاگاداریی ڕای گشتی بڵاودەکرێنەوە.

هیـوادارین کـە لەمـە بـەدواوە فریـوی کەسـانی خیانـەتکار و داردەسـتانی بیـانی نـەخۆن و ئاگـادار بـن کـە تاکـە مەبەسـتی ئێمـە دابینکردنی مافەکانی کرێکـارانی پیـشەسازیی نـەوت دەبێـت و بـەهیچ شێوازێك ڕێگا نـادەین بکرێینـە داردەسـتی پیـاوانی خیانـەتکارو ئـاژاوە گێڕ و داردەستانی وڵاتانی بیانی.

بـژی وڵاتـی خۆشەویـستمان ئێـران! پایـەدار بێـت سـەربەخۆیی و مەشـروتیەتی ئێـران! سـەرکەوتووبن کرێکـارانی پیـشەسازیی نـەوت! مەرگ و نەمان بۆ ئەو کەسانەی کە مافی کرێکار پێشێل دەکەن! بـژی سەرجەم کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران!

**شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی ڕێکخراوەکـانی کرێکـارانی پیـشەسازی نەوت**

یووسف ئیفتخاری – عەلی شاهەندە – محەمەد بەدیع – عـەباس عەلی نەجەفی – تەقی سامانی – ئـەمیر قـولی محەمـەدی – موسـتەفا

باغیتە – نەوشاد قەنبەرزادە – حەسەن عەلی سابتی – هۆرمۆز شەعبانی

**٣٩- ( بەشێك لە هەواڵی شاندی نێردراوی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی سەندیکا کرێکارییەکان بۆ ئێران) [61]**

ڕێکخراوی کرێکارانی نەوتی ئابادان

لە ڕێکەوتی ٢٤ ی مارسی ١٩٤٧ی. ز ( ٤ ی خاکەلێوەی ١٣٢٦ی. ھ) شاندێك لەلایەن ڕێکخراوی نێونەتەوەیی سەندیکا کرێکارییەکان لەگەڵ شاندێکی دوازدەکەسی لە نوێنەرانی ڕێکخراوە کرێکارییەکانی نەوت بە سەرۆکایەتی یووسف ئیفتخاری کۆبووەوە. ئەلعەریس، سەرۆکی شاندی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی سەندیکا کرێکارییەکان ئەم کۆبوونەوەیەی بەشێوەی لای خوارەوە سازدا:

سەرۆکی شاند ( ئەلعەریس) پرسیاری ( ١): ئەم ڕێکخراوەیە کەی پێکهاتووە؟

ئیفتخاری: دوومانگ و نیو پێش ئێستا.

پرسیاری ٢ – ئەم هەڵبژاردنە چۆن ئەنجام درا؟

وڵام – کاتێك کە شاندی پێشوو هەڵوەشایەوە، ١٤ کەس لە ئەندامەکانی چالاکییەکانیان بەشێوەی نهێنی درێژە پێدا. ئەوان لە تاران داوایان لە یووسف ئیفتخاری کرد و دەستیانکرد بە هەڵبژاردنی نوێنەرانی کرێکارانی کۆمپانیای نەوت.

---

[61] – هەواڵی هاتنی شاندی نێردراوی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کرێکاری بۆ ئێران، پەڕاگ ٢ بۆ ١٤ ی حوزەیرانی ١٩٤٧ ی . ز ( ١٢ بۆ ٢٤ ی جۆزەردانی ١٣٢٦ ی . ھ ) بەوتەی شاکیری ، بارودۆخی چینی کرێکار لەئێران ١٣٢ . ١٢٥ . p.p

پرسیاری ٣ – هەڵبژاردنەکە لەکۆمپانیای نەوتدا بەچ شێوازێك بوو؟

وڵام – هەر گروپێك لە کرێکارانی کۆمپانیا نوێنەرێکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

پرسیاری ٤ – لەکۆمپانیای نەوتدا چەند گروپی کرێکار هەیە؟

وڵام – کۆمپانیا یازدە گروپی سەرەکی هەیە کە هەر کامێکیان دەبن بەچەند بەشی بچوکترەوە و لەکاتی هەڵبژاردندا لەپێشدا نوێنەری بەشە بچووکەکانی هەڵدەبژێردرێن و پاشان هەڵبژاردن دەکرێت لەنێوان گروپە سەرەکییەکاندا.

پرسیاری ٥ – چەند گروپ بەشدار بوون لەهەڵبژاردنەکاندا؟

وڵام – لەماوەی دوو مانگ و نیو دا ئێمە لەنێو دوو گروپدا هەڵبژاردنمان کردووە.

پرسیاری ٦ – چەند کرێکار لەهەڵبژاردنەکاندا بەشدارییان کردووە؟

وڵام – ئێمە زانیاریی تەواومان پێ نیە بەڵام بەپێی زانیارییەکانی کۆمپانیای نەوت لەسەدا شەستی کرێکاران بەشدارییان لەو هەڵبژاردنەدا کردووە.

پرسیاری ٧ – کۆمپانیای نەوت لەو هەڵبژاردنەدا دەستوەردانی کرد یان بێلایەن بوو؟

وڵام – کۆمپانیا لەم بابەتەدا هیچ ڕۆڵێکی نەبووە.

پرسیاری ٨ – کۆمپانیا لەو ڕێکخراوە نوێیە کە پێکهاتبوو ڕازی بوو یان نا؟

وڵام – بەڵێ، ڕازی بوو، مـن ڕای بـەڕێز ڕاس [62] بەرپرسـی بەشـی تکنیکیی کۆمپانیام وەرگرت و لەوڵامـدا پێـی وتم ( ئێمـە ڕێکخراوەکـە بەرەسمی دەناسین).

پرسیاری ٩ – ئێوە لەئێستادا نوێنەرایەتی چەند کرێکار دەکەن؟

وڵام – بەتەواوی ئاگادار نیم

پرسـیاری ١٠ – ئەگـەر وایـە ئێـوە چـۆن هەڵبـژاردنتان کـردووە لەکاتێکدا نازانن چەندکەس بەشداریی لەو هەڵبژاردنەدا کردووە؟

وڵام – کاتێـك کەلەسـەدا شەسـتی کرێکارەکـان بەشـداربوون ئـەوە هەڵبژاردن دەکرێت.

پرسیاری ١١ – پرسیارەکەی من لەمەڕ بنەمای یاسایی هەڵبـژاردن نیە، بەڵکو دەمەوێ بزانم چەند کرێکار بەشـداری ئـەو هەڵبژاردنـەیان کردووە؟

وڵام – ئێمە دڵنیاین لەو دوو گروپەدا لەسەدا شەستی کرێکارەکان بەشدار بوون.

پرسیاری ١٢ – هێشتا وڵامی پرسیارەکەی منتان نەداوەتـەوە. دوو پاتی دەکەمەوە:

چەند کرێکار لەهەڵبژاردنەکەدا بەشدار دەبوون؟

لـەدوای نیـو کاتـژمێر گفتوگـۆ یووسـف ئیفتخـاری گـوتی ( ٢٠٠٠ کرێکار بوونەتە ئەندام لەم ڕێکخراوە نوێیەدا و هەتاوەکو ئێستا ١٨٠٠٠ کەس داوای ئەندامیەتیان پێشکەش کردووە). لەبەرچاو گرتنی ئـەوەی کـە بـەس تـەنها لـەئاباداان کۆمپانیـای نـەوت ٣٠٠٠٠ کرێکـاری هەیـە

---

[62] – Ross

وڵامێکی روون نیە لەمەڕ ژمارەی ئەندامانی ئەم رێکخراوەیە.

پرسیاری ١٣ – هۆکارەکانی ئێوە چیبوو بۆ دامەزراندنی رێکخراوی کرێکارانی نەوت؟

وڵام – ( لەلایەن یەکێك لەو کەسانەی کە لەشاندەکەی ئیفتخاریدا بوون) لەدوای مانگرتنی بەناوبانگی تەمووزی ١٩٤٦ ی. ز ( پوشپەڕی ١٣٢٥ ی. ه) رێبەرانی ئەنجومەنی کرێکاری هەڵهاتن و لەم نێوەدا ژمارەیەك کرێکار گیانی خۆیان بەختکرد و بوونە قوربانی. ئەوان لەلایەن رێکخراوی ناوەندەوە هیچ یارمەتییەکیان پێنەکرا. رێبەرانی ئەنجومەنی کرێکاری و رێکخراوی ناوەندی و ئەو برە پارەیەی کەبۆ یارمەتیدانی ( زیانلێکەوتوانی مانگرتن) کۆیان کردبووەوە، لەگەڵ خۆیاندا بردیان بۆ تاران، ئەوە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی بیر لەدامەزراندنی رێکخراوێکی نوێی کرێکاری بکەینەوە.

پرسیاری ١٤ – بۆچی بۆ رێکخستنی رێکخراوەکەتان لە تارانەوە بانگهێشتی یووسف ئیفتخاریتان کرد؟ لەنێو کرێکارانی ئابادان و کەسێکی وەها نەبوو رێبەرایەتی ئەم رێکخراوەیە بکات؟

وڵام – ( لەلایەن یەکێکی دیکە لەشاندەکەی ئیفتخاری) یەوە، ئیفتخاری بیست ساڵ لەمەوپێش ئەندامی رێکخراوی کرێکاریی ئابادان بووە. ئێمە داوامان لە رەزا روستا کرد بەڵام وڵامی نەداینەوە. هەربۆیەش داوامان لە ئیفتخاری کرد.

پرسیاری ١٥ – هۆکاری رەزامەندیی کۆمپانیای نەوت و دەوڵەت لە دامەزراندنی ئەم رێکخراوەیە چیە؟

وڵام – ( ئیفتخاری) دەوڵەت و کۆمپانیا دژی دامەزراندنی

ڕێکخراوەکان نەبوون. ڕێکخراوەکانی پێشوو کە ٣٠٠٠٠ کرێکاریان بوو هۆکاری شەڕی نێوان ئێرانییەکان و عەرەبەکان بوون. ئەم شەڕە بووە هۆی ئەوەی کە دەوڵەت لەئابادانـدا قەدەغەکردنی هاموشۆ دابنێت و ڕێبەرانی ڕێخکراوەکانیش دەستبەسەر بکات.

پرسیاری ١٦ – یانەی ئەنجومەنەکان گەڕایەوە بۆ ڕێکخراوەکەی ئێوە؟

وڵام – لەدوای ڕووداوەکانی ئابادان بەشێك لەئەندامانی ئەنجومەنەکە هەڵهاتن و بەشێکیشیان دەستبەسەر کران. کاتێك کە گەیشتینە ئابادان داوامان لە دەوڵەت کرد ئەو یانەیە بگەڕێنێتەوە بۆ ئێمە. ئەم مەسەلەیە دوو مانگ و نیو پێش ئێستا ڕوویان دا.

پرسیاری ١٧ – لەهاوینی ڕابردوودا، لەتەمووزی ١٩٤٢ ی. ز ( پوشپەڕی ١٣٢٥ ی. ه) ئێوە دژی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەند بوون بۆچی کاتێك کە لویی سایان لە تاران بوو هیچ نارەزاییەکتان دەرنەبڕی؟

وڵام – من لەساڵی ١٩٤٥ دژی بەشداری نیرەج ئەسکەندەری ودژی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەند نارەزاییم دەربڕی.

پرسیاری ١٨ – ڕێبەرانی ڕێکخراوەکە لەکاتی مانگرتنەکەی ١٤ ی تەموزی ١٩٤٦ ی. ز ( ٢٣ ی پوشپەڕی ١٣٢٥ ی. ه) چ کەسانێك بوون؟

وڵام – مەهدی هاشم مەجەفی و حسێن پەروەردە سەرۆکی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەند بوون.

پرسیاری ١٩ – لەدوای مانگرتنەکە مەهدی هاشم نەجەفی و هاوڕێیانی لەلایەن دەوڵەتەوە ڕاوەدوو یان دەستبەسەر کران؟

ولام – دەوڵەت بۆ پاراستنی گیانی هاوولاتیان چەند کەسێکی دەستبەسەر کرد. ئەوان لەدوای ماوەیەکی کەم، واتە لەدوای هاتنی موزەفەر فیروز وەزیری کار و ڕاگەیاندن و نوێنەرانی ئەنجومەنی یەکگرتوو بۆ ئابادان ئازادکران.

پرسیاری ٢٠ – ئەم دوو کەسە لەچی دەترسان؟

ولام – لەوە دەترسان کە عەرەبەکان بیانکوژن.

پرسیاری ٢١ - ناکۆکیی نێوان عەرەبەکان و کرێکارە ئێرانییەکان چیبوو؟

ولام – عەرەبەکان بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوە کۆبوونەوەیەکیان سازکردبوو کە دوو کەس لە ئەندامانی ئەنجومەنی یەکگرتوو لەوێوە تێپەڕدەبن. یەکێك لەوان دەڵێت ( ئەگەر بەنرخی خوێنیشم بێت ئەم ڕێکخراوە عەشایرییە لەناو دەبەم).

دواتر یووسف ئیفتخاری لەبارەی دۆخی مادییەوە قسەی کرد و وتی ڕێبەرانی ئەنجومەنی یەکگرتوو بە میلیار قەران پارەیان دزیوە. ئەویش پرسیاری کرد ئایا ڕێکخراوی نێونەتەوەیی ڕێکخراوە کرێکارییەکان ئاگاداری ئەو بابەتەیە؟

پرسیاری ٢٢ – ئەو مەسەلەیە ڕوونتر بکەنەوە.

ولام – ئەوان بۆ یارمەتیکردنی بنەماڵەی کرێکارانی گیان بەختکردو و بریندار لەمانگرتنەکەی ساڵی ١٩٤٦ ی. ز، مووچەی ڕۆژێکی سەرجەم کرێکارانی ئابادانیان کۆکردەوە بەلام تەنانەت یەك قەرانیشیان نەدا بە بنەماڵەی ئەو کرێکارانە.

لەو نێوەدا یەکێك لەهاوڕێیانی یووسف ئیفتخاری پسوولەیەکی

دەرهێنــا لەمــەڕ ئــەوەی کــە مووچــەی ڕۆژێکــی داوەتــە ئەنجومــەنی یــەکگرتوو. وتیــشی ( ئێمــە لــەبارەی دزیــنی ئــەو پارەیــە لەلایــەن ئەنجومەنی یەکگرتووەوە بەڵگەی دیکەشمان لەبەدەستدایە).

تاوتوێکردنی قسەوباسەکانی یووسف ئیفتخاری

ئیفتخــاری لــە وڵامــی پرســیاری دووەمــدا باســی لــەوەکرد کــە ئەنجومەنی پێشوو هەڵوەشاوەتەوەو لەوڵامی پرسیاری سیازدەهەمدا وتی کە ڕێبەرانی ئەنجومەنەکە هەڵهاتوون. دواتـر لـەوڵامی پرسـیاری پازدەهەمــدا دەڵێــت: دەوڵــەت ناچــار بــوو کــە قەدەغــەی هاموشــۆ ڕابگەیـەنێت. دەوڵەت ناچارکرا کـە دۆخـی نایاسـایی لـە خوزسـتاندا ڕابگەیەنێت و ڕێبەرانی ئەنجومەنی دەستبەسەر بکات. ئـەم وتانـە دژ بەیــەکن. یووســف ئیفتخــاری لەلایەکــەوە دەڵێــت کــە ئەندامــەکانی هــەڵهاتون و لــەو لایــشەوە دەڵێــت کــە ئەنجومەنەکــە هەڵوەشــاوەتەوەو دواتــریش دەڵێــت کــە دەوڵــەت ئــەوانی دەستبەســەر کــرد. ڕاســتیی ڕووداوەکە ئەوەیە کە نە ئەنجومەنەکە هەڵوەشـایەوەو ڕێبەرەکانیـشی هەڵهاتن، بەڵام هەر بەوشێوەیە کەئیفتخاری باسیکرد: (ئەوان لەلایـەن دەوڵەتــەوە دەستبەســەرو بەنــدکران و دواتــریش نێــردران بــۆ تــاران). ئــەوان لــە ئــەهواز و بەشێکیــشیان لــە تــاران بەنــدکران و بەشــێکی دیکەیشیان تارێندران. ئەم ئەنجومەنە لـەنێو کرێکارانـدا وەهـا جێگـای خــۆی کردبــووەوە کــە بەتــەواوی هەوڵــەکانی ئیفتخــاری، هــەروەها پارمــەتیی کۆمپانیــای نــەوت و دەوڵــەت ئاکــامی نــەبوو لــەئیرادەی کرێکارانــدا هــیچ کاریگەرییــەکی نــەبوو. لەکۆتاییــدا مەهــدی هاشــم نەجــەفی کــە لــە بەرپرســانی ئەنجومــەنی کرێکــارانی ئابــادان بــوو

لەرێکەوتی ١٤ ی ئابی ١٩٤٦ ی. ز ( ٢٣ ی گەلاوێژی ١٣٢٥ ی ه) بەدەستی هێزە ئەمنیەکان دەستبەسەر کرا و لەئاباادان، ئەهواز و قوم بەند و دواتر تارێندرا بۆ تاران. ناوبراو بۆی نیە بگەڕێتەوە خوزستان. لەئێستادا هاوڕێیانی ئەو عەبدوڵلا وەفایی زادە، مەنوچەهر مۆسلێح، غولام رەزا مۆرادی و فەتحوڵلا دەشتیپوور لەتاراندا دەستبەسەرن، سەفەوی و نەزەر ئاشوریش لە ئەهوازن. حسێن پەروەردە، لە بەرپرسانی ئەنجومەنی خوزستان و رێبەری کرێکارانی ئابادانیش لە ئەهوازە. ئەوانی دیکەیشیان تارێندراون و یان لەلایەن هێزە ئەمنیەکانی خوزستانەوە بەدوایاندا دەگەڕێن. لەم ناوەدا بەس رەمەزان کاوە کە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی و بەرپرسی بەشی دارایی ئەنجومەنی ئابادان بوو بەهۆی ئەو گوشارانەی کە لە بەندیخانەدا لەسەری بوو یان لەوانەیە بەهۆی کێشەی دارای و گەندەڵییەوە، پەیوەست بوو بە یووسف ئیفتخارییەوە و لە ئەنجومەندا دەستی لەکار کێشایەوە.[63] ئەو بەو دەست لەکارکێشانەوە کە بەرپرسی بەشی دارایی بوو خۆی لە بەندکردن دەرباز کرد. ئەندامانی ئەنجومەنی کرێکارانی خوزستان تەنانەت لەبەندیخانە و تاراوگەیشدا پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ کرێکاران نەپچڕاندووە. ئەم پەیوەندییانەش دەستکەوتی زۆر گەورەی هەبووە. ئەم هاوڕییانە توانیویانە پەیوەندی و یەکڕیزیی کرێکاران لەگەڵ ئەنجومەنی ناوەندیدا بپارێزن و پەرەی پێبدەن. لەماوەی چەند مانگی رابردوودا ئەنجومەنی یەکگرتووی

[63] – رەمەزان کاوە یەکێك بوو لەهاوڕێیانی یوسف ئیفتخاری لەمانگرتنەکەی کۆمپانیای نەوت لەساڵی ١٣٠٨ ی . ه ( ١٩٢٩ ی . ز ) ی ئابادان .

ناوەندی چەند نوسراوەی ناردووە بۆ ئابادان و بەسەدان ڕاگەیانـدراوی بڵاوکردومتـەوەو بـەو هۆیەشـەوە دەسـکەوتی بەرچـاویان هـەبووە. ئەنجومـەنی خوزسـتانیش بەبـەردەوام خـەریکی چـالاکییە و بـە بەردەوامی کرێکاران لەگۆڕانکارییـەکان ئاگـادار دەکاتـەوە. ئەنجومـەنی خووزستان پێش چونەوەی شاندی نێردراوی ڕێکخراوی نێو نەتـەوەیی کـار لـە ئابـادان ڕاگەیانـدراوێکی بڵاوکـردەوە. بـەو شـێوەیەش ڕۆژێـك پێش چوونی شاندەکە بۆ ئابـادان ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـد بـە بڵاوکردنـەوەی نوسـراوەیەك تـەواوی ئـەو پلانانـەی کـە داڕێـژرابوو پوچـەڵکردەوە. ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـد لەگـەڵ ڕێکخـراوی کرێکـاریی ئابـادان و بەشـێوەی نهـێنی و بـەردەوام لەپەیوەندیدایـە. چەند کەسێك لە ئەندامانی جێگای متمانەی ئەنجومەنی ئیفتخارییـان خستبووە ژێر چاودێرییەوە. کۆمپانیای نەوت و دەوڵەت لەحاڵێکدا کە ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاوەدوو دەناو ئەوانی دەستبەسـەر دەکـردو یـان دەیانی تاراند و یان لەسەر کـار دەریـان دەکـردن، پـشتیوانی دەکـرد لـە یووسـف ئیفتخـاری. لەلایـەکی دیکەیـشەوە دوژمنـانی ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـد و ئـەو کەسانەی کـە ئـەو بانگەشـەیان دەکـرد بـۆ خۆیـان بـەئازادی دەسـتوڕانەوە. وتـەکانی یووسـف ئیفتخـاری لەمـەڕ چـالاکییەکانی ئەنجومـەنی کرێکـاری کـە بـووە هـۆی ئـاژاوەو کوشـتن، نیـشاندەری ئەوەیـە کـە ئـەو ئاگـاداری ئـەو باسـانەیە کـە لـە دادگـا سـەربازییەکاندا دەکرێـت. ئـەو ئاگـاداری هەوڵـە نهێنیـەکانی ئـەو دادگایانەیــە لەمــەڕ ڕووداوەکــانی ١٤ ی تــەموزی ١٩٤٦ ی. ز ( ٢٣ ی پوشپەڕی ١٣٢٥ ی. هـ) لە ئابادان. ئـەو تۆمەتانـەی کـە لەلایـەن دادگـای

سـەربازییەوە باسـدەکرێت بـەڕوونی دەری دەخـات کـەرێکخـراوی عەشـایەری، ڕێکخراوێکـی چـەکدارە. بـەلاّم ئـەم ڕێکخراوەیـە بـۆ دژایەتیکردنی کرێکار پێکهات. زۆرتر لەوەیش بەڕوونی نوسراوە کە ( ئەندامانی ڕێکخراوی عەشایەری بەچەکەوە هێرشیان کردوەتە سەر کرێکاران). دیسان نوسراوە: (لەوەدا هیچ گومانێك نیە کە ئەنـدامانی ڕێکخراوی عەشایەر بەچەکەوە هێرشیان کردووەتـە سـەر کرێکاران و ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران کوژران و برینـدار بـوون ). ئـەم وتانـە لـە دادگـای ڕووداوەکـانی ١٤ ی تـەموزی ١٩٤٦ی. ز ( ١٣٢٥ ی. هـ) ئابـادان باسکراوە [64]. ڕێکخراوەکەی یووسف ئیفتخاری بەتـەواوەتی تێکشکابوو هیچ کرێکارێك ئامادەنەبوو ببێتە ئەندام لـەو ڕێکخراوەیـەدا. هۆکاری ئەو وڵامەی کە بـە پرسیاری شاندەکەی داوە کە دەڵێن ژمـارەی ئـەو کرێکارانـەی کـە بەڕێکخراوەکەتانـەوە پەیوەسـت بـوون چـەندە هـەر ئەوەیـە. ئـەو لەوڵامـدا دەڵێـت ( زانیـاریی تـەواوم لا نیـە) و لەمـەڕ هەڵبژاردنەکەیش دەڵێـت (ئەوانـە لـەکۆمپانیای ئەوتـدا ڕوویـان داوە). ئیفتخاری دەڵێت کە دەوڵەت و کۆمپانیای ئەوت بەهیچ شێوازێك دژی ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـد نـەبوون بـەلاّم دووخـاڵ لێـرەدا ئـەو وتەیە ڕەتدەکاتەوە: بروسکەی سـەرۆك وەزیـران قەوامولسەڵتەنە ڕوو بە ڕێکخـراوی عەشـایری لـە ١٠ ی تـەموزدا: بەوتـەی دادگـای سـەربازی نامەی ژمارە ٨٩ ی پۆلیسی ئابادان ڕێکـەوتی ٢٣ ی حـوزەیرانی ١٩٤٦ ی. ز ( یەکەمی پوشپەڕی ١٣٢٥ ی. هـ) ڕێکخراوی عەشایری چەکدار بووەو

---

[64] – بەشـێك لەمەواڵەکـە کـە پەیوەنـدیی بـەڕێکخراوی عەشـایەری عەرەبـەوە بـوو وەرنەگێردراوەتەوە .

دژی کرێکاران بووە. سەرۆك وەزیران قبوڵیکرد کە ئەو ڕێکخراوەیە پەیوەست بێت بە حیزبی دیموکراتی ئێرانەوە. کۆمپانیای نەوت لە ٢٣ ی حوزەیرانی ١٩٤٦ ی. ز ( ٢ ی پوشپەڕی ١٣٢٥ ی. ﻫ) بۆ سازدانی کۆبوونەوەیەك سەیارەی دابین کرد بۆ ڕێکخراوی عەشایر. ئەمە لەکاتێکدایە کەکۆمپانیای نەوت بەجوانی ئاگادارە کە ڕێکخراوەکەی یووسف ئیفتخاری هیچ نیە و ئەوی بەڕەسمی ناسیوە و یارمەتی دەکات، لەحاڵێکدا لە بەڕەسمی ناسینی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی کرێکاری کە ڕێکخراوێکی زۆر بەهێز بووەو زۆربەی کرێکارەکان تیایدا ئەندام بوون خۆی دەبوارد.

ئەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت ئەو قسەی کە دەڵێت لەنێوان کرێکارانی ئێرانی و عەرەبدا شەڕو پێکدادان ڕووی داوە دوورە لەڕاستییەوە. کرێکارانی عەرەب هیچ کاتێك بەقەدەر کرێکارانی ئێرانی بەرژەوەندییان نیە لەنێو ئەنجومەنی ناوەندیدا و نەبەقەد کرێکارە ئێرانییەکانیش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەنجومەنەکە دەکەن. لەلایەکی دیکەیشەوە ڕێکخراوی عەشایریش بەتەنها کرێکاری عەرەبی تیادا ئەندام نیە لەبەرئەوەی ژمارەیەك لە کۆنەپەرستە ئێرانییەکانیش لەو ڕێکخراوەیەدا بەشدارن. سەبارەت بەوتەی یووسف ئیفتخاری لەمەڕ ئەوەی کە گوایە ئێمە یارمەتیی بنەماڵەی کرێکارە کوژراو و بریندارەکانمان نەکردووەتەوە دوورە لەڕاستییەوە. بڕی ٣٠٠٠٠ تمەن لەڕێگای ڕەمەزان کاوە کە بەرپرسی بەشی دارایی ئەنجومەنەکە بوو پێیاندراوە و پێویستە ئەو لەو بارەیەوە وڵام بداتەوە. جگە لەمە بڕێکی دیکەیشمان بۆ نارد کە بەتەواوی ژمارەی

هەژمارەکانی خوزستان داخڵ کراوە کە گەیشتومەتە دەستی کاوە کە ئێستا پەیوەست بووە بەئیفتخارییەوە ئەو برەیش دیارنەماوە .[65]

**٤٠- ( لەئۆفیسی سەرك وەزیرانەوە بۆ وەزارەتی كار، ٢٤ ی ڕێبەندانی ١٣٢٦ ی. ه ( ١٩٤٨ ی. ز )[66]**

ئۆفیسی سەرۆك وەزیران، ژمارە ٢ / ١٦٩٢٧، ڕێکەوتی ٢٤ / ١١ / ١٣٢٦ ی. ه ( ١٩٤٨ ی. ز) جەنابی دکتۆر سەجادی. بەڕێز ئیفتخاری شکاتی کردوە کە لەم دواییانەدا بەڕێز دکتۆر بەختیار سەرۆکی فەرمانگەی کاری ئابادان بەهاوکاری جێگرەکەی ڕێکخراوی کرێکارانی نەوتی داگیر کردوە داواکارین لێکۆڵینەوە لەو بابەتە بکەن و کاری پێویست بکەن بۆ چارەسەر کردنی. لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە ( واژوو بەجوانی ناخوێندرێتەوە).

**٤١- ( لەوەزارەتی كارەوە بۆ سەرۆك وەزیران ( ئیبراهیم حەکەمی)، ٨ ی ڕەشەمەی ١٣٢٦ ی. ه ( ١٩٤٨ ی. ز)** وەزارەتی کار، ژمارە ١٩٤٣٩ / د، ٨ / ١٢ / ١٣٢٦ ی. ه ( ١٩٤٨ ی. ز) جەنابی سەرۆك وەزیران. بەپێی نامەی ژمارە ٢ / ١٦٩٢٧ لەڕێکەوتی ٢٤ / ١١ / ١٣٢٦ ی. ه

( ١٩٤٨ ی. ز) سەبارەت بەشکاتی بەڕێز یووسف ئیفتخاری لەبارەی داگیرکردنی ڕێکخراوی کرێکارانی نەوت، داواکارین سەیری نامەی ژمارە ٩١٦ / ١٩٣٩٠ لەڕێکەوتی ١ / ١٢ / ١٣٢٦ ی. ه

( ١٩٤٨ ی. ز) ئەم وەزارەتە ناردویەتی بۆ جەنابی پارێزگاری

---

[65] – پاشماوەی ئەم هەوڵە پەیوەندی بەچالاکیەکانی ئەنجومەنی یەکگرتووی مازندەرانەوە هەیە هەر بۆیە وەرنەگیراوەتەوە

[66] – ( بەڵگەی نەتەوەیی ) زنجیرەی ن . ژمارە ١٤ – ١١٦٠٠٧

پارێزگای شەشەم، بکەن. لەلایەن وەزیری کارەوە ( واژوو) حەبیب نەفیسی.

**٤٢- ( بەرەو پرۆگرامی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران)** [67]

زەحمەتکێشانی ئێران یەکبگرن

**پێشەکی**

بەردەوامیی ژیانی کۆمەڵگە پێوەندی بەکاری کرێکاران و زەحمەتکێشان و وەرزێرانەوە هەیە. سەرجەم ئەم کەلوپەلانەی کە ژیانی پێدەکرێت بەهۆی زەحمەتی بێپسانەوەی چینێکەوەیە کەخۆیان لەهەموو ئەو بەرهەمانە بێبەشن. هەر چەندە کرێکاران و وەرزێران پێکهێنەری سامانن، خۆیان لێی بێبەشن، لەبەرئەوەی ژمارەیەك کەسی چاوچنۆك و پارەپەرست دەیانهەوێت لە بەرهەمی زەحمەتەکانی ئەوان گیرفانی خۆیان پڕبکەن و لەبەرئەوەی کەچینی کرێکار مافەکانی خۆیان نەزانن، هەوڵدەدەن کە هەموو کاتێك ئەوان لە نەزانین و نەخوێندەواریدا بهێڵنەوە.

**فەرمانۆکە** کرێکاران و فەرمانبەران ووەرزێران و ڕۆشنبیرانی هەژاری ئێرانی کە بوونەتە ئامانجی تاڵانکردنی بەشێك لەخاوەنکاران و پارەپەرستانی زاڵم و چاوچنۆك، بەشێوازێکی زۆر خراپ ژیان بەسەر دەبەن. هەموویان لەستەمی بێکۆتایی چەوساندنەوەی وەحشیانەی خاوەنکارەکان دەناڵێنن، بەڵام ئەو ناڵینە تاکەکەسیانە هیچ دەستکەوتێکی بۆیان نابێت. خاوەنکارەکان هەوڵدەدەن کەلەنێو

---

[67] – بەلگەکە هی ئیفتخاریە .

کرێکاراندا یەکڕیزی و تەبایی نەبێت و ڕیزەکانی ئەوان پارچە پارچە بکەن و ئەوان ناچار بکەن کە فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن. چارەسەری ئەم هەموو نەهامەتییە یەکڕیزی و یەکدەنگییە. بۆ کەمکردنەوەی ماوەی کار و زیادکردنی هەقدەست و دابینکردنی بژیوی ژیانی کرێکاران و زەحمەتکێشان دەبێ یەکگرتوو بن و خەبات بکەن. لەم خەباتەدا، کرێکاران جگە لەزنجیرەکانی دەست و پێیان هیچی دیکە لەدەست نادەن. ڕێکخراوەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران جەخت لەدەستکەوتەکانی ئەم خەباتە و داوا لەسەرجەم کرێکاران و زەحمەتکێشان دەکەن ببنە ئەندام لەو ڕێکخراوەی خۆیاندا.

پرۆگرامی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران

١- پێکهێنانی هاوڕێیەتی و هەستی هاوسۆزی لەنێوان کرێکاران و زەحمەتکێشاندا.

٢- هەوڵدان بۆ باشترکردنی بارودۆخی مادی و بردنەسەرەوەی ئاستی ژیانی کرێکاران وزەحمەتکێشان (بردنەسەرەوەی ئاستی مووچەو دابینکردنی خانووی شیاو لەنزیك کارگەکاندا بۆ کرێکاران)

ڕوونکردنەوە: کرێکارانێك کە ماڵەکانیان کیلۆمەترێك و بەرەوسەر لەشوێنی کارەکەیانەوە دوورە، خاوەنکار دەبێت خەرجیی هاتوچۆو کرێ خانووەکەی بۆ بدات.

٣- بەڕەسمی ناسینی ماف مانگرتن بۆ کرێکاران و زەحمەتکێشان.

٤- کەمکردنەوەی ماوەی کارکردن بۆ هەشت کاتژمێر ( سەبارەت بەو کارانەی کە قورسن ماوەکە دەبێت کەمتر بێت).

٥- ڕۆژانـــی هـــەینی پـــشووی ڕەسمـــی دەبێـــت بەلەبەرچـاو گـــرتنی مووچە بۆ کرێکارانیش هەژمار بکرێت.

٦- ئەگـەر ڕۆژانـــی پـشوو یـان کـاتێکی زۆرتـر کرێکـار کـار بکـات، خاوەنکار دەبێت مووچەی کرێکارەکە بە دووقات بدات.

٧- کرێکـاران و زەحمەتکێـشانی مووچـەخۆر دەبـێ مـاف ئـەوەیان پێبـدرێت لەسـاڵێکدا یـەك مـانگ پـشوویان بـە مووچـەوە بـۆ هـەژمار بکرێت.

٨- خـەبات دژی بێکـاری و هەرچەشـنە چەوساندنەوەی کرێکـاران بەدەستی خاوەنکار.

٩- هەوڵدان بۆ ناردنی یاسای کار بۆ پەرلەمان و پەسندکردنی بـە وێنەی یاسایی نێونەتەوەیی کار.

ڕوونکردنـــەوە: ئـــەو یاسـای کـە لـە برگـەی ٩ دا باسمـانکرد ئـەم خاڵانەی لای خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

ا – بیمـەی کرێکـاران ( لـەکاتی بەساڵاچوون، بێکـاری، نەخۆشـی، پەککەوتن و مردن).

ب – دابینـکردنی مەرجەکانی تەنـدروستی.

پ – دیاریکردنی ماوەی کارکردن.

ت – لەبەرچـاوگرتنی مافـەکانی ژنـان و منـداڵانی لەبـەرگرەوەی یاسای کار.

ج – پشوو بەمووچەوە ( بۆ ژنانی دووگیان چوار مانگ بـۆ پـێش منداڵبوون و دوای ئەوە).

چ - دیاریکردنی کەمترین و زۆرتـرین تـەمەن بۆ کرێکار

١٠- پێدانی مووچەی کرێکارەکان بەپێی پێویست.

١١- پێراگەیشتنی تەواو بەسەر بینای کارگەکاندا ( لەبەرچاو گرتنی مەرجەکانی تەندروستیی کرێکاران) و دابینکردنی بنکەی تەندروستی لەنزیك کارگەکاندا.

١٣ – دابینکردنی جلوبەرگی کار بۆ کرێکار لەسەر خەرجیی خاوەنکارەکان.

١٤ – خەبات دژی بێڕێزی و لێدانی کرێکار بەدەستی خاوەنکارو ناچار کردنیان بۆ ڕێزگرتن لە هەستی کرێکار.

١٥- بەڕەسمی ناسینی ڕێکخراوە کرێکارییەکان لەلایەن خاوەنکارو دەوڵەتەوە.

١٦- هیچ خاوەنکارێك بەبێ هۆ ماڤ دەرکردنی کرێکاری نیە. ئەگەر هاتوو کرێکار هەڵەیەکی کرد، دەبێت ڕێکخراوی کرێکاران ئاگادار بکەنەوە.

١٧ – دەبێت لەنێوان کرێکارو خاوەنکاردا گرێبەستی ڕەسمی هەبێت.

١٨- خەبات دژی سیخوڕی لەنێو کارگەکاندا.

١٩- لەبواری تەندروستییەوە لەو کارگانەی کەکارەکانیان مەترسیدارە، پێویستە شیر بدرێتە کرێکارەکان. ( وەك کارگەکانی چیمەنتۆ و جگەرەو هی دیکە).

٢٠- دامەزراندی قوتابخانە بۆ نەخوێندەوارەکان و فێرکردنی پیشەسازی بۆ ئەو کرێکارانەی کە ئارەزویان لێیەتی لەنێو کارگەکاندا و لەسەر ئەرکی خاوەنکارەکان.

٢١ – دامەزراندنی یانە بۆ کرێکاران.

٢٢ – پێویستە خاوەنکارەکان سوپەرمارکێت و نانەواخانە بۆ کرێکاران و بنەماڵەکانیان لەنێو کارگەکاندا دابین بکەن.

٢٣ - دانانی ژووری دادوەری و دابینکردنی پارێزەر بۆ بەرگری لە مافەکانی کرێکاران.

٢٤- دامەزراندن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤاری کرێکاری.

٢٥- دامەزراندنی دایەنگە و باخچەی ساوایان بۆ منداڵی کرێکاران لەنزیک کارگەکاندا.

٢٦- دامەزراندنی سندوقی هاوکاری بۆ یارمەتیکردنی کرێکارانی ئەندام لە ڕێکخراوەکە.

٢٧- دامەزراندنی کۆمپانیای هاوکاری لەلایەن ڕێکخراوەکانی کرێکارانەوە.

**پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران**

**مافی ئەندامەتی**

بڕگەی ١ – سەرجەم کرێکاران و فەرمانبەران و پیشەوەرانێك کە بەهۆی زەحمەتی خۆیانەوە ژیان دەکەن، لەحاڵێکدا کە ئەم مەرجانەی لای خوارەوەیان تێدا بێت ئەوە دەتوانن ببنە ئەندام لە ڕێکخراوی تایبەت بەخۆیان.

ا – قبوڵکردنی پەیڕەو پرۆگرامی ڕێکخراوەکە.

ب – تەمەنی لەشازدەساڵ کەمتر نەبێت.

پ – کەسێکی بەدناو نەبێت.

ڕوونکردنـەوە – کرێکارانێـك کـە تەمـەنیان لەشازدەسـاڵ کـەمتر بێت، دەبنە ئەندام لەڕێکخراوی لاوانی ئەو ڕێکخراوەیە.

٢- ئـەو کەسـەی کـە داوای ئەندامـەتی کـردووە دەبێـت لەلایـەن ئەندامێکی ڕێکخراوەکە بەنوسراوە پشتگیری بکرێت.

٣- ئەوانـەی کەدەبنـە ئەنـدام دەبێـت ئـەم خاڵانـەی لای خـوارەوە جێ بەجێ بکەن

ئـــەلف – لەکۆبوونـــەوەکانی ڕێکخراوەکەیانـــدا بەبـــەردەوام بەشداربن.

ب – ئـەبێت پابەنــدبن بــە یاســاو ڕێــساکانی ڕێکخراوەکــەوە، فەرمانەکانی ڕێکخراوەکە جێبەجێ بکەن.

پ – مانگی لەسەدا یەکی داهات یان مووچەکەیان وەکو یارمـەتی بدەنە ڕێکخراوەکە.

ڕوونکردنەوە – ئەوانەی کە داهاتێکی دیاریکراویـان نیـە، بـەلانی کەمەوە مانگانە بڕی (؟) وەکو یارمەتی بدەنە ڕێکخراوەکە.

**٤- ئــەو ئەندامانــەی لای خــوارەوە بــەپێی بڕیــاری شــاندی بەڕێوەبەرایـــــەتیی ڕێکخراوەکــــــەی مــــــاف ئەندامــــــەتی لێوەردەگیرێتەوە.(بڕیار لەو بارەیەوە بەدەستی ڕێکخراوی شارەکانە).**

ئەلف – ئەو کەسانەی کە سێ مـانگ بەبـەردەوام و بـەبێ بیـانو لەکۆبوونەوەکاندا بەشدار نابن.

ب – ئــەو کەســانەی کــە پابەنــد نــەبن بەیاســا و ڕێــساکانی ڕێکخراوەکە و فەرمانەکان جێبەجێ ناکەن.

پ – ئــەو کەســانەی کــە لــەنێو کرێکارەکانــدا دووبــەرەکی

دروستدەکەن وپابەندی پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوەکە نابن.

ت- ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێکخراوی کرێکاران سیخوڕی دەکەن.

٥- ئەو کەسەی کە ماڤ ئەندامەتیەکەی لێوەرگیراوەتەوە دەتوانێ لای ڕێکخراوی ناوەند و یان لەکۆنگرەدا شکات بکات.

**ڕێکخراو**

٦- هەر یەکە لەشاندە پیشەسازییەکان لەوانە کانەکان، کارگە و یان هەر یەك لەم پیشانە وەك پیشەی ناسنگەری، دارتاشی و هی دیکە لەحالێکدا کە کرێکارەکانی کەمتر لە یازدە کەس نەبن، لەهەر شارێکدا ڕێکخراوەی تایبەت بەخۆی دادەمەزرێنێت.

**کۆبوونەوەی گشتیی ڕێکخراوەکان**

٧- لەدەستپێکی دامەزراندنی هەر ڕێکخراوەیەك، هەرکاتێك کۆی ئەندامەکانی گەیشتە یازدەکەس، کۆبوونەوەی گشتی ڕێکخراوەکە ساز دەکرێت و شاندی بەڕێوەبەرایەتی بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن کەئەو شاندە نابێت لەسێ کەس کەمترو لەیازدە کەس زۆرتر بێت .

**شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکان**

٨- ئەرکەکانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەر ڕێکخراوەیەك کەلەلایەن کۆنگرەی گشتی ڕێکخراوەکانەوە پێیان دەستپێردرێت بریتیە لە بەڕێوەبردنی کارو بارەکان و جێبەجێکردنی پەیڕەو پرۆگرامی ڕێکخراوەو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دامەزراوەی سەرووتر لەخۆی.

٩- شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەر ڕێکخراوەیەك لەنێو خۆیاندا دوو

بەرپرس و خەزنەدارێك هەڵدەبژێرێت كە ئەركەكانیان بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت .

ئـەلف – بەرپرسی یەكـەم دەبێـت ڕێكخـەری كـار و بارەكـان و سەرپەرشـتی ڕەوتـی بـەڕێوە چـوونی فەرمانـەكانی شـاندی بەڕێوەبەرایەتی بكات و نامەو نوسراوەو هەواڵەكان واژوو بكات .

ب – بەرپرسـی دووەم ڕاگەیانـدراوەكانی نامـە و هەواڵـەكان دەنوسێت و لەگەڵ بەرپرسی یەكەمدا واژوویان دەكات .

پ – خەزنـەدار دەبێـت پارمـەتیی ئەندامـەكان كـۆ بكاتـەوەو پسوولەی ڕەسمـی ڕێكخراوەكـەیان پێبـدات و ژمێریـاریی ڕێكخراوەكـە كۆنترۆڵ بكات.

ڕوونكردنەوە : لەكاتی پێویستدا شاندی بەڕێوەبەرایەتی دەستی كراوەیـە بـۆ دانـانی كەسـانی دیكـە بـۆ پارمەتیـدانی بەرپرسـان و خەزنەدار .

١٠- شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی لانیكـەم دەبێـت حەفتـەی جارێـك كۆبوونەوە ساز بكات، لەبارەی چالاكییەكان و جێبەجێكردنی پەیڕەوو پرۆگرام و فەرمانەكانی ڕێكخراوی ناوەند .

١١- هەر ڕێكخراوەیەك بەپێی بارودۆخ و شوێنی كارەكەی، بەپێی بڕیاری شاندی بەڕێوەبەرایەتی بنكەكان دیاری دەكرێن .

١٢ – بنكەكان لـەنێو خۆیانـدا ڕێكخـەرێك و سـەرقەڵەمێك دیـاری دەكەن و لە كۆبوونەوەكانیاندا كـە حەفتـەی جارێك دەبێت، پـەیڕە و پرۆگرامـی ڕێكخراوەكـە دەخوێننـەوەو لەوبارەیـەوە بـاس و گفتوگـۆ دەكەن و بیروڕاكانی خۆیان دەنێرن بۆ شاندی بەڕێوەبەرایەتی.

١٣- شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەر ڕێکخراوێك، بۆ ئەو کرێکارانەی تەمەنیان لەخواروی ١٦ ساڵەوەیە، بنکەی جیاواز پێکدەهێنن .

١٤- ئەگەر هاتوو لە شارێکدا ژمارەی ئەندامان ئەوەندە کەم بوو کە نەتوانرا ڕێکخراو پێکبهێنن، کرێکارەکان و پیشەوەرەکان دەتوانن ڕێکخراوێکی هاوبەش پێکبهێنن .

### کۆڕی ڕێکخراوەکان

١٥- ئەندامانی ڕێکخراوی هەر کارگەیەکی پیشەسازی یان پیشەوەری، هەر شەش مانگ جارێك کۆڕی گشتی دەبەستن. ئەرکەکانی ئەم کۆڕە بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت :

ا – گوێگرتن لە هەواڵی شاندی بەڕێوەبەرایەتی .

ب – بڕیاردان لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کار و بارەکانی ڕێکخراوەکە بەپێی پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆ هەتا ئەو جێگای کە ڕێگەیان پێدراوە .

پ – هەڵبژاردنی شاندی بەڕێوەبەرایەتیی نوێ کە ژمارەیان بەپێی ژمارەی ئەندامانی ڕێکخراوەکە لەسێ کەس کەمترو لە یازدەکەس زیاتر نەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ .

ت – هەڵبژاردنی نوێنەرانێك بۆ بەشداری لە کۆڕی شارەکەدا . ژمارەی ئەو نوێنەرانە پێشتر بەپێی فەرمانی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەند لەلایەن ئەنجومەنی شارەکانەوە دیاری دەکرێت .

### کۆڕی شارەکان

١٦- کۆڕی شارەکان ساڵی جارێك بەبەشداری نوێنەرانی

هەڵبـژێردراو لەلایـەن کـۆڕی ڕێکخراوەکـانی شـارەکەوە دەبەسـرێت.
ئەرکەکانی ئەم کۆڕە بەم شێوەی لای خوارەوە دەبێت :

ئەلف – گوێگرتن لە هەواڵی ئەنجومـەنی شارەکە و تـاوتوێکردنی چالاکییەکانی ئەنجومەنەکە .

ب – تاوتوێکردن و هەڵبژاردنی ڕەوتی ڕێکخراوەیـی و ئـابووری و تەندروسـتی و ڕۆشـنبیریی کرێکـاران و زەحمەتکێـشانی شـارەکە و گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ پەرەپێدانی ڕێکخراوەکان هەتا ئـەو جێگای ڕێگەیان پێدراوە .

پ – هەڵبـژاردنی ئەنـدامانی ئەنجومـەنی شـارەکە کـەژمارەیان لەنێوان ۱۱ بۆ ۳۵ کەس دەبێت .

ت – هەڵبـژاردنی یـەك یـان چـەندکەس وەك نوێنـەر بـۆ بەشـداریکردن لـە کـۆڕی پارێزگـا کـە پێـشتر بـەپێی ڕێنماییـەکانی ئەنجومەنی پارێزگا و ئەنجومەنی ناوەندی دیاریکراوە .

ج – هەڵبـژاردنی کـەس یـان کەسـانێك وەك نوێنـەر بـۆ بەشـداریکردن لـەکۆنگرەدا کـە ژمارەیـان پێـشتر لەلایـەن ئەنجومـەنی ناوەندییەوە دیاری کراوە .

ڕوونکردنەوە – هەڵبژاردنی کۆڕی شارەکان بەشێوەی ڕاستەوخۆو نهێنی بەڕێوە دەچێت .

**ئەنجومەنی یەکگرتووی شارەکان**

۱۷ – ئەنجومەنی یەکگرتووی شار کە لەلایـەن کـۆڕی شـارەکان بـۆ ماوەی یەکسـاڵ هەڵدەبـژێردرێت، ئـەم ئەرکانـە لای خـوارەوە لەئەسـتۆ دەگرێت :

ئـەلف – جێبـەجێکردنی بڕیارەکـانی کـۆڕی شـارە کـە لـەدوای پەسندکردنیان لەلایەن ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندییەوە .

ب – جێبـــەجێکردنی فەرمانـــەکانی ئەنجومـــەنی پارێزگـــاو ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەند .

پ – چاودێری کردنی کاروبارەکـانی ڕێکخراوەکـان و هەوڵـدان بـۆ پەرەپێـدانی ڕێکخراوەکـە و بانگەشـەی بـەربلاو لـەنێو کرێکـاران و زەحمەتکێشاندا .

ت – چـاودێری و هەوڵـدان بـۆ باشـترکردنی ئاسـتی دارایـی – تەندروستی و ڕۆشنبیری کرێکاران و زەحمەتکێشان .

ج – چاودێری و بەشـداریکردن لەهەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی شـارو ئەنجومەنـەکانی پارێزگـاو پەرلـەمان بـەپێی ڕێنمایـەکانی ئەنجومـەنی یەکگرتووی ناوەند.

ح – هەوڵـــدان بـــۆ نەهێـــشتنی نـــاکۆکیی نێـــوان کرێکـــاران و خاوەنکارەکـــان و هەوڵـــدان بـــۆ ئـــەنجامی گرێبەســـت لـــەنێوانیان بەشـــێوازێك کـــە مافـــەکانی کرێکـــارانی تێـــدا ڕەچـــاو کرابێـــت و چـاودێریکردنی ڕەوتـی بەڕێوەچـوونی یاسـا و ڕێـساکانی تایبـەت بـە کرێکاران و زەحمەتکێشان .

ڕوونکردنەوە – ئەنجومـەنی شـار مـافی ئـەوەی هەیـە نوێنـەرانێك لەو ڕێکخراوانەی کە لە ئەنجومەندا نوێنەریان نیە، بـۆ بەشـداریکردن لەکۆبوونەوەکاندا بانگهێشت بکات .

١٨- کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی شارەکان لانیکەم پێویـستە مـانگی جارێك بەڕێوە بچێت .

١٩ – ئەنجومەنەکانی شارەکان لەنێو خۆیاندا شاندێکی بەڕێوەبەرایەتی کەژمارەیان لەنێوان ٣ بۆ ٨ کەس دەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ هەڵدەبژێرن . شاندی بەڕێوەبەرایەتی، تەواوی کار و کارەکانی ئەنجومەنەکە ڕێک دەخات و لەبەرامبەر ئەنجومەنەکەدا وڵامدەرەوە دەبێت .

٢٠- شاندی بەڕێوەبەرایەتی شارەکان لەنێوان ئەندامانی خۆیان و ئەندامانی ئەنجومەنەکەدا، کومیسیۆنەکانی ڕێکخستن و دارایی و بانگەشە پێکدێنن .

٢١- شاندی بەڕێوەبەرایەتی لەنێوان خۆیاندا دوو کەس وەك بەرپرسی یەکەم و دووهەم هەڵدەبژێرن . بەرپرسی یەکەم سەرۆکی گشتی ڕێکخراوەکەیە سەرجەم نامەو ڕاگەیاندراوەکان واژوو دەکات و بەرپرسی دووهەمیش هەواڵ و ڕاپۆرتەکان ڕێکدەخات و بەهاوکاریی بەرپرسی یەکەم واژوویان دەکات.

٢٢- کۆمیسیۆنی دارایی شارەکان، بەرپرسی سەرجەم داراییەکانی ڕێکخراوەکانی شارەکەیە و ئەرکەکانی بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت :

ا – وەرگرتنی سەرجەم داهاتەکانی ڕێکخراوەکان و کۆکردنەوەیان لە سندوقێکی تایبەتدا .

ب – ڕاگرتنی ژمێریاری داهات و خەرجیی ڕێکخراوەکان بەشێوەی جیاواز .

پ – ڕێکخستن و ڕاگرتنی هەرکام لە داهاتەکان بەشێوەی جیاواز.

ت – چاودێری لە ڕەوتی وەرگرتنی پارمەتیەکانی ئەندامەکان و

داهات و خەرجییەكانی دیكە .

ڕوونكردنەوە – ئەنجومەنی یەكگرتووی شارەكان هەموو مانگێك بەشێك لە داهاتەكەی دەدات بە ئەنجومەنی یەكگرتووی ناوەند و بەشێكیش دەدات بە ئەنجومەنی یەكگرتووی پارێزگاكەی خۆی بۆ خەرجیی گشتی . دیاریكردنی ئەو بڕەپارەیە و شێوازەكەی لەلایەن ئەنجوومەنی یەكگرتووی ناوەندەوە دیاری دەكرێت .

٢٣ – ئەنجومەنی شارەكان چەند كەسێك بۆ ماوەی شەش مانگ هەڵدەبژێرێت وەكو كومیسیۆنی لێكۆڵینەوەی شارەكان كە ژمارەیان سێ تا پێنج كەس دەبێت. كومیسیۆنی ناوبراو چاودێریی سەرجەم كارەكانی ڕێكخستن و بانگەشە و دارایی ڕێكخراوەكان و شاندی بەڕێوەبەرایەتی و كومیسیۆنەكان دەكات و ڕای خۆی لەمەڕ ئەوان بە ئەنجومەنی شارەكە ڕادەگەیەنێت .

### كۆڕی پارێزگا

٢٤- كۆڕی پارێزگا لەو نوێنەرانە پێكدێت كەلەكۆڕی شارەكاندا هەڵبژێردراون. ئەم كۆڕە ساڵی جارێك و لە ناوەندی پارێزگا بەڕێوە دەچێت و ئەركەكانی بریتین لە :

ا – گوێگرتن لەهەواڵی ئەنجومەنی یەكگرتوی پارێزگاو گفتوگۆ لەوبارەیەوە .

ب – لێكۆڵینەوەی دیاریكردنی ڕەوتی ئابوری و تەندروستی و ڕۆشنبیریی كرێكاران و زەحمەتكێشانی پارێزگاكە و هەوڵدان بۆ بەرە پێشبردنی چالاكییەكانی ئەنجومەنی شارەكان .

پ - هەڵبــژاردنی ١٥ بــۆ ٣٩ کــەس وەك نوێنــەری ئەنجومــەنی یـەکگرتووی پارێزگـا بـۆ مـاوەی ساڵێك لـەڕێگای دەنگـدانی نهـێنی و ڕاستەوخۆ .

ئەنجومەنی یەکگرتووی پارێزگا

٢٥- ئەرکەکانی ئەنجومەنی یەکگرتووی پارێزگا :

ا – ئـەو بڕیارانــەی کــە لــە کــۆڕی پارێزگــادا دراوە لــەپاش پەســندکردنیانەوە لەلایــەن ئەنجومــەنی یــەکگرتووی ناوەنــدەوە، جێبەجێیان بکات .

ب – فـەرمان و ڕێنوێنیـەکانی ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـدی جێبەجێ بکات .

پ – چــاودێری کردنـــی کاروبارەکــانی ئــابووری، ڕۆشــنبیری و تەندروستی و دارایی ئەنجومەنی شارەکان و هـەروەها چاودێریکردنی ڕەوتی بەرەو پێشچوونی گرێبەستەکانی نێوان کرێکار و خاوەنکار و هاوکاریکردنی کرێکاران بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان .

ت – لەهەڵبژاردنــەکانی ئەنجومــەنی شــارەکان و ئەنجومــەنی پارێزگـا و پەرلەمانـدا بـەپێی ڕێنماییـەکانی ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەند بەشداری و چاودێریی ڕەوتی هەڵبژاردنەکان بکات .

ڕوونکردنەوە – کاندیدەکانی پەرلەمان لەشارەکان و پارێزگاکانـدا لەلایەن ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندەوە دیاریدەکرێن .

٢٦- ئەنجومـەنی یـەکگرتووی پارێزگـالانی کـەم دوومـانگ جارێـك کۆبوونەوە ساز دەکات .

٢٧- ئەنجومەنی یەکگرتووی پارێزگا لـەناو خۆیانـدا ٥ بـۆ ٩ کـەس

بۆ ماوەی شەش مانگ وەك شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەبژێرن، شاندی بەڕێوە بەرایەتی بەرپرسی بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی ئەنجومەنەکەی و لەبەرامبەریشیدا وڵامدەرەوەیە .

٢٨ – شاندی بەڕێوەبەرایەتی لەنێو خۆیاندا بەپرسەکان بەو شێوەیەی کەلەبڕگەی ٢٠ دا هاتووەو هەروەها ئەندامانی کومیسۆنەکانی دارایی، بانگەشەو ڕێکخستنی پارێزگا دیاری دەکەن .

٢٩ – کومیسیۆنی ئابوری پارێزگا بەڕێوەبەری پاراستنی سەرجەم ژمێریاری پارێزگاکە دەبێت .

٣٠- کومیسیۆنی بەدواداچوونی پارێزگا بۆ ماوەی شەش مانگ لەلایەن ئەنجومەنی یەککگرتووی پارێزگاوە دیاریدەکرێن کەژمارەیان ٣ تا ٧ کەس دەبێت و ئەرکەکانی ئەوکۆمیسیۆنە چاودێری سەرجەم کار و بارەکانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی و کومیسیۆنەکان و دارایی و ڕێکخستنی ئەنجومەنەکانی شارەکان دەبێت و بیروڕای خۆی لەو بارەیەوە بەئەنجومەنی پارێزگا ڕادەگەیەنێت .

**کۆنگرە**

٣١- کۆنگرە ساڵی جارێك و بە بەشداریی نوێنەرانی هەڵبژێردراوی کۆڕی شارەکان دەبەسرێت. کۆنگرە، بەرزترین ئاستی ڕێکخراوەکەیە، ماف گۆڕین و نوسینەوەی پەیرەوو پرۆگرامی ڕێکخراوەکە و دیاریکردنی ڕەوتی گشتی و بڕیار لەسەر لابردنی بەشێك لەڕێکخراوەکە و بڕیارە چارەنوسسازەکان تایبەت بەکۆنگرەیە.

٣٢- کۆنگرە، هەواڵەکانی ئەنجومەنی یەککگرتووی ناوەند و ڕێکخراوەکانی شارەکان دەبیسێت و توێژینەوەی بۆ دەکات و

ئەنجومــەنی یــەکگرتووی ناوەنــدی نــوێ هەڵدەبــژێرێت کــە ژمــارەی ئەندامەکانی بەپێی رای ئامادەبوانی کۆنگرە جیـاوازە و چەندکەسـێك وەك کۆمیسۆنی بەدوادا چوونی ناوەندی هەڵدەبژێرێت .

ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی

٣٣ – ئەنجومــەنی یــەکگرتووی ناوەنــدی ســەرجەم بڕیارەکــانی کۆنگرە جێبەجێ دەکات، بەرپرسایەتی کۆنگرە لەئەستۆ دەگرێت .

٣٤- ئەنجومــەنی یــەکگرتووی ناوەنــدی هــەتا بەســتنی کــۆنگرەی یەکــەمی ڕێکخراوەکــان بــەرزترین ناوەنــد و بەرپرســی ڕێگەپێــدراوی ڕێکخراوەکانــە و ســەرجەم کاروبارەکــانی ناوەنــد و شــارەکان بــەپێی پرۆگرام و پەیرەوی ناوخۆ بەڕێوەدەبات .

٣٥- ئەنجومــــەنی یــــەکگرتووی ناوەنــــدی ئێــــستا دەتوانێــــت ئەندامەکانی خـۆی لـەنێوان ئەندامـەکانی چالاکی ڕێکخراوەکـان هـەتا ئاستی ٤٥ کەس هەڵبژێرێت.

٣٦- ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەنـد بـۆ ڕاپەڕانـدنی کاروبارەکـانی خـۆی چــەند کەسـێك وەك شـاندی بەڕێوەبەرایــەتی ناوەنــدی کــە ژمارەیان ٧ بۆ ١٥ کەس دەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ دیاری دەکات .

ئەرکەکانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی، چاودێری و ڕاپەڕانـدنی ئـەو ئەرکانەیە کە خراوەتە ئەستۆی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی.

٣٧- شاندی بەڕێوەبەرایەتی بۆ باشتر بەرەو پێشچوونی کارەکـانی، بـەم شـێوەیەی لای خـواردوە ئەرکـەکان لـەنێوان ئەندامـەکانی خـۆی دابەش دەکات :

١ – نوسینگەی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەند کە ژمارەیان پێـنج

کەسە بۆ ڕاپیکردنی کارەکان .

ب – کومیسیۆنی ڕێکخراوەیی ناوەندی .

پ – کومیسیۆنی بانگەشەی ناوەندی .

ت – کومیسیۆنی دارایی و ئابووریی ناوەندی .

ڕوونکردنـــەوەی یەکـەم – کومیـسیۆنەکان مـاڤ ئـەومیان هەیـە کەلـەنێوان ئەنـدامانی ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـدی و ئەنـدامانی ڕێکخراوەکان، ئەندامەکانیان هەڵبژێرین.

ڕوونکردنـــەوەی دووەم – هەڵبـــژاردنی بەرپرســـان و ئەنـــدامانی کومیسیۆنەکان شەش مانگ جارێك بەڕێوە دەچێت .

ڕوونکردنــــەوەی ســـێ یـــەم – بەرپرســـان و کومیـــسیۆنەکان لەبەرامبـــەر کۆبوونـــەوەی شـــاندی بەڕێوەبەرایـــەتی ناوەنـــدی بەرپرسیارن.

٣٨- ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەنـدی لـەنێو ئەندامـەکانی خۆیـدا چـــەند کەســـێکیش وەك کۆمیـــسیۆنی بـــەدوادا چـــوونی ناوەنـــدی کەژمارەیان ٣ بۆ ٩ کەس دەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ هەڵدەبژێرێت .

کومیـسیۆنی بەدواداچـوونی ناوەنـدی چاودێری سـەرجەم کـار و کارەکانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی و کومیسیۆنەکانی ناوەنـدی دەکـات و ڕای خـۆی لـەو بارەیـەوە دەداتـە ئەنجومـەنی یـەکگرتووی ناوەنـدی، کومیـسیۆنی بەدوادچـوونی ناوەنـدی هـەرکاتێك ئاگـاداری سەرپێـچی شاندی بەڕێوەبەرایەتی ناوەنـدی بێـت مـاڤ ئـەوەی هەیـە ئەنجومـەنی یـــەکگرتووی ناوەنـــدی بانگهێـــشت بکـــات و داوای لێبکـــات بـــۆ ساخکردنەوەی شاندی بەڕێوەبەرایەتی .

٣٩- ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی شوێنێکە بۆ بەدواداچوونی شکاتی ئەندامان و ئەو کەسانەی دەرکراون و رێکخراوەکان. سزادانی ئەو کەسانەی کە تووشی هەڵە بوون ئەرکی ئەو ئەنجومەنەیە .

٤٠- کۆبوونەوەی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی ئەبێ لانیکەم سێ مانگ جارێ بێت و گوێ لە هەواڵەکانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی بگرێت .

٤١- ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی ماف ئەوەی هەیە سەرجەم کۆڕەکان بانگهێشت بکات، هەڵبژاردنەکانی شاندی بەڕێوەبەرایەتی رێکخراوەکان و ئەنجومەنەکان دووبارە بکاتەوە .

٤٢- ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی ماف ئەوەی هەیە بەپێی پێویست بۆ بەشێك لەرێکخراوەکان پەیڕەوی ناوخۆ دابنێت و کاری پێبکات .

٤٣- پەیڕەوەی ناوخۆی هەر یەکە لەرێکخراوەکان بەپێشنیاری رێکخراوەکە لەلایەن ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندییەوە پەسند دەکرێت .

**ئەنجومەنی باڵای کرێکاران و زەحمەتکێشان و وەرزێرانی ئێران**

٤٤- ئەندامانی ئەنجومەنی یەکگرتووی ناوەندی، رێکخراوەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی ناوەندی وەرزێرانی ئێران ئەنجومەنێکی هاوبەش پێك دەهێنن لەژێر ناوی (ئەنجومەنی باڵای کرێکاران و زەحمەتکێشان و وەرزێرانی ئێران) و لەسەرجەم کارەکاندا هاوکاریی نزیك و هاوڕێیانەیان پێکەوە دەبێت.( پەیرەو پرۆگرامی ئەم ئەنجومەنەیش لەلایەن خۆیانەوە

ئامادەو کاری پێدەکرێت.)

ئـەم پـەیڕەوە ناوخۆیـە کەلـە ٤٤ خـاڵ دا ئامـادەکراوە، لەلایـەن ئەنجومـــەنی یـــەککگرتوی ناوەنـــدی، ڕێکخراوەکـــانی کرێکـــاران و زەحمەتکێـشانی ئێرانـەوە پەسـندکراوەو هـەتاوەکو بەسـتی کـۆنگرەی یەکەمی ڕێکخراوەکان کاری پێدەکرێت .

## ڕێکخراوی وەرزێران

## پەیڕەو و پرۆگرام

١- هەوڵـدان بـۆ دانـانی یاسـایەك کـە تیـادا پێوەندییـەکانی نێـوان خاوەن زەوی و جوتیار بەشێوازێکی دادپەروەرانە دیار کرابێت .

٢- هەوڵـــدان بـــۆ وەرگرتنـــەوەی ئـــەو زەوییانـــەی کـــە بەگوشـــار لـەجوتیاران وەرگـیراوەو کەسـانێکی دیکـە بوونەتـە خـاوەنی و کـڕینی زەوی بەشـێوازی ڤیـستی درێژخایـەن و دابەشـکردیان بەسـەر ئـەو جوتیارانەی کە زەوییان نیە و تاپۆ کردنی ئەو زەوییانە بۆیان.

٣- هەوڵـــدان بـــۆ هـــەموارکردنی یاســـای زەوی و هاوکـــاری بـــۆ گەڕاندنەوەی ئەو زەویانەی کە لەژێر گوشاردا لەجوتیاران وەرگیراوە .

٤- ڕێکخـستنی یاسـایەك بـۆ سەرپەرشـتیکردنی پێوەندییـەکانی نێوان خاوەن زەوی و جوتیار بە پێی بنەماکانی مافی مرۆڤ .

٥- هەڵوەشـــاندنەوەی ســـەرجەم ئـــەو داســـەپاندنانەی خـــاوەن زەویەکان بەسەر جوتیاراندا، لەوانە کاری زۆرەملێ، کـاری نیـوەو نیـوە چڵ، پێـدانی دەستخۆشـانە لـەکاتی شـاییدا بـەکوێخا و خـاوەن زەوی و پێدانی پێشکەشی لەکاتی هەلگرتنەوەی بەرو بوومدا .

٦- لەبەرچــاوگرتنی ڕووداوەسرووشــتییەکان لەلایــەن خــاوەن زەوییەکانەوە .

٧- هەوڵــدان بــۆ پێکهێنــانی بــانکی کــشتوکاڵی لــە شــارەکان و شارەدێکاندا و سەرپەشتی سەرجەم چالاکییەکانی بـۆ ئـەوەی یارمـەتی جوتیـارانی کەمـداهات و دەسـتکورت بـدات و پێـشگرتن لەهـەر جـۆرە ساختە و ساختەکارییەك .

٨- دامەزراندنی ناوەندگەلێك بۆ یارمەتیکردنی جوتیاران لەبواری دابینکردنــی ئامرازەکــان ( لەوانــە مەکینــەی جــووت، جەنجــەڕ، چـەڵتووككوت و، لـەناو بردنـی نەخۆشـییەکانی گـژوگیا و پێکهێنـانی نوسینگەیەك بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ جوتیاران.

٩- هەوڵــدان بــۆ پێکهێنــانی ناوەندگــەلی تیمارگــەری لەشــوێنی گونجاودا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بلاّو لەنێو ئاژەڵەکاندا .

١٠- ئامادەکاری بـۆ بەرزکردنـەوەی نرخـی ئاورێـشم و لۆکـەو هـی دیکـە کـە لەلایـەن دەوڵـەت و خـاوەن سـەرمایەکانەوە لـە وەرزێـران دەکڕدرێت و پێشگرتن لە هەرچەشنە ساختەکارێك لەو بوارەدا .

١١- هەوڵدان بۆ بیمـەکردنی وەرزێـران لـە بابـەت ئاگرکەوتنـەوە و وشکە ساڵی و هی دیکە .

١٢- هەوڵــدان بــۆ دابینکردنــی بنکــەی تەنـدروســتی لەلادێکانــدا لەلایەن حکومەتەوەو چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بەبێ بەرامبەر .

١٣- یارمەتیدان بۆ بەرەو پێشبردنی کاری دەستی وەرزێران لەوانـە قوماشی ئاورێشم و هـەروەها بـەرەو فەرشـو هـی دیکـە ( هەڵبـەت ئـەم کارە دەستیانە تایبەتە بەئافرەتان ) .

١٤ – دروست کردنی قوتابخانە لەسەرجەم لادێکانداو دابین کردنی مامۆستای لێهاتوو بەمووچەی شیاوەوە .

-١٥ دابینکردنی دادگا بۆ پێداچوونەوە بە شکات و داواکارییەکانی جووتیاران و پشتیوانیکردن لەوان لە بەرامبەر هەر چەشنە دەستدرێژی و چەوساندنەوەیەکدا.

-١٦ هەوڵدان بۆ پێکهێنانی فەرمانگەی ئاو هەڵکەندنی قەنات و بیری قووڵ و دامەزراندنی بەنداو بۆ جووتیاران .

-١٧ ئاسانکاری بۆ هاوسەرگیریی وەرزێران و بنەماڵەکانیان .

-١٨ دابینکردنی کوێخا بۆ لادێکان و سەرپەرشتیکردنیان بەمووچەی شیاو بۆ ئەوەی لە بواری ئابوورییەوە پێویست نەکات دژ بەجوتیاران کار بکەن.

ڕوونکردنەوە – هەڵبژاردنی کوێخا بەدەنگی نهێنی و ڕاستەوخۆی خەڵکی لادێکە دەبێت .

-١٩ دژایەتی بەرەنگاربوونەوەی هەرچەشنە کاری خراپ لەوانە لەشفرۆشی و دەرکردنی لەشفرۆشەکان لە لادێکان .

-٢٠ هەوڵدان بۆ دژایەتیکردنی بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان و مەیخواردنەوە بۆ گەنجان لەلادێکاندا .

-٢١ دەمەزراندنی کۆڕو کۆمەڵ بۆ جووتیاران و هاندانیان بۆ بەشداریکردنیان لەو چەشنە کۆڕوکۆمەڵانەدا بۆ ڕوونکردنەوەی بیرو هۆشی جوتیاران.

-٢٢ پێکهێنانی کۆڕی هونەری لەلادێکاندا بۆ سەرقاڵکردنی خەڵك، تا بەو شێوەیە تۆزێك لەماندووییان بحەسێتەوە.

٢٣- دابینکردنی سوپەرمارکێت لە لادێکاندا بەمەبەستی دابینکردنی کەلوپەل بۆ خەڵکی لادێکە و بەشێوازێکی دادپەروەرانە.

٢٤- هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ پشتیوانیی بێوەژنەکان و هەتیوەکان و دابینکردنی کاری شیاو بۆ ژنان .

**٤٣- ( پەیڕەوو پرۆگرامی ئەنجومەنی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران، ١٣ / ٩ / ١٣٢٥ ی .هـ ( ١٩٤٧ ز ) )** [48]

**زەحمەتکێشانی ئێران یەکبگرن**

**پێشەکی**

کرێکاران، وەرزێران، ڕۆشنبیرانی ئێران : ئێوە دەزانن ئەوەی پێویستی ژیانەو بێ ئەوانە ژیان ناکرێت، واتە دەستکەوتی جوتیاران پێکهاتەکانی دیکە بەهۆی سەرمایەی دارایی کەسانێك ( حکومەت یان کەسانێك ) و هێزی لەش و مێشکی ئێوە پێکدێت .

هەربۆیەش دەبێت هەروا کەبەرژەوەندی خەڵکانێك لەبواری بەکارهێنانی سەرمایەوە پارێزراوە، بەرژەوەندی ئێوە زەحمەتکێشان کە سەرمایەی لەش و مێشکتان شەوو ڕۆژ بەکار دێنن و بەشێوەیەکی بەردەوام و ماندووی نەناسانەوە کار دەکەن و بەردەوام توشی کێشەو گرفت دەبن پارێزراو بێت و دەبێت لەو هەموو بەرهەمەی کە ئێوە بەدەستی دێنن بێبەش نەکرێن، بەڵام بەگشتی ڕەزیلی و قازانجپەرستی خاوەن سەرمایەکان ( حکومەت یان کەسایەتیەکان ) دەبێت هۆکارێك بۆ لەناوچوونی بەرژەوەندیەکانی ئێوەو لەو کاتەدا کەئەوان بە مەلیۆنەها قەران بەهۆی ڕەنج و زەحمەتی ئێوەوە قازانج دەکەن،

---

[48] – خودی بەڵگەکە هینی یوسف ئیفتخاری یە .

هەزاران کەس لەنێوە بەدەستی برسیەتی و هەژاریەوە، هێزی لەش و مێشکی خۆیان لەدەستدەدەن و لەناو دەچن.

### جوتیاران و زەحمەتکێشانی ئێران

ئێران ولاتی خۆشەویستی ئێومیە، واتە ولاتێکە کە دەبێت لە ئاو، زەوی و هەر شتێکی دیکە کە تیایدایە یان بەهۆی زەحمەتی ئێوەوە پێکدێت، بەشێوەی تەواو و بە وێنەی مرۆڤ تیایدا بەشتان هەبێت، واتە بەجوانی بتوانن بخۆن، بخۆنەوە، لەبەری بکەن و لەپێویستیەکانی تەندروستی و رۆشنبیری کەڵکوەربگرن .

### زەحمەتکێشان و رۆشنبیران :

ولاتی ئێران لە هەزاران ساڵ پێش ئێستاوە خاوەن ئاستێکی باش لە زانست و پیشەسازی بووە و بەهێزی مێشکی رۆشنبیران، زانست و پیشەسازی بەرەو پێشچووەو بەهێزی پۆلایینی لەشی زەحمەتکێشان، پیشەسازی و کشتوکاڵ بەرەوپێشچووە و ژیانی خەڵکەکەی رۆژ بەرۆژ بەشێوەیەکی پێشکەوتوو دابین بووە .

ئەم ولاتە بەرینە لەپاش بەجێماوەی باوو باپیرانی نەترس و بوێر و جەرگەکانمانەو لەبەرئەوەی منداڵەکانیان نەکەونە بەر چەپۆك و دەستدرێژی داگیرکەرانەوە، ملوێنەها کەس لەپیاوانی نەتەوە پەرست و زەحمەتکێشی ئەم ولاتە لەپێناویدا خوێنیان رژاوە. لەبەر ئەوەی هیچ دەستکەوتێك لەم جیهانەدا بەقەد ئازادی بەنرخ نیە و بەتەنها لەژێر سێبەری سەربەخۆی و ئازادی و دیموکراسیی راستەقینەدا بەرژەوەندییەکانی مەدەنی و ئابوری بەتایبەت زەحمەتکێشان بەدیدەکرێت .

**کرێکاران، وەرزێران و رۆشنبیرانی ئێران :**

ئەگەر قازانجپەرستی بەشێك لەسەرمایەداران و داردەستان و خۆفرۆشانی دەرەکی و ناوەکی بونەتە هۆکارێك بۆ هەژاری و نەهامەتی و بەهۆی نەبوونی کەرەستەی تەندروستی، هەزارەها کەس لەنێوە لەبارودۆخێکی خراپدا بەسەر دەبەن و لەپێناو ویستەکانی رۆشنبیری و زانست بێبەش کراون . دەبێ یەکگرتووبن و دژ بەوان خەبات بکەن و لەو پیلانانەی کە بۆ پەرژوبلاو کردنی یەکریزی نێوەو لەباربردنی هەوێنی خەبات لەدلّتاندا دایانرشتووە ئاگاداربن و پوچەلّی بکەنەوەو بژیوی ژیانی خۆتان و مندالّەکانتان بۆ هەتاهەتایی دابین بکەن و چیدی نەهێلّن چەوسێنەران لەوە زیاتر دەستدرێژی بکەنە سەر مالّ و ژیانتان .

**بەیرەوو پرۆگرامی رێکخراوەکانی کرێکاران**

١- پێکهێنانی هەستی هاوکاری و هاوخەباتی لەنێوان سەرجەم کرێکاران و زەحمەتکێشان بۆ یەکریزی لە دابینکردنی بەرژەوەندیەکانیان و خەبات بۆ بەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانیان .

روونکردنەوە – هاوکاریی کرێکاران بەمەبەستی دابین کردنی مافە ئابورییەکان دەبێت و هەر بۆیەش رێکخراوەکان لە پێشهاتە سیاسییەکاندا بەهیچ شێوازێك دەستوەردان ناکات و سەر بەهیچ رێکخراوەو حیزبێکی سیاسی نیە .

٢- بەرەسمی ناساندنی رێکخراوە کرێکارییەکان .

٣- پشتیوانیکردن لە سەرجەم مافە مەدەنی و ئابوورییەکانی کرێکاران .

٤- ناچارکردنی حکومەت، خاوەنکارەکان و کرێکاران بۆ پشتیوانیکردن لەبەرهەمە ناوخۆییەکان، بۆ ئەوەی بەهۆی هاوردەکردنی کەلوپەلی بیانیی کەرتی پیشەسازی ناوخۆ و لەکۆتاییشدا ژیانی کرێکاران توشی گرفت نەبێت .

٥- هەوڵدان بۆ نوسینەوەی یاسای کارو بەرێکردنی بۆ پەرلەمان بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان، بەشێوازێك سەرجەم مافەکانی کرێکاران تیایدا لەبەرچاو گیرابێت.

٦- هەوڵدان بۆ باشترکردنی ژیان و گوزەرانی کرێکاران.

٧- هەوڵدان بۆ دابینکردنی خانوو لەلایەن خاوەنکارەکانەوە لەنزیك کارەکاندا و فرۆشتنەومیان بەکرێکارەکان بەقیستی درێژخایەن .

٨- دابینکردنی کەرەستەی هاتوو چۆ بۆ ئەو کرێکارانەی کە شوێنی ژیانیان لەکارەکەیانەوە دوورە

٩- هەوڵدان بۆ تەندروستکردنی بینای کارگەکان و دابینکردنی بنکەی تەندروستی لەناو کارگەکاندا و پێکهێنانی سندوقی یارمەتی کرێکاران بۆ کاری پێویست.

١٠- دابینکردنی بیمە بۆ سەرجەم کرێکاران لەوانە :بیمەی پەککەوتەیی و بێکاری و هی دیکە .

١١- هەوڵدان بۆ چەسپاندنی یاسای ماوەی کارکردن کەهەشت کاتژمێر لەرۆژێکداو چل وهەشت کاتژمێر لەحەفتەیەکدا دەبێت جگە لەو کارە مەترسیدارانەی کە لەماوەی کارکردن تیایدا دەبێت کەمتر لەو ماوەیە بێت.

١٢- بەرەسمی ناساندنی پشووی رۆژی هەینی و پشووە رەسمییەکانی دیکە بەلەبەرچاوگرتنی مووچەکانیان بۆ سەرجەم کرێکاران.

١٣- جگە لەو ماوەیە کە بۆ کار دیاریکراوە لەکاتێکدا کرێکار لەلایەن خاوەنکارەوە کاری زیاتری پێ بسپێردرێت دەبێت لەسەدا پەنجای مووچەکەی بەزیادە بۆ هەژمار بکرێت.

١٤- کرێکارانێك کە بەردەوام بەشەودا کار دەکەن پێویستە لەسەدا پەنجای مووچەی زیادەیان بۆ لەبەرچاو بگرێت .

١٥- مافی بەکارهێنانی پانزەرۆژ پشوو لەساڵێکدا بەلەبەرچاوگرتنی مووچەکانیان.

١٦- مافی بەکارهێنانی سێ مانگ پشوو بۆ ژنانی دووگیان، مانگ و نیوێك پێ و مانگ و نیوێك دوای منداڵبوون بەلەبەرچاوگرتنی مووچەکانیان .

١٧- هاوتا بوونی مووچەی ژن و پیاو لەکاتێکدا کارەکانیان وەکیەك وابێت .

١٨- ناچارکردنی خاوەنکار بۆ رێزگرتن لەکرێکار، بەشێوەیەك کەهیچ لایەنێك بەرامبەر بەلایەنەکەی دیکە سووکایەتی نەکات .

١٩- پێشگرتن بە لەسەرکاردەرکردنی کرێکار بەبێ هیچ پاساوێك.

٢٠- هەوڵدان بۆ پێکهێنانی ئەنجومەن لەنێوان کارگەکاندا بەبەشداریی نوێنەری کرێکاران و خاوەنکار بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی نێوانیان و باشترکردنی بەرهەمی کارگەکە .

٢١- بەرەسمی ناساندنی مافی مانگرتن و خۆپیشاندان بەمەبەستی

دەستەبەر کردنی داخوازییەکانی کرێکاران بەلەبەرچاو گرتنی مووچەکانیان.

٢٢- ناکۆکی نێوان خاوەنکارو کرێکاران دەبێ لەپێشدا لەلایەن ڕێکخراوەکانەوە چارەسەر بکرێت .

٢٣- خەبات دژی ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی خراپی بارودۆخی وڵات و ئابووری کرێکاران و لەناو بردنی بژیویی ژیانیان .

٢٤- پێکهێنانی قوتابخانە بۆ نەخوێندەواران و کردنەوەی خولی بەهێزکردنی کرێکاران و لەنێو کارگەکاندا بۆ پەروەردەکردنی کرێکاری لێهاتوو.

٢٥- ناچار کردنی حکومەت بۆ دابین کردنی کار بۆ بێکاران و خەبات دژی بێکاری .

٢٦- ناچارکردنی حکومەت بۆ دانانی سندوقی بێکاری بۆ کاتی پێویست و چاوەڕواننەکراو.

٢٧- پێکهێنانی کۆمپانیای هاوکاری و سندوقی هاریکاری بۆ کاتی بێکاری و هاوسەرگیری و دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیانی کرێکاران .

٢٨- پێش گرتن بەلەسەر کار دەرکردنی کرێکار بەبێ ئاگاداری ڕێکخراوەکان .

٢٩- دابینکردنی یانەی وەرزش وخۆشبژیویی جۆراوجۆر بۆ کرێکاران.

پەیڕەو پرۆگرامی ڕێکخراوەکانی وەرزێران

١- پێکهێنانی هەستی هاوکاری لەنێوان سەرجەم جوتیاران و

وەرزێران، بەشێوازێك كە بەتەواوەتی هەست بەهاوسۆزی و هاوكاری بكەن . بۆ دابین كردن و دەستەبەركردنی سەرجەم مافە مەدەنی و ئابوریەكان یان هاوخەبات و یەككگرتووبن .

ڕوونكردنەوە – هاوكاری جوتیاران و وەرزێران پێكەوە بەمەبەستی دەستەبەر كردنی مافەكانیان دەبێت و هەر بەو هۆیەشەوە، ڕێكخراوەكانی جوتیاران لەهیچ پێكهاتەیەكی سیاسی دا دەستوەردان ناكات و سەر بەهیچ ڕێكخراوێك و حیزبێكی سیاسی نیە .

٢- بەڕەسمی ناساندنی ڕێكراوەكانی وەرزێران .

٣- پشتیوانی كردن لەسەرجەم مافە مەدەنی و ئابوریەكانی وەرزێران لەبەرامبەر خاوەن زەویەكان و حكومەت و پیاوەكانی دا .

٤- ناچاركردنی حكومەت و خاوەن زەویەكان بۆ پشتیوانی كردن لەبەرهەمە كشتوكاڵیەكانی ناوخۆو پێش گرتن لەهاوردەكردنی بەرهەمی دەرەكی .

٥- هەوڵدان بۆ دانانی یاسایەكبۆ دابین كردنی پێوەندی دۆستانە لەنێوانخاوەن زەوی و وەرزێراندا بەلەبەچاو گرتنی مافەكانی هەردوو لایەن .

٦- هەوڵدان بۆ باشتر كردنی ژیان و گوزەرانی وەرزێران .

٧- هەوڵدان بۆ دابین كردنی خانوو زەوی بەپێی پێویست بۆ هەر وەرزێرێك لەلادێكەی خۆیدا هەتا ئەو ڕادەیەی كەبتوانێت ژیانی خۆی و بنەماڵەكەی دابین بكات .

٨- ناچار كردنی حكومەت بۆ دابەشكردنی زەوی بەبێ بەرامبەرو

لەژێر چاودێری ڕێکخراوەکان دا لەنێوان وەرزێراندا .

٩- ناچار کردنی خاوەن زەوی و وەرزێر بۆ ڕێزگرتنی دوولایەنە .

١٠- دژایەتی لەبەرامبەر زۆرە ملێ و سەپاندنی نایاسایی بەرامبەر بەوەرزێران لەلایەن خاوەن زەویەکان و پیاوانی حکومەت .

١١- پێشگرتن بەلێسەندنەوەی زەوی لە وەرزێر لەلایەن خاوەن زەویەوە بەبێ هۆ .

١٢- هەوڵدان بۆ پێکهێنانی ئەنجومەن لەمنێ و لادێکاندا بەبەشداری نوێنەری وەرزێران و خاوەن زەوی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوانیان و باشتر کردنی بەروبوومەکان .

١٣- ناکۆکی لەنێوان وەرزێران و خاوەن زەوی دا دەبێ لەپێشدا لەڕێکخراوەکان چارەسەر بکرێت .

١٤- هەوڵدان بۆ پاراستنی ژینگە لەلادێکان و دابین کردنی بنکەی تەندروستی لەسەرجەم لادێکاندا .

١٥- هەوڵدان بۆ بیمەکردنی وەرزێران لەبابەت بەروبومەکانیان و قەرەبوو کردنەوەیان لەپاش هەر ڕووداوێکی نەخوازراو لەلایەن حکومەتەوە .

١٦- دژایەتی کردنی ئەو کەسانەی کەدەبنە هۆکاری خراپی باری ئابووری وڵات و لەکۆتایشدا دەبنەهۆی لەناوچوونی بەرژەوەندیەکانی وەرزێران

١٧- دژایەتی کردن لەگەڵ دیاردەی بێکاری دابین کردنی کار بۆ بێکارەکان .

١٨- دامەزراندنی قوتابخانە بۆ کەسانی نەخوێنەدەوارو دانانی

خولی تواناسازی بۆ وەرزێران بۆ ئەوەی وەرزێران بەتەکنیکی سەردەم لەو بوارەدا ئاشنا بکرێن .

١٩- دامەزراندنی کۆمپانیای هاوکاری و سندوقی هاریکاری لەلادێکاندا بۆ مەبەستی دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیانی وەرزێران و یارمەتی کردنیان بۆ کاتی بێکاری و هاوسەرگیری و هی دیکە .

٢٠- دژایەتی کردن لەگەڵ خراپڕاگرتنی زەویەکان و بەکار نەهێنانیان و هەوڵدا بۆ پێشکەوتن لە بواری گشتوکاڵ لەڕێگای ئاوەداکردنی ئەو زەویانە، دروست کردنی سەد، بەکارهێنانی ڕووبارەکان، دروست کردنی قەنات و بیری قوڵ و شتی دیکە لەو بارەیەوە .

٢١- هەوڵدان بۆ ناچار کردنی حکومەت بۆ دابین کردنی کەرەستەی پێویست بۆ گۆڕینی شێوازی کشتوکاڵ بەسیستەمی فەرمانۆی لەسەرجەم لادێکانداو بەیەکسان لەنێ و وەرزێران دا دابەش بکرێت .

٢٢- هەوڵدان بۆ زۆرترکردنی سەرمایەی بانقی کشتوکاڵی و کردنەوەی لق لەسەرتاسەری وڵات بۆ یارمەتیکردنی وەرزێران .

٢٣- هەوڵ بۆ پێشخستنی پیشەی دەستی لەوانە فەرش چنین بەشێوەیەك کەقازانجەکەی بچێتە گیرفانی ئەو کەسانەی کەکار دەکەن

٢٤- هەوڵدان بۆ دامەزراندنی بنکەی بەیتەریە لەسەرجەم لادێکان دا بۆ پێشگرتن لە نەخۆش کەوتنی ئاژەڵەکان .

٢٥- دامەزراندنی یانە ڕیازی و خۆشبژیوی بۆ وەرزێران .

پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و وەرزێران

مەرجەکانی بوون بەئەندام

ئەم کەسانەی لای خوارەوە ماف ئەندامیەتیان پێ دەبەخشرێت :

١- کرێکـــاران و وەرزێـــران، فەرمانبـــەرانی پلـــە نـــزم و ئـــەو ڕۆشـنبیرانەی کـەکار دەکـەن و بـەهۆی دەسـتڕەنجی خۆیانـەوە ژیـان بەسەر دەبەن .

٢- پەیڕەو پرۆگرامی ڕێکخراوەکە قبوڵ بکەن .

٣- لەنێ و خەڵکدا بەدناو نەبن .

٤- ئەندامێکی ڕێکخراوەکان پشتگیریان بکات .

٥- تەمەنیان لەسێزدەساڵ کەمتر نەبێت .

٦- ئەنـدامی حیـزب و ڕێکخـراوە گـەلێك نـەبن کەچالاکیەکانیان دژی بەرژەوەندی گشتی و سەربەخۆی وڵات بێت .

ئەرکەکان

ئەنـــدامانی ڕێکخراوەکـــان ئـــەم ئەرکانـــەی لای خوارەوەیـــان لەئەستۆیە :

١- فەرمانەکانی ڕێکخراوەکەیان جێبەجێ بکەن .

٢- واز لـــەکارەکانیان نـــەهێنن و بـــەجوانی کـــار و کارەکانیـــان ڕاپەڕێنن .

٣- لـەنێو بنکـەکان و کۆبوونـەوەکان دا بەبـەردەوام بەشـدارییان هەبێت .

٤- لەسـەدا یـەکی مووچـەکەیان وەك و مـاف ئەندامـەتی بدەنـە

ڕێکخراوەکە .

ڕوونکردنەوە – ئەو ئەندامانەی کەبەهەر هۆکارێکەوە لەکارەکانیان دوور دەخرێنەوە هەتا ئەو کاتەی دەچنەوە سەر کار ئەو برە پارەیان لێ وەرناگیرێت .

ئەو کەسانەی کەبێ بەش دەبن لەماف ئەندامیەت :

١- ئەو کەسانەی کەکار ناکەن و لەسەر هەژماری خەڵکانی دیکە ژیان دەکەن .

٢- کەسانی بێکار .

٣- کەسانی بەدناو قەزانجپەرست .

دەرکردن

ئەو ئەندامانەی کە خاوەنی ئەم مەرجانەی لای خوارەوە ئەبن لەرێکخراوەکان دەردەکرێن :

١- ئەو کەسانەی کەسێ جار لەسەر یەك بەبێ پاساو لەکۆبوونەوەکان دا بەشداری نەکەن .

٢- ئەو کەسانەی کەدژی پەیرەوو پرۆگرامی ڕێکخراوەکان هەڵسوکەوت دەکەن و فەرمانەکانی ڕێکخراوەکان جێ بەجێ ناکەن .

٣- ئەو کەسانەی کەبەبێ بیانوو سێ مانگ ئەو برەپارەیەی کەوەك و پارمەتی بەرێکخراوەکان دیاری کراوە خۆڕادەبوێرن .

٤- لەنێوان ئەندامەکاندا ناکۆکی ساز بکەن و ببنە هۆی پەککەوتنی چالاکیەکانی ڕێکخراوەکان .

٥- ئەوکەسانەی کەدەبنە ئەندامی ڕێکخراوەگەلی هاوشێوەی دیکەو یان دەبنە ئەندامی ڕێکخراوەو حیزب گەلێك کەدژی

بەرژەوەندی گشتی وسەربەخۆیی وڵاتن .

ڕوون کردنـــەوە – ئەنـــدامی دەرکـــراو مـــافی ئـــەوەی هەیـــە کەلەئەنجومەنـەکانی لێکۆڵینـەوەی شارو پارێزگـاو ناوەنـدو هـەروەها لەکۆنگرەدا شکات بکات و بێگوناحی خۆی بسەلمێنێت .

بەگشتی

١- ســەرجەم هەڵبــژاردنی ڕێکخراوەکــان بەدەنگــدانی نهــێنی و زۆرینە دەکرێت .

٢- هــەموو کۆبوونەوەیەکبەبەشــداری دووبــەش لەســێ بەشــی ئەنــدامانی ڕەسمیــەتی دەبێــت و دەنگــی نیــوە زائیدیــەکی ئەنــدامان لەبەرچـاو دەگیرێـت و کەمینــە دەبێــت پاشــڕەوی دەنگــی زۆرینــەی ئەندامان بن

٣- ســەرجەم هەڵبژاردنــەکان جگــە لەهەڵبــژاردنی کۆمیتــەی ناوەندی لەکۆنگرەدا کەدووساڵ جارێك بـەڕێوە دەچێت، سـاڵی جارێـك بەڕێوە دەچێت .

٤- ئەنجومــەنی ناوەنــدی کـاتی لەلایــەن شـاندی پێـك هێنــەرەوە دیاری دەکرێن و هەتا بەستنی کۆنگرە بەفەرمی دەناسـرێن . هـەروەها ئەندامانی ئەنجومەنی ناوەندی بەهاوئاهەنگی لەگەڵ شاندی پێکهێنەر بۆ ڕاپەڕانـدنی کـار و کارەکان دەتـوانن لـەنێ و ئەندامانـدا کەسانێکی دیکە دیاری بکەن بۆ بەشداری لەئەنجومەنی ناوەندی دا .

ئەنجومــەنی ناوەنـدی کاتێـك لـەنێو خۆیانـدا کۆمیتـەی ناوەنـدی کاتی دیاریدەکەن .

٥- گۆڕانکـاری لـەنێ و بڕگـەکانی پـەیڕوو پرۆگـرام بەدەنگـدانی

کۆنگرە پەسند دەکرێت .

ئەنجومەنەکان

١- سەرجەم ئەنجومەنەکان لەیەکەم کۆبوونەوەیان داسەرۆکێك، جێگرێك، دوو بەرپرس و پەیامنێرێك بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن .

٢- ئەنجومەنەکان لانیکەم مانگی جارێك کۆبوونەوە ساز دەکەن .

٣- سەرجەم ئەنجومەنەکان لەبەرامبەر رێکخراوەکەیان دا بەرپرسیارن بەڵام سەرجەم چالاکیەکانیان لەپێشدا نەبێت لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیەوەپەسندکرابێت و دواتر لەلایەن بەرپرسانی ئەنجومەنەکەوە بچێتە بواری جێ بەجێ کردنەوە .

٤- فەرمانەکانی رێکخراوەکان لەدوای پەسەنکردنیان لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیەوە بەدەستی ئەنجومەنەکان جێ بەجێ دەکرێت .

٥- چاودێری کردنی سەرجەم چالاکیەکان و رێکخستنی ئەنجومەنەکەو جێ بەجێ کردنی پەیرەوە ناوخۆییەکان بەدەستی ئەنجومەنەکان دەبێت .

٦- هەوڵدان بۆ باشتر کردنی باری دارایی، رۆشنبیری، تەندروستی کرێکاران و وەرزێران یەکێکی دیکەیە لەکاروکارەکانی ئەنجومەنەکان .

٧- چارەسەرکردنی ناکۆکی لەنێوان کرێکاران و خاوەنکارەکان یەکێکی دیکەیە لەئەرکەکانی ئەنجومەنەکان یان نوێنەرەکانیان .

٨- ئەنجومەنەکان بۆ باشتر راپەراندنی ئەرکەکانیان جگە لەدیاریکردنی شاندی بەرێوەبەرایەتی ماف ئەوەیان هەیە کە کۆمیسیۆن گەلێك لەوانە کۆمیسیۆنی رێکخراوە، بانگەشە، دارایی، بەدوادا چوون و هی دیکە لەدوای پەسندکردنیانلەلایەن کۆمیتەی

ناوەندیەوە بۆ خۆیان هەڵبژێرن .

ڕوونکردنـــەوە – کۆمیـــسۆن گـــەلێك کەلەلایـــەن کۆمیتـــەی ناوەندیەوە دیاری دەکرێن پێیان دەوترێت کۆمیسۆنی گشتی .

**شاندی بەڕێوەبەرایەتی**

١- شاندە بەڕێوەبەرایەتیـەکان بەرپرسـی جێبـەجێکردنی بڕگـە و بابەتەکانی پەیڕەوو پرۆگرامی ڕێکخراوەکانن و لەبەرامبەر چاودێری کردنیان دادەبێ ولاّم دەرەوەبن .

٢- شـاندەکانی بـەڕێوەبردن دەبـێ یـنی کـەم حـەوتوی جارێـك کۆبوونەوە سازبکەن .

٣- شـــاندەکانی بـــەڕێوەبردن ( جگەلەشـــاندی بەڕێوەبەرایـــەتی بنکـەکان ) لـەنێ و خۆیـان دا سـەرۆکێك، جێگرێـك، دووبـەرپرس، ژمێریارێك هەڵبژێرن .

ڕوونکردنەوە- لەئەنجومەنە بچووکەکان دا لەوانەیـە بەشـێك لـەو کەسانە دیاری نەکرێن .

٤- هـــەر ئەنـــدامێك لەشـــاندی بەڕێوەبەرایـــەتی دا پێویـــستە سەرۆکایەتی یەکێك لەکۆمیسیۆنەکان ومەستۆ بگرێت .

**لیژنەکان**

١- لیژنـەکان لانیکـەم سـاڵی جارێـك کـۆ دەبنـەوەو ئەرکەکـەیان بریتیە لەوەی کەگوێ لەهەواڵەکانی ئەنجومەنـەکان بگـرن و ڕێگایـەك هەڵبـژێرن بـۆ باشـتر بـەرەو پێـشبردنی چـالاکیەکانی ڕێکخراوەکـان ژمـارەی ئەنـدامانی ئـەو لیژنەیـە لەلایـەن کۆمیتـەی ناوەنـدی یـان

کۆنگرەوە دیاری دەکرێت و بەشێوەی فەرمی بەسەرجەم ئەندامانی ڕێکخراوەکان ڕادەگەیەنرێت .

سەرۆك – سەرۆکی لیژنەو ئەنجومەنەکان – و شاندەبەڕێوەبەرایەتیەکان ئەرکی چاودێری کردنی بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەکان و کاری دیکەی لەو بابەتەیان لەئەستۆیەو لەنەبوونی ئەوان دا جێگر ئەورۆڵە دەگێڕێت .

بەرپرس – بەرپرسەکان ئەرکی نوسینەوەی کۆنوسی کۆبوونەوەکان و ناردنیان بۆ سەرەوەی خۆیان و ڕاگەیاندنی بڕیارو فەرمانەکان کەلەسەرەوەی خۆیانەوە هاتووە بۆ ئەندامانی ئەو بەشە لەئەستۆیانە .

پەیامنێر – پەیامنێرەکان ئەرکی کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری پێویست و ڕاگەیاندنیان بە لیژنەکان لەئەستۆیانە .

ژمێریار – پێویستە سەرجەم خەرجی و داهاتەکان و سەرجەم ژمێریاری دارایی چاودێری و هەواڵەکانی بۆ سەرەوەی خۆی بنێرێت .

ئەندامەکانی لیژنەکان، ئەنجومەنەکان و شاندەبەڕێوەبەرایەتیەکان لەوانەیە لەبەرامبەر ئەو کار و کارانەی کەدەیکەن لەدووای پەسندکردنیان لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیەوە بڕە مووچەیەکیان بۆ تەرخان بکرێت .

بەشێك لەداهاتی ڕێکخراوەکان بەواژووی دووکەس ( سەرۆکی شاندی بەڕێوەبەرایەتی و ژمێریار ) خەرجی ڕێکخراوەکە دەکرێت و ئەو بڕەیش کە دەمێنێتەوە دەنێردرێت بۆ ئەنجومەنی شارو پارێزگاو کۆمیتەی ناوەندی بۆ خەرجیی گشتی .

ڕوونکردنەوە – ئەو برەپارەیەی کەلەهەر شوێنێك ( ڕێکخراوە – شـار – پارێزگـا – ناوەنـد ) کۆدەکرێتـەوە بـەواژووی دووکەسـەوە دەخرێتە بانکەوە .

ڕێکخراوەکان

لەهـەر شـوێنێکدا کرێکـارانی کارگەیـەك یـان کانێـك و هـەروەها کرێکارانی هەر پیشەیەك لەوانە ئاسنگەر، دارتاش، کرێکاری بیناسازی، موهەنـدیس و هـی دیکـە و هـەروەها لـە لادێیـەکیش وەرزێرانـی ئـەو لادێیە ڕێکخراوەی تایبەتبەخۆیان پێك دێنن .

بنکەکان – پێکهاتەی ڕێکخراوەکان بریتیە لە بنکەکان و بنکەیش بریتیـە لـەنۆ کـەس لـە کرێکارەکـان و ئـەوانیش بـۆ ڕاپەڕانـدنی ئەرکـەکانیان لـەنێوخۆیان دا شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی هەڵدەبـژێرن . ئەو شاندەیش بریتیە لە سەرۆکێك، بەرپرسێك و ژمێریارێك .

ڕوونکردنـەوە – لـەڕێکخراوەی کارگـەکان دا، کرێکـارانی بەشـە جیاوازەکان بۆ خۆیان بنکەیەك پێك دێنن و ئەگەر هاتوو کەمتر لەنۆ کەسـیش بـوون ئـەوە لەوانەیـە بەشـێك لـە ئەنـدامانی شـاندی بەڕێوەبەرایەتی دیاری ئەکەن .

ئەرکەکانی ئەندامانی بنکـە – ئەنـدامانی بنکـەکان پێویـستە دوو حەفتـە جارێـك کۆبنـەوەو سـەبارەت بـەکار و چالاکیەکانی بنکەکـەو پـەیرەو پرۆگرامـی ڕێکخراوەکـان بـاس و گفتوگـۆ بکـەن . سـەرۆکی بنکەکـە دەبـێ چاودێری کۆبوونـەوەکان بکـات و کـار و کارەکـان ڕێـك بخـات . بەرپرسـی حەوزەکـە دەبـێ ئـەو پارەیـەی کـەوەك و یارمـەتی لەئەندامەکانی وەردەگرێت و پسوولەیان بۆ دەکات بیداتە ژمێریارەکە

و کۆنوسی کۆبوونەوەکان ڕێکبخات .

گروپ – سەرجەم ئەو بنکانەی کەلەزیەك بەشی کارگەیەکدا بوونیان هەیە گروپێك پێکدێنن. لەڕێکخراوانی کرێکارانی پیشەی و وەرزێراندا، نۆ بنکە گروپێك پێکدێنن.

ئەنجومەنی گروپ – سەرجەم سەرۆکی بنکەکانی نێ و گروپەکە ئەنجومەنی گروپ پێك دێنن و هەر کاتێك زۆرینە بڕیار بدات، کۆبوونەوە ساز دەکەن و سە بارەت بەپێش هاتەکان باس وگفتوگۆ دەکەن

هەڵبژاردنی شاندی بەڕێوەبەرایەتی گروپ و نوێنەری گروپ لەئەنجومەنی ڕێکخراوەکە لەئەستۆی ئەنجومەنی گروپدایە .

شاندی بەڕێوەبەرایەتی گروپ – ئەنجومەنی گروپ بۆ بەڕێوە بردنی کار و کارەکانی خۆی، چەند کەسێك وەك شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەبژێرێت کەژمارەیان سێ بۆ حەوت کەس دەبێت.

ئەم شاندەش لەنێ و خۆیاندا بەڕێوەبەرێك، بەرپرسێك، سندوق دارێك و ژمێریارێك هەڵدەبژێرن.

ئەنجومەنی ڕێکخراوە – نوێنەرانی ئەنجومەنی ڕێکخراوە لەلایەن ئەنجومەنی گروپەکانەوە کەلەهەر نۆ بنکە یەك نوێنەر دەبێت دیاری دەکرێت . هەڵبژاردنی شاندی بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکە و

نوێنەری ڕێکخراوەکە بۆ بەشداریکردن لەئەنجومەنی کرێکاران و وەرزێرانی شارەکە لەئەستۆی ئەنجومەنی ڕێکخراوەکە دەبێت .

ئەنجومەنی ڕێکخراوەکە لانیکەم مانگی جارێك کۆبوونەوە ساز

دەکەن و سەبارەت بە پرسە جۆراوجۆرەکان باس و گفتوگۆ دەکەن .

شاندی بەڕێوەبەرایەتیی ڕێکخراوە – ئەنجومەنی ڕێکخراوەکە لەنێو خۆیاندا سێ تا حەوت کەس وەك شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکە هەڵدەبژێرن. شاندی بەڕێوەبەرایەتیی ڕێکخراوەکە سەرۆك و جێگرێك و سکرتێرێك و ژمێریارێك هەیە.

شاندی بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکە لەبەرامبەر ئەنجومەنی ڕێکخراوەکە وەڵامدەرەوە دەبێت .

ئەنجومەنی کرێکارانی شارەکە – نوێنەرانی ڕێکخراوانی کرێکارانی هەر شارێك ئەنجومەنی کرێکارانی شارەکە پێك دێنن و لانی کەم ساڵی جارێك کۆبوونەوە ساز دەکەن .

هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی کرێکارانی شارەکە و نوێنەرانی ئەنجومەنەکە لەئەستۆی خودی ئەو ئەنجومەنە دەبێت .

لیژنەی کرێکارانی شارەکان – ئەندامانی ئەم لیژنەیە بەدەستی ئەنجومەنی کرێکارانی شارەکە دیاری دەکرێت ولانی کەم مانگی جارێك کۆبوونەوە ساز دەکەن .

لیژنەی کرێکارانی شارەکە لەبەرامبەر ئەنجومەنی کرێکارانی شارەکەدا وەڵامدەرەوە دەبێت و لەنێو خۆیاندا حەوت بۆ یازدە کەس وەك شاندی بەڕێوەبەرایەتی کرێکارانی شارەکە هەڵدەبژێرن . شاندی بەڕێوەبەرایەتی کرێکارانی شارەکە لەبەرامبەر لیژنەی کرێکارانی شارەکە وەڵامدەرەوە دەبێت . ئەنجومەنی وەرزێرانی شارەکەو لیژنەی وەرزێرانی شارەکەو شاندی بەڕێوەبەرایەتی وەرزێرانی شارەکە بەوێنەی ئەنجومەن و لیژنەو شاندی بەڕێوەبەرایەتی کرێکارانی

شارەکە پێکدێن و کاروبارەکانیان ڕادەپەڕێنن.

ئەنجومــەنی شــار – ئەنــدامانی ئەنجومــەنی شــار لــەڕێگای ئەنجومـــــەنی کرێکـــــارانی شـــــارو ئەنجومـــــەنی وەرزێرانـــــی شارەکەهەڵدەبژێردرێن و لانیکەم ساڵی جارێك کۆبوونەوە ساز دەکەن. هەڵبــژاردنی لیژنــەی شــارەکە و نوێنــەرانی ئەنجومــەنی پارێزگــا لەئەستۆی ئەو ئەنجومەنە دەبێت.

لیژنــەی شــارەکان – ئەنــدامانی لیژنــەی شــارەکان بەدەســتی ئەنجومــەنی شــارەکان دیــاری دەکــرێن و لانیکــەم مــانگی جارێــك کۆبوونەوە ساز دەکەن و لـەنێ و خۆیانـدا ژمـارەی ٣ بـۆ ١٥ کـەس وەك شاندی بەڕێوەبەرایەتی شارەکە هەڵدەبژێرن .

ئەنجومــەنی پارێزگــا – ئەنــدامانی ئــەم ئەنجومەنــە بەدەســتی نوێنــەرانی ئەنجومــەنی شــارەکان دیــاری دەکــرێن و ســاڵی جارێــك لەناوەنــدی پارێزگــادا کۆبوونــەوە ســاز دەکــەن. هەڵبــژاردنی لیژنــەی پارێزگا و نوێنەرانی کۆنگرە لەئەستۆی ئەو ئەنجومەنە دەبێت.

لیژنەی پارێزگا – لیژنەی پارێزگا بەدەستی ئەنجومـەنی پارێزگا دیاری دەکرێت و لانیکەم مانگی جارێك کۆ دەبنـەوە. لیژنـەی پارێزگا لـەنێو خۆیانـدا ٧ تـا ١٥ کـەس وەك شـاندی بەڕێوەبەرایـەتی پارێزگـا دیاردەکات.

کـۆنگرە – کـۆنگرە بەدەسـت نوێنـەرانی ئەنجومـەنی پارێزگـان دووساڵ جارێك دەبەسترێت. کۆنگرە بەرزترین ئاستی ڕێکخراوەکانـەوە بەهـەموو شـێوازێك ڕێگەپێـدراوەو مـاف هـەر چەشـنە گۆڕانکارییـەکی هەیـە لـەنێو پـەیڕەوو پرۆگرامـی ڕێکخراوەکانـدا و بڕیـارە گرنگـەکان

لەپرسەکانی ڕۆژو بەدواداچوون لەو بابەتانەوە بەدەستی ئەو دەبێت .

هەڵبــژاردنی ئەنــدامانی کۆمیتــەی ناوەنــدی ڕێکخراوەکــانی کرێکاران و وەرزێرانی ئێرانیش یەکێکی دیکەیە لەمافەکانی کۆنگرە. کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوەکانی کرێکاران و وەرزێرانی ئێران کە بۆ مـاوەی دووسـاڵ و لـەکۆنگرەدا هەڵدەبـژێردرێن، ڕادەسـتپێردرێت بـۆ ڕاپەڕاندنی سەرجەم بڕیارەکانی کۆنگرەو لە بەرامبەریـدا وڵامـدەرەوە دەبێـت. کۆمیتـەی ناوەنـدی لـە نـەبوونی کـۆنگرەدا، بـەرزترین ئاسـتی ڕێکخراوەکـان هـەژمار دەکرێـت و سـەرجەم بڕیارەکـانی هـەتا کـاتی بەستنی کۆنگرە پێویستە جێبەجێ بکرێت. کۆمیتـەی ناوەنـدی لـەنێو خۆیاندا ٧ بۆ ١٥ کەس وەك شاندی بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەبژێرن.

ئـەوەی لـەم گـشتکۆ(مجموعـە)یـە دا دەخرێتـەڕوو سـێ جـۆرە، بیرەوەرییەکان، نوسینەکان و بەڵگەنامەکان، "*بیرەوەرییەکان*" بەرهەمی ئەو وتوویژانـەن کـە لـە پـاییز و زسـتانی ١٣٦٨ لەگـەڵ یووسـف ئیفتیخـاری ئەنجامـدراون و دوای نووسـینەوەیان لەبـەر کاسـێت و رێکخـستن و پاکنووسـکردنیان ئامـادەی بڵاوکردنـەوە کـراون و "*نووسـینەکان*" زنجـیرە وتارێکن یووسف ئیفتیخاری لە ئۆردیبەهێشتی ١٣٣٠تا تیری ١٣٣١ ( گوڵانی ١٩٥١ تـا پوشـپەڕی ١٩٥٣ ز) لـەژێرناوی "کورتەمێـژووی بزووتنـەوەی کرێکـاری لـەئێران" لەرۆژنامـەی "ئـیرادەی ئازەربایجـان" ژمـارە ١٦ای سـاڵی سـێهەم ١٩ گـوڵانی سـاڵی ١٣٣٠( ١٩٥١ ) ـ ژمـارە ٦٩ سـاڵی چـوارەم ٢١ پوشـپەڕی ١٣٣١(١٩٥٢) بڵاویکردوونەتەوە.





3500دينار

